# چەند تیشکێکی قورئانیی

## لە ئاسمانی ویژداندا


دانانی

مامۆستای پایە بەرز

محمد فتح الله گولەن

وەرگێڕانی:

حبیب محمد سعید

وەرگێڕاوی کتێبی
Kur'andan İdrake Yansıyanlar
لە تورکی‌یەوە


- ناوی کتێب : چەند تیشکێکی قورئانیی
- دانەر : ماموٚستا محمد فتح الله گولەن
- وەرگێڕی عەرەبیی : أورخان محمد علي
- وەرگێڕی کوردیی : حبیب محمد سعید



- چاپی : یەکەم
- ساڵی چاپ : ١٤٣٠ ك ـ ٢٠٠٩ ز
- ژمارە سپاردنی (١٧٤٩) ساڵی ٢٠٠٩ ی دراوەتێ .
- تایپ و دیزاین : سۆز کۆمپیوتەر

# کورتەیەك لە ژیانی دانەر

مامۆستا ( محمد فتح الله ) گولەن لە ساڵی ١٩٣٨ دا لە گوندی (کۆروجوك)ی سەر بە قەزای ( حسن قلعة ) ی سەر بە پارێزگای ( أرضروم ) لە دایك بووە و، لە خێزانێکی دینداردا پەروەردە بووە . ( رامز ئەفەندیی ) باوکیشی پیاوێك بووە کە بە خاوەنی زانست و ئەدەب و دین ناسراوە .. ( رەفیعە هانم ) ی دایکیشی بە نافرەتێکی دیندار و ئیمانی قووڵ بە خوا ناسراوە . هێشتا تەمەنی موحەممەد لە چوار ساڵیی تێنەپەڕیی بوو ، دایکی دەستی کرد بە فێرکردنی قورئان . ئەوەبوو لە نیوەشەودا کوڕەکەی هەڵ ئەستاند و دەرسی قورئانی پێ ئەوت .

باوکیشی هەردوو زمانی عەرەبیی و فارسیی فێر کرد و ، ماڵەکەشیان باوەشی بۆ زانایان و تەصەووفکارە ناسراوەکانی ئەو ناوچەیە کردبووەوە ، بۆیە مامۆستا موحەممەدیش هەر بە منداڵیی راهات تا لە کۆڕی پیاوی گەورەدا دابنیشێ و گوێ لە قسە و باسیان بگرێ .

**سەرەتای خوێندنی :**

بە منداڵیی لە قوتابخانەی دینییدا خوێندوویەتی و ، هاتوچۆی تەکیەشی ئەکرد، بۆیە شان بە شانی زانستە دینییەکان ، کە لە دیارترین فەقیهی ئەو ناوچەیە وەری ئەگرتن ، کە ئەویش ( عثمان بکتاش ) بوو ، پەروەردەیەکی رۆحییشی وەر گرت ، ئەوەبوو لای ئەو مامۆستایەی نەحو و ، بەلاغە و ، فیقه و، ئوصوولی فیقه و ، عەقائیدی خوێند ، لە هەمان کاتدا وەنەبێ زانستە دانراوەکان و فەلسەفەشی پشت گوێ خست بێ .. لە ماوەی ساڵانی خوێندنیدا لە ( پەیامەکانی نوور ) و بزووتنەوەی قوتابیانی نوور شارەزا بوو و ، زۆر چاك بە دڵیدا چوون ، چونکە لە راستییدا بزووتنەوەیەکی نوێخوازیی و زیندووکاریی بەرفراوان بوو ، کە زانای پایەبەرزی هەڵکەوتووی زەمانە و ، دانەری

( پەیامـــەکانی نـــوور ) ، مامۆســـتا ســـەعیدی نوورســـیی دەســـتی دایـــێ
فەرماندایەتیی کرد .

کە تەمەنی مامۆستا موحەممەد بەرەو پێش چوو ، خوێندنەوەی زیادی کـرد و
رۆشنبیرییشـی جۆراوجـۆر و فـراوانتر بـوو ، چـونکە سـەرەڕای شـارەزابوونی لـە
فەلسەفەی خۆرهەلات ، لە رۆشنبیریی و فیکر و فەلسـەفەی خۆرئـاواش ئاگـادار
بوو و ، بەردەوام خەریکی خوێندنەوەی زانستە دانراوەکـانیش بـوو ، وەك فیزیـا و
کیمیا و زانستی فەلەك و زیندەوەرزانیی ... تد .

**مامۆستا موحەممەد فەتحوللا :**

کە تەمەنی مامۆستا موحەممەد گەیشتە بیست سـالان لـە مزگـەوتی ( ئـووچ
شەرەفلیی ) ، لە شاری ( ئەدرنە ) بە ئیمام دامـەزرا ، کـە ئـەوەبوو مـاوەی دوو
سال و نیوی لەو مزگەوتـەدا لـە جـەووێکی زوهـد و پـەروەردەی نـەفس‌دا بەسـەر
برد ، بـە رادەیـەك کـە بڕیـاری دابـوو شـەویش لـە مزگـەوت‌دا بمێنێتـەوە و ، بـۆ
پێویست نەبێ نەچێتە دەرەوە .

کـاری بـانگ‌کردنـی لـە ئـەزمیر ، لـە مزگـەوتی ( کستانە بـازاری ) ، لـە
قوتابخانەی لەبەرکردنی قورئان ، کە سەر بـەو مزگەوتـە بـوو ، دەست پـێ کـرد .
پاشان دەستی دایە کاری ( وعـظ ) بە شێوەیەکی گەڕۆك . ئەوەبوو بە سەرانسەری
ناوچـەی خۆرئـاوای ئـەنادۆل‌دا گـەڕا .. لـە سـالی ( ١٩٧٠ ) دا دەسـتی دایـە
رێکخسـتنی چـادرگا ( مـخیمات ) بـۆ لاوان .. ئـەوەبوو لـەو چـادرانەدا و بـە
وتارەکانی دەروونەکانی پەروەردە کردن و ، لە چلك و چەپەلیی پاکی کردنـەوە و ،
بەدیهێنەر و پەروەردگاری هێنانەوە یاد . چونکە دەروونەکان و رۆحەکان بۆ وەهـا
رابـەرێك تینـوو بـوون ، تـا رێـی بـەردەمیان بـۆ لای خـوای گـەورە و پێغەمبـەرە
بەڕێزەکەی ﷺ بۆ رووناك بکاتەوە .

لە ١٢ /٣ / ١٩٧١ دا ، دوای ئاراسـتەکردنی ئاگادارکردنەوەیـەکی سـەربازیی
بۆ حکوومـەتی ئەو کاتە ، مامۆستا فەتحوللا دەست‌گیر کرا ، ئەویش بـە تـاوانی:
(( هەولدان بۆ گۆڕینی بنچینە کۆمەلایەتیی و سیاسیی و ئابووریـیەکانی رژێمـی

دەسەڵاتدار و ، وەبەرهێنانی هەستی دینیی گەل، ئەویش بە پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی نهێنیی بۆ گەیشتن بەو ئامانجە )) .
گرتنەکەی شەش مانگی خایاند ، کە بریتیی بوو لەو ماوەیەی کە دادگا بۆی بڕییەوە و ، پاشان بەر درا و ، دوای ئەوە گەڕایەوە سەر کاری خۆی و ، ڕەوانەی شاری ( ئەدرمیت ) یان کرد و ، پاشان لەوێوە گوازرایەوە بۆ ( مانیسا ) و، لەوێشەوە بۆ ( بورنوفا ) لە پارێزگای ئەزمیر ، کە ئەوەبوو هەتا ساڵی ١٩٨٠ لەوێ مایەوە .
لەم ساڵانەدا مامۆستا بە وێنەی ئامۆژگارێکی گەڕۆك بە وڵاتدا ئەگەڕا و، لە مزگەوتەکاندا وتار و ئامۆژگارییەکانی پێشکەش بە خەڵك ئەکرد. هەروەها ( محاضرة ) ی زانستیی و دینیی و کۆمەڵایەتیی و فەلسەفیی و فیکریی ڕێك ئەخستن و ، کۆڕ و کۆمەڵ و چاوپێکەوتنی تایبەتیی ئەبەست و، وەڵامی ئەو پرسیارانەی تیّدا ئەدانەوە کە بە مێشکی خەڵکدا ئەهاتن ، بە تایبەت لاوان و وەڵامیان نەئەزانین و ، سەرەنجام ئەکەوتنە چاڵی گومان و ئیلحادەوە .. ئەوەبوو وەڵامەکانی دەرمانی شیفابەخش بوون بۆ مێشك و دڵی لاوەکان ، بە شێوەیەك کە خەڵکەکە دەورەیان لیّ ئەدا و ، داوای ڕێنماییان لیّ ئەکرد ..
ئەم کۆمەڵە ـ بەبێ ئەوەی چاوەڕوانیی هیچ کەڵك و قازانجێکی ماددیی یان دنیایی بکەن ـ لە سنووری ئەو یاسایانەدا کە لە تورکیا بەڕێوە ئەچوون، دەستیان دایە دامەزراندنی چەندین قوتابخانە و ، بەشی ناوخۆ و ، دەرکردنی چەندین ڕۆژنامە، دامەزراندنی چەندین چاپخانە و ، دانانی چەندین کتێب و، وێستگەیەکی رادیۆ و، کەناڵێکی تەلەفزیۆنیی . دوای دارمانی یەکیەتیی سۆڤیەت ئەو قوتابخانانە لە هەموو جیهاندا بلاّوەیان کرد ، بە تایبەت لە وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاستدا کە بۆ ماوەی حەفتا ساڵ لە ژێر داگیرکاریی رووسیی و، ئیلحادی شیووعییەتدا ئەیان ناڵاند .

**وت و ویژ :**

مامۆستا فەتحوڵلاّ دەستی دایە بزووتنەوەیەکی پێشەنگ ـ بە تایبەتیی دوای ساڵی ١٩٩٠ ـ بۆ وت و ویژ و لە یەك گەیشتن لە نێوان دەستە و تاقمە جۆر بە جۆرەکان و ، خاوەن رۆژنامەکان و ، رۆشنبیراندا ، هەروەها لە نێوان دینەکان و بیر و بۆچوونەکانی تردا ، ئەمەش بە نەرم و نیانیی و ، دوور لە دەمارگیریی و گرژیی.

ئەم بزووتنەوەیە لە تورکیادا ، پاشان لە دەرەوەی تورکیاش‌دا پێشوازیی لیّ کرا و ، لەو کۆبوونەوەیەش‌دا گەیشتە چڵەپۆپە ، کە لە ڤاتیکان لە نێوان مامۆستا فەتحوڵلاّ و پاپادا گریّ درا ، ئەویش بە بانگهێشتی پاپا بۆ مامۆستا.

مامۆستا بڕوای هاتە سەر ئەوە کە جیهان ، دوای پێشکەوتنی هۆیەکانی گەیاندن، وەك گوندێکی لیّ هاتووە . لە بەر ئەوە هەر بزووتنەوەیەك پشت بە دوژمنایەتیی و ناکۆکیی ببەستیّ هیچ ئەنجامێکی ئیجابیی نابێت . بۆیە پێویستە بە سنگێکی فراوانەوە روو لە هەموو جیهان بکرێت و ، ئیسلامیش وەها بگەیەنرێت کە لەسەر تۆقاندن نەوەستاوە ـ وەك دوژمنەکانی وەهای پیشان ئەدەن ـ بگرە بوار و دەرفەتی فراوان هەیە بۆ هاوکاریی نێوان ئیسلام و لایەنەکانی تر .

**بەرهەمەکانی :**

أ ) هەزارەها کاسێت و کاسێتی ڤیدیۆ کە بریتیین لە وتار و ئامۆژگاریی و موحازەرە و نەدوەکانی .

ب ) کتێبە چاپ کراوەکانی :

١ ـ أسئلة العصر المحيرة ( ٤ بەش ) . ٢ ـ الموازين أو أضواء على الطريق ( ٤ بەش ) . ٣ ـ العصر والجيل . ٤ ـ الإنسان في تيار الأزمات . ٥ ـ نحو الجنة المفقودة . ٦ ـ صفحة الزمن الذهبية . ٧ ـ أنفاس الربيع . ٨ ـ عندما نقيم صرح الروح . ٩ ـ النور الخالد : مفخرة الإنسانية محمد ﷺ (

٢ بەرگ ) . ١٠ ـ في ظلال الإيمان ( ٢ بەش ) . ١١ ـ تلال القلب الزمردية ( ٢ بەش ) . ١٢ ـ براعم الحقيقة في جيل الألوان ( ٢ بەش ) . ١٣ ـ تأملات في سورة الفاتحة . ١٤ ـ من فصل لفصل ( ٤ بەش ) . ١٥ ـ المنشور ( ٤ بەش ) . ١٦ ـ روح الجهاد وحقيقته في الإسلام . ١٧ ـ الحياة بعد الموت. ١٨ ـ القدر في ضوء الكتاب والسنة . ١٩ـ طرق الإرشاد في الفكر والحياة . ٢٠ ـ البعد الميتافيزيقي للوجود . ( ٢ بەش ) . ٢١ ـ ريشة العازف المكسورة ( ديواني شيعر ، ٢ بەش ) . ٢٢ ـ تربية الأطفال . ٢٣ ـ أضواء قرآنية. ٢٤ ـ ترانيم روح وأشجان قلب .

زۆرێك لە كتێبەكانيشی بۆ سەر زمانی ئینگلیزیی و ئەڵمانیی و بولغاریی و ئەلبانیی و ئەندەنووسیی و رووسیی و كۆریی و هی تریش وەرگێڕراون .

ئەو كتێبانەشی كە بۆ سەر زمانی عەرەبیی وەرگێڕراون ئەمانەن : ١ ـ القدر. ٢ـ الموازين . ٣ ـ الأسئلة . ٤ ـ الجهاد . ٥ ـ طرق الإرشاد . ٦ ـ أضواء قرآنية . ٧ ـ عندما نقيم صرح الروح . ٨ ـ ترانيم روح وأشجان قلب . ٩ ـ التلال الزمردية . ١٠ ـ النور الخالد . ١١ ـ حقيقة الخلق ونظرية التطور .

بە كۆمەكیی خوا ئەوانی تریشی بۆ سەر زمانی عەرەبیی وەرئەگێڕرێن و ، بە پێی تواناش چاپ ئەكرێن .

شایانی زانینە كە ئەم كتێبەی بەر دەستمان بریتی‌یە لە كۆمەڵە ئامۆژگاری‌یەكی سەرپێیی كە لە مزگەوتدا پێشكەشی كردوون ، یان وەڵامی پرسیاری قوتابیەكانی ، یان میوانەكانیەتی و ، لەو كۆڕە زانستیانەدا كە بۆ بەستنیان راهاتووە ، پێشكەشی كردوون . لەبەر ئەوە شێواز و ناوەڕۆكی كتێبەكە لەگەڵ ئەو جەووە تایبەتیە گونجاوە . بۆیە شێوازی وتاری پێوە ئەبینین . قوتابیەكانیشی ئەم ئامۆژگاریی و وەڵامانەیان كۆ كردوونەتەوە و ، دوای رەزامەندیی دانەر و راست كردنەوەی پێویست ، بە چاپ گەیەنراون .

# پێشەکیی دانەر

قورئـان تیشـکی بریسـکاوەیە بـۆ وشـەکان و پیتـەکان لـە جیهـانی ئـەزەل و ئەبەددا.

ئەو دەنگی ئەو مەلەکوتەیە کە فیکری ئینس و جینن ئەدوێنێ و، کاتێکیش کە لەناو صەدەفەیەکی بریسکاوەدا ئەگۆڕدرێ بە گەوهەرێکی لە رادەبەدەر جوان، پاڵەوانانی بەلاغە و ئەدەب جوانیی و رازاوەییەکی وەهای تێدا ئەبینن کـە هـەڵ نابزرکێت و تیاناچێت و ، ئەم بوونـەوەرە گەورەیـەش ـ کـە پیشـانگای جـوانیی و هونەر و رەنگە خواییـە رێـك و پێـك و یـەك ئاوازەکانـە ـ هـەروا بـە نیشـتمان و وڵاتـی تـرس و لـەرز و تۆقانـدن ئەمێنێتـەوە و ، دێـو و درنـج و رۆحـە خراپویستەکانیش هاتوچۆی تێدا ئەکەن .. بە مەرجێك ئەم بوونەوەرە بە کتێبێـك ئەژمێررێ کە هەموو دێڕێك تیایا بە نهێنییەك لە نهێنییەکانی جیهـانی بـەرز و بـاڵا ئەخاتـە روو و ، هـەروا دێـڕ و پـەڕەکانی ئـەم بوونـەوەرە بـە پـرژ و بڵاویـی ئەمێننـەوە هـەتا ئـەو رۆژە بێتـە بەرەوە کـە قورئـانی تێـدا بکرێتـە نوورێـك و پەخشانی سەر رووی ئەم بوونـە ببێـت . خەڵکەکـەش ـ جگـە لـە هـەڵگرانی بـیرە چەوتەکان ـ یەك دەنگ ئەبن لەسـەر ئـەوەی کـە هـەر کاتێـك قورئـان بـە وێنـەی خۆرێکی گەشاوە هەڵ هات ئەوا هەورە رەشەکان ، کە چۆکیان دابووە سەر سنگی دنیـا ، رەوینـەوە و ، روخسـاری پێکـەنیوی بـوونیش دەرکـەوت و ، هـەموو شتەکانیش گۆڕان بۆ برگە و رستە و وشەی کتێبێکی خەم ڕەوێن و شـادمان کـەری خوێنەرەکەی . لە کاتی بیستنی دەنگیدا نوورەکـان بـە خـوڕەم لـە چـاوی دڵـەوە هاتنـە خـوارەوە و ، هەسـتەکانیش ، کـە لـە رۆحەکانـەوە هـەڵ چـوون و ، زمانەکانیش ، کە بووبوونە تـەرجومان بـۆ ئـەو هەسـتانە ، دەسـتیان دایـە وتنـی سروودەکانی نوور .

بەڵێ !... لەمڕۆ بە دواوە ، کە چاوەکان و دڵەکان پێی ڕۆشن بوونەتەوە، داخۆ چەند مەتەڵ لەم بوونەوەرەدا لە هەزاران ساڵەوە چاوەڕوانیی حەلیان کردووە و، چەند گرفتی ئاڵۆزی بەناو یەکدا چوویش چاوەڕوانیی حەلیان کردووە ، کەچیی یەك لە دوای یەك حەل کران و ، پەیوەندیی ڕاستەقینەی نێوان مرۆڤ و بوون و بەدیی‌هێنەریش وەك مانگی چواردە بە ڕوونیی دەرکەوت و ، هەموو مەتەڵ و نادیارێکیش بەرگی مانایان پۆشیی و ، لە خولگەی دانایەتیی‌دا بە ڕێکیی ڕیز بوون ..

قورئان لووتکەی فیکری بەهێز و ڕاستە و ، بنچینەی داڕشتنی ورد و، بناغەی دارشتنی مەنتیقی‌یە . جا هەروەك ئەم فورقانە مەزنە سەرداری هەموو کتێبە ئاسمانیی و نائاسمانی‌یەکانە ، ئەوا دوێنراوی یەکەمیشی سەرداری هەموو پێغەمبەرانە .(کتێبە پێشینەکان بۆ ئەوە هاتن کە ئیشارەت و نیشانە لەسەر ڕێگەی قورئان دابنێن ، بەڵام ئەو کتێبانەی کە دوای ئەو هاتن بۆ ئەوە بوو هەر یەکە بە پێی نەخشەی ڕۆحی و دەوڵەمەندیی ئەو ڕۆحە شەرحی بکەن و پەراوێزی بۆ دابنێن). ئەوانەی پێش قورئان هاتن بەو شێوەیەی کە پێغەمبەران سەلامیان لێ بێت مژدەیان دا پێناسەی قورئانیان کرد و ، ئەوانەش کە دوای ئەو هاتن بەو شێوە دیارەی کە دابەزیی‌بووە خوارەوە پێناسەیان کرد و ، بە چاوی خۆیشیان ئەو کاریگەری‌یە گەورەیە و ، ئەو ئینقیلابە مەزنەیان دیی کە قورئان دای‌هێنا ، بۆیە لە بەردەم ئەو بەلاغەتەی قورئان‌دا کە بەرابەرکێی لەگەڵ ناکرێت چەمانەوە و، دانیشیان بەوەدا نا کە قورئان سولطانی فەرمایشت و ئیعجازی بەلاغی‌یە. کاتێکیش کە قورئان بە شەپۆلی جیاوازی ئەنوارەوە ئەهاتە خوارەوە بۆ دنیا، خاوەنانی دڵە ڕووناکەکان بە هیچ شێوەیەك چاویان لێی کلا نەکرد و ، بەم لاو بەو لاش‌دا سەیریان نەکرد ، بەڵکو بە هەموو ئەندامێك و بە ڕۆحەکانیانەوە پابەندی بوون .. بەڵێ ! ... لە کاتێك‌دا کە قورئان لە ئاسمانەوە بە وێنەی تاڤگە ئەهاتە

خوارەوە تا تینوێتیی دڵە تینووەکان بشکێنێ ، خاوەن دڵە تێگەیشتووەکان سنگیان بۆ کردەوە و ، دڵۆپێك ئاوی ئەو ئاڤگەیان لە دەست نەدا..

ئەم قورئانە توانیی بە یەك باز دەنگی بە دوورترین گۆشە لە گۆشەکانی دنیا بگەیەنێت و ، هەموو دەنگە شوومەکانیش کپ بکاتەوە و ، لە هەموو دڵێکیشدا ـ کە هەوڵ بۆ حەق ئەدات و خاوەنی فیکرێکی پێشتر نیە ـ چەندین سۆزی ئاسەمەندی ، کە وەك دەنگی خوڕەی کەوثەر وەهان ، هێنایە جۆش و ، لەو دڵانەشدا کە فەتحی کردن ئاگری تەنیایی و بێکەسیی کوژاندەوە و ، لە هەموو رۆحێکیشدا هیوای پێك گەیشتن و ئاسەمەندیی بۆی هەڵ قوڵاند .. سروشتە ساردەکانیش دەماری گەرما بە قورئان ئەجوولێنن . بەڵام دڵە شەیداکان بە حەزی مانەوەی هەتا هەتایی و نەمریی ، بە قورئان هۆگر بوون و پێی ئاسوودە بوون .

لەم دنیا فانیەدا ، کە هەموو نوێیەك کۆن ئەکات و ، هەموو گەشاوەیەکی تێدا ئەڕزێت و ، هەموو رەنگێکی تێدا کاڵ ئەبێتەوە ، ئەگەر شتێك بەردەوام بە نوێیی و گەشاوەیی مابێتەوە ، ئەوە قورئانە . قورئان ئاقانە کتێبێکە کە توانیی لەو کاتەوە هاتۆتە خوارەوە ، لە رووی هەموو رەشەبا و گێژەڵووکەیەکدا کە هەڵیان کردبێ و ، هەموو باران و بەفرێکدا کە باریی بن و، لە رووی هەموو بارودۆخێکی سەختدا کە سەریان دەرهێنا بێت و، لەبەردەمیدا دەرکەوتبن ، بوەستێت و ، توانیشی بە وێنەی کتێبێکی ئاسمانیی ئاقانە دوور لە گۆڕان و دەستکارییکردن پارێزگاریی لە ئەسڵی خۆی بکات. لەبەر ئەوە هەرکە دەنگی قورئان لە قوڕگی قورئان خوێنێکەوە دەر ئەچێت ، خێرا هەست ئەکەین کە هەر ئێستا لە ئاسمانەوە هاتبێتە خوارەوە و ، هەروەك بانگ کرابین بۆ دەعوەتێکی خوایی کە لە بەهەشتەوە هاتبێت و ، کاتێکیش کە قورئان گەوهەرەکانی پەخشان ئەکات دڵە ئیماندارەکان وەها هەست ئەکەن کە بەرز بوونەتەوە و، پێویستییان بە هەموو سەروەت و سامانی دنیا نەماوە . قورئان ملوانکەیەکی روون

کردنەوەیە کە لە فەرمایشتی خوایی هۆنراوەتەوە و، شالاوێکیشە لەو زانستەی کە کۆتا سنوور بۆ پەی پێ بردنی مرۆڤ پێك دێنێت و، نەخشەیەکیشە بۆ هەموو بوون کە بە ئاوریشمی لاهووتیی وێنە کێشراوە و رازاوەتەوە و چنراوە. لە هەر ناوچەیەکدا دەنگی قورئان ببیسترێ ، ئەوا هەموو وتەیەك و هەموو دارشتنێکی تر بە جۆرە قالە قالێك دەرئەکەوێت و هیچی تر. لەو ناوچانەشدا کە ئالای قورئانیان تیا هەلٚ کرابێت نوور دلٚی ئیمانداران نوقم ئەکات و ، شەیاتینیش بەردباران ئەکرێن و ، خواناسانیش هەمیشە لە جەژندا ئەژین.

خوای بالادەستی ، پەروەردگاری جیهانەکان ، کە خاوەنی هێز و توانایە بەختەوەریی دنیا و قیامەتی بەستووە بە ئیرشاد و ئامۆژگاری‌یەکانیەوە ، ئیتر بەبێ کۆمەکیی ئەو گەیشتن بە ئامانج ئیمکان نابێت و ، هەرکەسیش خۆی بە موحتاجی ئیرشاد و ئامۆژگاری‌یەکانی نەزانێت و ، پەنای بۆ نەبات ، لە رێدا سەری لێ ئەشێوێت و تیا ئەچێت . قورئان دوایین و کاملٚترین فەرمایشتە هیدایەتی ئەو کەسە بدات کە شوێنی ئەکەوێت و ، بە گوێی ئەکات و ، بە ئامانج و مەبەستی خۆی ئەیگەیەنێت .. لەگەلٚ ئەوەشدا کە بەوپەڕی ئاسانی‌یەوە بەیانیان و ئێواران ئەخوێنرێت ، کەچیی لە تواناد ا نیە لە وێنەی بهێنرێت . هەرکەسیش لە قوولایی دلٚیەوە گوێی بۆ بگرێت هەست ئەکات کە هەرچیی پێویست بێت بی‌بیستێت ئەو بیستوویەتی و ، دەنگی ئەو قورئان خوێنانەش بەردەوام لەگەلٚ هەناسەی مەلائیکەتەکاندا تێکەلٚ ئەبێت .

هەتا کاتی هاتنە خوارەوەی و تەشریف‌هێنانی بۆ سەرزەویی ، هەموو پێغەمبەرێك شۆلٚەی ئەو هیدایەتەی هەلٚ ئەکرد کە لە سەرچاوەی نوور و تیشکی خۆیەوە هەلٚی گرتبوو و ، بیابانە کاکی بە کاکی‌یەکانی دەوروبەریشی بە چەند دلۆپێکی کەم لێی ئەگۆڕیی بۆ بەهەشتانێکی سایە و سێبەر پڕ .

بگرە ئەو چەرخە تاریکانەی کە سێبەری قورئانیان بەرکەوتبێ بوونەتە چەرخی زێڕین . بەلام ئەو چەرخانەی کە لە نزیکەوە لەگەلٚیا ئاشنا بوون و ، پێی ژیان

وەك بەهەشتیان لیّ هات .(هەرکەسێك خۆی پێشکەشی قورئـان بکـات بـۆ پلـەی مەلائیکـەتان بـەرز ئەبێتـەوە و ، لـە گیـاندار و بیّگیانـانیش هەرچـیی وا لـە بوونەوەردا لەگەڵیا هۆگر ئەبن .)

هەر کەسێك بە چاکیی لە قورئان تیّ بگات ، دەریـا فراوانـەکان بەلایـەوە وەك دڵۆپە ئاوێکیـان لیّ دێـت و ، هەرکەسـێکیش بـە نـووری قورئـان خـۆی نـوورانیی بکات ، خۆر لە بەردەمیا وەك مۆمێك ئەنوێنێت . هەناسـەکانی قورئـان کـە لـە قـوڵایی دڵەکانمانـەوە هەسـتیان پـیّ ئەکـەین دڵـەکانمان زینـدوو ئەکەنـەوە و، تیشکەکەشی کە هەموو شتێك نوقم ئەکات ، وەهـا لـە هـەموو دروستکراوێـك ئەکات کە بەڵگە و سەلماندن بێت لە سەر تەنیایی حەق تـەعالا . دەنگـی قورئـان بە هەرکەس بگات ـ ئەگەرچیی لە دوورترین و شارراوەترین شوێندا بێت ـ ژیـانی بە بەردا ئەکرێت هەروەك دەنگی ( صوور ) ی ئیسرافیلی بیستبیّ . ئەو دڵانـەش کە گوێ لە دەنگەکەی ئەگرن و ، ئـەویش بـە زمانـە تایبەتیـیەکـەی خـۆی ئـەیان دوێنیّ ، ئەکەونە جووڵە و پێی زینـدوو ئەبنـەوە : ﴿ هَـٰذَا بَصَـٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ ( الجاثیـة : ٢٠ ) . بـەڵیّ قورئـان بەصـیرەت و سـۆز و بەزەییـیە بۆ ئەوانەی کە دڵیان نەمردووە .

رۆژێك لە رۆژان قورئان ـ وەك کتێبەکانی تر ـ کتێبێك نەبووە لـە چوارچـێوەی کات و شوێنێکی دیاریی‌کراوی سەردەمی منداڵیی مرۆڤایەتییدا ، بەڵکو قورئـان موعجیزەیەکی گەورەی گشتگیر و دەوڵەمەندە کە لە هەموو کـات و شـوێنێکدا کاری خۆی ئـەکات و ، هـەموو ئـاوات و خواسـتەکانی مرۆڤایـەتییش ، هـەر لـە عەقیدەوە هەتا بچوکترین رەوشتی کۆمەڵایـەتیی ، جیّ بـەجیّ ئـەکات و ، هـەتا ئـەمرۆش ئـەتوانیّ تەحـەددای هـەمووان بکـات و تەحـەددای هـەموو شـتێکیش بکات.

لەو سەردەمەدا کە هاتە خوارەوە بەرەنگاری هەموو بەرهەڵستکارییەکی بەرامبەرەکانی بوویەوە و ، تەحەددای کردن با کتێبێك ، یان هەتا سوورەتێك، یان ئایەتێك لە وێنەی خۆی بهێنن .. نەیارە پێشینەکانی پێی سەرسام بوون و، بەیان و بەلاغەتەکەی بە وێنەی سیحر کاری تێ کردن ، هەتا ئەوەبوو پێغەمبەریان ﷺ بەوە تاوانبار ئەکرد کە ساحیر بێت ، یان شاعیر . لە بەرامبەر ئەو هەواڵە غەیبییانەشەوە کە لە پشتی پەردەکانەوە وەری ئەگرتن هۆشیان بە خۆیانەوە نەما و ، ئەیانوت پێی کاهینە . کەچیی بە تەواویی لە هێنانی وێنەی قورئان دەستەوسان بوون . واتە پاڵەوانانی شیعر و پەخشان و وتاربێژیی و دەستەی راگەیاندنیان ، لە نەیارانی قورئان ، ناچاری بێدەنگیی و لاڵیی و کشانەوە بۆ کونەکانیان بوون . بەڵام ئینکارە عینادەکانی ئەم چەرخە ، هەرچەندە رۆحی نەیاریی وئینکارییان لەو پێشینانەیانەوە بە میرات بۆ ماوەتەوە ، کەچیی سەرەڕای جۆرەها دیاغۆغیی و دیالەکتیك و ، هەموو جۆرە بەرامبەر وەستان و نەیارییکردنێك ، جگە لە دەرخستنی دەستەوسانیی و تووڕەبوون هیچیی تریان لێ نەهاتووە . زەمانە گۆڕا و ، چەرخەکان یەك لەدوای یەك هاتن و ، قەناعەت و بۆچوونەکان جیاوازییان تێ کەوت و ، توندوتیژیی نەیاریی و زۆرانبازیی گەرم بوو ، بەڵام قورئان بە وێنەی چیای سەرکەش و ، بە وێنەی دەریای فراوان و ، بە وێنەی ئەو ئاسمانەش کە رووبەڕووی هەموو نەیاران و ، رووبەڕووی هەموو رەخنە و بەرهەڵستکارییەکان سنووری بۆ نییە ، بەردەوام راوەستاوە و ، لەسەر گەیاندنی سام و قەشەنگییەکەی بە دڵان و ، لەسەر هیدایەتدانی ژیرییەکان بەردەوامە . لەو کاتەوە هاتۆتە خوارەوە کە ئەمە چواردە صەدەیە و ، لەو کاتەشەوە کە لەسەر عەرشی دڵەکانمان تەخت دانیشتووە ، چەندین سەردەم ئاڵ و گۆڕیان بەسەر هات ، کە تیایانا چەندین زمانپاراوی ناودار و ، چەندین قوتابخانەی فیکریی و ، چەندین رژێم و فەلسەفەی جیاواز سەریان هەڵ دا.. زۆریشیان هەوڵیان دا کە قورئان بڕووخێنن و ، بۆ ئەم مەبەستەش هەر

هۆکارێکیـان بـەلاوە بـوو و ، لـە وتـەی کاریگـەریش ، لـە بـەیان و بەلاغـەت، هەرچییان لە تواناڎا بوو بەکاریان هێنـا و ، جـەنگێکی بەردەوامیشـیان لەگـەڵیا هەڵگیرساند . بەڵام لەبەردەم ئەو بنچینە بەهێزە ڕێك و پێکە مەنتیقییانەدا، کـە قورئان بۆ بوونەوەر و ، بۆ وجوود و ، بـۆ مرۆڤـی دانـان و ، لەبـەردەم ڕوونکـراوە قووڵـەکانی ئـەو پەیوەندییانـەشدا بـەردەوام تێـك شـکان و ، بـە زەرەرۆمەنـدیی پاشەکشەیان کرد .

بەڵێ ! قورئان بە شێوازێکی یەکجار قەشەنگ و دڵڕفێن بۆچوونێکی جیـاوازی بۆ بوونەوەر و ، بۆ شتەکان و ، بۆ مرۆڤ هێنا ، چونکە لە ناوەندی بوونـەوەردا بـە یەك پارچـەیی ، مـرۆڤ بـە گشـتیی وەرئـەگرێت و ، هـیچ شـتێکیش پشـت گـوێ ناخات، بەڵکو هەموو شتێك ـ چەند بچووکیش بێت ـ لە شوێنی گونجاوی خـۆیدا دائەنێت . بەشەکانی پەیوەندییەکی پتـەو و وردیـان بـە هـەمووەوە هەیـە . ئـەو وەڵامـە جیاوازانـەش دەربـارەی وردترینـی ئـەو پرسـیارانەی کـە لـەم پیشـانگا بوونەوەرییە گەورەدا بە بیری مرۆڤ دا دێن ، هەر هەموو تیایـا وەڵام ئەدرێنـەوە. لە کاتێکیشدا کە قورئان وردترین پرسـیاری جیهـانی شـهوود ، یـان ئەوانـەی لـە پشتی پەردەکانەوەن و ، ئەوپەڕی وردەکارییان شیی ئەکاتـەوە ، هـیچ دوودڵیـی، یان گومان ، یان نیشانەی پرسیار لە مێشکەکاندا ناهێڵێتەوە ... بەڵێ ! قورئـان لەم هەموو وردەکارییانەدا کە ئەیانهێنێتەوە هیچ بۆشاییەك لـەم باسـەدا ، نـە لە عەقڵ و ، نە لە دڵ و ، نە لە هەست و ، نە لە مەنتیقدا ناهێڵێتەوە ، چـونکە دەوران دەوری عـەقڵ و هەست و سۆز و پەیپێ بردنی مرۆڤ ئەدات ، بە شـێوەیەك کەوا لە مرۆڤ ئەکات ـ کاتێك کە لە ژێر کاریگەریی ئەو عیشقەدایە ـ خەریکە لە پێناسەی مرۆڤانەی خۆی دەرئەچێت و ، ڕوو لە زاتی ( الله ) بکات . جا مرۆڤ بە وێنـەی هـەموو ئەوانـەی کـە ڕێـی بـەرەو خـوای باڵادەسـتیان گرتۆتـە بـەر ، لـە سەرسامییەوە ئەگوێزێتەوە بۆ وڕبوون و ، لە وڕبوونیشەوە بۆ دەریایەك لـە سـۆزە بەیەكدا کێشاوەکان ، کەوای لێ ئەکەن لەبەر شەرم و ترسی خوا بچەمێتەوە، کـە

ئەفەرموێ : ﴿ قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدٗا ﴾ ( الكهف : ١٠٩ ) .

کەواتە ئەمە قورئانە .. ئەو کلیلە زێڕینەی گەنجینەکانی ئەو فەرمایشتانەی کە تەواو نابن و کۆتایی‌یان نایەت و ، ئیمانیش بریتی‌یە لە نووك یان دانی ئەو کلیلە ئەفسووناوی‌یە . بڕواش ناکەم گەر کەسێك ئەو جۆرە کلیلە یان ئەو نووکانەی هەبێت ، دەربارەی مەسەلەکانی ئەو یاسا و بنچینە گشتی‌یانەوە کە پەیوەندی‌یان بە مرۆڤ و ، وجوود و ، بوونەوەرەوە هەیە ، پێویستی بە هیچی تر هەبێت .

کەسێك وەهمی ئەوە نەبات کە من بەم وشە دەستەوسانانەم ستایشی قورئان ئەکەم . جا من چیم هەتا ستایشی قورئان بکەم ؟!

هەروەك شاعیر وتوویە :

من يستطيعُ وصفه سوى اللهِ الوصّاف
الملآئكة الكرام المصطفون صفاً صفاً
يصفونه و يعظمونه حتى تحسبهم في طواف

واتە:

جگە لە خوای وەسفکەر کێ ئەتوانێ وەسفی قورئان بکات؟
هەروەها مەلائیکەتە بەڕێزەکان کە بە ریز وەستاون
وەسفی ئەکەن و، بە گەورەی ئەگرن ، هەتا وا ئەزانیت لە طەوافدان

کەسی وەها دەرنەکەوێت کە ناتوانێ ئەم سیفەتە لە رادەبەدەرەی بابەتی بەلاغە و زمانپاراویی ببینێ ، بەڵام ئەوە روون و ئاشکرایە کە هەر کەسێك ویژدانی بە کار بهێنێت ، ئەوە ئەزانێت کە هیچ کات لەو بارەوە هەڵەی نەکردووە، بە تایبەت ئەگەر هەدوو چاوی بگێڕێت و ، کاریگەریی جیهانیی قورئان ببینێت ...

قورئانی پیرۆز لە سەرەتای دابەزین و تەشریفهێنانیدا بۆ دنیا لـە رۆحـیش و لە مێشکی شوێن کەوتوانیشیدا کاریگەرییـەکی وەهـای خولقانـد کـە تەصـەوور ناکرێت ، بە شێوەیەك کە ئەو پلەی کەماڵەی کـە ئـەو بـەرەو ئەوانـە لـە کـەش و هەوا نوورانییەکەیدا پێگەیشتن ، پێی گەیشتن ، بۆ خۆی موعجیزەیـەك بـوو کـە پێویستمان نیە باسی هیچ جۆرێکی تـری موعجیزەکـانی بکـەین و ، هـیچ جـۆرە هاووێنەیـەکیش لـە ئاسـتی ئـەواندا ، لـە لایـەنی دیـنداریـی و ، بیرکردنـەوە و، ئاسۆی فیکر و ، ئەخلاق و ، شارەزایی نهێنییەکانی بەندایەتیی دەست ناکەوێت. بە راستیی ئەو کاتە قورئان بەرەیەك لە هاوەڵانی پەروەردە کرد ، کە ئەگەر بڵـێین لە ئاستی مەلائیکەتدا بوون زیادەڕەوییمان نەکردووە . هەتا ئەمڕۆکەش قورئـان ئەو دڵانە رۆشن ئەکاتەوە کـە رووی لێ ئـەنێن و ، لـە سەرچـەمەکە تینـوێتییـان ئەشـکێنێ و، نهێنییـەکانی وجـوودیش ئەچـپێنێ بـە رۆحیـاندا . ئەوانـەش بـە هەموو هەست و شعوور و دڵ و قابلیەت و پـەی پێبردنیانـەوە واز لـە دەروونیـان دێنن تا لە کەش و هەوای بێوێنەی قورئاندا مەلە بکـات ، خێـرا سـۆز و بیریـان ئەگۆڕێن و ، هەریەکەیان هەست ئەکات کە بە پێی پێوەرێکی دیاریی‌کراو گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ، وای لێ هاتووە لە جیهانێکی تردا بژیت .

بەڵێ ! ئەوەندە مرۆڤ بە هەموو دڵێکیەوە روو بکاتە قورئان ، ئیتر دوای ئـەوە ناتوانێ لە کاریگەریی سیحر و راکێشانەکەی خـۆی دەربـاز بکـات . قورئـان ئـەو قوتابیە ئەگرێت کە بۆ لای خۆی رای کێشـاوە و ، چـاك ئەیشـێلێت و ، سـەر لـە نوێ پێکی دێنێتەوە و ، بە تەواویی ئەیکات بە کەسێکی تر .. کەسێکی ئاسکی هەست ناسك ، بە پلەیەك کـە مـرۆڤ جـەخت لەسـەر ئـەوە ئەکاتـەوە هـەر ئـاڵ و گۆڕێك روو بدات مەگـەر بـەو کەسـە بکرێـت ، بـەڵکو زۆر جـار ئـەگونجێ چـەند کارێك جێبەجێ بکرێن کە لەوەو پێش وەها بە بیردا ئەهات کە جێبـەجێ‌کردنیان موستەحیل بێت ، چونکە ئەو کارانە لە سـایەیدا ئـەگۆڕێن بـۆ حاڵـەتێکی وەهـا ئاسایی کە هەموان سەرسام ئـەکات . قورئـانیش ئەفـەرموێت : ﴿ وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا

سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ﴾

( الرعد : ٣١ ) . چونکه لـه دڵ و، سـۆز و ، هەسـت و ، عەقڵـەکاندا ئەوپـەڕی کاریگەریی ئەنجام داوە ، بەجۆرێك کە ئەو کاریگەرییە لە بـەڕێوەبردنی چیاکان، یـان پارچـە پارچـەکردنی زەویـی ، یـان وت‌وویـژ کـردن لەگـەڵ مـردووان ، یـان زیندووکردنەوەی ئەو جەستانەی کە هەزارەها ساڵە رزیون ، کەمتر سەیر نیە.

هـەموو هاوەڵێـك لـە جیهـانی دڵ و رۆحدا پاڵـەوان بـوو و ، کۆمـەڵگای هاوەڵانیش کۆمەڵگایەکی جیاوازی موبارەك بوو کە لە سـایەی خێر و بەرەکـەتی قورئاندا پێ گەیی بوو و ، هاوەڵانیش توانی‌یان بە شێوەیەکی قووڵ و گـەورە کـار بکەنـە سـەر بەشـی گـەورەی جیهـان ، بـە رادەیـەك کـە ئـەو کارەیـان لەلایـەنی قەشەنگیی و لەعادەت‌بەدەرییەوە لە هەڵکێشانی چیاکان لە جێی خۆیاندا ، یـان ئاوی ژیان دەرخواردانی مردووان ، یان بەستنی ئاسمان بە زەوی‌یەوە کـەمتر نیـە. ئیتر کۆمەڵگایەکی تر نەبوو کە بتوانرێ لەگـەڵ ئـەم کۆمـەڵگا ئـاوازەی ئـەماندا بەراورد بکرێت ∴ جا ئەم هاوەڵانە کە بە رۆحی قورئانەوە شێلرابوون و ، بـە پێـی بنـەما ئاسمانی‌یـەکانی دڵ و دەروونیـان پێـك هـاتبوو ، واتـە لـە لایـەنی رۆح و مەعنەویاتـەوە بووبوونـە تـەرجومانی قورئـان ، توانی‌یـان کـارە موسـتەحیلەکان جێبەجێ بکەن و ، بە هۆی قورئانەوە رێی نەمرییان لەبەردەم رۆحە مردووەکاندا کـردەوە و رووی دنیایـان گـۆڕیی و ، هەسـت‌کـردن بـە لـەزەتی جیهـانی رۆحیـان گواستەوە بۆ ئەو کۆمەڵگایانەی کە تێکەڵیان بـوون و ، بوونـە ئاشـنایان و ، ئـەو قوفلانەشیان شکاند کە درابوون لە بیر و فیکرەکان و ، درابـوون لـە دەمـەکان و ، جارێکی تریش مرۆڤیان بۆ ئەو پلە بەرزە بەرز کردەوە کە خوا بەرزی کردەوە بـۆی و، پێی شەرەف‌مەند کرد و ، بۆچوونێکی نوێ و ، تەفسیرێکی نوێیـان بـۆ پلـە و پایەی مرۆڤ لە بوونەوەردا و لە نێو دروست‌کراواندا پێشـکەش کـرد و ، چاویان بڕی‌یـە ئـەو نهێنی‌یـە قووڵـەی کـە لـە نێـوان فەرمانـە تەکوینی‌یـەکان و یاسـا

شەرعی‌یەکان‌دایە ، ئەویش بە شەرح کردن ، روون کردنەوەی مەبەست و کۆتاسنووری دڵ و ئیرادە و هەست و شعوورەکان و ، بە جووڵاندن و بە بڵاوە پێ‌کردنی بنچینە و بناغەکانی ئەو بەها شارراوە نیسبی‌یانەی کە لە رۆحی مرۆڤ دا هەن ؛ بۆ ئەوەی مرۆڤی ئاسایی بەرەو رێی مرۆڤی کامڵ ئاراستە بکەن ، ئیتر ئەوەبوو لەوەدا سەرکەوتنیان بە دەست هێنا کە مرۆڤ وەها لێ بکەن کە لە هەرچیی بە چاوی ئەی‌بینێ ، یان بە هەستەکانی ئەی‌گاتێ ، یان لە دڵەوە هەستی پێ ئەکات ، پەنجەی ئیرادە و توانای بێ‌کۆتایی خوایی ببینێ . واتە پەیوەست کردنی هەموو شتێك و گێڕانەوەی بۆ لای خاوەنە ئەسڵی‌یەکەی.

ئەگەر ئیمان‌دار بەم پێوەرە بە دڵ و رۆح و هەست و فیکر و عەقڵییەوە پەیوەندیی بە خواوە هەبوو ، ئەوا بە تەواوەتیی لە رووکەشیی پەیوەست بوون بە لاشە و داواکاری‌یەکانیەوە دوور ئەکەوێتەوە و ، لە گۆشەیەکی ترەوە سەیری ژیان ئەکات و ، بۆیشی دەر ئەکەوێت کە تام و چێژێکی تری هەیە ، واتە لەوەی کە لەو دیوی ئاسۆی ئەم ژیانەوەیە ئاگادار ئەبێت . جا ئەم جۆرە پیاوەی حەقیقەت بە چاوی سەر و بە چاوی دڵیش ئەبینێت کە هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا ئالای خوایی بە سەریەوە ئەشەکێتەوە و ، دەستی قودرەتیش کاری تێدا ئەکات ، بۆیە هەست بە لەرزەیەك ئەکات و ، هەست و ئەستی هیوا و نزیکیی لەگەڵ شەرم و ترس و لەرزدا لە دەروونی‌دا تێکەڵ ئەبن و ، لەگەڵ ئەوەش‌دا کە لە دنیادا ئەژیی، وەها هەست ئەکات کەوا بەسەر بەرزی‌یەك لە بەرزی‌یەکانی ئاخیرەتەوە.. کاتێك کە هەناسەیەك هەڵ ئەمژێت هەست بە هیوا و چاوەڕوانیی ئەکات و، کاتێکیش کە هەناسەکە ئەداتەوە هەست بە ترس و سام ئەکات و ، هەمیشە لەو مەیدانەدا کە قورئان نەخشەی کێشاوە هات و چۆ ئەکات و ، لە سایە و سێبەری قورئاندا ئەژیت .

روون‌کردنەی قورئان لەم چوارچێوەیەدا بە نموونە پێویستیی بە چەندین بەرگ هەیە ، کەچیی ئەوەی کە لەم کتێبە بچکۆلەدا هەوڵمان دا پێشکەشی بکەین،

بریتی‌یه له گوڵچنێکی وەڵامی سەر پێی بۆ ئەو پرسیارانەی کە لە کۆڕ و دانیشتنی جۆرا و جۆردا و بە پێی موناسەبەتیان خراونەتە روو . لێرەدا ئەوەش ناشارینەوە کە ئەم وەڵامانە لە دەمی کەسێك دەرچوون لە شەرح کردنەکانی‌دا هەموو بیر و هەستەکان کز ئەبن هەرچەندە قەشەنگ و بڵند بن .

بڕوام وەهایە کە لەوانەیە زۆرێك لە حەقیقەتە ئاسمانی‌یەکان لێرەدا پۆشاکێکی زەمینی‌یان پۆشیبێ بێت . لەبەر ئەوە هەر کەسێك بڕیاری دابێت چەند سەعاتێك لەگەڵ قورئان‌دا بەسەر بەرێت ، ئەویش بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە ، ئەوا لە سەری پێویستە ئەوە بەرچاو بگرێت ، تا لە زەینیا هەیبەتی قورئان لەرزەی پێ نەکەوێت . لەگەڵ ئەوەش‌دا کە ئەم کار و رەنجە هەوڵی بۆ کارێکی موستەحیل داوە ، چونکە لە هەوڵی شەرح‌کردنی دەریا بە یەك دڵۆپە ئەچێت ، یان لە پیشان دانی خۆر بە یەك ئەتۆم ئەچێت . بەڵام ئێمە ئەڵێین : ئاوازی شمشاڵێك لەلایەن شوانێکی مەڕەوە ، هەرچەندە خۆی بە کەم بزانێت ، لەوانەیە لە جیهانی مۆسیقادا جێی خۆی بکاتەوە . لە بەر ئەوە ئاواتەخوازین ئەم چەندە دێرە ـ کە لەوانەیە موسڵمانان تووشی ژانەسەر بکەن ـ لێمان وەربگیرێن .

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴾ .

وصلى الله على سيدنا المقتدى وأصحابه ذوي القدر والتقى .

# سەرەتا

قورئان فەرمایشتی خۆی ناراستەی تێکڕای ئینس و جینن ئەکات. فەرمانیان بەسەردا ئەدات و ، دوورەپەرێزییشیان لێ ئەکات و ، هەندێ شتی حەرامیش ئەخاتە بەردەمیان و ، وتەی ئەوانیش و وتەی شەیتانەکانیش ئەگێڕێتەوە. قورئان لە هەموو ئەمەدا بەردەوام خاوەنی ئیعجازە و ، ئیعجازیی قورئانیش لێرەدا بە تەنیا لە گێڕانەوەدا نیە ، بەڵکو وا لە چۆنیەتیی ئەو گێڕانەوەدا و ، لەو توخمە و وێنە و نەقشانەدا کە بەکاریان ئەهێنێت و هەڵیان ئەبژێرێت . لایەنە ئیعجازییەکەی تریش تیایا ئەوەیە کە ئەو هەواڵانەی ئەیانگێڕێتەوە هەواڵی غەیبیین.

بەڵێ ! پێش هەموو شتێك هەڵبژاردنی توخمەکان و ئامێرەکان لەلایەن قورئانەوە هەڵبژاردنێکی قەشەنگ و لە عادەت بەدەرە . پاشان قورئان ئەم توخم و ئامێرانە لە شێوازێکی جیاوازی خاوەن ئیعجازدا بەکار ئەهێنێ ، کە پێگەیشتنی ، هەتا نزیك بوونەوەش لێی ، لە تواناادا نیە . شێوازێك کە لە وزەی ئینس و جینن بەدەر . بەڵام بۆ ئەوەی ئێمە پەی بەم لایەنە بەرین لە سەرمانە بە شێوەیەکی فراوان و گشتگیر بڕوانینە ئایەتەکانی قورئان و ، بۆ ئەوەش کە ئەم ئیعجازە روون بکەینەوە پێویستە لە سەرمان هەندێ نموونە بە درێژە پێشکەش بکەین :

زۆر جار لە قووڵایی رۆحماندا هەست بە چەندین هەست و شعوور ئەکەین، بەڵام لە دەربڕینیاندا دەستەوسانین . ئا لەو کاتەدا لەژێر ئازاری دەستەوسانییدا ئەناڵێنن و وەك شاعیر ( محمد عاکیف ) ئەڵێین :

ئەگریم و شیوەن ئەکەم ... بەڵام ناتوانم گریان بخرۆشێنم !
هەست بە ئازار ئەکەم ... بەڵام ناتوانم شوێنە هەڵ قرچاوەکانم دەربخەم .
ئای بە دەست دڵی کەڕمەوە ! ... چەند بە دەستیەوە دادمە !

بەڵێ ! کەسانێکی زۆر هەن ، کاتێك کە قسە ئەکەن یا ئەنووسن ، ناتوانن بە وردیی هەستە قووڵەکانیان دەربڕن ، ئیتر دڵیان بە ئازارەکانی ئەو دەستەوسانی‌یەوە ئەپێچنەوە ... ئەو دەستەوسانی‌یەش لەوانەیە بۆ کەسێك کە بەوپەڕی سووك و ئاسانی‌یەوە هەموو شتێك دەربڕێت ڕێژەیی یان ڕەها بێت. لێرەدا لە بەرامبەرەوە ئیعجازی ڕێژەیی یان ڕەهایش دەرئەکەوێت . خۆ ئەگەر ئیعجازی ڕەها ( مطلق ) هەبێت ئەوە بە تەنیا تایبەتە بە قورئانی پیرۆزەوە.

جا ئەگەر لەم گۆشەیەوە قورئان وەربگرین ئەوا ئەتوانین بڵێین : (( ئەگەر قورئان بە زمانی شەیتان ، یان جینن ، یان مەلائیکەت ، یان فیرعەون ، یان نەمروود ، یان شەددادەوە فەرمایشت بکات ، ئەوا ئەو شێوازەی کە لە بەیان و زمانپاراویی‌دا بەکار هاتووە بە تەواویی هی قورئانە و ، ئەم شێوازەش بە پلەیەك لە عادەت بەدەرە کە هەردەم دەرگای بۆ هەموو مەعنا ئیشاریی و هێمایی‌یەکان والآیە و ، بە کەڵکی چەندین تەفسیر دێت و ، ڕوون کردنەوەیەکی تریش نیە کە بتوانێت بەم شێوازە مەبەستی خۆی دەربڕێت و ، بەم وێنە قەشەنگە پڕ ئیعجازەش ئەم جۆرە ئامێر و توخم و وێنانە بە کار بهێنێت )) .

ئەگەر پێتان خۆش بێت ، ئەتوانین لە گۆشەیەکی جیاوازەوە باسەکە وەربگرین:

هەموو ئاخاوتنێك ئاراستەی جیاوازی بەرەو ئەو لە طائیفە پەروەردگاری‌یانە هەیە کە لە مرۆڤ دان ، وەك دڵ و ( سر ) و ( خفي ) و ( أخفى ) ، کە مەبەستی ئەوەیە بەو لەطائیفانە بگات . جا ئەگەر لە لایەنی مەعناوە دژایەتیی لە نێو ئەو پلانەدا هەبوو ، ئەوە بەڵگەیە لەسەر بوونی ناتەواوی‌یەك لەو ئاخاوتنەدا.. جا ئەو ناتەواوی‌یە ـ بە ڕێژەیەکی جیاواز ـ لە هەموو داڕشتنێکی مرۆڤ دا هەیە. بەڵام قورئان لەم جۆرە ناتەواوی‌یە پاك و بێ‌گەردە .

هەروەها لێرەدا شتێکی تریش دێتە کایەوە ، کە ئەویش ئەوەیە ئەگەر ئەو مانایانەی کە بە دڵدا دێن و لە ڕوانگەی ئەندێشە و ( تصور ) و ( ژیری ) یەوە لە بێژەنگ دران و پاڵفتە کران و ، خۆیان پاراست و ، گەیشتنە قۆناغی لەفظ و

زمان پاراویی ئەوە بە ( بەیان ) ێکی نایاب ئەژمێررێت . هەندێ جار بەبێ گۆڕین و ئاڵ و گۆڕ کردن ئاخاوتن توانای بڕینی ئەم پلانەی نیە ، بۆیە لە چوار چێوەی خۆ دواندندا ئەمێنێتەوە و ، هەلی گەیشتن بە قۆناغی لەفظ و دەربڕینی دەرەوەی لە کیس ئەچێت . بەڵام دارشتنی خوای ( علام الغیوب ) ــ کە بە هەموو نهێنیی و شارراوەیەك زانایە ـ بۆ ئەم باسە بێدەنگەی ناو دەروون مەسەلەیەکی ترە کە نامانەوێت بچینە ناویەوە ، چونکە ئێمە لێرەدا ئەمانەوێت تەنها باسی ئاخاوتنی لەفظکراو بکەین :

ئەگەر ئاخاوتن وەك چۆن لە ئەندێشەدا بیری لێ کرایەوە ، توانرا وەهاش دەرببڕرێت ، واتە ئەگەر نیەت و ئیرادەی دەربڕین هاو ئاوازبوون لەگەڵ دەربڕیندا ، ئەوا ئەو جۆرە ئاخاوتنە ئاخاوتنێکی تەواو و کامڵە . بەڵام ئەگەر پێچەوانە بوو ، واتە ئەگەر ( تَصَوُّر ) نەیتوانیی بە شێوەیەکی تەواو ( تَخَیُّل ) بگرێتە باوەش و دەوران دەوری بگرێت ، ئەوا پلەی ئەو دەربڕینە لە دەربڕینی پێشوو کەمترە . ئەگەر مەلەکەی ( تَعَقُّل ) یش نەیتوانیی ئەو مانایانەی کە بۆی دانراون دەربڕێ، مانای وایە هەندێ قووڵایی ( تصور ) و ئەندێشەی لە دەست داوە.

بەم شێوەیە ئەو ئاخاوتنەی کە بە رێژەی ئاستی ئەندێشەی بەرز و بڵند ، کاتێك کە بەم قۆناغ و پلانەدا تێپەڕ ئەکات ، شتی زۆر لە دەست ئەدات ، ئەوە بە ئاخاوتنێکی ناتەواو ئەژمێررێت . بەڵام ئەو ئاخاوتنەی کە ئەتوانێت بە قووڵیی مانا و تێگەیشتن و نیەتی خاوەنەکەی دەرببڕێت ، ئەوە ئاخاوتنی کامڵ و تەواوە و ، تاقە نموونەی قەشەنگیش بۆ ئەم تێر و تەواویە قورئانی پیرۆزە. لەبەر ئەوە پێویستە لە پاراستنی قورئاندا بۆ قووڵیی ئەندێشە و ( تصور ) ، کاتێك کە ئاخاوتن لە هەر بەدیی هێنراوێکەوە ئەگێڕێتەوە ، بەدوای ئەو کەماڵەدا بگەرێین.

هیچ کەسێك ناتوانێت بەم شێوە کەماڵە و ، بەم شێوە قەشەنگیە ، ئەمە بهێنێت . بەڵێ هیچ کەسێك ـ ئیترسا ئینسیی بێت ، یان جینییی ، یان

مەلائیکەت ـ ناتوانێت راوی ئەو مانایانە بکات کە هێشتا وان لە قۆناغی خەیاڵ و نیەتدا ، پاشان بەم کەماڵەوە بیانگوازێتەوە بۆ قۆناغی دەربڕین . واتە ئێمە لە جێبەجێکردنی ئەم پێوانانەدا ، لە ئاخاوتن و ( بەیان ) دا ، هەرگیز سەرکەوتن بە دەست ناهێنین . کەواتە ئەو ( بیان ) ە قورئانی‌یەی کە بە پلەی کەماڵ ئەم پێوانانەی جێبەجێ کردووە ، ( بیان ) ێکە کەسانی تر لە ئاستیا دەستەوسانن ، واتە ئەو ( بیان ) ێکی پڕ ئیعجازی خوایی‌یە .

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ .... ﴾ ( الفاتحة : ٥ )

هەروەك هەموومان ئەزانین و ، هەروەك لە هەموو تەفسیرەكانیشدا هاتووە، كورتەی ناوەرۆكی نوكتەكە لێرەدا كە ( مفعول بە ) پێش خراوە بەم جۆرەیە: خوایە ئێمە تەنها بڕیار لەسەر خوایەتیی تۆ ئەدەین و لە غەیری تۆیش ملكەچیی بۆ هیچ كەس ناكەین و ، تەنها لە لای تۆش ئاسوودەیی و حەسانەوە و دڵدانەوەمان دەستگیر ئەبێ .

نوكتەكەی تریش كە شایانە لێرەدا تۆمار بكرێ ئەمەیە كە لە بریی بەكارهێنانی كرداری (( عَبَدَ )) ی رابوردوو ، شێوەی رانەبوردووی هەمان كردار كە (( نعبدُ )) وە هاتووە . چونكە شێوەی رابوردوو چەند مانایەك ئەگرێتەوە وەك: خوا پەرستییمان كرد ... نوێژمان بەجێ هێنا ... وەها و وەهامان كرد .. واتە هەندێ مانای غرووری تێدایە كە لەگەڵ رۆحی خواپەرستیی و بەندایەتییدا ناگونجێن .

بەڵام لە شێوەی (( نَعبُدُ )) دا هیچ ئاماژەیەك بۆ ئەو جۆرە خراپ تێگەیشتنە نیە ، چونكە كرداری (( نعبد )) ئاماژە بۆ دەستەوسانیی و هەژاریی مرۆڤ ئەكات لە بەردەم حزووری مەزنی خواییدا و ، ئاماژەش بۆ بەردەوامیی زانینی ئەو دەستەوسانییە و ئەو هەژارییە ئەكات و ، ئەشتوانین ئەوەی كە مرۆڤ ئەیەوێ لێرەدا بیڵێ بەم شێوەیە كورتی بكەینەوە :

(( ئەی پەروەردگارم ! ... بڕیارم داوە جگە لە خۆت سەربەستییم بۆ هیچ كەس نەكەمە قوربانیی و ، خۆشم بۆ هیچ كەس زەلیل نەكەم . لەبەر ئەوە بە هەموو دڵێكمەوە ، بە نیەتی بەندایەتیی و زەلیلییەوە روو لە خۆت و لە

دەرگانەت ئەنێم و ، بە دڵێکیشەوە کە پڕ بێ لە تاسەمەندیی و خۆشەویستیی روو لە پەرستن و گوێڕایەڵییت ئەنێم و ، بڕیاریشم داوە لە یاخیی بوون لە فەرمانت و لە هەر شتێك کە تۆ خۆشت نەوێت و لێی رازیی نەبی کەنار بگرم... نیەتم لە کردەوەم گەورتر و چاك ترە و ، لێیشت ئەپاڕێمەوە کە نیەتەکەم بە کردەوە وەربگریت ! کردەوەیەك بە پێی ئەوەی کە نیەتی کردنی دێنم ، نەك بە پێی ئەوەی کە کردوومە ، ئەی پەروەردگارم ! .... ))

پاشان جەخت لەسەر ئەوەش ئەکاتەوە کە ئەم لەم تکا و پاڕانەوەیەیدا بە تەنیا نیە ، بەڵکو ئەڵێ براکانیشی لەم تکا و پاڕانەوەیەیدا لەگەڵیا هاوبەشیی ئەکەن . واتە لێرەدا گومان باشییەکی فراوان و گشتگیر ئەخاتە پێش چاوان و، لە هەمان کاتیشدا پشتگیریی و هاوبەشییەکەیان ئەداتە پاڵ خۆی ، بەمە رێك کەوتن و یەکدەنگییەکی وەها مسۆگەر ئەکات کە ناتوانرێ لەکەدار بکرێ ، لە کاتێکدا کە روو لە دەرگانەی خواوەندی فریادڕەس ئەکات ، ئیتر لە وەسوەسەی شەیتان رزگاری ئەبێت و ، لەبەردەم خوایەتیی کامڵ و رەهادا وێنەیەکی تەواوی بەندایەتییەکی تەواو پێشکەش ئەکات .

﴿ الٓمٓ ۝ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾ ( البقرة : ١ـ ٢ ) .

وشەی (( هدی )) کە لە ئایەتە پیرۆزەکەدایـە ، بـە شـێوازی چـاوگ هـاتووە و، ئەو مانایە هەڵ ئەگرێ کە مرۆڤ ، بەبێ کۆششی تایبەتیی خۆی ، نـاتوانێ بگاتـە هیدایەت و ، ناشتوانێ بگاتە ئەو ئامانجەی کە لێیـەوە چاوەڕوان ئـەکرێت .. بـە دەربڕینێکی تریش ، ئەگەر ئێمـە ( تنـوین ) ەکـەش بەرچـاو بگـرین ئـەوا بۆمـان دەرئەکـەوێ کـە ئـەم کتێبـە ـ کـە تاقـە ئـەتۆمێك شـك و گومـانی تێـدا نیـە ـ سەرچاوەی هیدایەتە بۆ خاوەن تەقواکان .. تـەنها بـۆ خـاوەن تـەقواکان . چـونکە دەروونیــان لــە گومــان و دوودڵیــی پــاك بۆتــەوە و ، دڵ و ڕۆحیشــیان رووی لــە وەرگرتنی حەق و ، ڕەچاوکردنی سوننەتەکانی فیطرەی خوایی و ، شـەریعەتە پـاك و بێگەردەکەی کردووە و ، دەروونیشیان روون بۆتەوە و ، ئامـادەی قبـووڵکردنـی هیدایەت و کەڵك وەرگرتن لێی بووە ، بێئەوەی بیرێك یان بڕیارێکی لەوە و پـێش لەوە قەدەغەیان بکات .

بـەڵام وشـەی (( هـدی )) کـە لـە کۆتـایی ئایـەتی : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ ﴾ دایە ، بە شێوازی چاوگ هاتووە ، واتە لەوانەیە خوای باڵادەست ، بـەبێ بوونی پەیوەندیی ئەو هۆکار و ئەنجامەی کـە بـە دیـی هێنـاوە و ، بـە هۆیـەکانی هیدایەتیشی گێڕاوە ، هیدایەتی خـۆی بـە بەنـدەکانی ببەخشـێت .. جـا دەرگـای تەقواش ئەو دەرگایەیە کە لەسەر ئەو سەخاوەت و بەخشینە ئەخرێتە سەرپشـت و ئەمانگەیەنێت پێی .. پلەی یەکەمی ئەم جۆرە تەقوایـەش بریتـییـە لـە ئیمـان و چاك ناسینی خوا و ، پلەی کۆتاییش بریتییە لـە گەیشـتن بـە ڕەزامەنـدیی خـوای باڵادەست و ، هەروەك لە دەربڕینە کورتەکەی ئایەتەکـەشدا هـاتووە ئـەوا تـەنها

ئەو کەسە رێی سەرفرازیی ئەدۆزێتەوە کە بەم ئاستەی تەقوا گەیشتبێ . پاشان سەرەڕای سیاقی ئایەتەکە و ، وا بەستەبوونی هیدایەتیش بە بەدیی هێنانی خوای بالاّدەستەوە ، ئەوا گەیشتنی مرۆڤ بە ئەمن و ئەمان و ، بە دلّئارامیی لە دنیادا و، بە سەرکەوتنی رۆژی قیامەت ، تا رادەیەکی زۆر ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەلّس وکەوتەی بە ویستی ئازادی ئەنجامی ئەدات .

کەواتە ئەتوانین بە کورتە بلّێین کە وشەی (( الهدی )) ی یەکەم هۆکارە و، وشەی (( الهدی )) ی دووهەمیش ئەنجامێکە کە لە بۆن خۆشیی نەرم و نیانیی و ئیحسان هەلّ کێشراوە و ، هەردووکیشیان وەلاّم دانەوە و گیراکردنی دوعای (( إهدنا )) ن کە لە سوورەتی (( الفاتحة )) دا هاتووە و ، روون کردنەوەیەکیشن بۆ چۆنیەتیی رێگرتنە بەری ئەوانەی کە وان بەسەر رێی راستەوە .



﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ﴾ ( البقرة : ١٠ ) .

لە هەندێ تەفسیردا وەها هاتووە کە ﴿ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ﴾ لە بابەتی (( الجزاء من جنس العمل )) ە . بەلاّم من وەهای ئەبینم کە چاکتر وەهایە بەم شێوەیە لە مانای ئایەتەکە بچینە پێشەوە :

خوای گەورە دلّیانی زیاتر نەخۆش خستووە ، چونکە ئەوانە لە ئاستی نیەتدا بە خراپکاریی و لە خوایاخیی بوون چەپەلّ بوون و ، هەرچیی هەلّێکیشیان بۆ هەلّ کەوتبێ هەولّیان داوە ئەو نیەتە خراپانەیان جێ بەجێ بکەن و ، هەتا هۆکارەکانیش زیاتر بوو بن ، ئەنجامەکانیش زیادیان کردووە . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە چوونەتە ناو ئەلّقەیەکی بۆشەوە . واتە ئەوان نەیان توانیوە دلّەکانیان لەم نیەتە خراپانە رزگار بکەن ، بگرە بە هیچ شێوەیەك بیریان لەمە

نـەکردەوە . جـا ئـەم نیەتـە خراپانـە نیـەتی خراپـی تریـان لێ کەوتنـەوە . ئـەو کردەوانەش کە لەسەر ئەم نیەتانە بینا کران کرەوەی تریان بەرهەم هێنـان و لێیـان کەوتنەوە ، بە چـوونە نـاوی ئـەم جۆرە ئەڵقـە بۆشـەوە مونافیقـەکان تیاچـوون .
کەواتە کاتێك کە تەفسیری ئایەتی ﴿ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ﴾ ئەکـەین ، لەسـەرمان پێویستە ماناکەی بـە شـێوەی ئـەنجامێکی سروشـتیی بـۆ چـوونە نـاو ئـەم ئەڵقـە بۆشەوە سەیر بکەن .

لەش ساغیی بناغە و یاسایە و ، نەخۆشییش شتێکی لابەلاییە . بە هـەمان شێوە فیطرەی ساغ بناغەیە و ، نەخۆشیی دڵیش لاوەکییـە . لەبـەر ئەمـە هـەر کەس گرنگیی بە دروستیی دڵی و ، پاراستنی و ، ئامـادەکردنی هـەموو مەرجـە مەعنەوییەکانی پاراسـتنی نـەدات ، ئـەوا ئـەو پارچـە ناسـکە خواییـە ئەکاتـە پارووییەکی چەور بۆ ڤایرۆس و میکرۆبەکان . لەگەڵ ئەوەدا کـە لەوانەیـە سـەرەتا شـتێکی بچـووك بێـت ، هـەنگاونان لـە هەڵەیەکـەوە بـۆ یـەکێکی تـر و ، لـە تاوانێکەوە بۆ تاوانێکی تر و ، لە یاخیی بوونێکەوە بۆ یەکێکی تر ، لە کۆتاییدا ئەبێتە هـۆی کرانـەوەی گۆشـەکە و ، ڕوودانـی تـاوانی وەهـا گـەورە کـە لـە ژوور بیرکردنەوەوە بن . واتە ئەبێتە مایەی ڕوودانی یاخییبوونە گـەورەکان کـە بـریتیین لـە شـەریك بـۆ خـوا دانـان ، چـونکە چـەندین ڕێ هـەن ، کـە بـەرەو کـوفر سـەر ئەکێشن.

ئەگەر بەرباد بوونی عەقیدە ، یان تلانەوە لـە نێـو گومـان و دوو دڵییـەکاندا نەخۆشیی مونافیقان بێت ، لە هەمان کاتدا مانای وەهایـە کـە کـوفر و ئیلحـاد لێهاتنێکی شارراوەیان هەیە . جا ئەگەر چاودێریی خوایی فریای ئەم نەخۆشـییە نەکەوێت و ، ئەو ئەڵقانە نەشـکێنێ کـە گەیەنـەری کـردەوە یاخییبوونـەکانن بـە کوفر ، ئەوا کردەوە یاخییبوونەکان ، بەوەی کـە بـە چـەندین قـات زیـاد ئەکـەن، لەوانەیە ببنە مایەی کافرکردن . بگـرە هەنـدێ جـار ئـەوە ڕوو ئـەدات کـە کـاتێ مرۆڤ گومان و دوو دڵیی دەورەی لێ ئەدەن ، لەوانەیە ببێتـە هۆیـەك بـۆ پچڕانی

هێڵی گەیەنەری نێوان خۆی و خوا ، بەمەش گومان لە هەموو شتێك زیاد ئەکات و، وەهاشی لە قەڵەم ئەدا کە ئەو و هەموو خەڵکیی لەم گومانەدا یەکسانن ، ئیتر لە کەش و هەوای ئەم گومانەدا چەند قات چەند قات ئەتلێتەوە . کاتێك کە دەربارەی ئەو هێڵەی بە خوای ئەگەیەنێت گومان و دوودڵیی دەورەی لێ ئەدەن و، بەرامبەر بە هەموو شتێك گومانی ئەبێت و ، شتانیش ـ بە پێوانەی خۆی ـ لە قەڵەم ئەدات ، ئەوا لە گومان و دوو دڵیی و ڕاڕایی ، لە ئاستی ئیلحاددا ، ئەتلێتەوە .. خۆی وەها ئەژیت و ، وەها وەهمیش ئەبات کە کەسانی تریش وەك خۆی بێ‌ئیمان و بێ‌گوێڕایەڵیین و ، ناگونجێ متمانەیان پێ بکرێ ، یان پشتیان پێ ببەسترێ ... واتە لە جیهانێکدا ئەژیی کە ئەندێشە و وەهمە نەخۆشەکەی دروستیان کردووە و ، سەرەنجامیش لە ژێر باری ئەو نەخۆشی‌یانەدا ورد و خاش ئەبێت .

* * *

﴿ مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسۡتَوۡقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبۡصِرُونَ ﴾ ( البقرة : ١٧ ) .

ئەم ئایەتە پیرۆزە بە نموونەیەکی دیار و بینراو جیهانی ناوەوە ئەخاتە بەر چاوان.

جا لەبەر ئەوەی کە مونافیقان لە ناو موسڵماناندا ئەژین و لەگەڵیان تێکەڵ ئەبن ، هەندێ جار تروسکەیەکی نووری ئیمانیان بە ئاسانیی ئەگاتێ ، بەڵام ئەو نیفاقەی چوو بووە ناو دڵ و مێشکیانەوە لە کەڵك وەرگرتن لەو نوورە قەدەغەی ئەکردن .

بەڵێ ! ئەو مونافیقانە لەگەڵ ئەوەدا کە چاویان کراونەتەوە کەوتوونەتە باروودۆخێکەوە هیچ نابینن ، ئەویش یان بە هۆی بایەخ نەدانیان بەو مەشخەڵەی کە پێغەمبەری بەڕێز ﷺ بە دەستیەوە بەرزی کردبوەوە ، یان بە سووك سەیر کردنی ، یان بە هۆی بەربادکردنی لێ هاتوویی‌یە فیطرییەکانی خۆیان . بەلام ئەوان لەگەڵ ئەوەش‌دا نووری ئەو مەشخەڵەی کە خەریکە چاویان ببات روو بە روویان ئەڕوات و ، ئەوانیش لە بریی ئەوەی بە چاوی ئیمانەوە سەیری بکەن ، ئەبینین دەست ئەدەنە گومان و ڕاڕایی ، تا ئەو هێزەی کە لە ڕۆحیانەوە سەری هەڵ داوە بێلایەنی بکەن و، کاریگەرییەکەی نەهێلن . هەتا وشەی (( استوقد )) ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە ئەو مونافیقانە خەریکی نەخشەدانان بوون بۆ چۆنیەتیی گێڕانی ئەو نوورە بە ئاگرێکی سووتێنەر ، لە بریی ئەوەی بۆ ڕێگا بڕین کەلکی لێ وەربگیرێ ..

بەلام کافران هەرگیز شارەزای ئیمان و ئەو نوورەش نەبوون کە لێیەوە دێتە دەرەوە .. هەرگیز نەیاندیوە و نەش‌چوونەتە ناو کەش و هەوا پیرۆزەکەیەوە. لەبەر ئەمە کاتێ کە کافران ـ بە هەر هۆیەك بوو ـ لە ویژدانیاندا هەستیان بەم نوورە کرد ـ بێجگە لەوانەیان کە عینادی‌یان ئەکرد ـ ، هەوڵیان دا دەستی پێوە بگرن و، پاشماوەی تەمەنیان بە وێنەی ئیمانداری موخلیص بەسەر بەرن . بێگومان جیاوازیی نێوان نوور و تاریکیی و ، ئیمان و کوفر لەمەدا دەورێکی گەورەی هەیە .. جا ئەوانەی کە لەوەوپێش شتانی تریان بینیبوو ، کە ئەم نوورەیان بینیی هاتنە ناو جیهانێکی نوێوە ... جیهانێك کە جوانیی و هێزی راکێشانی ئیسلام دەورەی دابێ . بۆ ئەمە کاتێك کە بەراوردی دین‌داریی ئەوانەی کە هەواڵی ئیسلام ئەبیستن و ، بۆ یەکەم جار لێی شارەزا ئەبن و ، ئیمانی پێ ئەهێنن و ، بە پێی ئەو ئەژین ، لەگەڵ دین‌داریی ئەو موسڵمانانەی کە لە وڵاتە ئیسلامی‌یەکان‌دا لە دایك بوون ـ کەمێکیان نەبن ـ بە شێوەیەکی روون تر لە ڕاستیی ئەوەی کە لە سەرەوە وتمان تێ ئەگەین ..

❊ ❊ ❊

﴿ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴾ ( البقرة : ١٨ ) .

﴿ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ ( البقرة : ١٧١ ) .

یەکێك لە دوو ئایەتەکە پەیوەندیی بە مونافیقانەوە هەیە و ، ئەوی تریشیان بە کافرانەوە و ، هەر وەکو لێرەدا ئەبینرێت لە بابەتی دەمارگیریی و بەرگەنەگرتن و نەرم و نیان نەبوونیاندا ، هەروەها لە گۆشەی سەیرکردن و بیر کردنەوەی نارەوادا ، بەشکەرێکی ناوکۆیی ( قاسم مشترك ) لە نێوان مونافیقان و کافراندا هەیە . لەبەر ئەوە هەردوو لایەنەکە وەها وەصف ئەکرێن کە کەڕ و لاڵ و کوێرن . بەلاّم بە پێی ئەم دوو ئایەتە هۆیەکانی گومڕابوونی هەردوو دەستەکە جیاوازن . ئەوەتا لە ئایەتی یەکەمدا هۆیەکە بۆ ئەوە ئەچێت کە ئەوانە نەگەڕاونەتەوە سەر فیترەتی بنەڕەتیی رابوردووی خۆیان . بەلاّم لە ئایەتەکەی تردا هۆیەکەی بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە کە ئەوانە عەقڵ و ژیریی خۆیانیان بە کار نەهێناوە .

ئەو بنچینە هاوبەشەش کە بە کەڕ و لاڵ و کوێریان ئەگێڕێ ئەوەیە بە خوێندنەوەی ئەو کتێبەی بوونەوەر کە لە بەرچاویاندا ، بە وێنەی پێشانگایەکی خوایی سەرسوڕمێن ، دانراوە بەدیهێنەریان ( جل شأنه ) نەدۆزییەوە و نەناسیی و .. ئەم کتێبەشیان بە چاکیی هەڵ نەسەنگاند و ، بە وردییش لە دەوروبەر و رووداوەکانیان نەکۆڵییەوە و ، دیراسەیان نەکردن و ، پەند و ئامۆژگارییان لێ وەرنەگرتن و ، گوێیشیان بۆ کتێبە ئاسمانییەکان و ، بۆ دەنگی ویژدانیان نەگرت .

خۆ ئەگەر ئەوان ئەوەیان ئەنجام بدایە ، ئەوا وەك ئیماندارەکان بە خێرایی شەهادەتیان بە (( لا إله إلا الله )) ئەدا . واتە عەقڵ و ژیریی خۆیانیان بە کار ئەهێنا و ، ئەگەڕانەوە سەر فیطرەتی ئەسڵیی خۆیان و ، ژیانیان بە پێی دەستوور و یاسای خوایی و ، بە پێی فەرمان و قەدەغەکانی ئەو بەسەر ئەبرد .

بەڵێ ، ئەوانە کەڕن، چونکە ناتوانن دەنگی هەموو شتێك ببیستن لە کاتێکدا کە هەر یەك لەوانە بە زمانی تایبەتیی خۆی خەریکی تەسبیح و تەمجیدی خوای باڵادەستە .. هەروەها ئەوانە لاڵن ، چونکە ناتوانن باسی ئەو شتە بکەن کە لە قوڵایی ویژدانیاندا هەستی پێ ئەکەن و ، ناشتوانن دەری ببڕن .. هەروەها کوێرن، چونکە ئەو ڕێ و ڕچانە نابینن کە بەڵگەن بۆ بوون و تاك و تەنیایی خوای باڵادەست.

ئەگەر بێینە سەر پوختەی ئایەتەکە ئەبینین وەسفی کافرەکان وەها ئەکات کە لە عەقڵ و ژیریی بێبەشن . واتە عەقڵیان بە کار ناهێنن و ، بیر ناکەنەوە . هەر وایشە ، چونکە ئەگەر توانای بیرکردنەوەیان ببوایە ، یان ئەگەر بیریان بکردایەتەوە ئەوا بەوپەڕی ئاسانی‌یەوە ئەیانتوانی ئەو ڕێیانە بدۆزنەوە کە مرۆڤ بەرەو ئیمان ئەبەن . ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەو کافرە عیناد و یاخی‌یانەی کە بە درێژایی چەندین ساڵ لە مەککەدا ئازاری پێغەمبەری بەڕێز ﷺ و هاوەڵەکانیان دا و ، سزایان پێ چەشتن ، کە دوای پەیمانی حودەیبییە ، لەو کەش و هەوا هێمنەدا چاکتر موسڵمانەکانیان ناسیین ، وازیان لەو عینادە کۆنە و، سەیرکردنە وشکە کۆنەیان هێنا و بۆیان دەرکەوت کە ئەوان لە هەڵەیەکی گەورەدا بوون .. لەبەر ئەوە روویان کردە حەق . بەڵێ گەیشتنی کافران بەم خاڵە گرنگە بەستراوە بە بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندنەوە . بۆیە ئەبینین قورئانی پیرۆز لەم بارەوە کارەکەیان کورت ئەکاتەوە و ئەفەرموێ : ئەوانە لە عەقڵ و ژیریی بێبەشن.

بەڵام ئەو مونافیقانەی کە قورئان دەربارەیان فەرموویە : ﴿ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَـٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَـٰٓؤُلَآءِ ﴾ ( النساء : ١٤٣ ) ، واتە لە نێوان کافران و ئیمانداران ڕاڕا و دوودڵن ... جارێك ئەیانبینیی لێرەن و ، جارێکیش ئەیان بینیی لەوێن . گیرۆدەی دەستی بێبەش بوونیانن لە ڕۆشنایی چاوەکانیان و

رۆشنایی هەست و پەی پێبردنیان . پاشان ئەمانە لەبەر ئەوەی کە وەهای لە قەڵەم ئەدەن کە ژیان تەنها بریتی‌یە لەم ژیانی دنیایە و ، ئەیان بینیی وا تووشی نەخۆشیی هەڵپەکردن بۆ لەزەت و خۆشی‌یەکانی ئەم دنیایە بوون . لەبەر ئەوە ئیمان و کوفر بە لای ئەوانەوە یەکسانە .. لە هەرکوێ رابواردن و ژیانی نەرم و خۆش گوزەرانیی هەبوو ئەچن بە دەمیەوە و ، کاتێکیش بزانن بەرژەوەندی‌یان وا لە هاتوچۆی مزگەوتدا ، هاتوچۆی ئەکەن . بەلام ﴿ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ ﴾ ( النساء : ١٤٢ ) ، واتە : بە تەمەڵیی هەڵ ئەستن بۆ نوێژ و لەبەردەمی خەڵكدا ریایی ئەکەن ، واتە : بە مانایەك لە ماناکان لەسەر شارێی ئیسلام بەردەوامیی بە ژیانیان ئەدەن و ، لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ شوێنی خۆیان ئەکەنەوە ، بەلام بە چاوێکی کوێری نابینا و ، بە دڵێکی تاریك و ، بە فیکرێکی خاڵیی لە ئیمان و لە راستگۆیی و ئیخلاص. واتە نوشستیی گەورە و بەدبەختیی ئەوان لە بێ‌ئیخلاصی‌یاندا حەشار دراون. بەم شێوەیە دەرهەق بە هاو وێنەی ئەوانە قورئانی پیرۆز دەستەواژەی (( لا يرجعون )) بە کار ئەهێنێ ، واتە ناگەڕێنەوە بۆ لای حەق و حەقیقەت و ، ناشگەڕێنەوە بۆ سەر فیترەتی رێك و پێکی بەدیی‌هێنانیان . جا لەم روانگەیەوە لەو وەسفانەیاندا کە لە سوورەتی ( المنافقون ) دا هاتوون ئەبینین کە ئەوانە (( لا يعلمون )) و (( لا يفقهون )) ، واتە نازانن و تێ ناگەن . ئیتر دەربارەیان وەسفی وەك (( لا يتفكرون)) ، واتە لە ژیریی بێبەشن و بیر ناکەنەوە ، نەهاتوون چونکە ئەو وەسفانە پەیوەندی‌یان بە بێ‌ئیمانی‌یەوە هەیە .



﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا ۙ قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا ۖ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ ( البقرة : ٢٥ ) .

ئایەتی ﴿ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا ﴾ ئاماژە بۆ لێك چوونێك ئەكات لە گۆشەی بە دەست هێنانی نیعمەت و پێشکەشی‌یەکانەوە و ، بە پێی لێك چواندنی مامۆستا سەعیدی نوورسییش ئەگونجێ ئەو نیعمەتە لێك چوانە لە ناز و نیعمەتەکانی دنیا بن ، یان لە ناز و نیعمەتەکانی قیامەت بن . بۆ نموونە : لەم دنیادا مرۆڤ سوپاس گوزاریی دەرئەبڕێ ، واتە ئەڵێت : (( الحمد لله )) ، ئیتر ئەو سوپاس‌کردنە لە قیامەت‌دا بە شێوەی بەروبوومێك ئەبینێتەوە . واتە هەموو تەکبیر و تەسبیح و تەهلیلێك لێرە لە بریی تۆو و ناوکی پژاو و لە ناو خۆڵدا چێنراو وەهان کە لە بەهەشت‌دا ناز و نیعمەتی جۆراوجۆر بەرهەم دێنێ .. بەلاّم پێویستە لەو بارەوە ئاماژە بۆ شتێکی گرنگ بکرێ ، کە ئەویش ئەوەیە ئێمە بە تەواویی پەیوەندیی نێوان ئەو دوو شتە نازانین .

لە راستیی‌دا ئێمە لە ناو بازنەی هۆکارەکان‌دا سەیری هەموو شتێك ئەکەین، بۆیە کاتێك کە شیکار و ناوێتەکاری فیکریی ئەنجام ئەدەین لە ژێر کاریگەریی هۆکارەکان‌دا ئەبین . ئەوەندە هەیە کە چەندین کار هەن لەم جیهانی هۆکارانەدا روو ئەدەن ، ئەویش بە جۆرێك کە ئەو حەقیقەتەی ئەم ئایەتە باسی ئەکات ، بە هەموو هێزێکەوە ، لە بەرچاومان ، دەر ئەخەن .

بۆ نموونە : تا ئێستە هیچ کەس لە کێڵگەیەك‌دا کە گەنمی تێدا چاندبێ درەوی جۆی نەکردووە ، هەر چەندە لە یەك جۆرن و ، لە درەختی سێویش هەرمێ و، هەنجیریش لە داری مێو لێ ناکەینەوە .

پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ ئەهات ، کەچیی لە کاتێك‌دا کە پێغەمبەر ﷺ لەوە ئەگەیشت کە جیبریل سەلامی لێ بێ ئەی فەرموو ، ئەوانەی لە نزیکی‌دا بوون

هیچیان نەنەبیست ، هەتا وەك گیزەی هەنگیشیان نەنەبیست . هەروەها دابەزینی خوای بالادەست لە دوای سێیەکی شەودا بۆ ئاسمانی دنیا و ... صەدان کاریتر... ئایا ئەتوانین بلێین ئێمە ئەم جۆرە کارانە لە چوارچێوەی (( هۆکار ـ ئەنجام )) دا تێ ئەگەین ؟

بەڵێ وەك ئیمام غەزالیی فەرموویە : ئێمە ناتوانین بە عەقڵە دنیاییەکانمان ، واتە بە (( عەقڵی ژیان و گوزەران )) ـ واتە بەو عەقڵانەی کە بۆ ژیانمان بە کاریان ئەهێنین ـ بە جوانیی لەم جۆرە کارانە تێ بگەین کە پەیوەندییان بە قیامەتەوە هەیە .. بەڵام کە لە قیامەتدا بە (( عەقڵی زیندووبوونەوە )) تفاقمان پێ ئەدرێ، ئەو کاتە ئەتوانین لە پەیوەندیی نێوان وتنی (( سبحان الله )) و وەرگرتنی بەروبوومێکی بەهەشت تێ بگەین ، چونکە لەوێ هەموو شتێك بە پێی یاسای غەیبیی و میتافیزیکیی بەڕێوە ئەچێت و ، بەوپەڕی روونییشەوە پەیوەندیی هۆکاریی نێوان ئەو خەڵات و نیعمەتانەی کە لەوێ هەن و کارکردنی ئێرە ئەبینین و تێ ئەگەین .

بەڵێ ... ئەو یاسا فیزیاوییانەی کە لێرە هەن لەوێ کاریان پێ ناکرێ . بۆ نموونە : پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ : نوێژەکانمان لە قەبردا ئەبنە هاودەم و هاو کۆڕ و دۆستمان و ، مرۆڤیش لە هەر هەشت دەرگا جیاوازەکانی بەهەشتەوە ئەچێتە ناو بەهەشتەوە و ، قورئانیش ئەبێتە تکاکار بۆ ئەو کەسەی کە ئەیخوێنێ ..

با ئێستاش بچینە خزمەت ئایەتەکە ... ( فخرالدين الرازي ) ئەڵێت : ئەم نموونانە لە قورئانی پیرۆزدا بۆیە ئەهێنرێنەوە تا بە شێوەیەکی چاکتر لە مەسەلەکان تێ بگەین و ، لێرەدا شتێکی دوور و نەگونجاو نیە . بەڵام ماهیەتی راستەقینەی هەر شتێك بە هەموو هێڵ و وردەکارییە راستەقینەکانیەوە لەوێ دەر ئەکەوێ . ئەو کاتەش ئیمانداران خاوەن کردەوە چاکەکان ئەڵێن : (( ئێمە ئەمەمان لە دنیادا بینیوە )) یان (( پێش کەمێك لە بەهەشتدا بینیومانە )) .

بەڵێ ، هەر نیعمـەتێك بگـری یـان ئـەوەتا پاداشـتی کردەوەیەکـە ، یـان لێـك چوونی ئەو پاداشتەیە . یان ناز و نیعمەتە هەتا هەتاییەکانی ئەویّ گوڵـە گـەنمی بۆ تۆوی کردەوە چاکەکانی ئێرە . کەواتە بەم رەچاوکردنی هەردووکیان لە گۆشەی ناوەوە لەیەك ئەچن . بەڵام بە رەچاوکردنی میانـەکانی ( أبعـاد ) بەهەشـت ئـەوا جیاوازییەکی زۆر لە نێوان هەردووکیاندا هەیە کە دنیا ئەگرێت و لێیشی زیـادە، چونکە یەکێکیان بەروبوومی حیکمەتە و ئـەوی تریشـیان بـەروبوومی قودرەتـە.[1] یەکێکیان سیفەتی هەتا هەتایی هەڵ گرتووە و ئەوی تریشیان کـاتیی و تیاچـووە. یـەکێکیان دارای میانـەی چـێژی هـەتا هەتاییـە و ئـەوی تریشـیان میانـەی جەستەیی . یەکێکیان بە پلەی (( عين اليقين )) ئیحسانە و ، ئـەوی تریشـیان لـە چڵەپۆپەی (( حق اليقين )) دا میهرەبانیی رەحمانییە .



﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ ﴾ ( البقرة : ٣٠ ) .

مەلائیکەت ئەمەیان ( واتـە جێنشـینییەتیی ئـادەم و خراپکـاریی نـەوەکانی لەسەر زەوییدا ) بەو زانستە تایبەتییە زانیی کە پێیـان بەخشـرا بـوو . ئەمـەش ئەوە ئەگەیەنێ ـ تا رادەیەك ـ ئاگاداری ( لوح المحو والإثبات ) بوون .. جـا لـە زانسـتی خـوایشدا ئـەوە نیـە دەربـارەی ( الأول ) زانیارییـەك هـەبێ ، پاشـان دەربارەی ( الآخر ) یش یەکێ هەبێ . یان دەربارەی کۆرپەلە زانیارییەك هـەبێ ، پاشان دەربارەی مرۆڤی تەواویش یەکێ هەبێ . یان دەربارەی ئـەلیکترۆن و پاشـان

---

[1] چونکە دنیا خانەی حیکمەتە و ، قیامەتیش خانەی قودرەتە . ( وەرگێڕی عەرەبیی )

دەربارەی ناوکیش ... تد ، چونکە زانستی خوایی لە یەك کاتدا زانستێکی دەورانگیرە بە هەموو شتێك . لەبەر ئەوە کاتێك کە لە باسی وەرگرتنی پەیمان و بەڵێندا ئەڵێین : خوای گەورە پەیمان و بەڵێنی لە جیهانی رۆحەکاندا ، یان لە رەحەمی دایكدا لە مرۆڤ وەرگرتووە ، ئەوە قسەیەکی راستە بەلاّم ناتەواو و سنووردارە و ، لەوانەیە چاکتر وەها بوایە بوترایە : هێشتا هەر خەریکی وەرگرتنە، چونکە جیهانەکەمان هەموو ساتێك لە گۆڕاندایە . بەلاّم بە نیسبەتی حەق تەعالاوە ئاڵ و گۆڕ بۆ ئەو لە ئارادا نیە . لە راستییشدا فەرمایشتی ( جَدِّدُوا إِيمَانَكُم بِـ (( لا إله إلا الله )) ) ، واتە بە وتنی ( لا إلـه إلا الله ) ئیمانتان نوێ بکەنەوە ، مەگەر کاتێك بتوانین لێی تێ بگەین ، کە لە بیری وەرگرتنی ئەو پەیمان و بەڵێنە تێ گەیشتبین کە وا لەناو ئەم زانستە دەورانگیرەدا بەوەی کە لەوەو پێش رووی داوە و ، بەوەش کە ئێستە روو ئەدات و ، بەوەش کە لە ئایندەدا روو ئەدات .

ئێستا با جارێکی تر بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان .

مەلائیکەت لە ( لوح المحو و الإثبات ) ەوە لەوە ئاگادار بوو بوون کە مرۆڤ لەسەر زەویـیدا فەساد بلاّو ئەکاتەوە و ، خوێنڕێژیی ئەکات ، بۆیە ئەم پرسیارەیان ئاراستەی خوا کرد . هەر وەك کاتێ کە تووشی چەند مرۆڤێکی خراپ ئەبین ئەڵێین : داخۆ خوا ئەمانە و هاووێنەیانی بۆچ بەدیی هێناوە ؟

لەوانەشە مەلائیکەتەکان ئاگاداری ئەوە نەبووبن و نەیانزانیبێ کە لە نەوەی ئادەم و پێغەمبەر و ئەصفیا و ئەولیاکان پەیدا ئەبن ، (( ئەوانەی کە بە خۆر و تۆوی مرۆڤایەتیی ئەژمێررێن )) . ئەی لەبەر ئەوە خوای بالاّدەست لە وەلاّمی ئەواندا نەیفەرموو : ﴿ إِنِّيَ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ ؟ فەرمووی : ئەوەی من ئەیزانم ئێوە نایزانن .

ئەم جۆرە جێنشینییەی کە پێشکەش بە مرۆڤ کراوە ، هەر وەك ئەگونجێ بیرێتە سەر ئەوە کە خوای بالاّدەست مافی دەست تێوەردانی بە رێژەیەك و بە

ئەندازەیەك بۆ هەموو لایەنەکانی بوون و رووداوەکان بە مرۆڤ بەخشیوە، هەروەها ئەشگونجێ ببرێتە سەر ئەوە و ، وەها تەفسیر بکرێ کە مرۆڤ لە دیاریی‌کردن و کارتێ‌کردنە سەر پەیوەندی‌یەکانی نێوان خەڵك و نێوان ئوممەتان دەوری هەیە.

جا ئەم جۆرە پەسەندێتیی ( إمتیاز ) و پێشکەشی‌یە مانای وایە رێ بە مرۆڤ دراوە تا لە بریی خوا و ، بە ناوی ئەو و ، جێگریی ئەوەوە کار بکات و دەستیشی بەسەر هەموو ئەو شتانەدا بڕوا دەستی ئەیان‌گاتێ .. ئەو کاتە مرۆڤ ئەبێتە ئامێرێك لە کاری بە زێڕکردنی کێتبی بوونەوەردا و ، ئەبێتە باخەوانێك لە باخچەی گۆی زەویی‌دا و ، ئەشبێتە کرێکارێك ، لە ژێر رابەرایەتیی خۆیدا، بۆ هەموو کاروبارێکی دنیا . بەمە هەر رایەك یان فیکرێك وەهای بگەیەنێ کە مرۆڤ خاوەنی راستەقینەی تاقە شتێکە بە لە سنوور دەرچوون و نەزانیی ئەژمێررێ.

لەبەر ئەوە ئەبینین خوای باڵادەست لە بری : ﴿ إني خالق ﴾ ئەفەرموێ : ﴿ إِنِّي جَاعِلٌ ﴾ ، واتە خوای گەورە لە باسی بەدیی‌هێنانی یەکەم جاردا ، کاری بەدیی‌هێنانی بە زاتی خۆی ئەنجام نەداوە ، بەڵکو لە لایەن سیفاتەکانیەوە . واتە گێڕانی بە جێ‌نشینی بینا و شێوەکاریی لە پلەی دووهەم‌دا ئەسڵیی نەبووە ، بەڵکو بە جێ‌گریی وەك چاودێر و پەرشتیار بووە ، واتە ئەو ئەم جێ‌نشینی‌یەی وەك سروشتێکی سەرەتایی لە بەدیی‌هێنانی‌دا پێ نەسپێرراوە ، بەڵکو وەك سیفەتێك پێی سپێرراوە کە لەو کەسەدا هەبێت کە مەرجەکانی ئەم جێ‌نشینیەتیەی سەرزەویی لە خۆیدا دێنێتە دیی . لەوانەیە یەکێك لەو کارانەی کە لە پشتی پرسیارکردنی (( یان راست تر بڵێین داواکردنی زانیاریی )) مەلائیکەتەکانەوەن ، بریتیی بێت لە ترسی تێکەڵ‌بوونی ئەو کارانەی کە بە جێگریی ئەنجام ئەدرێن بەو کارانەی کە بە ئەسڵیی ئەنجام ئەدرێن . ئەمەش وەهای گێڕاوە کە بوونی چاکە لە تەنیشت خراپەدا و ، بوونی تۆوی کردەوەی چاك لە تەنیشت تۆوی تاواندا و ، بوونی دڵ و ئیرادە و هەست و سۆزە پاکەکان و

ویژدان و بەزەیی لـە تەنیشـت هەسـتەکانی رق لیٚ بـوون و ناوبـانگ و تـوورەیی و تەماع ... تددا ، واتە بوونی رژێمێکی دەروونیی ئاوێتە لـە فیترەتـی مـرۆڤ و لـە قـوولایی ماهیـەتیدا ، دەورێکـی لـەم سـەرنجە دیـارەی مەلائیکـەتاندا هەیـە. ئەمەش لەو وەلامـەدا دیـارە کـە خـوا بـەوانی داوەتـەوە : ﴿ قَالَ إِنِّىٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ ، فەرمووی : ئەوەی من ئەیزانم ئێوە نایزانن . ئەم وەلامەش ئامـاژە بۆ ئەوە ئەکات کە ئەم باسە باسێکی قوولە و مەلائیکەتان پەی پـیٚ نابـەن و، لـە لایەکی تریشەوە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە خوای بالادەست لە پەی نـەبردن بەمـە عوزری مەلائیکەتانی وەرگرتووە .

❊ ❊ ❊

 ( البقرة : ٣١ ) .

ئادەم سەلامی لیٚ بیٚ تاکە دوێنراو نیە بۆ فێربوونی ناوەکـان ، بگـرە لەوانەیـە مرۆڤایـەتیی هـەر هـەمووی لـە سـەرەتایەوە هـەتا کۆتـایی بـەم فەرمایشـتە دوێنرابیٚ.. ئەوەش کە فێری ئادەم سەلامی لیٚ بیٚ کراوە لە جێی ناوك و لە جێـی تۆو ئەژمێرریٚ .. جا هەروەك هـەموو جۆرەکـانی خـوێن و دەمارەکـان لـە پشـتیا جێگیر بوو بوون ، هەرچییش فێری کرا بوو ناوك و تۆوی هـەموو زانسـتەکان بـوو و، فەرمانبەریی بەرەو پێش بردن و گەشـەپێـدان و فـراوانکردنـی ئـەو ناوکانـەش خراوەتە ئەستۆی بەرەکانی داهاتوو ..

هەروەك ئەشگونجیٚ کە ئەو فێرکردنە لە رێی ئەو وەحییەوە بووبیٚ کە خـوا بـۆ پێغەمبەرانی سەلامیان لیٚ بـیٚ نـاردووە ، هـەروەها جائیزیشـە لـە رێـی ئـەوەوە بووبیٚ کە خـوا حـەزی فێربـوونی لـە فـیترەت و جەوهـەر و نـاوکرۆکیدا دانـاوە ،

ئەمەش بۆ جێ بەجێکردنی پێویستی‌یەکانی و ، ئەم حەز و ئامادەباشی‌یە گورج و گـــەورە پێغەمبەرانەیـــەش بـــۆ فێربـــوون ، بـــەرەو فێربـــوونی ناوەکـــان و ناولێنراوەکانیش رای‌کێشاوە .

سەرەڕای ئەوەش ، ئایا مەبەست لەوەی کە ئادەمی سەلامی لێ بێ فێر کرا، بریتیی بوو لە گەیشتن بەو زانراوانـە لـە رێـی یـەکێ لـە زمانەکانـەوە ؟ یـان لـە دووتوێی چەندین تێبینیی سەر ئەو رێگایەدا بوو کە ناوەکانی بە ناو لێ نراوەکـان ئەگەیاند و ، لەوانیشەوە بۆ هاوەڵ و خاوەنی هەموو شتێك ؟ یـان بـۆ فێرکردنـی ئەو پەیوەندی‌یانە بوو ـ چ دیاریان و چ نادیاریان ـ کە لە جیهانی بووندا هـەبوون؟ شتێکی یەکسانە کە ئەگەر ئەوانە کۆمەڵە زانراوێکی مەلەکووتیی بـووبن .. یـان ناوی مەلائیکەت بووبن .. یان ناو و ناولێنراو و قەدەر و چارەنووسی مرۆڤ بـن.. هەموو ئەمانە کاری فەرعیین و لەبەر دەمیاندا زۆر ناوەستین .



﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ ( البقرة : ٤٤ ) .

لەگـەڵ ئـەوەدا کـە ئـەم ئایەتـە ، بـە شـێوەی راسـتەوخۆ فەرمایشت لەگـەڵ بەشێکی بەنی ئیسرائیلدا ئـەکات ، هـەروەها بـە شـێوەی ئامـاژەش فەرمایشـت لەگەڵ موسڵمانەکاندا ئەکات .. ئەوەی کە لێرەدا بە تایبەت ئەویسترێت بریتی‌یە لە ئاگادار کردنەوە لەسەر پێویسـتیی بـوونی یەکیـەتیی و نـەبوونی دژایـەتیی لـە نێوان ئەوەدا کە ئەوترێت و ئەوەشدا کە ئەنجام ئەدرێت . واتە یەك بـوونی وتـە و کردەوە . لەبەر ئەمـە ئـەبینین کـە ئایـەتێکی تـر بـە شـێوازێکی تـر ئـەم مانایـە

دەرئــــەبڕێت و ئەفــــەرموێ : ﴿ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴾ ( الصــف : ٢ ) .
ئەفەرموێ : بۆچی شتێك ئەڵێن كە خۆتان رەفتی پیێ ناكەن ؟

بەڵێ ! حاڵ و مەقاڵ ، یان وتە و كردەوە زمانێكی دوو لایەنەیە بۆ سەرخستن و نواندنی ( حەق ) . جا ئەگەر ئەم زمانە دوو لایەنە و دوو لا دیارە بە ناوی ( حەق ) ەوە بێتە گۆ و بە دەنگی بەرز حەق دەر ببڕێ ، ئەوا كاریگەریی گەورەی ئەبێت . چونكە لەسەر مرۆڤی بە پێویست ئەگێڕێ كە ئەوەی خەڵكی بۆ بانگ ئەكات ، یەكەم جار بەسەر خۆیدا جێ بەجێی بكات و ، وتەكانی و كردەوەكانی و، دەرەوە و ناوەوەی پێچەوانەی یەك نەبن ..

ئەگێڕنەوە كە خوای بالآدەست بە عیسای سەلامی لێ بێ فەرمووە : (( عِظ نَفسَكَ أوَّلاً فَإن قَبِلَت نَفسُكَ تِلكَ المَوعِظَةَ فَعِظِ الآخَرِينَ ، وإلاَّ فَاستَحِ مِنِّي )).
فەرموویە : یەكەم جار ئامۆژگاریی خۆت بكە ، جا ئەگەر نەفست ئەو ئامۆژگارییەی وەرگرت ، ئەوا ئامۆژگاریی كەسانی تریش بكە ، ئەگینا شەرمم لێ بكە .

كەواتە پێویستە مرۆڤ بە پێی ئەوە بژیت كە ئیمانی پێی هەیە و ، دوای پاك كردنەوەی دەروونی ، چیی فیكر و هەست و نەستی جیهانی ناوەوەی خۆیشی هەیە بیخاتە روو . هەر كەسێ خۆی شەونوێژ نەكات ، پێویستە باسی شەونوێژ نەكات و ، شەرم بكات لەو باسە . هەر كەسیش ناتوانێ بە هەموو خشووع و مل كەچییەكەوە نوێژ بەجێ بهێنێ ، بەرامبەر بە خوای بالآدەستیش بە ئەدەبەوە رەفتار ناكات و ، لە بەردەمیا هەست بە سام و هەیبەت ناكات ، پێویستە باسی سیفەتەكانی نوێژی كامڵ و رێك و پێك نەكات .. ئەگەر قوربانییدەریش نەبێت پێویستە دەربارەی ژیان لە پێناوی كەسانی تردا تاقە وشەیەك بە دەمیا نەیەت ، چونكە ـ لەبەر هەر حیكمەتێك بوو ـ خوای بالآدەست هێزی كاریگەریی ئەوەی كە ئەوترێت بەستوویەتی بە شێوازی رەفتاری قسەكەرەكەوە . سەرنج بدەن چۆن بەرگریی و وەڵام دانەوە و پارێزگاریی لە ئیسلامی زۆرێك لەو خەڵكە بەبێ

کاریگەریی ئەمێنێتەوە ؟ بگرە ئەبینین هەندێ لەوانە ـ بە بۆنەی کەمیی ئیخلاصیانەوە ـ لە زۆرێك لەوەی کە جاران بەرگرییان لێ ئەکرد واز دێنن ، لە پێناوی ئەوەدا کە لەگەڵ بیروبۆچوونی هەندێ لە نەیاراندا رێك بکەون .

جا شیخ الإسلام (( مصطفی صبري أفندي )) ش ئەمە راڤە ئەکات و ئەڵێت : (( نموونەی ئەوانە ، هەرچیی کە ئەڵێن ، یان وەڵامی ئەدەنەوە ، یان ئەو کتێبانەی کە ئەیاننووسن تیایانا دڵسۆز نین . خۆ ئەگەر دڵسۆز بوونایە ئەوا بە پێی ئەوە ئەژیان کە ئەیانوت و ، ئەو راڕاییەمان لە ژیانیاندا نەئەدیی )) ، کە ئەوەبوو نەیانتوانیی بە پێی یەكخستنی وتە و کردەوە ژیان بدەنە سەر .. بەم شێوەیە دوودڵیی و راڕایی سەری لێ دان و ، ئەوانەش کە شوێنیان کەوتبوون خستنیانە گومان و دوودڵییەوە .

لەبەر ئەوە ئەبینین نموونەی ئەم کتێبانە ئەگەرچیی بە نیەتی خزمەت کردنی ئیسلام نووسراون ، کەچیی ئەو وەڵامانە و ئەو پەرچدانەوەی شك و گومانانە بیر و فیکرەکانی زیاتر شڵەقاند و ، بوونە مایەی ئاژاوەیەکی فیکریی وەها کە دەست بەسەردا گرتنی شتێکی گران بێت . لەبەر ئەوە یەکێك لە کارە گرنگەکان بریتیی بوو لە گەڕان بە دوای رێبازی کاریگەر و بەبڕشتدا . لەبەر ئەوە پێویست بوو ئیرشادکار و تەبلیغکار ، شان بە شانی زانست ، بە سیفەتی ئیخلاصی قووڵ و راستەقینە خۆیان بڕازێننەوە و ، بە پێی ئەو زانستە بژین و ، شارەزای رێگاکانی تەبلیغ و ئیرشاد بن و ، لە دوێنراو تێ بگەن و ، بزانن چیی ئەڵێن و ، چۆنی ئەڵێن و ، لە چ شوێنێکدا ئەیڵێن .

لێرەدا پێویستە شتێکی تر یاد بخەینەوە ، کە لەوانەیە تێگەیشتنێکی هەڵە لە ئایەتی ﴿ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴾ بە دڵدا بێت . ئەم ئایەتە ئەفەرموێ : (( نەکەی باسی شتێك بکەی کە خۆت پێی نەژیابیت )) ، چونکە ژیان ( بە کارێکی دینیی ) خواپەرستییەکە و ، تەبلیغکردنیش ( ی ) خواپەرستییەکی ترە . جا هەر کەس هەردووکیان جێ بەجێ نەکات ، ئەوا دوو

تـاوانی لـه ئەسـتۆدا نـەبێت و ، لـە هێـزی کاریگـەرییش دوو هـەنگاو دوور ئەکەوێتەوە و ، ئەگەر یەکێکیشـیان جێ بـەجێ نـەکات ، ئـەوا یـەك تـاوانی لـە ئەستۆدا ئەبێت و ، لە هێزی کاریگەرییش یەك هەنگاو دوور ئەکەوێتەوە. چونکە هێزی کاریگەریی ـ وەك باسمان کرد ـ پشت بە جێ بەجێکردنی ئەوە ئەبەستێ کـە تەبلیغ کراوە .

بەڵێ ! فەرماندان بە کەسانی تردا بۆ چاکەکردن و ، دوورەپەرێزیی کردنیان لە خراپـە و ، لـە بیرچـوونی جێبـەجێکردنی ئـەوە بەسـەر ئـەو کەسـە خـۆیدا دژواریيەکی روون و ئاشکرایە .. ئەم رەفتارە هەڵەیەش کاریگەریی چەندین کاری ئیجابیی زۆر ، وەك هێزی بەلاغە و بـەیان و زانسـت ، کـەم ئەکاتـەوە . ئەمـەش ئەوەیە کە ئەم ئایەتە باسی ئەکات هەتا هیچ مرۆڤێکـی ژیـر نەکەوێتـە نـاو ئـەو جۆرە دژوارییەوە و ، لە هەمان کاتدا لە مرۆڤی ئەوێ کە ئیمان بهێنـێ و ، بـیر بکاتەوە ، ژیان بەسەر بەرێت و ، تەبلیغیش بکات . ئیتر لەوە بـەو لاوە زۆر وتـن و چەنەبازییە و ، سام و هەیبەتی قسەکەریش ناهێڵێ . ئەمەش ئـەوە ئەگەیـەنێ کە ئەو کەسە بە تەواویی خۆی لە یاد کردووە . لەبەر ئەوە لەسەر ئامۆژگارییکار و، نەسـیحەتکـار و ، ئیرشـادکار و ، تـەبلیغکـار و ، نووسـەر و ، بەرنامەرێـژ پێویستە لەو کارانە کە ئەنجامیان ئەدات جیـددیی بێـت ، تـا بـە جیـددییش لێـی وەربگیرێن و، هیچ گومانێـك نەخاتـە سـەر ئـەو باسـانەی کـە وەریـان ئـەگرێت و پێشکەشیان ئەکات ، هەروەها تا ـ بە رەفتارە چـەوتەکانی لـە بـواری ئیرشـاددا ـ لەبەردەم وتە رازاوەکانی بانگەوازکارانی رێبازی گومڕاییدا ژێر نەکەوێ ..



﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ﴾ ( البقرة : ٥٤ ) .

لەم ئایەتەدا دەستەواژەی ﴿ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ﴾ وەها تەفسیر کراوە کە : (( خۆتان بکوژن ، یان با ئەوانەی کە گوێرەکەکەیان نەپەرستووە ئەوانە بکوژن کە پەرستوویانە )) . بەڵام ئەگونجێ بەم شێوەیەش تەفسیر بکرێ :

مادام ئێوە بە پەرستنی گوێرەکەکە و کردنی بە خوا و ، بە رەخساندنی زەمینەیەك بۆ پەرتەوازەیی و ناکۆکیی ، یەکێتیی دینیی و کۆمەڵایەتیی و فیکرییتان رووخاند ، کەواتە هەستن کوشتاری یەکتریی بکەن .. یان لە لایەنی نەفس و ئەنانییەتدا بمرن ، بۆ ئەوەی لە لایەنی رۆح و بەهاکاندا زیندوو ببنەوە . یان بە پێی دارشتنی تەصەووف : (( هەستن خراپەکان ، وێنەی هێزی شەهوانیی و توورەیی ... تد لە دەروونتاندا بکوژن و ، بە هەستی ئەنانیی و سەلبییان دابنێن ، هەتا ببنە شایانی زیندووکردنەوەیەکی نوێ لە ژیانی رۆحیی دڵییتاندا )) .

مەبەست هەرچییش بێ لە فەرماندان بەسەر ئەوانەدا کە گوێرەکەکەیان پەرستبوو ، یان نەیانپەرستبوو تا خۆیان بکوژن ، ئەوا بانگ کردنی هەموو تاکێك بۆ ئەم جۆرە گوناه لابردن و خۆپاك کردنەوەیە - بۆ ئەوانەی کە گوێرەکەکەیان پەرست ، بە هۆی کوفرە ئاشکراکەیانەوە و ، بۆ ئەوانەش کە نەیان پەرست ، بە هۆی بێدەنگبوونیانەوە - چەندین دەلالەت و مانا لە خۆ ئەگرێ ..

لە پاڵ ئەمەشدا ، ئەم کاری پاك کردنەوە موبارەکە و ، ئەم تاقیی کردنەوە گرانە بۆ تێك شکاندنی دەروون و ، رۆیینی لە ناو خوددا ، ئازاری زیاتری هەبوو. یەکێکیش لەوانەی کە سەرنج رائەکێشێ ئەمەیە : لە بریی فەرمانی (( قاتلوا )) واتە بجەنگێن و کوشتار بکەن ، کە دەربارەی کوشتاری کەسانی تر ئەهات ، فەرمانی (( فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ )) دەرچوو ، کە ئەویش چەند جارەبوونەوەی ئێش و

نازارەکانی ناوەوە و دڵەڕاوکێی دەروون ئەگەیەنێ ، تا هۆیەك بن بۆ پاك کرنەوەی ئەو دەروونە تاوان بارانە .



﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴾ ( البقرة : ٦٥ ) .

ئەو شێوە گۆڕینەی کە لەم ئایەتەدا هاتووە ـ خواش چاکتر ئەزانێت ـ وەك موجاهید وتوویە ، بریتی‌یە لە گۆڕینی رەوشت و سیرەت ، زیاتر لەوەی کە گۆڕینی وێنە و دیمەن بێت . واتە لە بارەی رەوشت و سروشت سووکی‌یەوە وەك مەیموونیان لێ هات . جا رەوشت سووکیی دەرگا بۆ ئەوە والاّ ئەکات کە ئەو گۆڕینەی رەوشت بۆ چەندین بەرە بگوێزرێتەوە و ، ئەو رەوشت گۆڕینەش لە ناو هەندێ کۆمەڵگای ئێستادا ئەبینرێت .

هەروەك ئەگونجێ وشەی (( السبت : شەممە )) بە مانای ئەو رۆژە زانراوەی حەفتە هاتبێ ، هەروەها ئەشگونجێ لە چاوگێکی ئەو رۆژەی پشووەوە وەرگیرابێ کە جوولەکە بە رۆژێکی گەورەی رائەگرن و بە خواپەرستیی بەسەری ئەبەن و ، تەفسیرەکەی دواوەش پەسەندترە .

لەبەر ئەوە بە پێی تەفسیرەکەی دواوە مانای ئایەتەکە ئەمەیە :

ئەو جوولەکانەی کە لێپرسراوی‌یەکی سووك و بچووکیان خستە ئەستۆی خۆیان کە بریتیی بوو لە دیاریی‌کردنی تاقە رۆژێك بۆ خواپەرستیی ، وازیان لەو لێپرسراوی‌یە هێنا و ، ئەو پەیمانەشیان شکاند کە لەبەردەم بەدیی‌هێنەریاندا خستیانە ئەستۆی خۆیان .. ئەو پەیمانە کە شتێکی سروشتیی بوو ، لەبەر ئەوەی

که به مرۆڤ بـه دیـی هێنرابـوون و ، شـتێکی پێویسـتیش بـوو لەبـەر ئـەوەی کـە گەلێکی هەڵ بژێرراو بوون بە لای خواوە . ئەوانە لەبەر ئەوەی کە ئەو جۆرە هەڵـە و تاوانەیان لە دەست دا کەوت ، دابەزینە خـوار پلـەی مـرۆڤ و ، ئینکـاریی ئـەو فەزڵەشیان کرد کە بەسەر خەڵکیی و بەسەر گەلانی تردا هەڵ بژێرراو بوون ، ئـیتر خوای گەورە مرۆڤایەتیی و هەست و سۆز و بیر و فیکریانی سڕی‌یەوە و ، گـۆڕیی بە دەروونێکی تاکڕەویی دەربارەی بیر و فەلسەفە و ژیان ، لێرەدا هەمووی لەسەر دیوی دەرەوەیان ئاوەژو بوویەوە و ، بە کەساس و هەژار کەوتنە بەرچاو .



﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ ﴾

( البقرة : ٦٧ ) .

لە یەکەم ساتدا ، لەم ئایەتە پیرۆزەدا دوو شتی سەرەکیی سەرنج راکێش بـە دیی ئەکەین :

یەکەم بریتی‌یە لە تاقیی‌کردنەوەی بەنی‌ئیسرائیل لەلایەن خوای باڵادەسـتەوە ، لە کارێکدا کە دەروونیان لەگەڵیا وەها راهـاتووە توانایـان نیـە وازی لیّ بهێـنن . جـا ئـەم تاقیی‌کردنەوەیـە لـە پێنـاوی دەرخسـتنی ئیخلاصـیان و ، هـەواڵدانی سەرەنجامی ئەو تاقیی‌کردنەوەیە بوو بە کەسانی تر .

دووهەمیش ئەوەیە کە دەرچوونی ئەم جـۆرە فەرمانـە بـۆ ئـەوە بـووە عـادەتی مانگا پەرستن ، کە لەو کاتەدا لە نێوان بەنی‌ئیسرائیل‌دا پـەرەی سـەند بـوو ، بـە یـەکجاریی ریشـەکەن بکـریّ . چـونکە ئەسـڵ ئەوەیـە بەنـدە پابەنـدی عـەقیدەی تەوحیدی پاڵفتە بیّ و ، هەرچیی پێچەوانەی ئەو تەوحیـدە پاڵفتەیـە بـیّ لـە دڵیـا ریشەکەنی بکات و ، لە ژیانی دووری بخاتەوە .

بەلاّم بەنی‌ئیسرائیل لە یەکەم ساتدا لە مانای ئەم جۆرە فەرمانە تێ نەگەیشتن و ، لەو حیکمەتە وردەش حالّیی نەبوون کە تیایا بوو . هەروەها بە پیرۆز زانینی مانگا لە میصردا و ، توانانەبوونی بەنی‌ئیسرائیل تا لە حیکمەتی گوێڕایەلّیی ئەم فەرمانە تێ بگەن و ، پەی نەبردنیشیان بە پەیوەندیی ئەو فەرمانە بەو کارانەوە کە ئەوان چاوەڕوانی‌یان ئەکردن و ، بیریان لیّ ئەکردنەوە کە لەگەلّ پەیامی ئاسماندا بۆیان ئەهاتن ـ وەك هەندیّ جار لەلامان روو ئەدات ـ وای کرد کە ئەوان پێیان خۆش بیّ بە بیانووی جۆراوجۆر جیّبەجیّکردنی کارەکە دوا بخەن و ، کاتیش بەسەر بەرن بۆ خۆ دامالّین لیّی ، لە بریی ئەوەی خێرا کارەکە جیّبەجیّ بکەن ..

جا هەروەك رووداوی گوێرەکەکە لەوەو دوا بووە بەلّگە ، وا دەرکەوت کە ئەوان هێشتا بە تەواویی لە بەپیرۆز زانینی مانگا ، کە لە میصری‌یەکانەوە بۆیان مابوویەوە ، رزگار نەبوو بوون . لەگەلّ ئەمەشدا سەربڕینی ئەو مانگایەی کە دانیشتوانی ولاّتەکە بە پیرۆزیان ئەزانیی ، ئەوان بە یاخیی‌بوون لە دەسەلاّتی فیرعەونیان ئەژمارد . هەرچەندە ئەم فەرمانە ـ واتە سەربڕینی ئەو مانگایەی کە دانیشتوان بە پیرۆزیان رائەگرت ـ یەکێکە لە بنچینەکانی پەیامی مووسا پێغەمبەر سەلامی لیّ بیّ . لەبەر ئەوە ئەم فەرمانەیان وەها لە قەلّەم دا وەك ئەوەی کە فەرمانێك بێت لە توانادا نەبێت ، بۆیە وتیان : ((أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ؟ )).

جا ئایەتەکان لەوەودوا ئەو بیانووانەمان بۆ دەرئەخەن کە بەنی‌ئیسرائیل ئەیان هێنانەوە و ، خۆشیان لە پشتیانەوە پەنا ئەدا ، پاشانیش ئەو بڕیارە تیژ و بڕندەیەی پێغەمبەرێکی بەڕێزمان بۆ دەر ئەخەن ..



﴿ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْىِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾ ( البقرة : ٧٣ )

پیاکێشانی لاشەی کوژراوەکە بە بەشێکی مانگا سەربڕراوەکەدا و ، ئاماژە کردنی کوژراوەکەش بۆ ئەو کەسەی کە کوشتوویەتی بە موعجیزە ئەژمێرریٚ و، پیاکێشانی لاشەی کوژراوەکەش بە بەشێکی مانگاکەدا لایەنێکی بەکارهێنانی هۆکارەکانە . بەلاّم ئەو لایەنەش کە لەم فەرمانەدا رووی لە ئێمەیە ، بابەتێکە بۆ زانستی پزیشکیی نویٚ ، یان بۆ زانستی زیندەوەرزانیی (( بایۆلۆجیا )) . چونکە بە زیندوومانەوەی شانەکانی مێشك بۆ ماوەی چەند خولەکێك دوای مردن و، گەیشتن بە هەندیٚ ئەنجامیش دوای توێکاریی جەستە چەند کارێکە لە ئێمەش و ئەو بابەتەش کە لێی ئەدوێین تیٚ ئەپەڕیٚ .. لەوانەشە بگونجیٚ ، ئەگەر بەهەر شێوەیەك بووە دەست بخرێتە ئەو چەند خولەکەوە ، هەندیٚ زانیاریی پەسەندە کراو لە لاشعووری مردووەکەدا هەلّگیرابیٚ دەست بخریٚ .

جا هەروەك ئەگونجیٚ سەیری ئەم باسە تەنها لە لایەنە ئیعجازییەکەیەوە بکرێت ، هەروەها ئەشگونجیٚ ، بە هۆی تەکنەلۆجیای پێشکەوتووەوە ، لە ئایندەدا ، لەم بارەوە بەرەو ئامانجێکی گەورە رووی پیٚ بنریٚ ، تا لەو سنوورەی کە موعجیزەکان کێشاویانە نزیك بێتەوە .

دوای ئەوەی کە ئەو خەلّکە ، دوای ئەو رووداوانە ، هاتنە سەر جیٚبەجیٚکردنی فەرمانەکە ، بە چاوی خۆیان بە چەند قات بەرەکەتی گویٚڕایەلّیی و ملکەچییان بینیی .. ئەوەبوو یەکەم جار ، دوای ناسینی پیاوکوژەکە لەو تاوانە ئالّۆزەدا ، لە ناکۆکیی نێوان خۆیان رزگاریان بوو. هەروەها رۆحیان بە رێژەیەکی زانراو لە فیکری ماددیی و، ئیمان نەبوون بە قیامەت و زیندووبوونەوە رزگاری بوو ، چونکە رووداوی زیندووبوونەوەی کوژراوەکە ، ئەویش بە کێشانی بە بەشێکی مانگاکەدا ، دەرگایەکی فراوانی دەربارەی حەقیقەتی زیندووبوونەوە دوای مردن لە بەردەمیاندا والاّ کرد ..

* * *

﴿ وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴾

(البقرة : ٧٨ ) .

ئەم ئایەتە پیرۆزە وێنەی هەندێ گێلە رۆشنبیری ئەو کاتە ئەکێشێ ، کە دڵیان ـ هەر وەك ئێستاش وەهان ـ بەستراوە بە چەندین وەهم و ئاواتەوە دەربارەی جیهانێکی نموونەیی ( یوتوبیا ) ، لە بریی ئەوەی کە وابەستەی راستییەکانی دین بن ..

لە راستییدا ئێمە لە ناو بنچینەکانی مارکسیەت و شیوعییەت و سەرمایەدارییدا ئەو ئاواتانە ئەبینین کە بریتین لە جۆرە راکردنێك لە دینەوە بۆ جیهانی خەیاڵ و یوتوبیا و نوقلانە لێدان . ئەوەی کە جێی ئازارە ئەوەیە کە لەم بابەتی ئاوات خواستنەدا مێژوو خۆی دووبارە ئەکاتەوە و ، لەم کارەدا نەصارایش لەسەر رێبازی جوولەکە هەنگاویان هەڵ گرت و ، هەندێ لە موسڵمانانیش لە شوێن پێ هەڵگرتنی ئەوانە دوودڵ نەبوون .

بەڵێ ! موسڵمانان لەم رۆژەدا سەرگەردانن و ـ وەك پێشینەکان ـ لە فەلەکەی ئەو هیوایانەدا ئەسووڕێنەوە کە قورئانی پیرۆز ناوی (( الأماني ـ ئاواتەکان )) ی لێ ناون . دیارە حاڵی ئێستای جیهانی ئیسلامیی گەورەترین شاهیدە لەسەر ئەمە . ئەوەتا فەرموودەیەك لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە :

( لَتَتَّبِعَنَّ سُنَنَ مَن قَبلَكُم شِبراً بِشِبرٍ وذراعاً بِذِراعٍ حتى لَو سَلَكُوا جُحرَ ضَبٍّ لَسَلَكتُمُوهُ . قلنا : يا رسولَ الله ! اليهودُ والنَّصارَى ؟ قال : فَمَن ؟ ).[٢]

ئەفەرموێ : بست بە بست و باڵ بە باڵ شوێن رێبازی ئەوانەی پێش خۆتان

---

[٢] البخاري ، أحاديث الأنبياء : ٥٠ ، الإعتصام : ١٤ ، مسلم ، العلم : ٦ ، المسند للإمام أحمد : ٢ / ٣٢٥ ، ٣٢٧ .

ئەکەون ، هەتا ئەگەر ئەوان بچن بە کونی مارمێلکەیەکیش‌دا ، ئێوەش ئەچن بە دوایان‌دا . ئەڵێت : وتمان : ئەی پێغەمبەری خوا ! مەبەستت لە جوولەکە و گاورە؟ فەرمووی : ئەی کێ ؟

( الأماني ) کۆی ( أمنية ) یە و ، بە مانای ئەو ئاوات خواستن و خەو و خەیاڵانە دێن کە لە واقیعدا جێبەجێ ناکرێن . جا ئەو ئاوات خواستنە هەرچەندە لەگەڵ ( مثالية ) دا تێکەڵ ئەبێت ، بەڵام بە مانای ئەو گریمان و بیردۆزانە دێت کە جێبەجێ کردنیان موستەحیلە و ، هەرچەندەش وا دەرئەکەوێ کە هەندێکیان جێبەجێ بکرێن ، بەڵام بە ئەغڵەب کاری خەیاڵین و ، لە خەیاڵدا ئەمێننەوە و، ناشتوانرێ بە ئامانج بگەیەنرێن . لەبەر ئەوە ئەو ئاواتانە بۆ ئاوات خواز نوقڵانە لێدان و خەو و خەیاڵی خەڵەتێن و ، بۆ کۆمەڵگاش داخ و خەفەتێکی کوشندە بوون .

جا ئەگەر رۆشنبیرانی کۆمەڵگایەك توانای بینیی رێك و پێك و ، راست خوێندنەوەی کارەکانیان نەبێت و ، گەر نیمچە رۆشنبیرەکان و جەماوەری خەڵەتاو و بێئاگاکراویش ، بە وێنەی ئەم خەو و خەیاڵ و وەهم و ئاوات خواستنانە ، بە دوای سەرابدا را بکەن ، ئەوە مانای وەهایە ئەو کۆمەڵگایە حوکمی ئەوەی بەسەردا دراوە کە بکەوێتە داوی کارە موستەحیلەکانەوە و ، هەر لەوێش تیا بچێت ..

* * *

﴿ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ﴾ ( البقرة : ٨٧ ) .

زۆرێك لە ئەهلی تەحقیق ئەوەیان باس کردووە کە ( روح القدس ) جیبریلە سەلامی لێ بێت و ، لە چەندین تەفسیردا ئەمە هاتووە . بەڵام حەسسانی کوڕی ثابیت لە کۆڕی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەم شیعرەی وت :

وجبـريلُ أمينُ اللهِ فِينا     وروحُ القُدسِ ليسَ لهُ كفاءُ

پێغەمبەری خوایش ﷺ ئەم شیعرەی بە چاك دانا . كەواتە جیبریل ( روح القدس ) نیە ، هەروەها عیساش نیە سەلامی لیّ بیّت چونكە ئایەتەكە ئەفەرمویّ : ﴿ وَأَيَّدْنَهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ﴾ دیارە تەئییدكەر تەئییدكراو نیە . من بڕوام وەهایە كە ( روح القدس ) هیّزیّك و قودرەتیّكی مەلەكوتی‌یە لە ژیّر فەرمانی خوای بالاّدەستدا بۆ جیّ بەجیّ كردنی ئیرادەی خوا و ، پاشان ئەو هیّزە ئەگەڕیّتەوە بۆ جیهانی لاهوت . كاتیّكیش كە ئەم رۆحە تەئییدی عیسا پێغەمبەر سەلامی لیّ بیّت ئەكات بە رەنگی ئینجیل رەنگ ئەبیّت و، كاتیّكیش كە تەئییدی پێغەمبەرمان ﷺ ئەكات بە رەنگی قورئان رەنگ ئەبیّت .

ئەوەبوو مەسیحی سەردارمان سەلامی لیّ بیّت بە كۆمەڵە موعجیزەیەكی روون و ئاشكرا وەك روونیی خۆر رەوانە كرا .. كۆمەڵە موعجیزەیەك كە مرۆڤ بەرەو ئیمان و قەناعەت پیّكردن ، یان بە لایەنی كەمەوە بەرەو بەزاندن ، بەرن.. كۆمەڵە موعجیزەیەكی روون و ئاشكرا كە لە لایەنی بەڵگەوە پێویستی‌یان بە هیچ شتیّكی تر نەبیّت .

ئەم موعجیزانە لە قورئانی پیرۆزدا ، لە چەند سوورەتیّكدا هاتوون ، كە یەكیّك لەوانە بەدیی‌هیّنانی باڵندە لە قوڕ ، پاشان گیان بە بەریا كردن بە ئیزنی خوا و ، هەواڵدانی بە غەیب و ، بەوەش كە ئەوانەی گومان بە خۆی و پێغەمبەرایەتی‌یەكەی ئەبەن كە ئەیخۆن و لە ماڵەكانیاندا پاشەكەوتی ئەكەن . ئەشگونجیّ بوونی شتیّكی تایبەتیی هەڵ بهیّنریّ بەوەی كە سەردارمان عیسا سەلامی لیّ بیّت لەلایەن ( روح القدس ) ەوە تەئیید كرابیّ ، كە ئەویش بریتیی‌یە لەوەی ئەركی سەرشانی و پەیامەكەی خاوەنی مۆركیّكی تایبەتیی بووە. ئیتر ( روح القدس ) ـ وەك هەندیّ لە نەصارا لە قەڵەمی ئەدەن ـ بەشیّك نیە لە كەسایەتیی مەسیح سەلامی لیّ بیّت ، بەڵكو تیشك دانەوەیەكە بۆ نیعمەت پیّ بەخشین و لەطافەتیّكی تایبەتیی بۆ تەئییدكردنی و ، هیچیشی تیا

نیە کە ئەگەر ئەم تیشك دانەوەیە لە ڕێی جیبریلەوە سەلامی لێ بێت یا بە هۆی هەر مەلائیکەتێکی ترەوە ئەنجام بدرێت .

( روح القدس ) لە سەرەتاوە ، واتە لەو کاتەوە کە مەریەم سەلامی لێ بێت حامیلە بوو هەتا کاتی لە دایك بوونی منداڵەکەی بە چەند وێنە و شێوەیەکی جیاجیاوە دەرئەکەوت و ، لە نزیکیشەوە دوای سەردارمان عیسا سەلامی لێ بێت ئەکەوت و ، پەیوەندییەکی نزیکیشی بە قەدەری ئەم پێغەمبەرە بەڕێزەوە هەبوو. کاتێکیش کە ئیرادەی خوایی فەرمانی دەرکرد بە پێغەمبەرایەتیی رەوانەی بکات بۆ سەر قەومێکی سەرگەرم و نوقوم بوو لە ماددەپەرستییدا، ( روح القدس ) تەئیید و ئاراستە و پەروەردەی کرد بە پەروەردەیەکی رۆحیی لە ناوەندێکی میتافیزیکیی بەرزدا ، تا فیکری ماددیی برووخێنێ و سەر و ژێری بکات.

پاشان بابەتی شاهێدییدان دێت لەسەر بێتاوانیی و پاك و خاوێنیی دایکی مەسیح ، خانمان مەریەمی پاك داوێنی پاك و خاوێن ، لەلایەن دادگای قورئانەوە دژی بوختان و تاوانە نەشیاوەکان کە لەلایەن بوختانکەر و ئینکاریی کەرەکانەوە ، درابوونە پاڵی ، چونکە بێتاوان دەرچوونی مەریەم بێتاوان دەرچوونی کوڕە پێغەمبەرەکەشیەتی .

واللە أعلم بالصواب .

* * *

﴿ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ﴾ ( البقرە : ٩٠ )

واتە : ئەوانە دوای ئەوەی کە هەلیان بۆ هەڵ کەوت تا لەو غەزەبە رزگار بن کە لەوەو پێش لێیان گیرا بوو ، هەوڵیان نەدا کەلکی لێ وەربگرن ، ئەوەبوو غەزەبێکی تریان لێ گیرا . کرداری (( باءَ )) ش لەم ئایەتەدا ( إستحقاق ) و

( إستقرار ) ، واتە بەردەوامیی و سەرەمڕی غەزەب ئەگەیەنێت . جا یەك لە دوای یەك غەزەب گیران لێیان هۆیەکەی ئەوە نیە ئینکاریی تەوراتیان کردووە، وەك لە هەندێ لە تەفسیرەکاندا هاتووە ، یان لەسەر ئینکاریی ئینجیل وەك لە تەفسیرێکی تردا هاتووە ، بگرە هەتا لەسەر ئینکاریی قورئانی پیرۆزیش بە تەنیا، بگرە هەتا لەسەر ئینکاریی‌کردنی ئەوەی کە زەکەریا و یەحیا سەلامیان لێ بێت هێنایان ، بگرە لەسەر ئەوەی کە هەردووکیان کوشتن . هەر یەکە لە ئێمە ئەوە ئەزانێت کە هەرکەس پێغەمبەرێك بکوژێت شایانی ئەوەیە بە نەمریی لە دۆزەخدا بمێنێتەوە . لەبەر ئەوە جێی خۆی بوو ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە بەرهەڵستکردنی پێغەمبەرەکانیان و کتێبەکانیان لەلایەن هەندێکیانەوە و ، ئازاردانی مووسا و عیسا سەلامیان لێ بێت و ، دواجاریش ئەوەی کە دژی پێغەمبەری بەڕێزمان ﷺ ئەنجامیان دا ، هۆی سەرەکیی بوو تا لە کۆتاییدا بوونە شایانی ئەوەی غەزەب لە دوای غەزەب لێیان بگیرێت .

ئەوانە یەکەم جار ئەو پێغەمبەرانەیان بە درۆ خستەوە کە لەژێر سزای فیرعەون دەریان هێنان و ، ئەو رێگا راستەیان پیشان دان کە ئەبێتە هۆی گەیشتن بە کەماڵاتی مرۆڤایەتیی . پاشان هەندێ لەو پێغەمبەرانەیان کوشتن کە لەوەو دوا هاتن ، بەمە بوونە شیاوی ئەوەی غەزەبێکی توند و تیژیان لێ بگیرێت، بگرە بوونە شیاوی غەزەب لەسەر غەزەب . لە کاتێکیشدا کە چاوەڕوانی ئەو پێغەمبەرەی ئاخر زەمان بوون کە ئەوصافی لە هەموو کتێبە پێشووەکاندا هاتبوو ، زۆربەیان نەیانتوانیی کەڵك لەو هەلە زێڕینە وەربگرن کاتێك کە ئەو پێغەمبەرە بەڵێن دراوە لە تەنیشتیاندا و لە نزیکیانەوە رەوانە کرا و ، ئینکارییان کرد ، بەمە بوونە شیاوی لێ‌گرتنی غەزەب لە دوای ئەو غەزەبەی کە بە کۆڵ هەڵیان گرتبوو .



﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ ﴾ ( البقرة : ١١٤ ).

ئەگەر مانای ئەم ئایەتە ببەستین بە هۆی هاتنە خوارەوەکەیەوە و بلێین ئاماژە بۆ ئەو نەصارایانە ئەکات کە خەڵکیان لە گەیشتنە ( بيت المقدس ) قەدەغە ئەکرد و ، ئەو مانایەمان لێی دەرهێنا ، ئەو کاتە ئێمە شتێکی فراوان تەسك ئەکەینەوە .. چونکە هۆی هاتنە خوارەوەکە بە تایبەت لە قەڵەم ئەدرێت ، بەڵام حوکمەکەی لە چەند کارێکدا شتێکی گشتیی ئەبێت . کەواتە ئەوانەی هەوڵیان دا مەسیح سەلامی لێ بێت لە خاچ بدەن ، ئیتر سا لەو سەردەمەدا ، یان لەوەو دوا بە ستەمکارترینی خەڵك ئەژمێررێن . هەروەها ئەوانەش کە لە حودەیبیەدا لە رووی پێغەمبەردا ﷺ وەستان و لە چوونە ناو کەعبە قەدەغەیان کرد و، ئەوانەش کە لە دژی کۆمەکیيان کردن ، ئەوانەش بە ستەمکارترینی خەڵك ئەژمێررێن . هەروەها هەر کەسێکیش کە مزگەوتەکانی خوا لە کاری خۆیان بخات . هەر کەسێکیش دەست بخاتە ژیانی دینیی خەڵکەوە تا رادەی قەدەغە خستنە سەر مزگەوتەکان ، ئەوانەش لە ستەمکارترینی خەڵکن ... تد مادەم قورئانیش کتێبێکی گەردونییە ؛ کەواتە پێویستە ئەم ئایەتە و تەفسیرەکەی لە هەموو رووییەکەوە وەربگیرێن . تا ئەمە گونجاوتر و زیاتر لەبارە بۆ رۆحی قورئان.

پێویستە هەموو شتێك بە پێی بەهای خۆیی هەڵ بسەنگێنرێت ، ئەمەش ئەوەیە کە حەق و حەقیقەت بە پێویستی ئەگێڕن . لەبەر ئەوە ستەمە شتێك لە بەهای خۆیی کەمتر یان زیاتر هەڵ بسەنگێنرێت . لەبەر ئەوەش کەمتەرخەمیی کردن لە کەم دانانی بەهای شتێك ، یان زیادڕەویی کردن لە زیاد دانانی بەهای ئەو شتە ستەمێکی گەورەیە . لەبەر ئەمە شەریك بۆ خوا دانان لە ستەم و لادانە گەورەکانە و ، رووخاندن و داخستنی دەرگای مزگەوتەکانیش ، کە شوێنی ذیکری خوان و ، بانگەوازی تاك و تەنیایی خوا و ، پەرچ دانەوەی کوفر و ئیلحادیان لێوە

ئەنجام ئەدرێت .. رووخاندنی ئەوانە بە زوڵمێك ئەژمێررێت كە لە خراپیی‌دا دوای زوڵمی شەریك بۆ خوا بڕیاردان دێت .

بێگومـان ئـەو جـۆرە دەسـت درێژیـیە بـۆ سـەر مزگـەوتی (( الأقصـى ))بـە زوڵمێكـی گـەورەتر لـەو زوڵمـە ئـەژمێررێت كـە دەرهـەق بـە مزگەوتـەكانی تـر ئەكرێت. زوڵمەكە گەورەتر ئەبێت ئەگەر دەست درێژییەكە بۆ سەر مزگەوتی پێغەمبەر بێت . بەڵام ئەگەر دەست درێژیی بۆ سەر مزگەوتی حەرام بوو ئەوە زوڵم و كوفر و ئیلحادێكە لە دەرەوەی سنووری بـە بـیردا هـاتن . جا ئەگـەر لـەم گۆشـەیەوە سـەیری ئـەم ئایەتـە بكـەین كـە دەرهـەق بـە مزگـەوتی ( الأقصـى ) دابـەزیوە ، ئـەوا ئـەو مانایانـە شـارەزا ئـەبین كـە ئـەو وشـانە كـە بـە هـەموو چاودێرییەكەوە لەم ئایەتەدا هەڵ بژێرراون ئەیان‌گرنە خۆ . پاشـان وشـەكە لێـرەدا بە شێوەی تاك نەهاتووە ، واتە بە (( مسجد )) نەهاتووە ، بەڵكو بە شێـوەی كـۆ (( مساجد )) هاتووە ، كە ئەمەش ئاماژە بۆ گشت گیریی مەسەلەكە ئەكات.

لەم روانگەوە بۆمان دەرئەكەوێت كە شاهپوور و بەختنەصر بـە بۆنـەی دەسـت درێژیی كردنیانەوە بۆ سەر مزگەوتی (( الأقصى )) بەشی خۆیـان زوڵـم و تاوانیـان لەسـەر نووسـرا ، هـەروەها ئۆسپاسـیۆنۆس و تیتـۆس . هـەموو سـتەم كارەكـانی خۆرهەڵات یان خۆرئاوا لە دەست درێژیی‌كەران و لە سنوور دەرچووان دەرهـەق بـە حورمەتی پەرسـتگاكان لـەو تـاوان و زوڵمـە بەشـیان ئـەدرێت . بـەڵام ئـەو هێـزە داگیركارەی كە كەعبە و رەوضەی پاك و خاوێن كەمێك پـێش هـاتنی قیامـەت[٣] وێران ئەكات ، ئەوە زوڵمێكـی وەهـا ئـەنجام ئـەدات ، كـە لەسـەر ناوچـەوانی بـە كۆمەڵە پیتێك ئەنووسرێت و هەرگیز ناسڕێتەوە .



[٣] عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ قـال : (( يخرب الكعبـة ذو السـويقتين مـن الحبشـة )) . البخاري ، الحج : ٤٩ ، مسلم ، الفتن وأشراط الساعة : ٥٧ ، ٥٨ ،٥٩ ، وانظر أيضاً : المسند للإمام أحمد : ١ / ٢٢٨ .

﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ ( البقرة : ١١٧ )

کرداری ( بَدَعَ ) له زمانی عەرەبیی‌دا بە مانای هێنانەبوون و بەدیی‌هێنان دێت ، کە لەسەر نموونەیەکی پێشتر نەبووبێت . زەویی و ئاسمانەکانیش کە فراوانی‌یان سنووری بۆ نیە ، نموونەیەکن بۆ ئەو جوانی‌یەی کە مرۆڤ لێی تێر نابێت . واتە ئاسمانەکان و زەویی لەو بەدیی‌هێنراوە سەیرانەن کە لە پێشیانەوە نموونەیەکیان لیَ بەدیی نەهاتووە . جا لەبەر نەبوونیی نموونەیان لەوەو پێش لە لایەکەوە و ، لەبەر سروشتی ماددە بنەڕەتی‌یەکەیان و شێوەی ئێستایان لە لایەکی ترەوە ، یەکجار سەرنج ڕاکێش و سەرسووڕهێنەرن و ، ناشگونجیَ لەوان جوانتر و دڵڕفێن تر هەبێت و ، بە ملیارەها ئاماژەی نوورانیی ئاماژە بۆ بەدیی‌هێنەر و داهێنەریان ئەکەن ..

بەڵێ ! زەویی و ئاسمانەکان هەر هەموویان لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە وان تیایانا و ، هەموو جوانیی و مەزنی‌یەکی دڵڕفێن و ، هەموو نهێنی‌یەکانیان و، بەو پلەی کەماڵەی کە کەماڵی تر لە ژووریەوە نیە و ، بەبیَ هیچ ناتەواویی و کەم و کووڕی‌یەك ، لەلایەن بەدیی‌هێنەریانەوە بە وشەی ( كُن ) بەدیی هێنراون.. ئاسمانەکان و زەویی پارچە نین و لە خوای باڵادەست جیا بووبنەوە و، لێیشی دەر نەکەوتوون ، چونکە پەیوەندیی نێوان بوونەوەر و داهێنەرەکەی ( تبارك وتعالى ) پەیوەندیی بەدیی‌هێنەرە بە بەدیی‌هێنراوەوە . واتە ئەم پەیوەندی‌یە لیَبوون ، یان لیَدەرچوون ، یان دەرکەوتنێکی حەتمیی و بەبیَ ئیرادەی ئەو نیە . گەر بە فەرزی مەحاڵیش ئەمە پەیوەندی‌یەکە بێت ئەوا ئەم هەموو لیَدەرچوون و دەرکەوتنە نەئەبوو ئەگەری شیی‌بوونەوە و پارچە پارچە بوون و تەواوبوون رووی تیَ بکات ، وەك تەواوبوونی سووتەمەنیی خۆر رۆژێك لە رۆژان. کەچیی هەموو شتێك بەدیی ئەهێنرێت پاشان گەشە ئەکات و پەرە ئەسێنێت، پاشان مەحف

ئەبێتەوە و ئەڕوا و بەفەنا ئەچێت ، پاشان بە دوای ئەو بەفەناچوونەدا بوونێکی تر بە هەمان جوانیی و دڵ ڕاکێشانەوە بە دوای‌دا دێت... بەڵێ ! هەموو شتێك یەك لە دوای یەك دێن ، پاشان یەك لە دوای یەك کۆچ ئەکەن . بەڵام داهێنەری ئاسمانەکان و زەویی بە تاك و تەنیا بەبێ تیاچوون و ئاڵ و گۆڕ و بەفەناچوون ئەمێنێتەوە .

کاتێك کە خوای باڵادەست سەخاوەت ئەنوێنێت و نووری ژیان بە هاتووان ئەبەخشێت ، بەوە مانای بوون بۆ خاوەن ژیرییەکان دەر ئەبڕێت . کاتێکیش کە تازە هاتووەکان ، دوای ڕۆیشتنی تیاچووەکان ، هەمان ناز و نیعمەتیان پێشکەش ئەکرێت ، خوای گەورە بەوەش ئاماژە بۆ هەمیشەیی و هەتاهەتایی خۆی ئەکات.[٤]



﴿ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ ﴾

( البقرة : ١٢٤ ) .

دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە کە ئیبراهیم سەلامی لێ بێ یەکەم کەس بووە کە خەتەنە کراوە و ، یەکەم کەسیش بووە کە میوانداریی کردووە و ، یەکەم کەسیش بووە کە نینۆکی کردووە و ، یەکەم

---

[٤] وشەی ( البدعة ) لە هەمان ڕەگەوە هاتووە ، کە بریتی‌یە لە هەموو ئەو شتانەی کە لەوەو دوا بۆ دین زیاد کراون لە فیکر و کردەوە و ، لەو نین . وشەی ( البدعة ) ش پێناسەی جیا جیا کراوە ، بۆ نموونە: (( بریتی‌یە لە هەر کردەوەیەك کە پێغەمبەری خوا ﷺ و خەلیفە راشیدەکان بە نیەتی خواپەرستیی ئەنجامیان نەدابێت )) . یان : (( هەموو خواپەرستی‌یەك یان کردەوەیەکی چاك کە دوای پێغەمبەری بەڕێز ﷺ و دوای خەلیفە راشیدەکان دەرکەوتبێ و، ئەبوبێتە مایەی بەرزکردنەوەی سوننەتێك لە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ )) . هەڵوێستی زانایانیش بەرامبەر بە بیدعە جیا جیایە ، هی وایان هەیە زۆر بە توندیی دژی ئەوەستێت و ، هی واشیان هەیە هەڵوێستی ئەرمی هەیە . هەڵوێستی مامۆستا سەعیدی نوورسییش هەڵوێستێکی ناوەندی‌یە . جا ئەگەر ئەوەی کە داهێنراوە لە لایەنی ئوصولەوە لەگەڵ هیچ بنچینە و دەستوورێك پێچەوانە ئەبوو بە بیدعەی چاك ئەژمێررێت و ، گەر لەگەڵ هیچ دەستوورێکی ئوصولییش‌دا توانا ئەبوو ڕێك بخرێت ئەوا بیدعەی خراپە . والله أعلم بالصواب .

کەسیش بووە کە سمێڵی کورت کردۆتەوە ... تد . بەڵام ئەتوانین بڵێین کە ئەم کارانە پێشی ئەو هەبوون ، چونکە ـ بە پێی ئەوەی کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕراوەتەوە ـ ئەو شتانە کاری فیترەی ساغن . لەبەر ئەوە لەسەرمان پێویستە لێرەدا بە مانایەکی نیسبیی سەیری ئەو پێشکەوتنە یان پێشەوایەتی‌یە بکەین. لەوانەیە ئەو شتانەی لە چاو قەومەکەی‌دا بووبن نەك لەم کارانەدا یەکەمی هەموو کەس بووبێت لە سەردەمی ئادەمەوە سەلامی لێ بێت . بۆ نموونە مووسا پێغەمبەر سەلامی لیّ بێت لە شوێنێك‌دا ئەفەرموێت : ﴿ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ( الأعراف : ١٤٣ ) . ئاشکرایشە کە ئەو یەکەم ئیمان‌دار نەبووە ، کەواتە یەکەمیی لێرەدا لە چاو قەومەکەی‌دا بووە . لەبەر ئەمە راست ترین قسە کە بگونجێت دەربارەی تاقیی‌کردنەوەی ئیبراهیم سەلامی لیّ بیّ بوترێت ئەوەیە کە ئەو تاقیی‌کردنەوەیەی بە چاکترین و تەواوترین شێوە بڕیوە و ، هەرچییش پەیوەندیی بە شیرکەوە بووبێت بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا ـ کە هەتا مرۆڤە سەرەتاییەکانیش لێی تێ بگەن ـ داوەتە دواوە .

وشەی (( البلاء )) لە هەمان رەگی (( الإبتلاء )) و تاقیی‌کردنەوەوە دێت . لە وشەی (( الإبتلاء )) ئەوە تێ ئەگەین کە بە مانای دەرخستنی هەندێ دەست کەوتی ناوەکیی یان باطینیی مرۆڤ دوای تاقیی‌کردنەوەی هاتووە ، یان دەرخستنی لایەنی جوانیی یا ناشیرینیی تیایا ... چاکە یان خراپە ... بەرز و بەرێزیی یان شووك و نزمیی .

بەڵام مرۆڤ شان بە شانی ژیانی دڵ و رۆحی خاوەنی ژیانێکی لاشەیی و دەروونیی و خاوەنی هەوا و ئارەزواتە . جا لە لایەنی ژیانی دڵ و رۆحیەوە لە جیهانی غەیب و لە ( حەق تەعالا ) وە نزیکە و ، لە هەمان کاتا لە دوو توێی ژیانی دەروونیی‌دا هەوڵ ئەدا بە پلەکانی مرۆڤی کامڵ بگات . بۆ ئەمە بەردەوام لە نێوان تەکلیف و فەرمانە خواییەکان و لە نێوان داواکاریەکانی لاشە و دەروون‌دا لە زۆرانبازیی‌دایە و ، هەڵبژاردنیش بۆ هەڵسەنگاندن لەبەر دەمیدایە

و، هەندێ جار لەو تاقیی‌کردنەوەیەدا سەرنەکەوێت و ، هەندێ جاریش تێک نەشکێت و راستیی ناپێکێت . کەواتە ئەمە تاقیی‌کردنەوە و هەڵسەنگاندنێکی روونە و ، سەرکەوتوو و دۆڕاوی تێدا دەر ئەکەون .



﴿ قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةً تَرۡضَىٰهَاۚ ﴾

( البقرة : ١٤٤ ) .

یەکەم شتێك کە لە ئایەتەکەدا سەرنجی ئەگرین ناوبردنی رەزامەندیـیە لەگەڵ گۆڕینی قیبلە بەرەو کەعبە . جا لەوانەیە هەندێك دەربارەی پەیوەندیی نێوان ناوبردنی رەزامەندیی لەگەڵ گۆڕینی قیبلەدا پرسیار بکەن ، تا ئەم جۆرە شێوازە بەکار بهێنرێت .

هەروەك بە کورتە شەرحی نوکتەکانی ئایەتی ژمارە ( ١٥٠ ) ی سوورەتی ( البقرة ) ئەکەین ، ئەوا بە وەرگرتنی ئەم ئایەتەش لە گۆشەیەکی سۆفێتی‌یەوە ئەبینین پەیوەندیـیەکی پتەو لە نێوان ( الحقيقة الأحمدية ) و نێوان ( حقيقة الكعبة ) دا هەیە . کورت‌تریین روون‌کردنەوەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە هەندێك لە ( متصوفة) وتوویانە کە حەقیقەتی موحەممەدی پێغەمبەر ﷺ و حەقیقەتی کەعبە دوانەیەکن کە لە جیهانی ( إحتمال ) دا پێکەوە بەدیی هێنراون .

مزگەوتی ( الأقصى ) لە سەردەمێکی دیاریی‌کراودا لە مەککە و مەدینەدا بە هۆی چەندین حیکمەتەوە قیبلە بوو ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە تاسەیەکەوە و بەوپەڕی ئارامەوە چاوەڕوانیی رۆژی بەیەك گەیشتنەوەی لەگەڵ کەعبەدا و رووتێ‌کردنی ئەکرد ، کە لە تاسەمەندیی عاشق بۆ دۆستەکەی زیاتر بوو و، ئەوەش کە لە دڵیا کۆ بووبوویەوە بە خوای ئەگەیاند . لە راستیی‌دا پێغەمبەر ﷺ بە وێنەی پێغەمبەرەکانی تر ـ دیارە نموونە هێنانەوەش چەندوچۆنی ناوێت ـ

وەك باڵندەیەكی قیامەتیی وەها بوو ، هەتا لە جیهانەكەی تریش‌دا ، هەوڵی شارەزابوونی لە سنوورێك‌دا نەئەوەستا . هەرچیی بەرز و بڵند ئەبوویەوە هەوڵی گەیشتن بە بەرزتر و بەرزتری ئەدا بە رادەیەك كە ئەوە هەموو بایەخ پێ‌دانێكی ئەگرتەوە . ئەوەبوو بەرز بوویەوە هەتا گەیشتە ( سدرة المنتهى ) و ( قاب قوسین ) و نزیك تریش و ، لە چەندین جیهانی تردا گەشتی خۆی تەواو كرد ، بێ ئەوەی هیچ هێزێكی راكێشان یا شتێكی تر رێی پێ بگرێت و ، بێ ئەوەی سەری گێژ ببێ یان چاوی كلا بكات . ئەمەش بریتیی بوو لە لایەنێكی تری لە مەزنیی‌دا .

بەڵێ ! ئەم پێغەمبەرە بەرێزە ، كە سەرداری ئینس جینن بوو و ، لەو جۆرە جیهانانەدا گەشتی كرد و ، باڵی مەلائیكەتیش لە ژێر هەردوو پێیی‌دا را خرابوون، چاوی ئەبریە ئاسمان و ، فەرمایشتی لەگەڵ پەروەردگاریا ئەكرد و، داوای لێ ئەكرد لەگەڵ حەقیقەتی كەعبەدا كۆی بكاتەوە و ، بەوپەڕی نەرم و ناسكیی لێی ئەپاڕایەوە : پەروەردگارم ! كەی ؟ كاتێكیش كە خوای بالآدەست ئەو ویستەی بۆ بەجێ هێنا شتێكی سروشتیی بوو كە رازیی ببێ ، بۆیە پەروەردگاری پێی فەرموو : ﴿ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ﴾ ( البقرة : ١٤٤ ) ، ئەمە لە هەمان كات‌دا ئەوەشی ئەگەیاند كە پەروەردگاری لەو قیبلەیە رازی‌یە كە بۆی هەڵبژاردووە .

بەم میحرابە نوێیە ، مزگەوتی ئەقصا ـ لەگەڵ پاراستنی تەواوی پلە و پایەی موبارەكی پەسەندی خۆی ـ دوو هەنگاو گەڕایە دواوە ، تا ئەم ماڵە دێرینە كە پایە و پلەی لە دڵاندا كەم ناكات ، ببێتە نەزەرگەی خوایی ، ئەمەش لە سەردەمێك‌دا كە مرۆڤایەتیی ئامادەی بەرزبوونەوە بوو بەرەو سەردەمێكی فیكریی نوێ و ، بەرەو سەردەمی عەقیدەیەكی نوێ و ، تا نووری بدرەوشێتەوە و، نهێنیی‌یەكەی ئاشكرا ببێت و بە دوانەكەی كە پێغەمبەرە ﷺ و ، بەو ئیمان دارانەش كە شوێنی كەوتوون بگات و ، تا بە گەرمی‌یەكیش بیان‌گرێتە باوەش

که لەوەو پێش هیچ کەس ئەوەی دەست نەکەوتبێت و ، تا بۆ یەکەم جاریش و دوا جاریش ژیانی سەرەتا و کۆتایی بیروباوەڕ پێکەوە بەسەر بەرێت .



﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ﴾

( البقرة : ١٤٤ ).

لە کۆتایی ئایەتەکەدا رووتێکردنێکی جیاواز هەیە . جا رووکردنی پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتادا بەرەو مزگەوتی ئەقصا بریتیی بوو لە ئامادەکاریيەك بۆ نەرم کردنی دڵی جوولەکەکانی مەدینە تا پێغەمبەرییەکەی وەربگرن . واتە وریاکردنەوەی دڵەکانیان و وەهایان لێ بکرێت بڵێن: (( لەوانەیە پێغەمبەر بێت)). لە کاتی روو وەرگێڕانی قیبلەشدا بەرەو کەعبە یارمەتیی نەرم کردنی دڵی ئەو موشریکانەی مەککەی دا کە خۆیان لەسەر میللەتی ئیبراهیم سەلامی لێ بێت ئەژمارد ، بەڵام میللەتێکی جیاواز لە موسڵمانەکان و ، وەهایش لەو موشریکانە بکات کە ئاوڕ بە لای پێغەمبەرایەتیی موحەممەدەوە ﷺ بدەنەوە . واتە کاتێك ئیسلام دەری خست کە رێز لەو شوێنانە ئەگرێت کە جوولەکە و موشریکەکان بە شوێنی پیرۆزیان ئەزانن ، ئەوە کاری ئەکردە سەر هەڵوێستی ئەوانە . جا ئەم ئایەتە نموونەیەکە لەو ئایەتە قورئانییانە کە رۆح و دەروونی مرۆڤایەتیی چاودێریی ئەکات و ، لایەنی دەروونیی مرۆڤ بە شێوەیەکی قووڵ و بەناو یەکدا چوو بەرچاو ئەگرێت . لەوانەیە ئەم بابەتە لە مێژووی تەفسیردا لە هەموو بابەتەکان کەمتر بایەخی پێ درابێت .

وشەی (( الشطر )) بە چەند مانایەك دێت لەوانە نیوەی شت یان بەشێکی یان رووەو ئەو شتە . ئەمەش ئەوەمان بۆ دەر ئەخات کە واجبە و پێویستە بە پێی

توانا روو له حەرەمی شەریف ، واته کەعبەی موشەررەف بکرێت . جا زۆرێك لە هاوەڵان و ئیمامە تابیعی‌یەکان لەسەر بناغەی ئیمکانیەتی مرۆڤ بۆ رووکردنە کەعبە بە پێی ئەو شوێنانەی کە وا تیایانا ، لەم مەسەلەیە تێگەیشتن . واتە ئەو کەسەی کە وا لە حەرەمی شەریفدا پێویستە بە رێك و پێکیی روو بکاتە ناوەڕاستی کەعبە یان بەشێکی بە لایەنی کەمەوە . بەڵام ئەوانەی کە لە کەعبەوە دوورن پێویستە رووە و کەعبە روو بکەن ، ئەمەش بە پێی فەرمانی ئایەتەکە :

﴿ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ ﴾ .

هەروەها رستەی ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ﴾ لە ئایەتەکەدا ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە لەگەڵ واجب بوون و بە پێویست بوونی رووکردنە قیبلە لە نوێژدا ، دیسان ئاماژەش بۆ ئەوە ئەکات کە بە پێی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ : ( وجُعِلَتْ لِيَ الأرضُ مَسجِداً ) پێویست بە دیاریی‌کردنی شوێنێکی تایبەت ناکات بۆ نوێژ .

* * *

﴿ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِي وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ ( البقرة : ١٥٠ ) .

دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە مەدینە و شەرەفمەندی کرد ، ١٦ یان ١٧ مانگی بەسەر برد و لە نوێژدا رووی ئەکردە مزگەوتی ئەقصا . دیارە لەو رۆژانەدا کەعبە پڕ بوو لە بت . جا لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بە دینی تەوحید رەوانە کرابوو و بایەخێکی بە بتەکان نەئەدا ، ئەوا ماوەیەکی دیاریی‌کراو لەوە قەدەغە کرا کە لە نوێژدا روو بکاتە کەعبە ، تا هەڵوێستی یەکجارەکیی خۆی بەرامبەر بە بتەکان دەر ببڕێت .

لە راستییش‌دا پەیوەندی‌یەکی پتەو لە نێوان حەقیقەتی ئەحمەدیی و لە نێوان حەقیقەتی کەعبەدا هەیە و ، پێغەمبەریش ﷺ ـ بە پێی ئەو فیترەتەی کە لە نەزەلەوە خوا لەسەری بەدیی‌هێنا بوو ـ هەستی بەوە ئەکرد و ، پێی خۆش بوو روو لە کەعبە بکات و ، بۆی پەرۆش بوو . جا قورئانی پیرۆز ئەو روو تێ‌کردن و پەرۆشی‌یەی شەرح کردووە : ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾( البقرة:١٤٤).

بەڵام ئامانجی پێغەمبەر ﷺ لە روو گێڕانی بە ئاسمان‌دا بریتی‌یە لە حەزکردنی لەوە کە خوای باڵادەست دەربارەی بابەتی گۆڕینی قیبلە حوکمێکی نوێ دەر بکات . بەڵێ ! چاوەڕوانی هەواڵێکی ئاسمان بوو . لەبەر ئەوە ئەبینین ئایەتەکە دوای ئەوە مژدەی ئەداتێ : ﴿ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ﴾ . بە رواڵەت تێ‌گەیشتن لەم حەقیقەتە کارێکی گرانە و ، تەنها پێغەمبەر ﷺ خۆی لەمە ئەگەیشت ، کە بە فیترەتی بە چاکیی دەرکی بەم پەیوەندی‌یە پتەوەی نێوان خۆی و نێوان کەعبە ئەکرد .

بەڵێ ! حەقیقەتی کەعبە پەیوەندی‌یەکی پتەوی بە پێغەمبەرەوە هەبوو، بەڵام مەسەلەی تەوحید کە هۆی رەوانەکردنیەتی ، زۆر زۆر لە پیرۆزیی کەعبە و، لەوەی کە قیبلەی نوێژ بێت ، گرنگترە . لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ لە مەککە لە نوێژدا رووی لە مزگەوتی ئەقصا ئەکرد و ماوەیەکیش لە مەدینەدا لەسەر ئەوە بەردەوام بوو .

بەلام جولەکەی مەدینە ـ لە روانگەی ئەوەوە کە موسڵمانەکان رووی قیبلەیان بەرەو مزگەوتی ئەقصایە ـ دەریان ئەبڕیی کە خۆیان ئەصڵن و موسڵمانەکان پاشکۆیانن ، تا ئەو باسە بکەنە بەڵگەیەك بۆ راستیی دینەکەیان. خۆ ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بیویستایە هەر لە سەرەتای گەیشتنیەوە بۆ مەدینە قیبلەی بەرەو کەعبە ئەگۆڕیی . بەڵام ئەو بە ویست و حەزی خۆی هەڵس و کەوتی نەئەکرد ، بەڵکو بەردەوام لە هەموو کاروبارێکی‌دا دڵی بە دڵسۆزیی بە

خواوه بەستراوه و ، چاوەڕوانی فەرمانی ئەوه و ، ئەو فەرمانانەی ئەو پێش حەز و ویستی دڵی خۆی ئەخات . پێغەمبەر ﷺ مرۆڤێك بوو لە چڵەپۆپەدا و لە بەرزی‌یەوه سەیری دوورترین ئاسۆی مرۆڤایەتیی ئەکرد ، لەگەڵ ئەوەش‌دا لە یادی نەئەچوو کە ئەو بەنده و پێغەمبەره وگوێبیستی فەرمانی خوای باڵادەستە.

هەروەها پێغەمبەریش ﷺ ـ بە رووکردنیە مزگەوتی ئەقصا ـ نووری هیدایەتی لە دڵی چەند کەسێکی یەهووددا ، وێنەی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، هەڵگیرساند . ئەشگونجێ ئەم سیفەتەی پێغەمبەر ﷺ لە کتێبەکانیان‌دا باسی هاتبێت . بە هەر حاڵ هەندێك جوولەکە خوا هیدایەتی بۆ سەر ئیسلام دان. دوای شانزه مانگ یان حەڤدە مانگ لەم رووکردنە بەرەو مزگەوتی ئەقصا ئاوات هاتە دیی و ، ئەو خەڵکە هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوه نەما بتوانن دژی موسڵمانەکان بەکاری بهێنن . واتە لە توانای موشریکەکان‌دا نەبوو بڵێن : (( ئێوه روو لەو کەعبەیە ئەکەن کە پڕیەتی لە بتی ئێمە ، کەواتە دینەکەی ئێمە ئەصڵە ! )) و ، لە توانای یەهوودیش‌دا نەبوو بڵێن : (( ئێوه روو لە قیبلەکەی ئێمە ئەکەن ، کەواتە دینەکەی ئێمە ئەصڵە )) . لەم جۆره بارودۆخەدا فەرمانی خوایی هات بۆ رووکردنە مزگەوتی حەرام ، بەمە بەیەك گەیشتن لە نێوان زاتی پێغەمبەر ﷺ و ، زاتی کەعبەی موشەررەف‌دا رووی دا .

لە ( العهد القديم ) دا هەندێك ئاماژه هەن کە پەیوەندی‌یان بە.ئەشعیاوه سەلامی لێ بێت هەیە ، کە ئاماژه بۆ ئەوه ئەکەن رووداوەکان بەو شێوه روو ئەدەن کە روویان داوه ، چونکە هەندێك لە جوولەکەکان ، بە پشت بەستن بەم ئاماژانە ، ئەیان وت : (( قیبلەی پێغەمبەری هاتوو بەرەو مەککە ئەبێت ، بەڵام هێشتا موحەممەد لە نوێژدا روو لە ( بيت المقدس ) ئەکات )) . ئەمەش تیشك ئەخاتە سەر هەندێ لایەنی ئەم باسە .

﴿وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ﴾ واتە رووکردنتان لە نوێژدا بەرەو مزگەوتی ئەقصا نیعمەتێك بوو ، بەڵام نیعمەتی ئەصڵیی و گەوره بریتیی بوو لە بەیەك گەیشتنی

خۆشەویستان ، واتە بەیەك گەیشتنی پێغەمبەر ﷺ ـ کە نوێنەری ئوممەتی ئیسلامە ـ بە کەعبە و ، لەوێشەوە دواتر بەرزبوونەوە بەرەو ( سدرة المنتهى ) تا روو بە روو نیعمەتی خوایی دەستگیر ببێ ، ئەمەش تەنها بە رووکردنە کەعبە نەبێت . بەم شێوەیە خوای بالادەست نیعمەتی خۆی پێشکەش کرد و ، ئەمەش شەرەف مەندیەکە خوا بەم ئوممەتەی بەخشیی ، کە سۆز و رەحمەتی بە لێشاو بەسەریا رژاند ..



﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾

( البقرة : ١٥٣ ) .

ئارامگرتن واتە نەلەرزینی حاڵ و عەقڵی ئیماندار و ، دامەزراویی و شپرزە نەبوون لەگەڵ یەکەم لێقەوماندا ، کە مرۆڤ بەرەو یاخیی بوون راتەکێشێت و، ئەبێتە هۆی هەڵچوونی هەستە خراپەکان ، یان لە یەکەم ساتی بیستنی فەرمانی گوێڕایەڵیی و بانگەواز بۆی . ئەو فەرموودە شەریفەش کە ئەفەرموێ : ( إنَّما الصَّبرُ عِندَ الصَّدمَةِ الأُولى ) ئەم مانایە دەر ئەخات ، ئەگەر نا ئەو ئارامەی کە دوای یەکەم شۆکە و بەرکەوتن و ، دوای هێوربوونەوە دێت بە ئارامی تەواو ناژمێررێت .

وا چاکە لێرەدا ئاماژە بە کارێك بدەین ، کە ئەویش ئەوەیە گەورەترین ئارام ئارامگرتنە لەسەر گوێڕایەڵیی خوا و ، شوێنکەوتنی فەرمانەکانی و، دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکانی . چونکە مرۆڤ تەنها بە گوێڕایەڵیی ئەگاتە برجی تەوحید و ئاسۆی بەندایەتیی . ئیتر دوای ئەم پلەیە مرۆڤ ئامادەی ملکەچیی ئەبێت بۆ هەموو ئەو شتانەی کە لەلایەن خوای بالادەستەوە دێن .

لێرەدا ئەمانەوێ بەوانەی کە بڕیاریان داوە گەشتی بەرەو هەتاهەتایی دەست پێ بکەن بڵێین : ئەگەر بڕیارتان داوە بەرەو مەبەستێك بڕۆن کە لە هەموو لایەنەکانیەوە بۆنی هەتاهەتایی لێ بەرز ئەبێتەوە ، ئەوا گەیشتن بە ناوەها مەبەستێك پێویستیی بە گرتنە بەری ڕێیەکی دوور و دژوار هەیە . جا بە پێی یاسای (( بە هەندی ڕەنج و تەقەلا ، بەرزییەکان دەست گیر ئەبن )) ، ئەوا ڕێگرتنە بەریش بەرەو لووتکە بەرزەکان بە چیا و دۆڵ و لووتکەکاندا تێپەڕ ئەکات و ، ئەو کەسەش کە ئەو ڕێیە ئەبڕێت چەندین نارەحەتیی و دژواریی دێنە ڕێی . چونکە نەفسێکی بەدخواز لە ناو خودی مرۆڤ دا هەیە کە لەبەردەم وەسوەسە و پێشنیار و گومڕاییەکانی شەیتاندا دەرگای واڵا کردووە . لە دەرەوەی مرۆڤیشدا مولحید و ئینکاریکەر و زاڵمان هەن کە هەموو جۆرە زوڵم و زۆرداریی و هێرش و غەدرێك ئەنجام ئەدەن . بەم شێوەیە بەردەوام ئێوە لە گرفتی ماددیی و مەعنەوییدا ئەژین . هەوڵ ئەدەن بەرگە بگرن و کێڕەی ددانیشتان دێت . لە هەمان کاتدا لەوانەیە ناچاری وەڵام ئامادە کردنیش ببن بۆ زۆرێك لەو کارانەی کە هەموو کاتێك لە لای ڕاست و لە لای چەپەوە دێن . جا ئەگەر خۆتان ئامادەی ئەمە نەکردبێت و ، لە لایەنی ڕۆحیی و جەستەیییەوە خۆتان بە دەستەوە نەدابێت و ، مەشقێکی چاکتان نەکردبێت و ، بە وەرزشی مەعنەویی پێویست و ، بە بڕی پێویست خۆتان ڕانەهێنابێت ، ئەوا لەو ڕێیەدا تیا ئەچن و سەرگەردان ئەبن و ، تواناتان نابێت لەسەر ڕەوتی خۆتان بەردەوام بن، یان ئەو ڕەوتە لە شێوێك لەو شێوە مەعنەوییانەدا کە پێچەوانەی بیر و هەستی بنەڕەتییتانن ئەنجام ئەدرێت .

یەکەم قەڵایەکیش بەرامبەر ئەو مەترسییانەی کە ئەگونجێت بێنە ڕێ پشت بەستنە بە ئارام گرتن ، چونکە ئەبێتە ئەو زەمینە ڕەق و بتەوەی کە پێتان لەسەری ناخلیسکێت . بە ڕاستیی بڕی سەرکەوتن لە ژێر سایەی ئارامگرتندا نەخشە ئەکێشرێت و ، بە تابلۆی ئارامگرتنیش دووڕیانەی ڕێی خێر و ڕێی شەڕ

روون ئەبێتەوە و ، بە دەرمان و چارەسەرییەکانی ئارامگرتنیش نەبێت بەندایەتیی ڕاستەقینە بۆ خوای باڵادەست نایەتە دیی و ، بە ئارامگرتنیش توانای سەرکەوتن بەرەو پلەکانی حەقیقەتەکانی ئیمان و ئیسلام و ئیحسان ئەبێت . جا ئەگەر مرۆڤ بە درێژایی تەمەنی ئامانجێکی هەبێت تا لە ئیمانەوە بگوازێتەوە بۆ مەعریفە و، لە مەعریفەشەوە بۆ خۆشەویستیی و ، بۆ ترس و بیم و ، ئەیەوێت تامی چێژە ڕۆحییەکان بکات و بگاتە ویصالی ڕاستەقینە ... ئەگەر ئامانجێکی لەو شێوەی هەبێت لەسەری پێویستە توێشووی ئەو ئارامە هەڵ بگرێت کە ئەبێتە پاڵپشت و سەرچاوەی هێز و ، ئەشبێتە ئەو هاوەڵەی کە لێی جوێ نابێتەوە . ئەگەر بیر لە جۆرەکانی ئارامگرتن بکەینەوە ، بۆمان دەر ئەکەوێت کە ئارام گرتن بڕگەی یان ماددەی یەکەمە لەو ڕەچەتەیەدا کە بۆ بەرزبوونەوە و پێشکەوتنی ئادەمیزاد نووسراوە .

نوێژ ـ کە ئەویش مەشقێکی تیایە لەسەر ئارامگرتن ـ گرنگ ترین هۆکارە بۆ دامەزرانی ئیمان و، پاككردنەوەی ڕۆح و ، دەستخستنی تەندروستیی و، گرنگ ترین هۆیەکیشە بۆ لەیەك گەیشتن و، جۆریی و ، یەکگرتنی کۆمەڵایەتیی و، ڕوونترین دیاردەشە بۆ قەوارەی ئوممەت و ، سەری هەموو خواپەرستییەکانە و، ڕێ و هێڵی کەشتیی دینە و ، پەیژەی نوورانییشە بۆ میعراجی دڵ .

جا هەر کەسێك بە نوێژکردن ئیمانی بە بەشێك لە سروشتی خۆی گێڕا بێت و، ئەو ئیمانەی کردبێتە ئامێرێك کە ڕۆحی پێ پاك و خاوێن بکاتەوە و ، ژیانی دڵیشی پێ فراوان و قووڵ بکات و ، لە ئاو و هەوای فینکی نەرم و نیانیشیدا هەست بکات کە ئەو وا لە نێوان ئوممەتێکدا کە وەك بینای بتەو وەهایە .. هەر کەس خوا بۆ ئەوە تەوفیقی دا ، ئەوا بە ئاسانیی ئەتوانێت بەسەر هەموو کۆسپەکانی ڕێی خواپەرستییدا زاڵ ببێت و ، بە ئامانجی خۆی بگات .



﴿ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴾ ( البقرة : ١٥٨ ) .

﴿مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴾ ( النساء : ١٤٧ ) .

لەم دوو ئایەتەدا ئەبینین وا خوای بالآدەست بە سیفەتی ((شاکر ـ سوپاس کەر)) خۆی پیشان ئەدا لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو (( مشکور ـ سوپاس کراو )) ە . بە پێی رای دەستەوسانی من ئەوەی کە لێرەدا ویستراوە ئاماژەی بۆ بکرێت بریتی‌یە لە بنەمای ( مقابلة ) . واتە خوای مەزن بەرامبەر بە کردەوەی بەندەکانی هەمان کردەوە بەرامبەریان ئەکاتەوە و ، ئەمەش یەکێکە لە رەوشتەکانی خوا . جا ئەمە بە تەنیا بابەتی شوکر ناگرێتەوە ، بەڵکو بە هەمان شێوە لە ئایەتە قورئانیەکان و فەرموودە شەریفەکاندا لە مەسەلەکانی تردا ( مقابلة ) ئەبینین . بۆ نموونە : ﴿ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ ﴾ ( المائدة : ٣٩ ) . ئەفەرموێ : هەرکەس دوای زوڵم و ستەم تەوبە بکات و خۆی چاک بکات ، خوایش تەوبەی لێ وەر ئەگرێت .

پێغەمبەریش ﷺ لە پەروەردگاریەوە ئەگێڕێتەوە و ئەفەرموێ : ( إذا تقرب العبد إلي شبراً تقربت إليه ذراعاً ، وإذا تقرب مني ذراعاً تقربت منه باعاً ، وإذا أتاني مشياً أتيته هرولة ... ) .[5] ئەفەرموێ : ئەگەر بەندەکەم بستێك لێم نزیك کەوتەوە ، من باڵێك لەو نزیك ئەکەومەوە و ، گەر باڵێك لێم نزیك کەوتەوە، من باعێك لەو نزیك ئەکەومەوە و ، گەر بە رۆیشتن بە پیرمەوە هات ، من بە هەروەلە بە پیریەوە ئەڕۆم .

بەڵێ ! ئەوەی لێرەدا ئەمانەوێ ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە کە نیعمەتێك گەر لە هەر سەرچاوەیەکەوە هات پێویستە بە ( مقابلة ) پاداشت بدرێتەوە . ئەگەر ئەو حەقیقەتەمان بێتەوە یاد کە ئیمام ( بدیع الزمان ) ی نوورسیی لە وتەی

---

[5] البخاري ، التوحيد : ٥ ، التوبة : ١ ، مسلم ، الذكر : ٢ ، ٣ ، ٢٠ ـ ٢٢ .

یەکەمدا ئاماژەی بۆ کردووە کە ئادەمیزاد بەرامبەر بەو شتەی کە ئەیکرێت پارە بە بەقاڵەکە یان فرۆشیاری میوەکە ئەدات . چاکە ... بەڵام بەرامبەر بە خوای بالادەستی خاوەن و بەدیهێنەر و بەخشندەی هەموو شتێك چیی بکەین ؟ یان ئەو چیی لێمان ئەوێت ؟ دیارە پێویستە بەرەنگاربوونەوەمان لەگەڵ ئەم نیعمەتانەیدا بە پێی ئەوە بێت کە ئەو لێمانی ئەوێت .

ئەگەر مەسەلەکە لە لایەنی عەزابەوە وەربگرین هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نایەت . بۆ نموونە با سەیری ئەم ئایەتانە بکەین : ﴿ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَـٰدِعُهُمۡ﴾ ( النساء : ١٤٢ ) ﴿وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُ﴾ ( آل عمران : ٥٤ ) . پێویستە لەبەر رۆشنایی ئەم ئایەتە ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦ﴾ ( فاطر : ٤٣ ) لەم ئایەتانە تێ بگەین ، چونکە جائیز نیە کردەوە خراپەکان بدەینە پاڵ خوای بالادەست .

بەڵێ ! خوای بالادەست لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو کەسە ناگەڕێ کە نیعمەت وەر بگرێت و سوپاس بکات و ، بە ویستی خۆی بۆ رەزامەندیی خوا ببەخشێت ، هەروەها لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو کەسەش ناگەڕێ کە نیعمەت وەر بگرێت و نینکاریی بکات و ، کاتی بەخشینیش رژدیی بکات ، یان بە منەت‌کردن و ئازاردان خێر و صەدەقەکانی بەتاڵ بکاتەوە . جا ئەوانەی بە سوپاس‌کردن بەرەنگاری نیعمەتەکان ئەبنەوە ، ئەوانە ئەزانن هەر نیعمەتێك خوای بالادەست پێی بەخشیون لە عادەت و رەوشتی خواییە ، لەبەر ئەوە نابێت لە بەخشینیان بەسەر خەڵكدا رژدیی بکرێت و ، ئەمەش ئەبێتە هۆی داباریینی نیعمەتی تازە و، ئەبێتە هۆکارێکیش لە هۆکارەکانی نزیك بوونەوە لە خوای بالادەست . بەم شێوەیە ئەچنە ناو بازنەیەکی چاکەکارەوە کە خێر تیایا خێرێکی تر بەرهەم دێنێت ، تا لە کۆتاییدا بگەنە ئاسۆی ( معية ـ لەگەڵبوون ) ، ( وما يَزالُ العبدُ المؤمنُ يتقرَّبُ إلَيَّ بالنوافِلِ حتى أكونَ سَمعَهُ الذي يَسمَعُ بهِ ، وبَصَرَهُ الذي يبصرُ

بِهِ ، ويدَهُ التي يبطِشُ بِها ، ورِجلَهُ التي يَمشي بها ) . [٦] ئيتر تەنها چاكە ئەبینێت و ، تەنها چاكەش ئەبینێت و ، لە لادانی گۆشەی بینین ئەپارێزرێت و، هەرچییش ئەبینێت دەرسی عیرفانی لێ وەرئەگرێت و ، دڵیشی ئەبێتە گەنجینەی دانایەتیی و عیرفان .



﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾ ( البقرة : ١٦٥ ) .

وا ئەزانم ئەم ئایەتە پیرۆزە بۆ ئەم حەقیقەتە گشتی‌یەی خوارەوە ئاماژە ئەكات:

لە خۆشویستنی ئیرادیی‌دا پێویستە بە لای ئیمان‌دارەوە هیچ خۆشەویستی‌یەك نەبێت كە لە ژووری خۆشویستنی خوای باڵادەستەوە بێت . گۆڕانی خۆشەویستیی بۆ رەوشت و شعوورێك كە تێكەڵ بە كیانی مرۆڤ ببێت و خۆشەویستێكی شەیدای لێ دەرچێت پێویستیی بە كات ( زمن ) هەیە و، ئەمەش بە رادەی ناسینی خوایە لە لایەن ئەو مرۆڤەوە . خۆشویستنی ئیرادییش بریتی‌یە لە پەیوەندیی و پەسەندی‌یەك كە ئەم فەرموودە شەریفە : ( لا يُؤمِنُ أَحَدُكُم حتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيهِ مِن وَلَدِهِ ووالِدِهِ والنَّاسِ جَمِيعاً ) ئاماژە بۆ ئەم پلە و پایەیە ئەكات . لە راستیی‌دا خۆشویستنی راستەقینە بەم هەنگاوەی یەكەم‌جار دەست پێ ئەكات. ئەگەر بێینە سەر باسی هەستەكانی خۆشەویستیی فیطریی بە لای مرۆڤەوە وەك خۆشویستنی مرۆڤ بۆ دایك و باوك و ژن و سامانەكەی ... تد پێویستە ئەو

---

[٦] كەسێكی وەك ئەم بەندەیە كە ژیانی لە بارودۆخێكی بەرزیی و بڵندیی‌دا بە ئەنجام دانی فەرزەكان و سوننەتەكان بەسەر ئەبات ، یەكێكە لەوانەی كە فەرموودە شەریفەكە باسیان ئەكات .

خۆشویستنە لە چوار چێوەی ئەو خۆشویستنەدا بێت کە خوای باڵادەست فـەرمانی پێ داوە ، ئەگینا خوای باڵادەست ، هەر لە ژیانی دنیادا ، بە جۆرەها هۆ و ڕێگا بەندەکەی تووشی تاقییکردنەوە ئەکات و ، تۆڵەی لێ ئەسێنێت ، یان ئـەوەی بـۆ دوا ئـەخات بـۆ ڕۆژی قیامـەت . کورتەکـەی ئیمـاندار مرۆڤێکـی هاوسـەنگە و، پێویستە لە هەموو ساتێکیش‌دا پارێزگاریی لەو هاوسـەنگی‌یەی خـۆی بکـات و، لەبەردەم هەموو ویست و ئارەزووەکانی تری‌دا بی‌پارێزێت .

بەڵێ ! خەڵکانێك هەن کە لە بەگەورەگرتنی هەندێ کەس‌دا تا پلەی خوایەتیی زیـادەڕەویی ئەکـەن و ئـەڵێن : (( ئـەو پەروەردگارمانـە و ، پەرسـتراومانە و ، خوامانە )) و ، باسی ئـەوە ئەکـەن کـە ئـەو بـەدیی‌هێناون و ، لـە ستایشـی کـار بـەڕێوەبردنی لاف و گـەزاف لێ ئـەدەن و ، پلـە و پایـەی پەرسـتراوی ڕەهـای پـێ ئەبەخشن . جا هەرچەندە هەندێك لەوانە ئەم جۆرە بیر و هەستانە بە ئاشکرا دەر نابڕن ، بەڵام بەو هیوا و ئاواتەیان کە لێی بە تـەما بـوون و ، ڕوو نانیـان لێـی و، دەربڕینی هەمان پەیوەندیی و بایەخ پـێ‌دان ، هـەمان شیرك ئـەنجام ئـەدەن . جـا ئەگەر سیفەتی (( شیرکی ئاشکرا )) بەسەر دەستەی یەکەم‌دا بیڕین ، ئەوا دەستەی دووهـەم وان لـە (( شـیرکی ضـیمنیی )) و شـیرکی ناڕاسـتەوخۆدا و ، ئایەتـە پیرۆزەکـەش بـە توندیی بـە دەسـتەی یەکـەم‌دا هەڵئەشـاخێت و ، دەسـتەی دووهەمیش وریا و ئاگادار ئەکاتەوە .

پاشـان ئـەم ئایەتـە پردێـك لـە نێـوان خوایـەتیی و لـە نێـوان خۆشەویسـتیی‌دا دروست ئـەکات و ، سـەرنجی مرۆڤـەکان بـۆ لای هەسـتی ئـەو خۆشەویسـتی‌یە ڕا ئەکێشێت کە وا لە نێوان مرۆڤ و لە نێوان ئەوەدا کە بڕوای وەهایە کە پەرستراو و خـوای بێـت . جـا ئەگـەر دڵـەکان ملکەچیی بـۆ ئـەو خوایانـە قبـووڵ بکـەن و گوێڕایـەڵی‌یان بـۆ بکـەن ، ئـەوا لەسـەر ئیمـانداران پێویسـتە سـنگیان بـەو فراوانی‌یەی بکەنەوە و ، دەرگای دڵەکانیشیان بۆ خۆشەویسـتیی خـوای باڵادەسـت بخەنە سەر پشت و ، چاویش ببڕنە ڕەزامەندیی خوا و ، ئـەوەش بـزانن کـە بـەهای

راستەقینەی ژیانیان لەسەر گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانەکانی خوا وەستاوە و ، ئەو کارەش ئەنجام بدەن کە ئەو پێی رازییە و بۆ ئێمەی پێ خۆشە و ، ئامانجیش بریتیی بێت لە رەزامەندیی ئەو .

ئەوانەش کە خوایان خۆش ناوێت ، بۆ چارەنووس و سەرەنجامی نادیاریان، بەردەوام لە دڵەڕاوکە و ترس بیمدا ئەژین . بەڵام ئیمانداره راستەقینەکان لەو پێوانە راست و بە وردیی هەژمێرکراوە ئاگادارن کە پێغەمبەران و ئەولیایان و ئەصفیایان ـ ئەوانەی کە بوونە هۆ بۆ ئیمان هێنانی خەڵك و بۆ زیاتر ناسینی خوای باڵادەست ـ بۆ ئیماندارانیان داناوە و ، تەوحیدیش ترازوو و تەوەرەی ئەو خۆشەویستییەیە . ئەوان یەکەم جار خوایان بە شێوەیەك خۆش ئەوێت کە لە عیشق و شەیدابوون تێپەڕ بکات . بە هۆی ئەمەوە بەرامبەر بە هەموو شتێك لە غەیری خوا هەست بە پەیوەندییەکی نیسبیی ئەکەن . ئەوان هیچ شتێکی تریان وەك خوا خۆش ناوێت ، بەڵکو هەر شتێکیان بە خۆش ویستنێکی نیسبیی بە پێی نزیکیی ئەو شتە لە خوا و لە رەزامەندیی خواوە خۆش ئەوێت . جا ئەم خۆشەویستییە خۆشویستنێکی بتەو و باقیی ئەبێت و ، لەناو ناچێت و لەرزەشی پێ ناکەوێت ، چونکە ئەوە خۆشەویستییەکە لە عەقڵ و دڵ و مەنطیقەوە هەڵقوڵاوە .

* * *



﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴾ ( البقرة : ١٨٥ ) .

هیچ زۆرلێکردنێك ـ وەك یاسایەکی گشتیی ـ لە دیندا نیە . هەر شتێکیش بە قورس دەربکەوێت ئەبێتە هۆکارێك بۆ ئاسانیی . کورت کردنەوەی نوێژ لە سەفەردا و ، ماوەدان بۆ رۆژوو شکاندن لە چەندین حاڵەتی تایبەتییدا و، تەشریعی تەیەممومم ، هەموو ئەم کارانە لە شوێنی نارەحەتیی و ماندوێتییدا روو

له ئاسانیی و ماوەدان ئەنێن . بگرە هەتا چاوپۆشییش لەو هەڵانە ئەکرێت کە لە ئەنجامی لەبیرچوون روویان داوە .. هەرکەس لەبیری چوو و لە مانگی رەمەزان‌دا ئاوی خواردەوە ، یان خواردنی خوارد رۆژووەکەی بەتاڵ نابێتەوە ، بگرە بە پێشکەشی‌یەکی خوای باڵادەست ئەژمێررێ . ئەوەبوو جۆرەها ئەرك ، ئیترسا بۆ هۆکاری ئەصڵیی بووبن ، یان بۆ هۆکاری لاوەکیی هەڵگیران و ، رێی ئاسانکاریی گیرایە بەر . لەبەر ئەمە ئەتوانین بڵێین چەندین ئەرك و خواپەرستیی جوان هەن کە هەر یەکەیان بە بناغەیەك دا ئەنرێت بۆ گەیشتن بە بەختەوەریی هەتاهەتایی، وەك بەرهەڵست کردنی دەروونی بەدخواز و ، بەرزبوونەوەی ئاستی رۆح و، راهاتن لەسەر ئارام‌گرتن و ، خۆئامادەکردن بۆ قیامەت و ، بەدەست‌هێنانی نیعمەتی سەرکەوتن لەو رۆژەدا، بەڵام هەرکە نیشانەکانی نارەحەتی‌یان تیا دەر کەوتن، خێرا بە بریتی‌یەکی ئاسان و سادە ئەگۆررێن ، یان بە تەواویی لا ئەبرێن و، گەنجینەکانی پاداشت بە دەرگای بەرینی نیەتەوە ئەبەسترێن ، وەك گێرانەوەی نوێژ لەوەو دوا ، یان دانی فیدیەیەکی سادە ، یان لابردنی ئەرکەکە بە تەواویی ئەویش لە کاتی لەکارکەوتنی یەکجاریی‌دا .

گرانیی و ئاسانیی ملکەچ کردنیش بۆ فەرمانەکانی دین لەگەڵ حاڵەتی رۆحیی ئەو کەسانە و ئاستی زانیاری‌یان و ئەوەی کە لەگەڵیا را هاتوون ... تد رێژەیەکی راستەوانەی هەیە ، چونکە دین هەموو پلەکانی کۆمەڵگا یەك پێ ئەگرێت . واتە هەموو ئەوانەی کە سەر بە دینن ئیترسا مامۆستا بن یان کرێکار یان خزمەتکار ، نێرینە بن یا مێینە ئەتوانن بە پێی پێویستیی و لێ‌هاتنەکانیان کەڵك لە دین وەربگرن و ، هەر هەموو ئەشتوانن تامی شیرینیی ملکەچیی بۆ فەرمان و قەدەغەکانی ئەم دینە بکەن ، هەر یەکە بە پێی ئاستی خۆی . بەڵام ئەگەر سەیری بەها خۆیی‌یەکانی فەرمان و قەدەغەکانی ئیسلام بکەین ئەبینین پریەتی لە سووك و ئاسانیی و چاوپۆشیی و نەرمیی .

❊ ❊ ❊

﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ ( البقرة : ١٨٦ ) .

له چەندین بۆنەدا خوای بالآدەست نزیکیی خۆی لە بەندەکانیەوە دەر بڕیوە ، لێرەش‌دا ئەفەرموێ : من لە بەندەکانمەوە نزیکم . بەڵێ ! خوا لە بەندەکانیەوە زۆر نزیکە ، بەڵام بەندە بە پێی ئەو پلەیەی کە پێی گەیشتووە ، بە کاری پڕ لە ئیخلاصی و پاك‌بوونەوەی هەستەکانی ، خوای بالآدەست ئەناسێت . بێ‌گومان ناسینی خوای بالآدەست لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بە ویژدانی وەك ناسینی هیچ تاکێکی ئوممەتەکەی نیە ، ئەگەرچیی ئەو تاکە لە ئەولیایانیش بێت . ئەوەی گرنگ بێت لێرەدا ئەوەیە کە بەندە لە لایەکەوە هەوڵ بدات لە ناسینی خوای بالآدەست‌دا پلەی خۆی بەرز بکاتەوە و ، لەم مەیدانەدا کۆشش بکات و ، لە لایەکی تریشەوە مافی ئەو پایە و پلانە بدات کە پێیان ئەگات ، یان هەوڵیان بۆ بدات . یان لەسەر بەندە پێویستە لە لایەنی هەست و سۆز و بارودۆخی فیکری‌یەوە و ، لە لایەنی کاریشەوە بەو شێوە بژیت کە ئەو پلە و پایەیە لەسەری بە پێویستی ئەگێڕێت و ، لەو مەیدانەش‌دا ژیانی بەسەر بەرێت ، ئەگینا لەوانەیە لە لووتکەیەکی بەرزەوە بۆ ناو دۆڵێکی قووڵ بەر بێتەوە .

جا ئێمە لێرەدا پێش هەموو شتێك وەهای ئەبینین کە مژدەی نزیکیی لە خوای بالآدەستەوە بەستراوە بە زوو گیرابوونی دوعاوە و ، ئەو نزیکی‌یەش ـ کە لە دەرەوەی دووری‌یە هەندەکیی و چۆنێتی‌یەکانەوە و ، لە دەرەوەی هەموو دەرچەکانیەوە بێت ـ بەستراوە بەو دوعا پڕ لە ئیخلاصەوە کە لە خوا داوا ئەکرێت و، ئەنجامێکی ئەویشە .

شان به شانی ئەوەش پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە کاریگەریی دوعا لە دەرەوەی زنجیرەی هۆ و هۆکارەکانە ، لەبەر ئەوە دوای بێدەنگ کردنی ماددییەکان و سروشتپەرستەکان پێویستە ئەوە روون بکەینەوە کە هۆکارەکان و یاسا سروشتییەکان بەدیهێنراوی خوای بالادەستن و ، ئەوان سنوور بۆ ئیرادە و ویستی خوایی دانانێن و ، دەستیان بە سەریا ناڕوات و ، هەرگیز توانای ئەوەیان نیە و ، خوای بالادەست ئەگەر بیەوێت ئەتوانێت - شان بە شانی ئەو راستەوانەیەی کە لە سروشتدا هەیە - بە رووداوە لە رادە بەدەرەکان ، وەك موعجیزە و کەراماتەکان ، ئاڵ و گۆڕ بەسەر هەموو شتێکدا بهێنێت و، لالانەوە و پاڕانەوەو دوعاکان گیرا بکات و ، کۆمەڵە کاروبارێك بەدیی بهێنێت کە لە سەرووی هۆکارەکانەوە بن . جا هەر وەك ئایەتەکە ئاماژە بۆ ئەمە ئەکات ، باسی نزیکیی خۆیشی ئەکات کە لە دەرەوەی چەند و چۆنە ( واتە چەند و چۆن سنووری بۆ دانانێن ) و ، دوعاکردنیش بە هاوار نابێت - هەروەك کەڕ بدوێنێت - ، چونکە خوا هەموو چرپەیەك و ختوورەیەکی دڵ و نەفس ، بە وێنەی دەنگە بەرزەکان ، ئەبیستێت . لەبەر ئەمە پێویستە دوعا بە شێوەیەکی گونجاو و، لە چوارچێوەی ئەدەبی پێویستدا بۆ سوڵتانی ئاسمانەکان و زەویی ئەنجام بدرێت، کە ئەفەرموێ : ﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴾ ( ق : ١٦ ) .

پاشان بە پێی فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ ( البقرة : ١٨٦ ) ئەوانەی کە لە کرۆکی دڵیانەوە گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانەکانی خوا ئەکەن و ، لە هەموو کارێکیشیاندا ئامانجیان ئەوەیە بە ئیمانی کامڵ بگەن ، ئەوانە ( راشد ) ن و ، بە ئامانج و مەبەستەکانیشیان گەیشتوون . چونکە بەندە بە پلەی خۆدامالینی لە هەوا و ئارەزووەکانی و لە لاوازیی دەروونی و ، بە پلەی هانابردنی بۆ خوای بالادەست ، کاری خۆی بەو خوایە سپاردووە کە چاکەکاریی تایبەتیی و ، پشتگیریی تایبەتیی و ، مامەڵەی

تایبەتیی و ، میهرەبانیی خۆی پێئەبەخشێ کە کاری وەها ئەنجام ئەدات کە هەزارەها هۆکار لە هەزاران ساڵدا ئەنجامی نادەن .

* * *

﴿ وَقَـٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ﴾ ( البقرة : ١٩٣ ) .

ئەگونجێ ئەو وتەیەی هاوەڵی پایەدار عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لێیان رازیی بێ بهێنرێتەوە ، کە لە کاتی ئەو رووداوانەدا وتبووی کە لە نێوان عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر و حەججاجی کوڕی یووسفی ثەقەفیی روویان دا ، کاتێک کە دوو پیاو دێنە لای و پێی ئەڵێن : خەڵکیی دەستیان داوەتە کارێک ، تۆیش کوڕی عومەری و هاوەڵی پێغەمبەری ﷺ ، چیی لەوە قەدەغەت ئەکات تۆیش دەست بدەیتە کار ؟ وتی : ئەوە قەدەغەم ئەکات کە خوای گەورە خوێنی براکەمی حەرام کردووە . وتیان : ئەی خوا نافەرموێ : (( وَقَـٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٌ ؟ )). نافەرموێ : کوشتاریان بکەن هەتا ( فیتنە ) روو نەدات ؟ وتی : ئێمە کوشتارمان کرد هەتا ئەوەبوو ( فیتنە ) رووی نەدا و دین و ملکەچییش بۆ خوا بوو . بەڵام ئێوە ئەتانەوێ کوشتار بکەن بۆ ئەوەی ( فیتنە ) روو بدات و دین و ملکەچییش بۆ غەیری خوا بێ .

لە سەردەمی مەککەدا ـ کە زیاتر لە نیوەی سەردەمی پێغەمبەرایەتیی پێک ئەهێنێ ـ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریی موسڵمانەکانی ئەکرد کە لێبووردە و نەرم و نیان بن هەتا لە لایەن خوای باڵادەستەوە فەرمانێکی تر بێت . ئەمەش هەر هەمووی لە چوارچێوەی ئایەتی : ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ وَجَـٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ﴾ ( النحل : ١٢٥ ) و ، بە درێژایی

سیانزە یان چواردە ساڵ هەموو هەڵس و کەوتێکی موشریکان ، کە بریتیی بوون لە زوڵم و ستەم و کینە و سڵەمینەوە و دەست درێژیی و زەلیل کردن ، لەلایەن موسڵمانانەوە بە لێبووردن و چاوپۆشیی و خۆشەویستیی وەڵام درانەوە . دوای نوشستیی‌هێنانی ئەم ڕەفتارەی موسڵمانانیش بۆ نەرم‌کردنی دڵە ڕەقەکانی لایەنی بەرامبەر ، سەردەمی بە کارهێنانی هێز هێنرایە کایەوە ، ئەمەش تەنها بۆ یەك مەبەست ، کە بریتیی بوو لە قەدەغەکردن و وەستاندنی دەست درێژیی بۆ سەر دین و ، کوشتنی مرۆڤە بێ‌تاوانەکان و ، زەلیل‌کردنی بەرەکانی داهاتوو.

واتە یەکەم جار چاوپۆشیی و لێبوردن ، پاشان بەرگریی لە خۆکردن . جا بۆ دینێکی جیهانیی ، لە جیهانێك‌دا کە بڕوای بە یاسای هێز هەیە و بۆ بە حەق دەرخستنی ناحەق پەنای بۆ ئەبا ، ئەم کارەی ئیسلام کارێکی پێویست بوو. هەروەها بۆ وەستاندنی دوژمنانی دین لە سنووری خۆیاندا کارێکی پێویست بوو.. هەروەها بۆ سازکردن و ڕێك و پێك کردنی مەیل و ئارەزووەکان .. هەروەها بۆ سنووردانان بۆ ئارەزووەکانی دەروونی بەدخواز کە نیازی جەنگانی لەگەڵ کەسانی تردا و سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەریاندا هەبێ . هەموو ئەم هۆیانە لە پشتی مۆڵەت‌دان بە جیهاد و کوشتاری پێغەمبەرەوە بوون ﷺ ، کە لە کتێبە ئاسمانیی‌یە پێشووەکاندا بە (( خاوەنی شمشێر )) وەصف کراوە . جا هەروەك فێر بوو بوو چۆن کوشتار بکات ، وەهاش فێر بوو بوو چۆن صوڵح بکات . خۆ ئەگەر وێنەی ئەم کارامەیی‌یە پێغەمبەرانەیە نەبوایە ، ئەوا نەئەتوانرا دەست بەسەر ئارەزووەکانی دەروون‌دا بگیرێ کە سروشتی کوشتن و دوژمن‌کاریی‌یە . چونکە کاتێك کە هەستەکانی ئەکاتە حەکەم ، لە سەرەتای دەست پێ کردنی ناکۆکیی و کوشتاردا ، ئەوا جگە لە ڕشتنی چەندین گۆمی خوێن و ، جگە لە دروست کردنی چەندین (( پاڵەوان !! ))ی جەنگی خوێناویی ، هیچ مەبەستێکی تری نابێت . خۆ سروشتی ئەو بڕیارانەش کە ئەوانە دەریان ئەکەن شتێکی دیارە. لەبەر ئەوە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر دەستیان دایە چارەسەریی کەلێنەکان و ،

وشك‌کردنی سەرچاوەکانیان لە سروشتی مرۆڤ دا و ، ڕێك و پێك کردنیان و ، خستنیانە چوارچێوەی ڕژێمێکی نیشانە ئاشکراوە و ، داخستنی هەموو ئەو دەرگایانەش کە بەرەو خراپکاری‌یەکان سەر ئەکێشن و ، لە هەوا و ئارەزووە مرۆیی‌یەکانەوە هەڵ قوڵاون . ئەمەش بە دانانی بنچینەیەکی روون، یەکەم بۆ جەنگەکانی بەرگریی‌کردن و پاشانیش بۆ جەنگەکانی هێرش‌بردن، هەر کاتێ کە مەرجەکان و بارودۆخە پێویستەکان هاتنە دیی .



﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾( البقرة : ٢١٣ ).

هەندێك لە تەفسیرنووسان لە تەفسیری ﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾ دا ئەڵێن: ئادەمیزادەکان هەر هەموویان کافر بوون ، خوای گەورە نووح پێغەمبەر و پاشان پێغەمبەرەکانی تری سەلامی خوایان لێ بێت ڕەوانە کرد . بەڵام ئەم تەفسیرە بە هیچ شێوەیەك ڕاست نیە . لە سەردەمی ئادەمەوە سەلامی لێ بێت هەتا ئەمرۆ، لە هەموو سەردەمێك‌دا ، خەڵکیی بۆیان ئیمکان بووە هیدایەت لەسەر دەستی پێغەمبەرێك دا وەربگرن و ، شوێن ڕێگاکەی بکەون و ، خۆیان بە پلە بەرزەکان بگەیەنن . واتە هەمیشە ئەو هەلە ڕەخساوە و ، هی وایان بووە کەلکی لەو هەلە وەرگرتووە و ، هی واشیان بووە کەلکی لێ وەرنەگرتووە و وەك خۆی ماوەتەوە. بە هەر حاڵ ئادەمیزاد بەبێ ڕابەر نەماوەتەوە و ، هەرچەندە بە هۆی ئەو پەیامە تازانەوە کە پێغەمبەران سەلامیان لێ بێت پێیان ڕەوانە ئەکران ناکۆکیی ئەکەوتە نێوان ئادەمی‌یەکانەوە ، بەڵام ئەو هیدایەتەی کە ڕەوانە کردنی پێغەمبەران پێشکەشی ئەکرد یەکجار لەو ناکۆکی‌یە زیاتر بوو .

به پێی رای بدیع الزمان ، مامۆستا نوورسییش ئەگەر لە ناو صەد نەمامدا ده نەمام سەوز بن و ببنە درەختی بالاّ بەرز ، ئەوا ناوتری ئەو کشتیارەی خاوەنیان زەرەری کردووە . بە هەمان شێوە ئەگەر لە ناو صەد کەسدا ده کەس هیدایەت وەر بگرن و ئیمان بهێنن و لە ژیانیاندا لە هۆ و مەبەستی بەدیی‌هێنانیان ئاگادار بن ، ئەوا ئەوە بەسە کە تێکڕای خەڵك لە گاڵتەجاڕیی بەدیی‌هێنان رزگاری ببێت .

بەڵێ ! خەڵك لە سەرەتاوە ، بە هۆی چاکەی ئەو پێغەمبەرانەوە کە لە یەك سەرچاوەوە رەوانە کرابوون و پەیامەکانیشیان لە یەك ئاسمانەوە هاتبوونە خوارەوە، یەك ئوممەت بوون و ، ئەو کاریگەرییەش کە ئەو پەیامانە کردیانە سەر ویژدانی خەڵکەکە وەهای لێ کردن کە یەك کۆمەڵ بن ، ئیتر دڕونده دەر نەچوون و، دڵ و دەروونیشیان لە دین و ئیمان خاڵیی نەبوو و ، دەست درێژیی‌کەریش نەبوون . پاشان بە بۆنەی هەندێ هۆی لاوەکییەوە ناکۆکییان تێ کەوت و، یەکێتییان تێك چوو . ئەوەبوو یەکەم مرۆڤ کە لە هەمان کاتدا یەکەم پێغەمبەریش بوو ماوەیەکی دوور و درێژ خەریکی گەیاندنی تەوحید و چەسپاندنی بە یەکابوون بوو . پاشان هەندێ تەبیعەت کە لە ناخی مرۆڤدا چەقیون ـ ئەمەش لە پێناوی دەست خستنی هەندێك لە بەرژەوەندییەکانی و ، بە بۆنەی تاقی‌کردنەوەیشیەوە ـ ئاسەوار و کاریگەریی خۆیان دەرخست ، ئیتر هەڵپەی سۆز و ئارەزووەکان جێی عەقڵ و مەنتیقیان گرتەوە و ، ئارەزووەکانیش جێی هیدایەت . بەم جۆرە یەکێتیی و بە یەکابوون لەبەردەم ناکۆکییدا تێك شکان . بەڵام خوای بالاّدەست ، کە لە بناغەدا مرۆڤی لەسەر بنچینەی ئیستیقامەت و پاکیی بەدیی هێناوە ، پێغەمبەری نوێی رەوانە ئەکردن ، تا ئەو کۆسپانەی کە کەوتوونەتە نێوان دڵی مرۆڤ و حەقیقەتەکانەوە لایان بەرێت و، سەرەنجامی خراپەشی پیشان بدات و ، لە دڵیشیا هیوای چاکە بڕوێنێت و ، بۆ وریایی و ئاگاداریش بانگی بکات .

بەڵام هەندێکیان نەیانتوانیی لە دیلیی هەوا و ئارەزووەکان رزگار بن و، هەندێکی تریشیان نەیانتوانیی قەدەغەی خۆیان لە بەردەوام بوون لەسەر رێی زوڵم و تەکەببور بکەن . ئەمەش بووە مایەی بەردەوام بوون و پەرەسەندنی ناکۆکیی ، بەڵام بە رێی جۆراوجۆر و شێوازی تر، ئەگەرچیی لە جاران جیاواز بن.

لە راستیی‌دا ناکۆکیی یەکەمی نێوان خەڵکیی لە ئەنجامی لاوازبوونی حەقیقەتەکان بوو لەبەر چاویان و ، گۆڕانیان بۆ چەند راستی‌یەکی کزۆڵە و، پاشان شیی بوونەوەیان و جێ‌گرتنەوەیان لە لایەن شتی ترەوە . بەڵام ناکۆکیی دووهەم هۆی سەرهەڵدانی یان حەسوودیی بوو ، یان زیادەڕەویی و ئەوەی لەوەوە پەیدا ئەبێت لە تەئویل و تەفسیری هەڵە ، دوای ئەوەی کە حەقیقەتەکان روون بوونەوە و، هەموو خاڵە نادیارەکانیش بە بەڵگە و سەلماندن دەرکەوتن ، یان دەست دانە چەندین ئیجتیهادی رووکەش ، کە سەرەڕای بوونی سەلماندن و بەڵگەی خوایی، لە ئارەزووبازی‌یەوە سەریان هەڵداوە .

لەگەڵ ئەوەش‌دا خوای باڵادەست بە هۆی ئایەتە روون و ئاشکراکانیەوە ، لە مەسەلەکانی ئیجتیهاددا ، هەموو کون و کەلەبەرێکی گرتووە و ، هەموو ئەو رێگایانەشی داخستوون کە ئەبنە مایەی پەیدابوونی ئەو تەفسیرانەی کە لە هەوا و ئارەزووەکانەوە هەڵقوڵاون . تۆش ئەگەر بتەوێت بە زمانی فەقیهەکانەوە ئەمە دەر ببڕیت ئەوا ئەڵێیت : (( لا إجتهاد مع النص )) . واتە : کە دەق هەبوو ئیجتیهاد ناکرێت .

بەڵێ ! ئەوانە دەستیان نەدایە ئەو ئایەتانەی کە بانگەشەی رێککەوتن ئەکەن و ، هۆیەکن بۆی ، بەڵکو هەڵمەتیان دا و کەوتنە شوێن ئەو ئیجتیهادانەی کە پشتیان بە ئارەزووەکان بەستبوو و ، سەریان لە پەرتەوازەیی و ناکۆکی‌یەوە دەر ئەچوو و ، ئەمەش وای لێ کردن لە شیو و دۆڵی ناکۆکیی و پەرتەوازەیی و سەرگەردانیی‌دا تلێر ببنەوە .

* * *

﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ ( البقرة : ٢٤٨ ) .

پێش هەموو شتێك پێویستە مانای ( سكينة ) بە جوانیی بزانرێت. ( سكينة ) لە بارەی زمانەوانی‌یەوە بە مانای جیددیی و ویقار و دامەزراویی و دڵنیایی، یان بە مانای نیشانە ، یان ئەو موعجیزەیە دێت کە مرۆڤ دڵ ئاسوودە ئەکات ، واتە ئەو موعجیزەیە کە کاتێك مرۆڤ بە چاوی خۆی ئەی‌بینێت و بە ویژدانی هەستی پێ ئەکا ، رۆحی هەست بە حەسانەوە و هێمنی‌یەك ئەکات . واتە ( سكينة ) بە تیشكدانەوەی جۆراوجۆر دەر ئەکەوێت و ، بۆ خۆنواندنیش بە شێوەی جۆراوجۆر زۆری لێ دێت .

بە هەر حاڵ پاشماوەیەکی موبارەك بوو کە چەند پێغەمبەرێکی مەزنی پێشینە لە دوای خۆیان بەجێ‌یان هێشتبوو و ، دەروونەکانیش هێمنیی و دڵنیایی‌یان لێیانەوە دەست ئەکەوت . جا لەبەر ئەوەی کە سەکینە لە تابووتەکەدا بوو، تابووتەکە خۆی بە سەکینە و بە هۆیەکی موبارەکیی ئەژمێررا . لەبەر ئەوەش بەو شێوە ژمێررا چونکە مەلائیکەتەکان ـ کە پاڵەوانی ئەم رووداوە بوون ـ تابووتەکەیان هەڵگرتبوو ، بەم بۆنەوە پلە و پایەیەك و بەهایەکی گەورە بە تابووتەکە بەخشرا . هەروەها بە گەورە زانینی تابووتەکەش بەو رادەیە لەلایەن مەلائیکەتەکانەوە ئەوە دەر ئەخات و بەڵگەشە لەسەر رادەی نرخ و بەهای موبارەکی .

ئەو ( سكينة ) یەش کە لە قورئان و سوننەتدا باس کراوە بریتی‌یە لە تەجەللایەکی مەلەکوتیی سیفەت قیامەتیی ، واتە لە جیهانی غەیبەوە ، کە خوای بالادەست بە هەندێ کەسی ئەبەخشێت ، ئیتر خۆراك و هێز بە دڵەکان و نووریش بە ئیرادە ئەبەخشرێت . لەوانەیە ئەو سەکینەیە لە ئەنجامی دوعا و پاڕانەوەی دۆستانی خواوە بێت و ، لەوانەشە لە ناخڵۆفدا و بەبێ داواکردن بێت، بەڵکو بە بۆنەی ڕێزگرتن و نەرمیی نواندن لەگەڵ حاڵەتێکی تایبەتیی‌دا . واتە سەکینە نیعمەتێك و فەزڵێکە کە نهێنی‌یەکان دەورەیان داوە ، بە شێوەیەك کە ئەو کەسەی پێشکەشی کرا و چووە سایەیەوە ، بە وێنەی ئەو کەسە هەست ئەکات کە چووبێتە قیامەتەوە و بە چاوی خۆی دیبێتی . هەندێکیش لە مانای سەکینەدا وتوویانە بریتی‌یە لە دابەزینی مەلائیکەت . هەندێکی تریش وتوویانە بریتی‌یە لە هاتنە خوارەوەی بەدیی‌هێنراوە ڕۆحانی‌یەکان . جا ئیتر ئەگەر سەکینە بریتیی بێت لە دابەزینی مەلائیکەت یان دابەزینی بەدیی‌هێنراوە ڕۆحانی‌یەکانی تر لە غەیری مەلائیکەت ، ئەوا هەرکە سەکینە لە شوێنێك‌دا دابەزیی منەتی خواییش دائەبەزێت ... منەتی خوایی دائەبەزێت و کەشی ئەو شوێنە بە کەشێکی پڕ لە ئاسوودەیی ئەگۆڕێت ، بە رادەیەك کە ئەگەر مەرگ لەو شوێنەدا بە خوڕ ببارێت ، ئەوا ئەو کەسەی کە سەکینەی دابەزیوەتە سەر جوولەی پێ ناکەوێت . ئەمەش نموونەیەك لەسەر ئەوە : لە غەزای خەندەق‌دا ئیمانداران لەرزەیەکی توندیان پێ کەوت و ، چەند ڕۆژێکیش لە ژێر چەپۆکی ئاسنینی ئابلۆقەدا تلانەوە ، کەچیی لەگەڵ ئەوەش‌دا بە شێوەی پاڵەوانی خۆگر مانەوە. ئەمەش نموونەی پاڵەوانەکانی (( ئوحود )) کە ڕووبەڕووی مەرگ و ڕووبەڕووی ئەو بومەلەرزە سەختە بوونەوە کە شۆکەی بە بناغەی هەموو شتێك خستبوو.. غەزای (( ئوحود )) شتێکی ئاسان نەبوو . ئەوەبوو حەفتا لە هاوەڵانی تێدا شەهید بوو کە حەمزە خوا لێی ڕازیی بێت سەرداریان بوو . بەڵام کە خوا هاتە کۆمەکی‌یان و سەکینەی بەسەریاندا باراند ، بە وێنەی شێر نەڕاندیان و،

زامەکانیان توند بەست و ، بۆ رۆژی دووهەمی جەنگەکە هەستان و لە شێوەی سوپایەکی نوێدا ، بۆ راونانی دوژمن دەرچوون ، هەتا هەندێکیان ئەو برا زامدارانەیان کە لەگەڵیان دەرچووبوون و ، بە هۆی سەختیی زامەکانیانەوە توانایان نەبوو رێ ببڕن ، بە کۆڵ هەڵ ئەگرت . کاتێك کە ئەبوسوفیان بەمەی زانیی و ، لێبڕانی هاوەڵانی بۆ ساغ بوویەوە بۆ شوێن کەوتنیان تا مەککە ، بە پەلە فەرمانی بۆ سوپاکەی دەرکرد تا بگەڕێنەوە و بەرەو مەککە هەڵ بێن ، تا ئەو تۆزە سەرکەوتنەشی لە دەست نەچێ کە بە دەستی هێنابوو .

بە بۆنەی ئەو تایبەتمەندییانەی سەکینەوە کە لە سەرەوە باسمان کردن لە دوعاکانیشدا داوا ئەکرا . بۆ ئەمە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵە بەرێزەکانی لە غەزای خەندەقدا ، کەمێك پێش گەیشتنی دوژمن ، بە شێوەی سروود ئەیانوت:
( فَأَنزِلَنَّ سَكِينَةً عَلَينَا ) . [٧]

بەڵام سەکینەش بۆ هەموو مرۆڤێك و لە ناو هەموو قەومێکدا بە هەمان شێوە دانابەزێت و نادرەوشێتەوە . لە دابەزینی سەکینەدا ـ کە ئەتوانین وەها پێناسەی بکەین بریتییە لە لوتف و پێشکەشیی خوای بالادەست ـ بەردەوام بارودۆخی تاکەکان و کۆمەڵگاکان بەرچاو ئەگیرێت . ئەوەبوو لە بەدردا سەکینە بریتیی بوو لەو مەلائیکەتانەی کە دابەزینە مەیدانی جەنگەکە . بەڵام ئەو سەکینەیەی کە دابەزییە سەر ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و خەریك بوو قورئانی ئەخوێند ، لە شێوەی پەڵە هەورێکدا درەوشایەوە . هەروەها ئەو سەکینەیەش کە لە ئەشکەوتی ( ثور ) دا دابەزییە سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ ، کە لەگەڵ ئەبوبەکری صدیقی هاوەڵیدا بوو خوا لێی رازیی بێت ، لە شێوەی ئاسوودەیی دڵ و پشت بە خوا بەستنێکی گشتیی بوو ، هەرچەندە هاوەڵەکەی زۆر لە دڵەڕاوکەدا بوو بۆی . هەروەها سەکینە لە کاتی کۆچ کردندا بە لای ئیمام عەلییەوە خوا لێی رازیی بێت بە شێوەی متمانە و ئاسوودەیی دڵ درەوشایەوە

[٧] البخاري ، المغازي : ٢٩ ، مسلم ، الجهاد : ١٢٣ ـ ١٢٥ .

کاتێك که له ناو نوێنه‌که‌ی پێغه‌مبه‌ردا ﷺ خه‌وت و ، چاك نه‌شی‌زانیی که ئه‌بێته نێچیری شمشێره داخ له دڵه‌کان .

به‌ڵام به‌نو ئیسرائیلی‌یه‌کان ، پێش هه‌موو شتێك له‌سه‌رمان پێویسته ئه‌م حه‌قیقه‌ته بچه‌سپێنین : ئه‌وه‌ی زیاتر ئه‌م قه‌ومه ناسراوه‌ی مێژوو جیا ئه‌کاته‌وه ئه‌مه‌یه که ئه‌وانیش سه‌کینه‌یان به شێوه‌یه‌ك که ده‌ست بی‌گرێ و چاو بی‌بینێت پێشکه‌ش کرا ، ئه‌مه‌ش له‌به‌ر راگیرکردنی هه‌ست و بیریان و تایبه‌ت‌مه‌ندیی ژیانیان و ره‌وشتی تایبه‌تی‌یان ، واته به شێوه‌یه‌کی به‌رجه‌سته و بینراو پێشکه‌شیان کرا ﴿ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً ﴾ ( البقرة : ٥٥ ) . جا لێره‌دا هاتنی ئامێری نه‌فیی (( لن )) ئه‌وه ئه‌گه‌یه‌نێت که ئه‌وان خۆیان ئاماده کردبوو به ئاسانیی ئیمان نه‌هێنن . لێره‌دا پێمان خۆشه له باسه‌که ده‌رچین و بڵێین: کارێکی گران بوو بۆ عیسا پێغه‌مبه‌ر سه‌لامی لێ بێت له نێوان ئه‌و قه‌ومه‌دا، که هه‌موو شتێکیان ئه‌به‌ست به‌وه‌وه که به چاو ئه‌ی‌بینن ، ئه‌رکی پێغه‌مبه‌رایه‌تیی ئه‌نجام بدات ، چونکه ئه‌و بایه‌خی به لایه‌نی رۆحیی ئه‌دا. ئه‌مه‌ش حیکمه‌تێکی خوایی تیا بوو ، چونکه مه‌به‌ستی پێغه‌مبه‌رایه‌تیی عیسا سه‌لامی لێ بێت ـ که لایه‌نی رۆحانیی تیایا زاڵ بوو ـ بریتیی بوو له راست کردنه‌وه‌ی ئه‌و لایه‌نه ماددی‌یه ره‌قه که جووله‌که پێوه‌ی گیرۆده بوویوون . له هه‌مان کاتیش‌دا ئاماده کاری‌یه‌ك بوو بۆ پێغه‌مبه‌رایه‌تیی پێغه‌مبه‌رمان ﷺ . جا عیسا پێغه‌مبه‌ر سه‌لامی لێ بێت ژیانی له هه‌وڵی جێ‌به‌جێ‌کردنی ئه‌م په‌یامه‌ی‌دا به‌سه‌ر برد. هه‌وڵی ئه‌مه‌ی دا و به پێی ئاستی تێ‌گه‌یشتنیان په‌یامه‌که‌شی پێشکه‌ش کردن. ئیتر شتێکی بۆ باس نه‌کردن که به‌لایانه‌وه سه‌یر بێت یان وه‌ری نه‌گرن ، به‌ڵکو پێی فه‌رموون : ( شتی زۆرم به لاوه هه‌یه که ئه‌مه‌وێ پێتانی بڵێم ، کاتێك که فارقلیط هات پێتانی ئه‌ڵێت ) .[٨] عیسا

---

[٨] إنجيل يوحنا ، الباب ١٤ ، خلاصة ١٥ ، ١٦ ، ٢٦ ، ٢٧ ، الباب ١٦ ، خلاصة ٧ ، ٨ .

پێغەمبەر سەلامی لێ بێت شتێکی بۆ باس نەکردن کە لە چوارچێوەی بۆچوون و تێگەیشتنیان و ، لە ئاستی دەرك پێکردنیان بترازێت . لەگەڵ ئەوەش‌دا هەندێك لە رەوشت لاوازەکان ـ ئەوانەی کە ماددی‌یەت چاوی کوێر کردبوون و ، نەیان ئەتوانیی هەتا لەوە تێبگەن و وەری بگرن ـ لەوانەی کە بووبوونە کلکی بیزەنتی‌یەکان هەوڵی کوشتنی ئەم پێغەمبەرە بەرێزەیان دا . جا ئەگەر سەکینە بەو شێوە رۆحانی‌یەی کە هاتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرمان ﷺ و ، بۆ سەر ئیمام عەلیی خوا لێی رازیی بێت و ، بۆ سەر ئوسەیدی کوری حوضەیر خوا لێی رازیی بێت ، بۆ سەر ئەو جۆرە قەومەش بهاتبایەتە خوارەوە ، ئەوا نەیان ئەتوانیی هیچی لێ تێ بگەن . لەبەر ئەوە ئەبینین ئەو سەکینەیەی کە دابەزی‌یە سەر ئەو جۆرانە بە شێوازێکی ماددیی و، بە شێوازێکی وەها پیرۆز بوو کە ئەوان لێی تێ بگەن . بریتیی بوو لە ئەماناتە پیرۆزەکان لە پاشماوەی پێغەمبەران یووسوف و مووسا و هاروون سەلامیان لێ بێت کە لە ناو تابووتێك‌دا بوون و ونیان کردبوو .

ئەتوانرێ هاتنی سەکینە لە ناو تابووتێك‌دا لە لایەنی ( ظاهري ) و لە لایەن ( باطني ) یشەوە هەڵ بسەنگێنرێت . جا لە لایەنی ( ظاهري ) یەوە :

١ ـ توانای خوای باڵادەست دەر ئەخات .

٢ ـ متمانەی پێغەمبەری مژدەدەر زیاتر ئەکات .

بەڵام لە لایەنی ( باطني ) یەوە بریتی‌یە لەو هێز و توانایەی کە جوولەکە لەم جۆرە رووداوانە وەری ئەگرێت ، کە لە ئاسۆی کارە لە رادەبەدەرەکان و موعجیزەکانەوە روو ئەدەن . بەڵام لێهاتن و ئامادەباشیی تاکەکان بۆ وەرگرتنی ئەو سەکینەیە بە پێی جیاوازیی وزە رۆحی‌یەکانیان جیاواز ئەبێت . ئەو بەشەی کە تاکێکی وزە زۆر بە دەستی دێنێت بێگومان لە بەشی ئەو تاکەی کە ئەو لێهاتن و ئامادەباشی‌یەی نیە و ، لە بەشی ئەو تاکەش کە هەر رووداوێکی دێتە بەردەم لە گۆشەی رەخنە و زامدارکردنەوە چارەسەری ئەکات ، جیاواز ئەبێت.

ئەشگونجێ تابووتەکە هێمای ئەوە بێت کە ئەو قەومە ـ لە کاتێک یان لە سەردەمێکدا ـ لە لایەنی هەست و فیکر و ئیمانەوە مردوو بووبن ، یان بە جەستەبوونی سەکینە لە تابووتەکەدا هێما بووبێت بۆ سەر لە نوێ زیندووکردنەوەی ئەو کۆمەڵە . لەبەر ئەم هۆیە داوود پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بۆ هەر کوێ بچوایە تابووتەکەی ئەخستە پێشی سوپاوە و لەگەڵ خۆیدا ئەیگێڕا.

* * *

﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ ( البقرة : ٢٥١ ) .

سەرەڕای چەند کارێک ، لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای بالادەست سەرنجمان ڕائەکێشێت بۆ لای بوونی تەرازوو و هاوسەنگیی و پێوەرێک لە جیهانی مرۆڤ دا ، هەروەك بوونی لە جیهانی سروشت و ژینگەدا . هەموو شتێك یاسا و پێوەرێکی دیاریی‌کراو و ، چەندین دەستووری دیاریی‌کراوی بۆ دانراوە . لەبەر ئەمە و ، لە پێناوی مسۆگەرکردنی ئەو هاوسەنگی‌یە لەبەر خاتر و لە پێناوی مرۆڤایەتیی‌دا ، خوای بالادەست هیدایەتمان بۆ سەر ڕێی ڕاست ئەدات و ، لە دڵ و دەروونماندا حەزێك بۆ کۆشش‌کردن لەو پێناوەدا دروست ئەکات . چونکە ئەم ئەنجامە پێویستە لە بازنەی هۆکارەکاندا بە دەستی مرۆڤ بێتە دیی ، ئەگینا دنیا ئەبێتە مەنزڵێك ژیانی تێدا بەسەر نابرێت ، وەك ئایەتە پیرۆزەکە باسی کردووە.

بەڵێ ! ئەگەر بە هۆی بیروباوەڕ و بەها دینی‌یەکانەوە ، هەندێ هەست کە لە سروشتی مرۆڤ دا ـ بۆ چەندین مەبەست و حیکمەتی دیاریی‌کراو ـ ڕوێنراون ، مل کەچ نەکرێن و ڕانەهێنرێن ، مرۆڤ لە وێرانکاریی و ، لە زوڵم و دەست درێژیی بەدوور نابێت . جا ئەگەر خەڵکانێك نەبن ، کە بە ئیمان و ئیسلام ، گۆڕانباشیی بەسەر هەستە مرۆڤانەکانیاندا بێنن و ، ببنە سەربازی حەق و یاسا ، تا ئەمن و

ئاسایش بڵاو بکەنەوە ، ئەوا دنیا ئەبێتە جیهانی لە سنوور دەرچووان و دەست درێژیی کەران و ، زوڵم و زەلیلییش تیایدا پەرە ئەسێنێت . بەڵام لە لایەنی پەیوەندیی و هاوکێشەیی نێو دەوڵەتی‌یەوە ئەوا ئاسایش و متمانە بوون لە نێوان دەوڵەتان و کۆمەڵگاکاندا نامێنن و ، کاروبار لە دەستی دەوڵەتە دەست ڕۆیشتووە خراپکارەکاندا ئەبێت . ئەمەش مانای تێك شکانی مرۆڤایەتیی و تلانەوەی لە باوەشی گەندەڵیی و ئاژاوەدا ئەگەیەنێت . لەم جۆرە کەش و هەوایەدا نە باسی ژیان وەك مرۆڤ و ، نە زانست و ، نە هونەر و ، نە ئیمان ناکرێت و ، نە ئاسایش و نە متمانەش چ لەناو ئوممەت و ، چ لەناو کۆمەڵگادا نامێنن . جا ئەگەر ئەم جۆرە کەش و هەوایە هاتە بەرەوە ، ئەوا ئاژاوە پەرە ئەسێنێت و ، خەڵکییش ئەبنە گورگ و ، بەهێز و دەسەڵاتداریش وا ئەبینێت کە هەمیشە حەق لای خۆیەتی و ، وەهاش هەست ئەکات کە بە ڕێژەی هێز و دەسەڵاتی خۆی لەسەر حەقە ، بۆیە هەوڵ ئەدا تا خۆی بەهێزتر بکات و، یاسایش بە ئارەزووی خۆی دابنێ . واتە هەوڵ ئەدا جیهانێك بەرپا بکات کە فەلسەفەیەکی گێڕ و گەوج و هەست و هۆشێکی خۆپەرستانە بەڕێوەی ببات.

بۆ ئەوەی ئەو بارودۆخە سەلبیی و گێڕانە دروست نەبن و ، بۆ ئەوەش نیەتە زاڵمانە و دەست درێژیی‌کەرەکان ڕاست ببنەوە ، خوای باڵادەست لە بەرامبەر کافری بێویژدانەوە ئیمانداری خاوەن ویژدان و ، لە بەرامبەر ئەهلی زوڵمیشەوە ئەهلی حەق و ، لە بەرامبەر دەست درێژیی‌کەرانیشەوە ئەهلی عەدالەت و ، لە بەرامبەر ئەهلی توند و تیژیی و خۆسەپاندنیشەوە ئەهلی خۆشەویستیی بەدیی هێنا . ئەمەش بۆ ئەوەی هاوسەنگی‌یەك لە نێوان خەڵكدا ، بە وێنەی ئەو هاوسەنگی‌یەی کە لە سروشتدا هەیە ، دابمەزرێت و ، دنیاش نەبێتە زۆنگاوی زۆرداریی و هەوا و ئارەزوو .

لەبەر ئەمە ئەرکی سەر شانی ئەهلی عەقڵ و ئیمان و عیرفانە کە ئەگەر فەساد لە جیهاندا پەرەی سەندووە با جیهان ڕزگار بکەن و ، گەر فاسیدیش

نەبووە هەوڵ و کۆشش بکەن تا چاك سازیی بەردەوام بێت ، ئەگەر ئیحتیمالی روودان و هاتنی فەساد هەبوو و ، دەستیش بەسەر لایەنگرانی ئاژاوە و پشێویی و فەساددا بگیرێت و ، ماوە نەدرێت لەوە زیاتر فەساد بەرپا بکەن . ئەمەش بە کردنەوەی یانەی زانست و پەروەردە و رۆشنبیریی و ، کردنەوەی بنکەی ئیرشاد و وریابوونەوە و ، پێك هێنانی دامەزراوەی پێویست لەو بوارەدا و ، دانانی چەندین بریکار لەو بارەوە و ، داخستنی هەموو کون و کەلەبەرێکی ئاژاوە و گەندەڵی‌یەك و ، رێنەدان بە کردنەوەی هەر دەرگایەك کە ئیحتیمالی ئاژاوەی لێ بکرێت، ئەبێت . جا با چاکە و بەخشیینی خوای بالآدەست بەسەر ئەو کەسەدا ببارێت کە ئەتوانێت ئەمە جێبەجێ بکات . سەرکەوتنیش لە جێبەجێ کردنی ئەمەدا ئەبێتە نیشانەی فەخر و نیشانەی پیاوچاکی‌یەك کە نرخی نەدرێت و ، بە سنگی ئەنجام دەرانی‌دا هەڵ ئەواسرێت ..

  

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴾ ( البقرة : ٢٥٥ ) .

بەڵێ ، خوا خۆی پەرستراوی تاقانەیە ، کە لە غەیری خۆی هیچ پەرستراوێکی تر نیە . لە غەیری خۆی هیچ پەرستراوێکی تر نیە ، چونکە هەموو مەوجوودات، لە ئەزەلەوە تا ئەبەد ، بریتیین لە سێبەری نووری وجوودی ئەو و ، هەموو ئەو وێنانەی ژیانیش کە لە سەرانسەری بوونەوەردا هەن بریتیین لە دانەوەی نووری خوای گەورە و ، هەموو مەوجوودێك و هەموو بوونێکیش بریتی‌یە لە تیشك دانەوەیەکی بچووك کە بوونی خۆی لە ( قَيُّومِيَّة ) ی خوای بالآدەست وەرئەگرێت. خوای بالآدەست وجوودی لە خۆیەوەیە و ، ژیان و ( قیومیة ) یشی لە خودی خۆیەوەیە . هەموو مەوجوودێك ، لە غەیری خوا ، لەو و ، لە تیشك‌دانەوەی سیفات و ناوە پیرۆزەکانیەوەیە .

خۆی ئەو زیندووە سەروکاریکەرەیە کە هیچ شتێك بەبێ پاڵدان بەوەوە بۆ خۆی ناوەستێت و ، بەبێ ( هێز و تواناى ) ئەویش هیچ مەوجوودێك توانای نیە درێژە بە بوونی خۆی بدات و ، بەبێ بەرچاوگرتنی ( قیومیة ) ی خوای باڵادەستیش ـ کە ئەوە ئەگەیەنێت کاروباری خوا بە خودی خۆی بەڕێوە ئەچێت و، کاروباری هەموو شتێکیش هەر بەو بەڕێوە ئەچێت ـ ناتوانرێ هیچ تەفسیر و روون کردنەوەیەك بۆ مەتەڵی ژیان بهێنرێتەوە و ، هەرگیز ناشتوانرێ لەسەر هیچ بناغەیەکی دروست و مەعقوول تەفسیری جیهانی بوون و ، بەردەوامیی ئەو جیهانە بکرێت ، بە خوا نەبێت . خۆی زاتی ( أوحد ) و ( أعظم ) ە و ، ئەم دوانەش دوو ئیسمی ئەعزەمی خوان . هەموو شتەکان و رووداوەکان تیشك دانەوەیەکن لە تیشكدانەوەکانی خوا و ، بوونەوەریش کتێبێکە بۆ ئەو تیشك دانەوەیە و ، لەبەردەمی ئادەمیزادەکاندا دانراوە تا سەیری بکەن و، بیخوێننەوە و، بە وێنەی گەشتیارێك کە بیەوێت چاو بەم کتێبەدا بخشێنێت و بیخوێنێتەوە، سەرنجی بگرن . پێغەمبەرانیش سەلامیان لێ بێت رابەر و تەفسیرکەری ئەم کتێبەن . کتێبە ئاسمانییەکانیش ، بەتایبەت قورئانی پیرۆز ، چاکترین تەفسیری ئەم کتێبە سەرسامکەرەن ، کە بە ناوەرۆکەکەی چاوەکان ئەبڵەق ئەکات و ، لە هەموانیش زیندوێتیی و رەنگاورەنگ و رەوانبێژیی زیاترە .

پێغەمبەری خوایش ﷺ دەربارەی ( ءاية الكرسي ) ئەفەرموێت کە گەورەترین و گرنگ ترین ئایەتی قورئانە ( وفيها ءاية هي سيدة ءاي القرءان هي ءاية الكرسي ) .[9] ئەو گرنگییەش لەمەوە دێت :

١ ـ گرنگیی دەربارەی ناوەرۆك ، چونکە ئەم ئایەتە تەوحیدی پاڵفتە فێر ئەکات و ، ئەشبێتە تەرجومانی سیفەتەکانی خوای باڵادەست و ،[10] بە شێوەیەکی کورتیش بە وێنەی سوورەتی ئیخلاصە . هەتا پێغەمبەر ﷺ لە

[9] الترمذي ، ثوٰب القرءان : ٢ / ٢٨٨١ .

[10] تفسير الطبري : ٣٠ / ٣٤٣ .

سەردەمی مەککەدا لە وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەدا کە دەربارەی خوای باڵادەست ئاراستەی ئەکران سوورەتی ئیخلاصی ئەخوێند . بەڵێ ، هەموو سوورەتێکی قورئانی پیرۆز خاوەنی بەهایەکی بڵندە ، بەڵام پلەی چاکەکانی بە پێی ناوەڕۆکەکەی ئەگۆڕێت .

٢ ـ دیسان گرنگی‌یەکە بەستراوە بەو وەڵامە لە عادەت بەدەرانەوە کە دەربارەی ئەم ئایەت و سوورەتانە پێشکەشی خوێنەرانی ئەکات ، کە لەگەڵ ئاستی تێگەیشتن و ، ئاسۆ فراوانیی و ، قووڵیی جیهانی ناوەوەی خوێنەردا ڕێژەیەکی راستەوانەی هەیە . بەڵێ ، گرنگترین هۆیش کە لەم بارەوە دەوری خۆی ببینێت بریتی‌یە لەوەی کە دڵ بە ئیمانێکی قووڵەوە روو بکاتە خوا . پێغەمبەریش ﷺ لە فەرموودەیەکیا دەربارەی مانگی رەمەزان ئەم کارە شەرح ئەکات ، کە ئەفەرموێت : ( مَن صَامَ رَمَضانَ إيمَاناً واحتِساباً غُفِرَ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِن ذَنبِـهِ ) .[١١] لەمەشەوە دەر ئەکەوێت کە ئیخلاص کاکڵە و بنچینە و رۆحی هەموو کردەوەکانە .

القَيُّوم : ئەم ناوە پیرۆزە لە یەك کاتدا روو لە زاتی خوای باڵادەست و ، روو لە کردەوەکانیشی ئەکات . بە نیسبەتی زاتی خواوە ، ئەم ناوە پیرۆزە ، قەدیمیی و هەمیشەمانەوەی خوای باڵادەست دەرئەبڕێت . بەڵام ئەو لایەنەی کە رووی لە کردەوەکانی خوای گەورەیە بریتی‌یە لە دەربڕینی بەردەوام بوونی مەوجوودات . چونکە بەردەوام بوونی مەوجوودات بەسراوە بە بەردەوام بوونی خوای باڵادەستەوە و ، دەربارەی بەردەوام بوونی مەوجووداتیش هەرچیی باس کراوە لە یاسا و لە رژێم ... تد بریتی‌یە لە چەند شتێکی ئیعتیباریی و نیسبیی. ئیتر مانەوەی مەوجوودات بە وێنەی ئەم یاسا نیسبیی و ئیعتیباری‌یانە لە تواناادا نیە . جا ئەگەر ویستمان شەرحەکە ئاسان بکەین ئەڵێین : بوونی ئەو کەسەی کە ئەم یاسایانە جێبەجێ ئەکات و ، بۆ کار پێکردن ئەیانداتە بەر پێویستە ، کە

---

[١١] البخاري ، الإيمان : ٢٨ ، ليلة القدر : ١ ، مسلم ، الصيام : ٣ ، ٦ ، المسافرين : ١٧٥ .

ئەویش خوای باڵادەستە . لەم بابەتەدا ئیبن عەرەبییش رایەکی تری هەیە و وای بە چاك ئەبینین لێرەدا باسی بکەین . ئیبن عەرەبیی ئەڵێت : حەقیقەتی شتەکان بریتی‌یە لە تیشك دانەوەی ناوە پیرۆزەکانی خوا . کەواتە ( وجود ) لە راستیی‌دا ( عدم ) ە ، بەڵام ئەم تیشك دانەوانە ، بە شێوەی بەر و دوا ، یەك لە دوای یەك دێن ، بە جۆرێك کە بە هۆیانەوە ئەبینین وا شتەکان هەن و بڕیاری بوونیشیان ئەدەین . خۆ ئەگەر خوای باڵادەست تەنها ساتێك ئەو تیشك دانەوانە ببڕێت ، ئەوا شتەکان هەر هەموویان لەناو ئەچن و نامێنن .

بەڵێ ! هەروەك شاعیری صۆفیی سولەیمان چەلەبیی وتوویە :

بە بوونەوەری فەرموو : ببە ... ئیتر بوو .

خۆ ئەگەر بی‌فەرموایە : تیاچۆ ... بوونەوەر تیا ئەچوو .



﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِٱلْقِسْطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ( ءال عمران : ٢١ ).

ئەوانەی هەتا هاتنی ئیسلام ئینکاریی هەموو دینێکیان کرد ، یان هەندێ کاروباری دینیان وەرگرت و ئینکاریی خوایان کرد و ، ئینکاریی ئەو نیشانانەشیان کرد کە لەسەر بوون و لەسەر تەنیایی خوای بالادەست بەلگەن، سەرەنجام گومڕا بوون و خەڵکیشیان گومڕا کرد . ئەوانە لێرەدا وەها وەسف کران کە ( بە ئایەتەکانی خوا کافرن ) ، هەروەها ئەوانەش کە لە فەرمانی ئەو پێغەمبەرانە یاخیی بوون کە بۆ رزگارکردنیان رەوانە کرابوون و ، کتێبەکانیش هاتنە خوارەوە بۆیان ، بە سیفەتی ( بە ناڕەوا پێغەمبەرانیان ئەکوشتن ) وەسف کران . هەروەها ئەوانەش کە دژایەتیی ئەوانە ئەکەن کە هەوڵی بەرپاکردنی حەق و عەدالەت ئەدەن لەناو خەڵکییدا و ، هەوڵی لەناودانیان ئەدەن ، بە سیفەتێکی ناشیرین وەسف کران کە بریتی‌یە لەوەی ( ئەو خەڵکانە ئەکوژن کە فەرمان بە بلاوکردنەوەی دادپەروەریی ئەدەن ) . ئەو سەرەنجامەش کە چاوڕوانیی هەموو ئەوانە ئەکات یەك سەرەنجامە کە بریتی‌یە لە سزای پڕ ئێش و ژان .

جا هاوڕێنەی ئەوانە نەیانتوانیی لە دنیادا بمێننەوە و تیایا نەمر بن و، نەشیانتوانیی قەدەغەی کۆچ کردنیان بۆ خانەیەکی تر بکەن و ، خۆیشیان بۆی ئامادە نەکرد . بە دارشتنی ( بدیع الزمان ) یش نەیانتوانیی مەرگ بکوژن و لەناوی بەرن و ، نەشیانتوانیی دەرگای قەبر دابخەن ، لەبەر ئەوە ئەوانە پێش مردنیان سزای مردن ئەچێژن . ئەوەبوو ماوەی ژیانیان لە دنیادا تەواو کرد و قیامەتیشیان لە دەست دا . بەمە دنیاش و قیامەتیشیان لە کیس چوو و، ئەمەش خەسارۆمەندیی روون و ئاشکرایە .

خۆ ئەگەر لێرەدا لە پوختەی ئایەتەکە ورد ببینەوە ئەبینین وایـن لەبەردەم شێوازێکدا کە لەگەڵیا رانەهاتووین . بەڵێ ! لەگەڵ وتەیەك را نەهاتووین کە مژدە بە سزایەکی پڕ ئێش و ژان بدات . چونکە مژدە کاتێك بە کار دێت کە باسی شتێکی جوان و دڵخۆش‌کەر بکرێت و ، باسی شتێك بێت کە مرۆڤ لە بەختەوەریی‌دا نوقم بکات و ، بۆ شتی ناشیرین و خەمبار بە کار نایەت . بۆ نموونە بەو کەسەی کە باوکی مردبێت ناوترێت : (( بە مردنی باوکت خۆشیی لە خۆت )) ، یان بەو کەسەی کە پارەی لە دەست دا نەمابێت : (( خۆشیی لە خۆت وا هەژار کەوتیت )) . لەبەر ئەوە لێرەدا پێویستە بە دوای حیکمەتێکی تردا بگەڕێین کە ئەویش ـ خوا چاکتر ئەزانێت ـ بریتی‌یە لە گاڵتەکردن و سووکایەتیی کردن بە کافران . جا ئەو جۆرە کەسانە کە دڵیان بەرامبەر بە ئیمان و بە قورئان رەق بووە و ، دەروونیشیان بەرامبەریان لە رق و قین پڕ بووە ، بێ‌گومان ئەوانە کاتێك کە ئەو جۆرە ئایەتانە ئەبیستن لە رق و تووڕەیی‌دا ئەتەقن .

خۆ ئەگەر سیاقی ئایەتەکەش هەڵسەنگێنین ئەگونجێت ئەم نوکتەیەش باس بکەین : خوای بالادەست لەبەردەم ئەوانەدا رێی ئیمان و هیدایەتی والا کرد و، پێغەمبەرانی بۆیان رەوانە کردن و ، پاشانیش میرات گرانی پێغەمبەرانی بۆیان رەوانە کرد ، کە فەرمان بە بلاوکردنەوەی دادپەروەریی لەناو خەڵکدا ئەدەن. بەلام ئەوانە لەسەر ئینکاریی‌کردنی ئەو هەموو نیعمەتانە و سپڵەیی نواندن بەرامبەریان سوور بوون . واتە ئیمانیان نەهێنا و ، دەستیان بە کوشتنی پێغەمبەران و ، بە کوشتنی ئەو کەسانە کرد کە فەرمانیان بە بلاوکردنەوەی دادپەروەریی ئەدا. لەبەر ئەوە باس‌کردنی ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ لە لایەکەوە لەبەر ئەوەیە سەرەنجامی خراپی ئەوانە بەیان بکرێت و، دووهەمیش هەڕەشەیان لێ بکرێت کە ئەوان هەلێکی زێڕین و مژدەیەکی راستەقینەیان لە دەست خۆیان دا.



﴿ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَـٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِي عَاقِرٌ ﴾ ( ءال عمران : ٤٠ ).

زەكەرییا سەلامی لێ بێت ئەمەی فەرموو ، ئەگەرچی پێشتر لە پەروەردگاری پاڕابوویەوە : ﴿ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ﴾ ( ءال عمران : ٣٨ ) . کاتێکیش کە مژدەی گیرابوونی دۆعاکەی وەرگرت بە شادمانیی و سەرسامی‌یەکی تێکەڵەوە فەرمووی : ﴿ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَـٰمٌ ﴾ . جا لەگەڵ ئەوەدا کە لەوانەیە لە یەکەم سەرنج‌دان‌دا وا دەر بکەوێت جیاوازیی لە نێوان هەردوو حاڵەتەکەدا هەبێت ، بەڵام ئەو جۆرە جیاوازی‌یە بوونی نیە . چونکە کاتێك کە زەکەرییا سەلامی لێ بێت بە هەموو کیانێکیەوە بۆ دۆعاکردن رووی کردە خوا لە حاڵەتێکی رۆحیی قووڵدا بوو ، لەبەر ئەوە بازنەی هۆکارەکانی بە بیردا نەئەهات. دیارە مەقامی دۆعاکردنەکە داخوازیی پشت گوێ خستنی هۆکارەکانی ئەکرد . هەروەها دۆعاکردنەکەش کارێکی قیامەتیی ئەگرتە خۆ کە پەیوەندیی بە میراتێکی چاوەڕوان‌کراوی پێغەمبەرایەتی‌یەوە هەبوو . بەڵام کاتێك گەڕایەوە بۆ جیهانی بەخەبەر بوون ـ ئەگەر دەربڕینەکە جائیز بێت ـ و چووەوە ناو جیهانی هۆکارەکان و ، لە روانگەی ئەو جیهانەوە سەیری مەسەلەکەی کرد، شادمان و سەرسام بوو و فەرمووی : ﴿ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَـٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِي عَاقِرٌ ﴾ .

لێرەدا کارێکی تری گرنگ هەیە کە پێویستە لەم مەقامەدا ئاماژەی بۆ بکرێت کە ئەویش ئەوەیە زۆرێك لە تەفسیرە تەقلیدی‌یەکان فەرمایشتەکەی زەکەرییا سەلامی لێ بێت ﴿ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَـٰمٌ ﴾ لە سیغەی سەرسووڕماندایە، بەڵام من وای ئەبینم لە سیغەی رێزلێ‌نان‌دایە لەگەڵ سەرسام بوون لە قودرەتی خوایی . جا ئەگەر زانیمان کە بەرزترین مەقام لە پلەکانی ویلایەت بەلای ئیبن عەرەبی‌یەوە بریتی‌یە لە مەقامی دەهشەت و سەرسامیی ، ئەوا تێئەگەین کە

ئەم سەرسامیی و سەرسوورِمانە پێچەوانەی مەقامی پێغەمبەرایەتیی نیە. بەڵێ! پێغەمبەرێك كە چوو بوو بەساڵدا و هاوسەرەكەشی لە سكوزا كەوتبوو سەرسامی‌یەك تێكەڵ بە ناسینێكی پێغەمبەرانەی خوای باڵادەست دەرئەبڕێت، پاشان هەستی ڕێزلێنان و بەدڵداچوون و منەت و پێزانین بۆ قودرەتی خوایی دەرئەخات و، ئەم سەرسامیی و ڕێزلێنان و منەت و پێزانینەش لە قاڵبی چەند لەفظێكی گونجاو لەگەڵ هەست و سۆزماندا دەرئەبڕێت .

بەلای ئێمەوە لە یاسای خوایی‌دا نیە ئافرەتێك گەیشتبێتە تەمەنی ( یأس ) و سووڕی مانگانەی وەستا بێت و لە سكوزا نیشتبێتەوە ، كەچیی سكی پڕ ببێت. لەبەر ئەوە دەركەوتنی وێنەی ئەم ڕووداوە ناسروشتیی و پێچەوانەی عادەتە لە بریی ئاماژەیەكی وریاكەرەوەیە تێكەڵ بە سەرسامیی لە ڕۆحی پێغەمبەرێكدا كە ئەوپەڕی ڕێز و تەقدیر بۆ نیعمەتە خوایی‌یەكان دائەنێت ... هەستی تەقدیر كردن پێش هەستی شادمانیی ئەكەوێت . ئەمەش شتێكی سروشتی‌یە و لەگەڵ پلە و پایەی پێغەمبەرایەتیی‌دا گونجاوە .

پاشان بە دوادا هاتن بە ئایەتی ﴿ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ ﴾ بۆ ئامـاژە كردنە كە چەندین ڕووداو كە پەیوەندی‌یان بە مەریەم و عیساوە هەیە سەلامیان لێ بێت ڕوو ئەدەن و دەرئەكەون . واتە شان بە شانی ڕووداوەكان كە بە پێی بازنەی هۆ و هۆكارەكان و ، بە پێی یاسا خوایی‌یەكان ڕوو ئەدەن ، چەندین ڕووداوی تریش ڕوو ئەدەن كە پەیوەندی‌یان بە هۆكارە دیارەكانەوە نیە ، بۆ ئەوەی بەردەوام ئاماژە بۆ ویستی خوایی ئازاد بكرێت .



﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ ( ءال عمران : ٦٤ ) .

گرتنی هەڵوێستی نەرم بەرامبەر بە ئەهلی کیتاب یەکێکە لە فەرمانەکانی قورئان . نەك هەر ئەهلی کیتاب بە تەنیا ، بەڵکو خوای باڵادەست فەرمانی بەسەر سەردارمان مووسادا دا سەلامی لێ بێت تا بە نەرمیی فیرعەون بدوێنێت: ﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴾ ( طه : ٤٤ ) . لەبەر ئەوە بە هیچ شێوەیەك لە ئیسلامدا ، بۆ بانگ کردن بۆ لای خوا ، جێی قسەی رەق یان گلەیی بە توندیی بەرامبەر بە خەڵکیی نابێتەوە .

ئایەتەکەی سەرەوەش نموونەیەکی پڕ بەلاغەتە بۆ فەرمایشتی نەرمی لە دڵانەوە نزیك و ، فەرمایشتی دڵڕفێن لە بانگەوازدا . جا ئەگەر وەها بە ئەندێشەماندا هات کە ئیسلام بریتییە لە قەڵایەك کە بە چەندین شوورا دەوری گیراوە ، کە ئەو شوورایانە سنوور ( حدود ) ەکانی خوا ئەنوێنن و ، بێگومان چەندین دەرگاشیان هەیە و ، رێگای زۆریش ئەوەندەی ژمارەی بەدیی‌هێنراوان هەن کە گەیشتن بەو دەرگایانە دەستەبەر ئەکەن . ئیسلامیش بە شێوازە تایبەتی‌یەکەی لە هەر یەکێك لەو رێگایانەدا و ، لە هەر خاڵێکی سەر ئەو رێگایانەدا خەڵکەکە ئەگرێتە باوەش ، بۆ ئەوەی لە یەکێك لەو رێگایانەوە بیان کاتە ژوورەوە . دیارنەبوونی ئەم هەنگاوە یەك لەدوای یەکانە ، یان پێ‌نەزانینی لە چەرخە پێشووەکاندا و هەتا ئێستایش هەندێکی بەرەو چەندین هەڵەی دیار و ئاشکرا داوەتە بەر .

ئەم ئایەتەش لە خاڵێکی ئەو رێگایانەدا بە روویەکی گەشاوە و بە زمانێکی شیرینی گوفتار جوان پێشوازیی لە ئەهلی کیتاب ئەکات و لێیان نزیك ئەبێتەوە و پێیان ئەفەرموێت : (( وەرن بۆ لام ! ... خێرا کەن بۆ لام )) . کاتێکیش کە بەو

شێوه ئەیاندوێنێ پێیان ئەفەرموێت : (( ئەوەی من بانگتان ئەکەم بۆی شتێکی تازه نیه بەلاتانەوه ، یان شتێك نیه نەیزانن ... بەلکو شتێکه پێش ئێمه ناسیوتانه و پێی هۆگر بوون ، بەلام ئەگونجێ له بیرتان چووبێتەوه ، یان بە شێوەیەکی هەڵه هاتبێتەوه یادتان )) . ئەم جۆره بانگەوازه پردێك له نێوان ئێمه و ئەهلی کیتابدا دروست ئەکات و ، لەلایەنێکەوه دەروونیان ئەلاوێنێت که پێی هۆگر بن . جا ئەم شێوه بانگەوازه بۆ لای ئیسلام گرنگه و ، ئەشتوانن ئەو دەستەواژەی بەسەردا ببڕن که لەم رۆژانەدا بلاوه که (( شێوازی گفتوگۆ )) یە . بەلێ ! ... بانگ کردنی ئەهلی کیتاب لەلایەن ئیسلامەوه بۆ سەر خالێك که لەگەلیا راهاتوون ئەتوانرێت له یەك وشەی کورتدا پوختەکەی وەر بگیرێت، چونکه قورئان تەنها یەك شتی لەوان داوا کرد ، که ئەویش بریتی‌یه له تێپەڕ بوون بەسەر ئەو پردەدا که لەبەر چاواندایه و گەیشتن بەو دەرگایه . جا ئەگەر هەموو شتێکمان خسته ئەو لاوه ، ئەوا وشەی (( سواء )) به تەنیا ئەو تێگەیشتنه ورده دەر ئەبڕێت بۆ نەرمیی و سنگ فراوانیی و حەزکردن به دروست کردنی چەندین پرد له نێوان ئێمه و ئەواندا . جا ئەبێ تایبەتمەندیی و سیفەتی ئەم پرده چیی بێت ؟

لێرەدا ئەبینین قورئان له بریی باس کردن به ناساندنی ( مثبت ) ( منفي ) پیشان ئەدات و ئەیخاته پێش چاوان و ، بەم شێوەیه ئەچێته ناو باسەکەوه : یەکەم ئەهلی کیتاب له چوارچێوەی تایبەتیی خۆیاندا خوایان ئەناسیی ، کەچیی دوای تێپەڕبوونی چەند چەرخێك تۆز و خۆڵ لەسەر ئەم ناسینەی که گەشاوەیی و جیددییەتی خۆی له دەست دابوو ، کۆبوویەوه . لەبەر ئەمه پێویست بوو کاری پاك کردنەوه و خاوێن کردنەوه ئەنجام بدرێت . کاتێك که ئەمه تەواو ئەبێت حەقیقەتەکان لەبەر چاواندا به روونیی دەرئەکەون و ، له رستەی ﴿ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾ دا ئەگونجێت ئەو کاری خاوێن کردنەوەیه ببینرێت . واته ئیسلام هەموو کردەوەیەك به کاری پاك و خاوێن کردنەوه دەست پێ ئەکات و ، زەینەکان له بیر

و بۆچوونی هەڵە و لە لادان رزگار ئەکات و ، چاوەکانیش لە هەڵەبینیی رزگار ئەکات . کاتێکیش کە ئەفەرموێ : (( إلا الله )) پێش ناساندنی ئیجابیانەی شتەکە ، کارێکی فیکریی و کارێکی عەقڵیی ئەنجام ئەدات ، بگرە لەوانەیە کارێکی نوێخوازیی ئەنجام ئەدات . لەبەر ئەمە ئەم ئایەتە پیرۆزە لە بریی ئەوەی کە بفەرموێ : (( با وا و وا بکەین )) ئەفەرموێ : (( لێمان گەڕێن با وا نەکەین)).

بەڵێ ! بە تێپەڕ بوونی زەمانە هەندێك لە ئەهلی کیتاب بەرەو شیرك لایان دا، ئەوەبوو بە وێنەی بت پەرستەکان کوڕ و کچیان بۆ خوای باڵادەست بڕیار دا و، چوونە ناو گێژاوێکی بێسەر و بنی هەڵەوە وەك وتنی یەك سیانن و سیانیش یەکە و ، هەندێك دەسەڵاتی خوایییان بە قەشە و راهیبەکانیان بەخشیی وەك وەرگرتنی تەوبە و دانانی شەریعەت و ، چەندین دیاردەی شیرکی تریش لە خواپەرستییدا . ئەو دەستەواژەیەش کە لە ئایەتەکەدا دەربارەی بەخواگێڕانی قەشە و راهیبەکان پەیوەندیی بە کاروباری ژیانی رۆژانەیانەوە هەیە و ، بڕیاری ئەوەش ئەدات کە ئەوان مافی شەریعەت دانانیان نیە . لەبەر ئەوە سەرەتا قورئان دەست بە خاڵیکردن و پاك کردنەوەی دڵەکان و مێشکەکان ئەکات لە شەریك دانان بۆ خوای باڵادەست و ، بڕیاریش ئەدا کە خواپەرستیی بە تەنیا بۆ ئەو بێت . پێویستە نوێژ و رۆژوو و حەج و زەکات بۆ خوای باڵادەست ئەنجام بدرێن و ، قوربانییەکانیش بە تەنیا بۆ ئەو سەر ببڕرێن . لێرەدا لەوانەیە ئەهلی کیتاب بە ئاسانیی بڵێن : (( ئێمە هەموو ئەمە لە پێناوی خوادا ئەنجام ئەدەین)). کەواتە لێرەدا قۆناغی شەریك بۆ خوا بڕیارنەدان ، بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان، دێت . واتە قبووڵ نەکردنی هیچ بەدیهێنەرێکی تر جگە لە خوا ، وەك سروشت، یا هۆکارەکان ، یا هەر هێزێکی تر و ، بڕوابوون بەوەی کە بەدیهێنان و مردن و ژیان و رزق و بەڕێوەبردنی بوونەوەر بە دەستی خوایە بە تەنیا و ، بەرز و پاك راگرتنیشی لەوەی کە منداڵی ببێت ، یا لەدایك ببێت ، یا پێویستیی بە کەسێکی تر هەبێت . هەروەها بەرز و پاك راگرتنی لە هەر ناتەواوییەك ، یا

هەر شوورەیی‌یەك ، یا لەوەی کەسێك هاوتای بێت . جا ئەگەر ئەم پەردە رەشە بەسەر ئیمانەوە لاچوو ، ئەو کاتە ئەگونجێت روو لە دیاردەکانی تری ژیان بنرێت. ئەمەش بۆ ئەوەی ئیمان بە خوا کامڵ ببێت و ، خواپەرستیی پاڵفتەشی بە تەواویی بۆ ئەنجام بدرێت ، واتە تەوحید بە هەموو واتاکانیەوە بێتە دیی . بەم شێوەیە هەر وەك لە بانگی ئیسلامدا ( تدرج ) واتە هەنگاو دوای هەنگاو هەیە، هەروەها لە کاردانەوەی بەستنی مێشك و دڵەکان و بەستنی ژیانی رۆژانە بە تەوحیدیشەوە ( تدرج ) هەیە . هەر وەك مامۆستا نوورسییش جەختی لەسەر کردۆتەوە ئیسلام ـ لە دیوێك لە دیوەکاندا ـ بریتی‌یە لە بەدەست هێنان و بتەو کردن و رێك و پێك بە کارهێنانی ئیمان . بەڵێ ! لە کۆتاییدا هەموو شتێك پاڵ بە ئیمان و بە تەوحیدەوە ئەدات . دوای پێك هێنانی ئەو حەقیقەتانەش کە ئیمان و تەوحید چەقەکەیان پڕ ئەکەنەوە ، بایەخ بەو مەسەلانە ئەدرێت کە پەیوەندی‌یان بە دەوروبەری دەرەوە هەیە و دیاری‌یان ئەکات .

نەزانینی فراوانیی و قووڵیی و نیشانەی ( تدرج ) ی بانگی ئیسلام و بانگی تەوحید زانینێکی چاك بە پێی ئەم پێوەرە و ، نەزانینی ستراتیجیەتی ئەم بانگەوازە بۆ بەستنی پرد لەگەڵ چین و بەشە جۆر بە جۆرەکانی گەلدا و ، لەو بارەشەوە کەوتنە ناو تێ‌گەیشتنی هەڵەوە ، بووە هۆی دوورکەوتنەوەی خەڵکێکی زۆر لە ئیسلام . سەرەنجامەکەشی بریتیی بوو لە دیاردەیەکی جیاواز ، بگرە بە تەواویی دژ و پێچەوانەی رۆحی ئەم دینەی کە خاوەنی هێزێکی بەهێزی راکێشانە و ، خەڵك بۆ لای خۆی رائەکێشێت . لەلایەکەوە رای گشتیی و خواستەکانی جەماوەر شێوێنران و ، پەلەکارییش ـ کە یەکێکە لە نیشانەکانی لاوازیی مرۆڤ ـ هەموو شتێکی گرتەوە و ، دەستووری ( تدرج ) یش پشت گوێ خرا و ، لەوەش گرنگ تر ریزبەندیی ئەو هەنگاوە یەك لە دوای یەکانەی کە لەم ئایەتەدا باس کراون پشت گوێ خرا . ئەوەبوو لە کۆتایی‌یەوە و لە دوا بڕگەیەوە دەست پێ کرا، سەرەنجام رێبازێکیان گرتە بەر کە جەماوەر بە رێبازێکی تیژڕەوی لە قەڵەم دا. لە

لایەکی تریشەوە ئەوە راگەیەنرا کە هەتا ئەوانەی کە لە رێبازی ئەحمەدیی لایان دابێت ئەچنە بەهەشتەوە ، ئەمەش لە ئەنجامی تێنەگەیشتن و دەرك نەکردن بە مانا و ناواخنی ئەم ئایەتە پیرۆزە بە چاکیی . لەگەڵ ئەوەش دا ئایەتەکان ـ کە یەکێکیان ئەم ئایەتەیە ـ ئەگەر بە چاکیی لێی ورد ببینەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەهلی کیتابدا تەنها پرد ئەبەستێت و دەرگاکانیش لەبەر دەمیاندا والآ ئەکات . بەلآم ئەوەی دوای چوونە ژوورەوە لەم دەرگایانەوە روو ئەدات ئەوە باس ناکرێت ، بگرە ئایەتی تر ئەوە ئەنجام ئەدەن . لەبەر ئەوە رێ بە کەس نادرێت ئاماژە بۆ ئەم ئایەتە بکات و بلێت ئەگەر ئەهلی کیتاب ئیمانیان بە خوا و بە پێغەمبەرمان هێنا ، بەلآم نەکەوتنە شوێن رێبازی پێغەمبەر ﷺ (( ... ئەوانە وەها و وەهایان بۆ ئەبێت )) . چونکە هاووێنەی ئەم ئایەتانە هی ئەوەن هاووێنەی ئەوانە بۆ سەر رێبازی پێغەمبەر ﷺ بانگ بکەن . جا دوای شوێن کەوتنی ئەم رێگایەی و چوونە ژوورەوە لە دەرگای کۆشکەکەیەوە ، ئەوا ئەوەی لەسەریانە شوێنی بکەون پێویست بە روون کردنەوە ناکات و ، لە پێناوی تێگەیشتن و وەرگرتنی ئیسلام و قورئانیش بە چاکیی ، پێویستە بە تێڕوانینێکی گشتگیر بڕوانینە قورئان و سوننەت و ، لە ناوکرۆکی ئەم گشتەشەوە لە بەشەکان تێبگەین و ، هەموو شتێکیش لە شوێنی راستی خۆیدا دابنێین . جا هەر وەك شانەکانی کۆرپەلە لە رەحەمی دایکدا هەر یەکەیان روو لە شوێنی راستی خۆی ئەنێت ، بەبێ هیچ لادانێك یان هەڵەیەك ـ هەر وەك لە وتەی سێیەمیندا هاتووە ـ ئیتر شانەی چاو ناچێت بۆ گوێ ، هەروەها پێویست بوو لە کاتی پێك هێنان و دامەزراندنی شێوازەکانی ژیانی ئیسلامییدا هەموو شتێك لە شوێنی راستی خۆیدا دابنرێت ، ئەمەش بەستراوە بە تێگەیشتنی قورئان و سوننەت لە ناو چوارچێوە گشتگیر و گشتییەکەیاندا و ، تێگەیشتن و وەرگرتنی هەموو بەشێك و دانانی لە لە شوێنی راستی خۆیدا . ئەگینا بە حەتمیی چەندین تەفسیر و ئیجتیهادی لار و وێر و هەڵە و ، چەندین کاری دژوار سەر هەڵئەدەن . ئەمەش

به وێنەی شێوانی کۆرپەلە لە ڕەحەمی دایکدا ، یان ڕوودانی حاڵەتی لەبار بردن لە منداڵبووندا .

کورتەکەی ئێمە لێرەدا ئەتوانین بڵێین کە ئەگونجێت بانگی ڕۆح و ویژدانە جیاوازەکان و ، ئەو ڕۆشنبیریی و شارستانیەتانە کە پشتیان بە چەندین تێگەیشتنی جیاواز بەستووە و ، ئەو ئومەتانەش کە کتێبە زۆرە دابەزیوەکان لە کاتی جیا جیادا پێکیان هێناون و پێیان گەیاندوون بکەین بۆ سەر هێڵێک کە لەوانەیە بتوانین ناوی بنێین ( هێڵی ئاشتەوایی ) و هەموو دڵ و ویژدانێك وەری بگرێت . هێڵێك کە یەکێتیی و هۆگریی بەرپا ئەکات و ، هەموو مەسەلەیەکیش لە چوارچێوەی سۆز و بەزەیی فراوان و گشتگیر و ، لە بازنەیەك لە ڕەهەندی گەردوونیی وەرئەگرێت ، بە جۆرێك کە هەڵی حەل کردن ، لە سایەی بە حەکەم کردنی حەقدا ، بە هەموو بیرێك و بە هەموو ویژدانێك ئەبەخشێت . بەم شێوەیە ڕۆحەکان ئەتوانن لە چنگی هەوا و ئارەزووەکان ڕزگاریان بێت ، تا بە بەندایەتیی ڕاستەقینە بۆ پەرستراوی ڕەها ( المعبود الحق ) ( جل شأنه ) بگەن و ، خۆیان لە بەندایەتیی خوا ساختەکانی دنیا ڕزگار بکەن .



﴿ كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓاْ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ( آل عمران : ٨٦ ) .

ئەوانەی لایەنی زاڵمان ئەگرن و پشتیوانیی لە کوفر و ناڕەوا ئەکەن، هەرچەندە جوانیی حەق و ناشیرینیی و نالەباریی خراپەیان بینیوە ، کەسانێکی چەوت و زاڵمن . ئەوانە خەڵکانێکی بەدبەختن کە فیترەتیان لای داوە و ئیفلیج بووە و ، بە ڕادەیەکیش لێهاتنی هیدایەت وەرگرتنیان لە دەست داوە کە خوای باڵادەستیش

له هیدایەت بەشی نەداون و ، ناشیان خاتە سەر رێی راست. هیدایـەتیان نـادات، چونکە هاوەڕێنەی ئەوانە چـوونەتە نـاو تـەنگ و چـەڵەمەی جـم و جـوولێکی دوور خـەرەوەوە لـە ناوجەرگـەی ئیسـلام و ، وان لـە حاڵـەتێکی نەفسـیی وەهـادا کـە هاوڕێـیەتیی ئـەو دوورکەوتنـەوە ئـەکات . ئـەو حاڵەتـە نـەیارییکردن و تـاوان بارکردنی ناوجەرگەی ئیسلام نیشانەیەتی ، ئیتر لە ناوجەرگـە دوور ئەکەونـەوە و، ئەوەش ئەبێتە مایەی قووڵکردنی رەشێتیی دڵەکانیان . ئەوانـە بـەم کردەوەیـەیان و، بە کەم سەیرکردنی ئیمانداران ـ ئەوانەی کە وەهای دەر ئەبڕن بە چاکیی ئەیان ناسن ، چونکە لە ناویانا بوون ـ وەهای لە قەڵەم ئەدەن خزمـەتی کـوفر و ئیلحـاد ئەکەن و ، رۆحی مەعنەوییشیان بـەهێز ئەکـەن و ، لـە هـەمان کـاتیشدا ئیمـان داران نوقمی خەم و خەفەت ئەکەن .

بەڵام ئەو خوا باڵادەستەی کە نوورێکی جیاوازی بە ئیسلام بەخشیوە ـ کـە لـە نووری خۆر ئەچێت لـە چـاو دینـەکانی تـردا ـ ئـەو دوورکەوتوانـە لـەم نـوورە لـە سـەرگەردانییەکی هەمیشـەییدا ئەهێڵێتـەوە و ، هـەرگیز بـۆ سـەر هـیچ شـتێك هیدایەت نادرێن و ، تەمەنیان و ژیانیـان لـەو کوێرییـەدا سـەرف ئەکـەن و هـیچ شـتێکیان دەسـت ناکـەوێت و ، ئەبنـە نموونەیـەکی خـراپ بـۆ تـاك و کۆمەڵـە گومڕاکان .



﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ ( آل عمران : ٩٧ ).

هەموو خواپەرستییەك کـە بـۆ خـوای باڵادەسـت ئـەنجام بـدرێت بریتییـە لـە سوپاس کردن بەرامبـەر بەو نیعمەتـە زۆرانـەی کـە بـە سـەرماندا رژانـدوونی و ، لەوانەشە بە رێژەیەك بە فیعلیی بەرامبەریان بێت . بەرامبـەرییەك کـە تـەنها لـە رێی خوا و لە پێناوی ئەودا ئەنجام ئەدرێت . حەج کردنیش بەو شێوەیە ، بریتییە لـە سـوپاس کـردن بەرامبـەر بـە نیعمـەتی لـەش سـاغیی و نیعمـەتی سـامانی

پێبەخشراو . لەبەر ئەوە هەرکەس نیەتی حەجی هێنا ئەڵێت : (( حەج بۆ خوا بەجێ ئەهێنم )) . لەبەر ئەمە قورئانی پیرۆز لەو بارەوە ئەفەرموێت : ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ ، لام لە وشەی (( لله )) دا بۆ ( إستحقاق ) ە و ، پیتی (( علی )) ش لە ( علی الناس ) دا بۆ فەرزە و ، لامی تەعریفیش لە ( الناس ) دا بۆ ( عهد ) ە. بەم شێوەیە سەرەتا دەست پێکردن بە وشەی ( علی الناس ) جۆرە لێهاتنێکی‌دەست پێکردنە و ئاماژەیەکیشە بۆ ئەو مەرجانەی کە بە دوای‌دا دێن. واتە وشەی ( علی الناس ) ئاماژە بۆ هەندێك لە خەڵکیی ئەکات . جا ئەوانە کێن ؟ ئەوانەن کە مەسرەفی ڕێگا و خواردنیان هەبێت لەگەڵ توانای سەفەر ، سەرەڕای بوونی مەحرەم بۆ ئافرەتان .

بەکارهێنانی پیتی ( جر ) ی (( علی )) لە ئایەتی ( علی الناس ) دا ئەم نوکتەیەمان بیر ئەخاتەوە : حەج خواپەرستی‌یەکە لە نوێژ و ڕۆژوو زۆر گرانترە. سەرەڕای ماندووبوونی سەفەر ، ئێوە ناچار ئەبن پارەیەکی زۆر خەرج بکەن و، لە کار و لە نیشتمان و لە خزمانتان ... تد دوور بکەونەوە . پیتی ( جر ) ی (( علی )) ش کە قورئان بە کاری ئەهێنێت لە دوورەوە ئاماژە بۆ ئەو نارەحەتی‌یانە ئەکات کە لە دووتوێی فەرزەکانی تردا تایبەتن بە حەج .

سەرەڕای ئەمە ( إستطاعة ـ توانین ) بریتی‌یە لە جێ بە جێکردنی فەرمان بە ڕەزامەندیی دڵ و ، بە نیەتی مل‌کەچیی بە جوانترین و چاکترین شێوە. ئەمەش بەستراوە بە ئیرادە و قودرەت و ئیمکانییەتەوە . واتە ( إستطاعة ) لێرەدا لە جێی بەشەکانی‌دا لە هێز و توانا و ئیمکانییەت بەکار هێنراوە و، فراوانیی مانای ئەم وشەیەش سەرچاوەیەك و هۆیەك بووە بۆ جیاوازیی تەفسیرەکەی لەلای ئیمامە موجتەهیدەکان و ، هۆیەکیش بووە بۆ ئاسانیی و فراوانیی .



﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾
( آل عمران : ١٠٢ ) .

شەرم و تەقواكردن لە خوا بە چاكترين شێوە لەگەڵ ناسينى خواى باڵادەستدا رێژەيەكى راستەوانەيان هەيە ، لەبەر ئەوە ئەتوانرێ بوترێ هەرچيى زانست هەن كە بۆ زيادكردنى ناسينى خوا يارمەتييمان نادەن زانستێكى رواڵەتين و ، بريتين لە وتى و وتى . هەروەها هەموو شەوبەسەر بردن و كۆشش كردنێك ، يان هەر پرسيار و وەڵامێك يارمەتيى فراوان كردنى ناسينى خوا نەدەن ئەوە ئيسرافە لە كاتدا و ئيسرافيشە لە قسەكردندا . كاتێكيش كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: (ويكره لكم ثلاثاً) ، لە ريوايەتێكيشدا هاتووە : ( ويسخط لكم )[12] ئاماژەى بۆ ئەم حەقيقەتە كرد و ، لە ناويشياندا باسى پرسياركردنى زۆرى كرد و، نموونەيەكى ئەو پرسيارانەشى باس كرد : ( مَن خَلَقَ كَذا ، مَن خَلَقَ كَذا ، حتى يقول : مَن خلقَ رَبَّكَ ؟ ) .[13] واى بە كەڵك ئەبينين دەربارەى ئەم كارەى دواوە بۆچوونى خۆمان بخەينە روو . ماوەيەكمان بەسەردا رۆيشت وەها باسى هۆكارەكانيان بۆ ئەكردين كە خواى باڵادەست ـ حاشا لەو ـ دەستەوسانە و، هۆكارەكان كار ئەكەن و كار جێبەجێ ئەكەن و هەموو شتێك بەديى ئەهێنن. كاتێك كە ناوى شێرپەنجە ئەبەن ئەڵێن : ئەمە نەخۆشىيەكە چارەسەرى نيە . كاتێكيش كە ئايدز دەركەوت وتيان : هيچ شيفايەكى لێ چاوەڕوان ناكرێت . بەم شێوەيە فيكر و شعوورى پشت بەستن بە خوا و خۆدانە دەست خوا ( توكل و تسليم ) يان بەلاى ئيماندارەوە رماند . ئەمەش ـ كەم بێت يان زۆر ـ ئێستا

---

[12] البخاري ، الذكر : ٥٣ ، مسلم ، العقائد : ١٠ ، ١٣ ، ١٤ ، الموطأ ، الكلام : ٢٠ ، المسند للإمام أحمد : ٢ / ٢٢٧ ، ٣٦٠ .

[13] البخاري ، بدء الخلق : ١١ ، مسلم ، الإيمان : ٢١٤ .

بـەلای هەموانـەوە هەیـە . مـن وای ئـەبینم لەسـەرمان پێویـستـە ـ لـە ڕێـی لێکۆڵینەوەوە ـ لە کاریگەرەوە بگەین بە کارتێکراو بۆ دەست خستنی ئـارامیی دڵ و ، پەیبردن بەوەی کە خوای باڵادەست داهێنەری هەموو هۆکارەکانە و، هـەر خۆی تایبەت مەندیی و سیفەتەکانیشی بە هۆکارەکان بەخشیوە و ، بـەردەوامیش لە یادمان بێت کە خوا لە دەرەوەی بازنـەی هۆکارەکانـەوە توانـای بـەدیی‌هێنان و هێنانە وجوودی هەیە ، تا بەردەوام فیکرە ئیمانی‌یەکانمان نوێ بکەینەوە.

هەوڵدان بۆ شەرم و تەقواکردن لە خوا بـە چـاکترین شـێوە ، واتـە لـەیادبوونی ترس و سام لێی بەردەوام و لە هەموو حاڵەتێکدا و ، بایەخدانیش بە هـەموو هـۆ و هۆکارێك کە ئەو هەستە ڕاستەقینە دروست بکەن و ، ڕێی دروست بـوونی هـیچ کون و کەلەبەرێکیش نەدرێت لە نێوان ژیان و ، لە نێوان ئامانج و مەبەستی ئـەو ژیانەدا و ، دۆزینەوەی ئەوەش کە بگونجێت ڕابکێشرێت و ئـاڵوگۆڕی پـێ بکرێـت لە هەر وتە یا ڕووداو یا باسێکدا بۆ یادخستنەوەی تەقوا و ، بەردەوام سـوپاس و ستایش‌کردنـی خـوایش لەسـەر ئـەو نیعمەتـە زۆرانـەی کـە لـە ژمـارە نایـەن و سەرژمێریی ناکرێن ، کارێکی پێویستە بۆ چوونە سەر ڕێـی تـەقوای ڕاسـتەقینە . لە هەمان کـاتدا مانایشـی کەوتنـە سـەر ڕێ و ڕێبـازی مـردن و سـەر نانەوەیـە لەسەر دینی ئیسلامیی ، کە ئـەوەش حاڵـەتێکی پڕ ڕەزامەنـدیی تایبەتی‌یـە بـە پێغەمبەرە بەڕێزەکان و ئەهلی ( خواص ) لە میرات‌گرانی پێغەمبەران . ئـەوەبوو هاوەڵە بەڕێزەکان ئەوەندە خواپەرستی‌یان ئـەکرد هـەتا قاچیان تلۆقـەی ئـەکرد و هێزیان تیا نەئـەما ، ئەمـەش لـە پێنـاوی دەسـت خسـتنی ئـەم پلەیـەی تـەقوا و گەیشتن بەم ئامانجە . ئەوەبوو بە پێی یاسای ﴿ اتقوا الله ما استطعتم ﴾ چـەندیان لە توانادا بوو ، بە درێژایی تەمەنیان کاریان کرد .



﴿ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ ( آل عمران : ١١٧ ) .

زۆر جار ئـەم مەسـەلەيە لـە قورئـانى پـيرۆزدا بـە صـيغەى ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ ( النحـل : ٣٣ ) هـاتووە و ، هـەر وەك تـێبينييش ئـەكرێت جيـاوازيى نێـوان هـەردوو صـيغەكە (( كـانوا )) ى كـردارى كەينوونەيە .

بەڵێ ! كردارى كەينوونەى (( كانوا )) لە ئايەتەكەى سەرەوەدا نيە ، ئەمـەش ـ خوا خۆى زاناترە ـ ئەمەى خوارەوەمان بير ئەخاتەوە :

١ ـ زوڵـم كردنـى ئەوانـە لـە خۆيـان لـە پـەنا و لـە نهێنيـىدا نيـە ، بـەڵكو راستەوخۆ و بە ئاشكرايە ، بە جۆرێك كە زوڵم كردنيان ـ بە تايبەتيى لە خۆيـان ـ بە ئاشكرا ئەبێت ، بە رادەيەك پێويست بـە دەربـڕين ناكـات ، چـونكە هـەموان ئەىبينن و پەى پێ ئەبەن .

٢ ـ كردارى كەينوونـە مـانـاى ئـەوە ئەگـەيـەنێت كـە لـەوەو پـێش نـەبووە و ، ئێستە هەيە . بەڵام كافرەكان لـە دێـرين زەمانـەوە و ، هـەتا ئێسـتاش زوڵـم لـە خۆيان ئەكەن . ئەمەش ئەوەيە كـە هـەموان ئـەىبينن . لەبـەر ئـەوە ئـەم ئايەتـە پيرۆزە كردارى كەينوونەى (( كانوا )) ى تێدا نيە .

٣ ـ لە پێناوى روون كردنەوەى ماناى بڕگەى دووهەم ئەڵێين : ئەوانـەى كتێبـى خوايان بۆ هات دواى ئەوەى كە بەو كتێبانە بۆ ماوەيەك هيدايەتيان وەرگرت لـەو هيدايەتە لايان دا و ، كەوتنە ناو كوفر و گومڕاييەوە . واتە لـە سـەرەتاوە زاڵـم نەبوون ، لەبەر ئەوە بەكارهێنانى كردارى كەينوونە (( كانوا )) دەربارەيان بـۆ روون كردنەوەى ئـەم كـارە ، شـتێكى گونجـاو بـوو . بـەڵام حـاڵى زاڵمـان لـە سـەرەتاوە پێويستى بە هيچ پابەند بوون و بە هيچ روون كردنەوەيەكى تر نيە .

* * *

﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ (آل عمران : ١٥٤) .

کاتێك كە قوتابیانی نوور هەر سزایەکیان ئەدرا یا هەر زوڵم و ستەمێکیان دەرحەق ئەکرا مامۆستا ( بدیع الزمان ) وەبیری ئەهێنانەوە کە پێویستە خوێندنەوە و تەفسیری ئەم ئایەتە دووبارە بکەنەوە . جا بە وێنەی کەسێکی وەك من کە سوودی لە دەرسی مامۆستا نوورسیی وەرگرتبێت با جارێکی تر ئەم ئایەتە بخوێنینەوە و ، ئەو دەرسەی کە پێویستە لێی وەربگرین .

خەو پیاکەوتنی هەر کۆمەڵێك ـ کە لە ترس و شڵەژانێکی زۆردا بژین ـ و گەیشتنیان بە ئەمن و سەکینەیەکی رۆحیی و دەروونیی و ، بە دڵئارامیی‌یەکی کامڵ ، ئەوە لوتف و فەزڵێکە لەلایەن خوای باڵادەستەوە بۆ ئەو کۆمەڵە و، بەڵگەی متمانەشە لەو کۆمەڵەوە و ، تەسلیم بوون و کارپێ سپاردن و بەتەمابوون و پشت پێبەستنی ئەو کۆمەڵەیە بە خوای باڵادەست . لە هەردوو غەزای بەدر و ئوحوددا دەرکەوتنی ئەم جۆرە دڵئارامیی‌یە و ، ئەم بەڵێنە خوایی‌یە و، هاتنی ئەم سەکینە رەحمانی‌یە بە رێژەی دەستگرتنە بە دینەوە و ، بە رێژەی رووکردنی دڵەکانە بەرەو میحرابی راستەقینەی خۆیان . ئەمە لە هەموو بارودۆخ و لە هەموو رووتێکردنێکی راستگۆیانەدا روو ئەدات.

بەڵێ ! دین رۆحی ژیانە و ، بەرزکردنەوەی فەرمایشتی خوایش پیرۆزترین فەرمانبەری‌یە و ، سەرف‌کردن و بەخت‌کردنی ژیانیش لەو پێناوەدا ئەو رێیەیە

کە تەقە لە دەرگـای ژیـانی هەمیشـەیی و ، بـوونی هەمیشـەیی ئـەدرێت و ، بـە پێوانەی دانانی ڕەزامەندیی خـوای باڵادەسـت وەك مەبەسـتی مەبەسـتەکان ، لـە بەرامبـەریا بایـەخ پـێدان و ، چـاودێریی کـردن و ، پارێزگـاریی کردنـی خـوا ئەبەخشرێت . جا ئەم بایەخ پێدان و چاودێرییکردنە لە هەموو کات و شوێنێکدا و بە ڕێژەیەکی نزیك لەو بایەخ پێدانەی کـە بـۆ هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازیـی بێـت ناوی براوە ، هەرکەی مەرج و کەش و هەوا و هۆیەکانی ئەو بایـەخ پێدانـە بێنـە دیی ، ئەبەخشرێت . لە ناو ئیمانداراینشدا هەرکەسیان لە هەمان ئاستی ئیمـان و تەسـلیم و تـەوەککولدا بێـت ئـەتوانێت بـە سـنگێکی کـراوە و بـە دڵێکـی دامەزراوەوە بەرهەڵستی هەتا ئاگرەکەی نەمروودیش بکات ، بگرە لەوانەیـە ئـەو ئاگرە بە ( برداً وسلاماً ) بگۆڕێت .

لە بەرامبەر ژیانە هێمنە دامەزراوەکەی ئەمانەوە ، کۆمەڵـە خـەڵکانێکی تـر هەن کە لە هەمـان کەش و هەوادا بەشداریی ئەمانە ئەکـەن ، کەچـیی لـە هـەمان ئـاو و هـەوادا نـاژین ، لەبـەر ئـەوە ئـەیان بیـنین لووتیـان ژەنـدووە بـە هـەوا و ئارەزووەکانی دەروونیاندا ، ئیتر ئەو گومانانەی کە وان لە بیر و هەستیانا ڕەنـگ ئەدەنـەوە تـا ڕێـی ژیـانێکی پـڕ لـە کـاری پێچـەوانەی خەجاڵـەتیان بـۆ نەخشـە بکێشێت. لەبەر ئـەوە ئەوانـە هـەرگیز حەسـانەوە و دڵئـارامیی نـابینن ، بـەڵکو لەبەر ئەوەی مێشکیان لە بیر و بۆچـوونی نـەفامیی پـڕە ژیـانێکی ڕارایـی بەسـەر ئەبەن . هەتا ئەگەر ئەوانە ئیمانیش بهێنن بیر و بۆچوونیان دەربارەی پشت بەستن بە خوای باڵادەست تێکەڵ بە بەدگومانیی ئـەبێت . ئایـەتی پـیرۆزی : ﴿ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ﴾ حالـــــــەتی بێئومێدیی لێڵ لـە هەسـت و سـۆزی ئەوانـەدا و ، ئـەوەی کـە تووشـی بـوون لـە دوودڵیی و داڕووخاویی بە ڕوونیی دەر ئەخات .



﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأَيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ ( آل عمران : ١٩٠ ) .

وێنەی ئەم سەرنجە گشتگیرە لە گرنگترینی ناتەواوییەکانمانە !... بەڵێ!... سەرنج دانێك کە ئیمانمان نوێ بکاتەوە و بەردەوام بە زیندوویش بیپارێزێت. هەروەك لاشە ئەگەر دڵۆپە ئاوێکی ساردی بەسەردا بکەیت کە لەگەڵیا رانەهاتبێت ، رائەچلەکێت ، وەهاش لەسەرمان پێویستە لە قەرەوڵی بیر و سەرنج دان‌دا ئەو شتە بدۆزینەوە کە وا لە ئیمانمان ئەکات رابچڵەکێت و ، وامان لێ بکات تیشك‌دانەوەی ناو و سیفەتەکانی دەسەڵات‌دار و خاوەنی راستەقینەی شتەکان و کاریگەری راستەقینە لەسەریان ببینین و ، ئەو رۆژانەی ژیانیشمان کە ماون لە بازنەی رەزامەندیی خوای باڵادەست‌دا و ، لەبەر رۆشنایی ئەو نوورەی کە لەو کاری بیرکردنەوە و سەرنج‌دانەدا بەدیی هاتووە ، بەسەر بەرین .

بەڵام ئەو شعوور و بیستن و تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی رۆح و مانا و دەنگ و دەروون و رەنگ و رازاندنەوە و زمان و تاسەمەندییەی کە هەر هەموویان لە ئاسمانەکان و زەویی و هەرچیی وا لە نێوانیان‌دا ئەتەنێنەوە ، بۆ هەموان دەست نادات ، بەڵکو وا دەرئەکەوێت پێویستیی بەو کەسە هەبێت کە ئەتوانێت پەی بەو دەوڵەمەندییە لە رەنگەکان‌دا بەرێت و بچێتە ناخیەوە و ، پەیش بەو ئاوازدانانە بەرێت لە دەنگەکان و لە مۆسیقادا ، پاشان هەڵسەنگاندنی لە لایەن دەستەیەك لە رۆشنبیرانی (( أولي الألباب )) ەوە ، ئەوانەی‌کە بە هەڵە و لادان مێشکیان خەسار نەبووە و ، بە هەوا و ئارەزووە دەروونییەکانیش کێشانە و پێوانەیان بە لاوە خەسار نەبووە ... پێویستییمان بەو (( أولي الألباب )) انە هەیە کە ئەتوانن بچنە ناو قووڵایی ئاسمانەکان و زەوییەوە بە هەموو ئەو سیفەتانەیانەوە کە مەفهوومی ( شوێن ) وەبیرمانی دێنێتەوە و ، ئەوەش کە

بەدییهێنانی ئەوەی وا تیایانا لە شت و لـە کائینـات داخوازیـەتی ، لـە هـەموو لایەکیانـەوە ، لـە ئاراستەکردنی ( ئیرادە ) و ( ئیختیـار ) ، ئەمـەش بـە پێـی مەبدەئی هاوڕێژەبوونی ( علّة ) ، بۆ گەیشتن بە هۆکاری ( کامڵ ) و بـە خـاوەنی قودرەتی ( کامڵ ) ( جل جلاله ) لە ڕێـی ( منطـق ) و ( تحليـل ) و ( ترکیـب ) ەوە . جا ڕۆح و عـەقڵی هـەموو مرۆڤێـك وەهـا بـەدیی هێنـراوە کـە بـە فیتریـی بتوانێت لەوە تێ بگات و دەرکیشی پێ بەرێت ، بەڵام کۆسپەکان بە وێنەی لـووت بـەرزیی و لەسنووردەرچـوون و بەرچـاوگرتنی هەڵـە ، قەدەغـەی بینینـی ئامـانج ئەکەن بە شێوەیەکی روون . هـەتا ئەگـەر مـرۆڤ بگاتـە چڵەپۆپەی زانسـت هـەتا نەتوانێت لەو کۆسپانە خۆی رزگار بکات ، ئەوا ناتوانێت لـە بڕیـاری هەڵـە خـۆی رزگار بکات .

  

﴿ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٔـٰنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ ( النساء : ١٨ ) .

ساتی بێئومێدیی بریتی‌یە لە دواساتی ژیانی ئەو مرۆڤەی کە ئیمانی لێ وەرنەگیراوە ، بەڵام گرنگ ئەوەیە سەرەتای ئەو ساتە دیاریی بکرێت . ئەم سەرەتایە لەو کاتانەدا دەست پێ ئەکات کە ئەو کەسە لە ساتەکانی کۆتایی تەمەنی‌دا لە گەڕانەوە بۆ ژیانی دنیا و ژیان تیایا بە هەست و هۆشی تەواوەوە، دەست ئەشوات . لە بۆچوونێکی تردا بریتی‌یە لەو ساتەی کە ئەو کەسەی لە گیانەڵادایە بە خۆی و بەوانەشەوە کە دەورەیان لێ داوە دەست لە گەڕانەوەی بۆ ژیانی دنیا بشۆن .

بەڵێ ! ئەگەر مرۆڤ توانیی ئیمان بهێنێت ، با لە دواساتەکانی ژیانیشی‌دا بێت ، ئەوا ئیمانی لێ وەرئەگیرێت ـ مادەم خاوەنی هێزی عەقلیی خۆی بێت ـ. ئەمەش ئەو ساتەیە کە پێغەمبەر ﷺ داوای ئیمان هێنانی لە مامەی دووبارە ئەکردەوە ، بەڵام ئەبوطالیب ـ لە ئەنجامی فشاری دەرەکیی‌دا ـ دەری بڕیی ( کە لەسەر میللەتی عەبدولموطەللیب ئەمرێت ) .[١٤] ڕووداوێکی تریش کە شیاوە لە سەری بوەستین ڕووداوی منداڵە جوولەکە نەخۆشەکەیە . ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ سەردانی منداڵێکی جوولەکەی کرد کە لە گیانەڵادا بوو و ، ئەوەی خستە سەر زمانی بڵێت : (( لا إله إلا الله )) . منداڵەکەش سەیری باوکی کرد وەك ماوەی لێ بخوازێت ، باوکیشی ئاماژەی قبووڵکردنی بۆ کرد . بەمە منداڵەکە ئیمانی

[١٤] البخاري ، مناقب الأنصار : ٤٠ ، الجنائز : ٨٠ ، مسلم ، الإيمان : ٣٩ .

خۆی دەربڕیی و ، کەلیمەی شـەهادەتی بـە دەم وت .[15] کەواتـە مـادەم هەسـت و شعوور تێك نەچووبێت ئەوا دەرگاکانی ئاسمان بۆ وەرگرتنی ئیمان لەسەر پشتن.

بەڵێ ! ساتی دەست لە خۆ بەردان ـ واتە ئەو سـاتەی کـە ئیمـانهێنـانی تیـّدا وەرناگیرێت ـ ئەو ساتەیە کـە مـرۆڤ هەسـتی نامێنێـت و ، خەریکـە دنیـا بـەجێ بهێڵێت و ، ئیمانهێنانی لێ وەرناگیرێـت . بـەڵام ئەگـەر پێچـەوانەکەی رووی دا، ئەوا لەو کاتـەدا سـەیری نیـەت و هەسـت و قەناعـەتی ئـەو کەسـە ئـەکرێت وەك تۆوێك کە لە ژیانی بەرزەخیی و لە ژیانی حەشردا گەشە ئەکات و گەورە ئـەبێت، تا ببێتە باقەیەك لە پاداشت و خەڵات بۆی .

کەواتە مادەم ئەو کەسە پێش سـاتی گیانـەڵاَ ، بـۆ گەڕانـەوە بـۆ ژیـانی دنیـا هیوای نەبڕیوە و ، دەستی لە خۆی نەشۆردووە ، ئەوا روونـان لـە کـوفرەوە بـەرەو ئیمـان بـەردەوام وەرگـیراوە . خـۆ ئەگـەر بارودۆخەکـە بـە پێچـەوانەوە بـوو ئـەوا حوکمێکی جیـاوازی ئـەبێت . واتـە ئەگـەر دەسـت لـە دنیـا شـۆررا و پـەردەکانی سەیرکردن بۆ ژیانی قیامەت هەڵدرانەوە ، ئەوا هەل لە دەست دەرچووە ، چـونکە مـاوە نـەماوە هـیص کردەوەیـەکی چـاك ئـەنجام بـدرێت ، ئەگەرچـیی وشـەیەکی جوانیش بێت . سۆز و بەزەیی خواییش هەڵیك بۆ ئەوانەی کـە ژیـانی دنیایـان بـە فیسق و فجوور پیس کردووە ، ئەڕەخسێنێت ، ئەگەر ئیمان بهێنن و تەوبە بکەن، ئەمەش بە پێی نـاوەڕۆکی ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە ﴿ قُلۡ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴾ ( الزمر : ٥٣ ) .



[15] البخاري ، الجنائز : ٧٩ ، المرضى : ١١ .

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْۚ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ (النساء : ٢٩) .

کاتێك کە قورئان ئەفەرموێت : ﴿ لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ ﴾ دەستەواژەیەکی گشتگیر بەکار ئەهێنێت . ئەوەتا شان بە شانی خواردنی ماڵ و سامانی خزم و کەسەکان ، یان بەکارهێنانی کەل و پەلیان بەبێ رەزامەندییان ، سەرنجمان بۆ لای حەرامیی خواردنی ماڵ و سامانە گشتییەکان رائەکێشێت . جا هەر وەك تالآن و دزییکردن ئەچێتە ئەم چوار چێوەوە ، هەروەها داگیرکردن و ریبا و قومار و ئیسراف و دەستبڵاویی لە سەرفکردنی پارەدا و ، بەدەستهێنانی پارە بە رێی ناشەرعییش . بەڵام ئەو قازانجەی کە لە رێی ئاڵوگۆڕی سامانەکانەوە و ، بە رەزامەندیی هەموو لایەك دەست بکەوێت و ، ئەو قازانجەش کە لە رێی بازرگانییەوە ـ کە لێرەدا باس کراوە چونکە گرنگترین رێیە بۆ قازانج کردن ـ دەست بکەوێت ، ئەوە بەسە بۆ ژیان و گوزەران ، ئیتر گرتنە بەری رێگا حەرامەکان و رێگا گومان لێ کراوەکان پێویست ناکات و زەروور نیە .

ئەشتوانین لە تێبینیی ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ﴾ دا کە لە ئایەتەکەدا هاتووە بە دوو مانا تێ بگەین:

١ ـ هەر کەسێك دەست بداتە تاوانی ریبا یا قومار یا بەرتیل ... تد لە رێی پارەی حەرام ئەوا بەو کارەی بە مەعنەویی خۆی کوشتووە و خۆی لەناو بردووە .

٢ ـ ئەگەر خەڵکیی خەریکی مامەڵەی حەرام و ناڕەوا و زاڵمانە بوون ، بۆ دەستخستنی سامان و سەرفکردنی و هەر هەڵسوکەوتێك لەو شێوەیە و ، وەرگرتنی هەر بیروباوەڕێك کە پاڵپشتی ئەوە بێت وەك سەرمایەداریی ، یا لیبیرالیی توندڕەو ، یا هەتا براگماتیی و میکیافیلیی ، ئەوا ئەبێتە هۆی

سـەرهەڵدانی رژێمـی تـری دژ بـەوان وەك شـیووعیەت ... بـەم شـێوەیە دەرگـا لەبەردەم پیاوکوژ و خوێنڕێژەکان و ، کاری دەربەدەرکردندا والآ ئەکەن .

بەڵێ ! ئەگەر ئێوە لە سەرەتاوە بچنە ناو ئەم رژێمانەوە سەرەنجامەکەی ئەوەیە کە هەندێکتان هەندێکتان ئەکوژنەوە . لەبەر ئەمە دەست لە ئیسلام بـەر مـەدەن و پشت گوێی مەخەن و بچـنە نـاو رێ گومڕاکـەرە جیاوازەکانـەوە ، تـا سـەرەنجام هەندێکتان هەندێکتان بکوژن . بەڵێ ! حاڵی ئەو دنیایەی کە ئەم رژێمانـەی تێـدا جێبەجی ئەکرێن لەبـەر چـاوتانە و پشـتگیریـی و تەصدیقی ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە ئەکات .

٣ ـ رواڵەتی ئایەتەکە بە تەواوەتیی گونجاوە لەگەڵ مانـای دوورەپـەرێزییکردن لە ( إنتحار ) ، واتە کەسێك خۆی بکوژێتەوە ، بەڵام ئەم ئایەتـە هەنـدێ لایـەنی تری هەن . بۆ نموونە تێكدانی ئەو هاوسەنگییەی کە لە نـاو چـین و توێـژە جـۆراو جۆرەکانی کۆمەڵگادا هەن ، ئەو کۆمەڵگایە بەرەو کێشە و ململانێـی نـاوەکیی را ئەکێشـێت . هـەروەها وازهێنـانی هەنـدێ نـەزان ـ بـە بۆنـەی خـراپ تێگەیشتنیانەوە لـە زوهـد ـ لـە رێگـا شـەرعییەکانی کاسپیی و ، هەڵبـژاردنی هـەژاریی و ژیـان بـە کولەمـەرگیی ، ئوممـەت بـەرەو لاوازیـی و تیاچـوون را ئەکێشێت. هەروەها دەست بە سەرداگرتنی کەسێك بـۆ سـامانی کەسـانی تـر بـە رێگەی ناشەرعیی ، یا هەڵنانی کەسانی تر بۆ دەست بە سەرداگرتن و داگیرکـردن بە ناشەرعیی ، ئەو کەسە شیاوی کوشتن ئەکات . ئەمەش هەندێ خـاڵ بـوون کـە لە ئایەتەکە تێ گەیشتین .

سۆز و بـەزەیی فـراوان و گشـتگیری خـوایش بـە هـۆی هیدایـەتدانیـەوە بـۆ چاکترین و بێوەیترین رێگا ئەدرەوشێتەوە . دیارە هەر شتی وەهایش لـە خـوای ( رەحمان و رەحیم ) چاوەڕوان ئەکرێت .



﴿ إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيمًا ﴾ ( النساء : ٣١ ) .

عادەتە لە کاتی پێشکەش کردنی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەم فەرموودەیە باس ئەکرێت :

( إجتَنِبُوا السَّبع المُوبِقَاتِ . قَالُوا : يَا رَسُولَ اللهِ ! وَمَا هُنَّ ؟ قَالَ : الشِّركُ بِاللهِ، والسِّحرُ ، وَقَتلُ النَّفسِ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إلاَّ بِالحَقِّ ، وَأكلُ الرِّبَا ، وَأكلُ مَالِ اليَتِيمِ ، وَالتَّوَلِّي يَومَ الزَّحفِ ، وَقَذفُ المُحصَنَاتِ المُؤمِنَاتِ الغَافِلاتِ ) .[١٦]

من لێرەدا ئەمەوێت لەسەر ( التولي يوم الزحف ) ، واتە پشت هەڵکردن لە رۆژی جەنگدا ، کە لەم فەرموودە شەریفەدا هاتووە کەمێك بووەستم . مانای پاشگەز بوونەوە و هەڵاتن لە رۆژی جەنگ و جیهادە . ئەمە مانای بەکارهێنانی دەستە واژەی ( التولي يوم الزحف ) ە . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت ئەگەر خەبات کردن لەگەڵ جیهانی کوفردا بەردەوام بوو ، ئەگەرچیی خەبات و زۆران بازییەکی گەرم نەبوو ، واتە ئەگەر جەنگێکی سارد بوو و ، مەیدانیشی رۆشنبیریی و پەروەردە و فێرکردن و سیاسەت و هونەر و ... تد لەو مەیدانە جۆراوجۆر و گرنگانە بوو کە لەم رۆژانەدا زۆران بازییان تێدا ئەکرێت . بۆ نموونە ئەو ئیماندارەی کە پاشەکشەی کردووە و خۆی حەشار داوە ـ هەتا ئەگەر بە نیەتی زیادکردنی کەماڵی رۆحیی خۆیشی بێت ـ ئەوا ئەم فەرموودە شەریفەی بەسەردا جێبەجێ ئەکرێت و ، گوناهبار ئەبێت . خۆ ئەگەر کەسێك لە پێویستێتیی ئەم جۆرە خزمەت و بانگەوازە گەیشت ، پاشان لە کاتی خەباتدا ـ سا ئەو خەباتە هەر جۆرێك بێت ـ پاشگەز بۆوە ، بێگومان بەوە گوناهێکی گەورە ئەنجام ئەدات. سەرەڕای ئەوەش ئەو جۆرە رەفتارە رۆحی مەعنەویی لە بەرەی ئیسلامییدا لاواز

---

[١٦] البخاري ، الوصايا : ٢٣ ، الطب : ٤٨ ، الحدود : ٤٤ ، مسلم ، الإيمان : ١٤٥ ، أبوداود ، الوصايا : ١٠ ، النسائي ، الوصايا : ١٢ .

ئەكات و ، دوژمنان دڵخۆش ئەكات و نوقمی شادمانی‌یان ئەكات و، ئەمەش گوناهێكی زیادەیە .

بە وازهێنان لەو گوناهە گەورانەی كە ئەبنە مایەی تیاچوون ـ كە تەنها لەبەردەم یەكێكیاندا هەڵوێستەمان كرد ـ خوای باڵادەست بەڵێنی چاوپۆشیی‌كردن لەو گوناهانە ئەدات كە ویست و مەبەستیان لەگەڵدا نەبووە و، بەڵێنی چاوپۆشییش لەو گوناهانە ئەدات كە لە گوناهە گەورەكان ناژمێررێن. ئەمەش بە پاك كردنەوەیەكی خوایی و ، شایان بوون بە ژیانێكی بەختەوەرانەی ژیانی بەرزەخ و ژیانی ئاخیرەت و ، دەستخستنی پیاسەكردن لە باخچەكانی بەهەشت و ، دەستخستنی شانس و بەختیاریی لە بینینی جوانیی خوای باڵادەستدا ، ئەژمێررێت .

بەڵێ ! ئەو پاڵەوانانەی كە ئەزانن چۆن لە گوناهەكان یاخیی ببن ، بە وێنەی فەرماندە سەركەوتووەكان بەوپەڕی ڕێزەوە ئەچنە ناو قەبرەكەیانەوە و ، بە دەروونێكی پڕ لە متمانەشەوە گەشتی ژیانی بەرزەخ ئەكەن و ، بە هەمان متمانە و شادمانیی و خۆشییشەوە ئەچنە بەهەشتەوە و ، جوانیی خواییش ئەبینن . چونكە خەبات‌كردن لە پێناوی نەكەوتنە ناو تاوانەوە ، بە تەواویی لەگەڵ خەبات كردن لە پێناوی ئەنجامدانی خێر و چاكەدا هاوتایە . جا ئەگەر لایەنی سەلبیی و ئیجابیی كردەوەكان بە دووری‌یەك لە دووری‌یەكان دابنێین ، ئەوا دامەزراویی لە هەردوو بەرەكەدا ( واتە ئەنجامدانی چاكە و دوورەپەرێزیی لە خراپە ) سەركەوتنێكی گەورە پێك دێنێت و ، بە گورجیی مووشەك مرۆڤ بەو سەرەنجامە چاكە ئەگات كە بۆی دیاریی كراوە .

  

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَـٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾

( النساء : ٥٦ ).

لە کاتی تەفسیرکردنی ئەم ئایەتەدا زۆربەی تەفسیرنووسان سامناکیی و گەورەیی سزای جەهەننەم بەیان ئەکەن ، ئەویش بە ناوبردنی ئەو فەرموودە شەریفەی پێغەمبەر ﷺ کە ئیبن عومەر خوا لێیان رازیی بێت ریوایەتی کردووە: ( يُعظمُ أهـلُ النـارِ في النـارِ حتـى إنَّ بَـينَ شَـحمَةِ أُذُنِ أَحَـدِهِم إلى عاتِقِـهِ مَسِـيرَةَ سَبعمائةِ عامٍ وإنَّ عظم جلدِهِ سبعونَ ذِراعاً وإنَّ جلدَهُ مِثلُ أُحُدٍ ) .[١٧]

چوارچێوەی گشتیی ئەم فەرموودەیە بریتییە لە وەصفی سزای جەهەننەم و حاڵی ئەوانەش کە ئەو سزایە ئەچێژن . جا من وەهای ئەبینم کە ئەگونجێت بەم شێوەیەی خوارەوەش لەم فەرموودەیە تێبگەین :

مرۆڤ لە لایەنی رۆحییەوە نەش و نوما ئەکات و بەرز ئەبێتەوە . بۆ نموونە: کەسێك دە ئەوەندەی تۆ لەزەت لە نوێژەکەی ئەبات ، کەواتە لێهاتنی ئەو لە لەزەتبردندا زۆر بەرز بۆتەوە . هەمان کار لە هەست کردن بە ئازاریشدا هەیە. ئەو کەسەی کە ئەم لایەنەی تێدا ناسك بۆتەوە بە سادەترین شت ئازاری پێ ئەگات و ، خەوی لێ ئەزڕێت و ، لەوانەشە بە دان یەشەیەك بێهۆش بکەوێت. لەبەر ئەمە بەرێزترینی پێغەمبەران ﷺ فەرموویەتی : ( إنِّي أُوعِكُ كَما يُوعِكُ رَجُلانِ مِنكُم ) .[١٨] کەواتە وەك بە گەورەبوون و هەڵاوسانی لاشە لە قیامەتدا ئێش و ئازار زیاد ئەکات ، ئەوا هەستکردنی زیاتریش بە ئازار لە جەهەننەمدا ـ بە هۆی چەندین حیکمەتەوە ـ بەم شێوەیە دەر ئەبڕێت . لە راستییدا نە هەڵاوسانی لاشە بە هۆی گوناه و تاوانەکانەوە و ئەوەندەی شاخەکان لێهاتنی و،

---

[١٧] مسلم ، الجنة: ٤٤ ، المسند للإمام أحمد ، ٢ : ٣٢٨ ، ٣٣٤ ، ٥٣٧ ، الهيثمي ، مجمع الزوائد : ١٠/٣٩١ ـ ٣٩٣.

[١٨] البخاري ، المرضى : ٣ ، ١٣ ، ١٤ ، ١٦ ، مسلم ، البر : ٤٥ .

نە هەڵاوسانی گوناھ و تاوانەکان و فراوانبوونیان ئەوەندەی فراوانبوونی رۆح ، تا بەو پێیە مرۆڤ سزا بچێژێت ( واتە بە پێی ئەو فراوانی‌یە ) ، پێچەوانەی عەقڵ نیە . چونکە فراوانیی عیلم و قودرەت و ئیرادەی خوایی کە دەوری هەموو شتێکیان داوە توانای ئەوەیان هەیە لە هەموو کات و شوێنێکدا ئەوە جێبەجێ بکەن . ئێمەش پەنا ئەبەینە بەر رەحمەتە فراوانەکەی ئەو و داوای لێ ئەکەین ئێمەش پێی بگرێتەوە و ، بە پێی ئەو رەحمەتە فراوانەشی لەگەڵمان بجوولێتەوە.



﴿ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ ( النساء : ١١٤ ) .

لەم ئایەتە پیرۆزەدا چەندین رێنمایی هەن کە پەیوەندی‌یان بە خزمەتە دینی‌یەکانی ئەمڕۆوە هەیە . لە هەندێ سەردەمدا وەك ئەم سەردەمەی کە خۆمان تیایا ئەژین و ، لەم سەردەمە دوایینانەی مێژووی نزیکماندا ؛ کاتێك کە بانگەواز بۆ ئیسلام و ، تەبلیغ کردنی پەیامە شیفابەخشەکەی بە مرۆڤایەتیی، بە هۆی هەندێ هۆکاری سەلبی‌یەوە ، کارێکی گران ئەبێت ، ئەوا ئەم بانگەوازە و ئەم تەبلیغە بە نهێنیی و بە چپە ئەنجام ئەدرێت، واتە لەسەر یاسای ( وَلْيَتَلَطَّفْ). جا ئایەتە پیرۆزەکەی سەرەوە باسی ئەوە ئەکات کە هەرکەس ئەوە ئەنجام بدات پاداشتێکی گەورەی بۆ ئامادە کراوە . هەروەك ئاشکرایشە خوای باڵادەست بە شێوەیەکی رەها و بەبێ سنووردانان پاداشت ئەبەخشێت تا تاسەمەندیی و شەیداییمان بورووژێنێ و زیادیشی بکات ، وەك لە فەرموودەی قودسیی‌دا دەربارەی رۆژوو هاتووە : ( الصَّومُ لِي وَأنا أجزِي بِهِ ) .[19]

[19] البخاري ، الصوم : ٢ ، مسلم ، الصيام : ١٦٥ .

هەستە خراپەکان و ، عادەتە پیسەکان و ، بیرە خوار و خێچە رەشەکان و، فێڵە چنراوەکان دژی ئیمانداران و ، پیلان و ئاژاوە هەڵبەسراوەکان بەرامبەریان چەند کارێکی رەشن پێکە و سەرچاوەیان شەڕ و خراپەیە ، کە هیچ شۆڵەیەکی خێریان ، هەتا بۆ ئەو پیاوخراپانەش کە نەخشەیان ئەکێشن ، لێوە دەستگیر نابێت ، چونکە ئەوانیش کەڵکیان لێ وەرناگرن . بەڵام هەستە راستگۆ و موخلیصەکان وەك فەرماندان بە صەدەقە و ، بڵاوکردنەوەی خێر و جوانیی و چاکە و ، ئاشتەوایی نێوان خەڵك هەست و سۆزی جیاوازن . جا هەرکەس ئەو کارە ئەنجام بدات و مەبەستیشی بەو کردەوەیەی رێ و رەزامەندیی خوای باڵادەست بێت ، بە تایبەتیی لەم جۆرە بارودۆخە نالەبار و ناسروشتییەدا ، کە وا پێویست ئەکات کاری چاکە بە نهێنیی ئەنجام بدرێت ، ئەوا ئەو کەسە خەڵاتێکی گەورەی ئەکرێت و پاداشتێکی گەورەش وەر ئەگرێت ، یەکەم بە بۆنەی کردەوەکەیەوە و ، دووهەمیش بە بەرچاو گرتنی بارودۆخە نەگونجاوەکەوە .

بەڵێ ! ئەگونجێت دامەزراوەی مەدەنیی جۆراوجۆر دابمەزرێنرێن کە مەبەستیان وەدەست هێنانی رەزامەندیی خوایی بێت ، بۆ جێبەجێکردنی سێ کار لەگەڵ مەرجەکانی بوونی ( شوورا ) لەو دامەزراوانانەدا ، چونکە هەر مەسەلەیەك لەو سێ مەسەلەیە چەندین دووریی کۆمەڵایەتیی گرنگی هەیە . جا لە وێنەی ئەم مەسەلانەدا کە پەیوەندییان بە یاسا و مافی کۆمەڵگاوە هەیە حیکمەت وەهایە پەنا بۆ حیکمەتی ئەو شوورایە ببرێت کە پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەنجامدانی هەموو کارێك ئامۆژگاریی کردووین دەستی پێوە بگرین .

بە پێچەوانەی ئەمەشەوە ، لەسەر ئیمانداران پێویستە لە هەر کۆبوونەوەیەك وریا و ئاگادار بن کە مەبەستی چپەکردن بێت بە پڕوپاگاندە دژی ئەم و ئەو ، یان پێكهێنانی کۆمەڵەی نهێنیی و ، گەر بشگونجێت تەفرەدانی پێكهێنانیان .



﴿لَّعَنَهُ ٱللَّهُ ۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ۝١١٨ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا﴾

( النساء : ١١٨ ـ ١١٩ ) .

ئەم ئاخاوتنە ناشیرینە کە شەیتان لەگەڵ خوای باڵادەستدا کردی ، کە لەم ئایەتە و چەندین ئایەتی تردا هاتووە : یا ئەوەتا خوای باڵادەست خۆی ڕێی داوە و ماوەی داوە بیڵێ ، یان ئەوەتا ـ بە پێی ڕوونکردنەوەی زۆرێك لە تەفسیرنووسان ـ ئەو وتەیە بە بیری شەیتاندا هاتووە و لەگەڵ فیترەتیا گونجاو بووە و ، خوای گەورەش هەواڵی پێمان داوە .

وەك یەك وەهایە کە ئەگەر ئەمە ڕوونکردنەوەی زمان حاڵی شەیتان بێت ، یان بۆڵە بۆڵی فیترەتی بێت . ئەوە دەرئەخات کە چۆن سوورە لەسەر تۆڵەسەندن لەو بەندانەی خوا کە نەگەیشتوونەتە قۆناغی ئیخلاص و ، یەکەمین زۆرانبازیی شەیتانیش کە لەسەر ئەم زەوییەدا لەگەڵ ئادەمیزاددا ڕووی دا ، وا ئەمڕۆش لە لایەن شەیتان و دار و دەستەیەوە هەر بەردەوامە . ئەوان بەردەوام سوورن لەسەر فریودان و خەڵەتاندنی خەڵك بە ئاواتی ناڕەوا و ، لەسەر هەوڵدان لەگەڵ مرۆڤدا بۆ ئاڵ و گۆڕی فیترەتی خۆی و بەدیهێنراوەکانی تر و ، تێکدانی هاوسەنگیی ئەو فیترەتانە . جا هەر وەك ڕاگیرکردنی هاوسەنگیی ڕۆحیی مرۆڤایەتیی بەستراوە بە دوورکەوتنەوەوە لە ڕێبازی ئیبلیس ، هەروەها پارێزگاریی هاوسەنگیی لە سروشتدا ـ هاوسەنگیی مرۆڤیش لەگەڵیا بێت ـ بەستراوە بەو دوورکەوتنەوەوە . ئەوانەش کە ئەچنە سەر ڕێبازی گومڕایی شەیتان لە دۆڕانێکی ئاشکرادان و ، ئەهلی بەدبەختین . بەڵام ئەوانەی لەو ڕێبازە دوورکەوتنەوە ئەوانە خاوەن بەختن و ، لە خواوە نزیکن.

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم﴾ ( المائدة : ١٨ ) .

ئەو کارەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەیەوێت روونی بکاتەوە بەم شێوەی خوارەوە لە ژیانمانا ئەدرەوشێتەوە : کاتێك کە یاخیبوون و پاشگەزبوونەوەی کەسانی تر هەڵئەسەنگێنین ، نەفسی خۆمان ناخەینە ناو چوارچێوەی ئەو مەسەلەوە و ، بە هەمان پێوەر کە موحاسەبەی خەڵکیی پێ ئەکەین موحاسەبەی خۆمان ناکەین. بۆ نموونە : کاتێك کە دەربارەی کەسێك خراپەیەکی لە دەست دەرچووە ئەڵێین: (( بۆچیی خوا سزای نادات و نایبات بە ناخی زەوییدا ؟ )) ، کەچیی لە هەمان کاتدا هیوادارین و چاوەڕوانین ، بە هۆی ئەنجامدانی چاکەیەکی بچکۆلەمانەوە، خوا لە گوناهەکانمان خۆش ببێت . بەڵام ئەبوا لە لایەنی شێواز و تەرزی بیرکردنەوەمانەوە لە بواری خراپەکاندا لەگەڵ ئەو دەستەیەدا خۆمان بەشدار بکردایە ، یان وەها بە تەما بین ـ لە بواری چاکەکاندا ـ ئیحتیمالی چاوپۆشیی کردن لێیان هەبێت چونکە کردەوەی چاکیان هەیە . هەنگاوێکی تر بەرەو پێش چوون لەم کارەدا ئەوەیە گوناهەکانیان بچووك بکرێنەوە تا ببنە ئەوەندەی قەبارەی بوندوقێك ئەگەرچیی لە راستییشدا ئەوەندەی چیاکان کەتە بن و، بۆ خۆیشمان پێچەوانەی ئەمە ئەنجام بدەین .

ئەگەر بەم پێوانەیە لە لاف و گەزافەکانی ئەهلی کیتاب ، کە لەم ئایەتە پیرۆزەی سەرەوەدا هاتووە ـ ورد ببینەوە ، ئەبینین تا چ رادەیەك بە لای خوایش و بە لای خەڵکیشەوە ناشیرین و قێزەونە . هەندێ کەس پاگاندەی ئەوە ئەکەن کە لەگەڵ خەڵکییدا جیاوازن و لەوان ناکەن و ، ئەمان خۆشەویستی خوان و،

وەهایشی ئەبینن ئەمەیە هۆی فەخر و شانازیەیان و ، لەوەش دوودڵ نین کە بەبێ بایەخدان و ڕێزگرتن بەرامبەر بە خوای بالأدەست رەفتار بکەن و ، بە چاوی سووکیی و مەهتووکی‌یەکیش سەیری کەسانی تر بکەن کە لە قبوولکردنی ئەو ئیددیعایەیان هەڵقولاّوە کە دەرگا لەبەردەم سەلبیاتەکانی تردا والاّ ئەکات کە ئەویش ئەمەیە : (( ئەگەر ئێمە بەم پلەیە لە خواوە نزیک بین ، کەواتە هەر کردەوەیەك ئەنجام بدەین ـ حاشا لەو ـ لێمان خۆش ئەبێت )) . عوزەیر سەلامی لێ بێت ، بە پێی راگەیاندنی ئەوان ، کوڕی خوا بوو ، هەروەها مەسیحیش سەلامی لێ بێت لەلای کۆمەڵێکی تر و ، ئەوەبوو شوێنکەوتوانی ئەو پێغەمبەرانەش خۆیان بە کوڕی خوا ئەزانی ، ئەگەرچیی بە شێوەی مەجازییش بێت ، لەبەر ئەوە ئەیانوت : (( نە ترس و نە شڵەژاوییمان نیە ، چونکە خوا کوڕ و خۆشەویستانی خۆی ئەپارێزێت و ، لەوێ لەو دنیا ماوە نادرێت هیچ هەڕەشە و گوڕەشەیەك دەرحەقیان بکرێت . دەبا ترس و شڵەژاویی بەشی ئەوانە بێت کە لەم شەرەفەدا بەشیان نیە ، سزا بۆ ئەوانە و ئازاردانیش بەشیانە )) . جا لەگەڵ ئەوەدا کە ئەمە لە کتێبەکانیاندا نیە ، بەلاّم هەرکە بە ئایەتەکانی سزادان هەڕەشەیان لێ بکرایە ئەو وەلاّمەیان ئەدایەوە و ، بڕواشیان وەها بوو لەو وت و وێژەدا کە لەگەڵ خاوەنی پەیامەکەدا ﷺ و هاوەڵەکانیدا ئەیکەن سەرئەکەون و ، وەهایان بە ئەندێشەدا دێت کە بەو قسە و وت و وێژەیان بە شتێك ئەگەن .

راستە دەستەواژەی ( کوڕی خوا ) لە هەندێ لە کتێبە پێشیینەکاندا هاتووە، جا هەروەك ئەگونجێ ئەوە هەڵەی وەرگێڕان بێت ، ئەشگونجێ ئەوە دەستەواژەیەکی مەجازیی بێت لەسەر شەفەقەت و سۆزی خوا بەرامبەریان وەك سۆزی باوك . وەنەبێ بەکارهێنانی وشەی ( باوك ) یش بە مانای ( الرؤوف ) و ( الرحیم ) لە کتێبی دینە ئاسمانی‌یەکاندا دەگمەن بێت .

لەبەردەم بەکارهێنانی وێنەی ئەم دەستەواژانەدا ، ئیتر سا بە مانا راستەقینەکەی بێت یا مەجازیی لە وت و وێژدا وەلاّمی بێدەنگ‌کەریان بۆ دێت

که «ئەگەر ئێوە کوڕ و خۆشەویستی خوان ، وەك دەری ئەبڕن ، بۆچی لەسەر گوناهەکانتان سزاتان ئەدات و ، بۆچی لە هەموو شوێنێکدا سەربڕین و بە دیل گرتن بەشتانە و ، لەم بارودۆخەتان رزگار نابن ؟» .



﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾

( المائدة : ٥٤ ) .

لە راستییدا ئەم ئایەتە شتی زۆر گرنگی تێدایە ، لە سەرووی هەموویەوە ئاگادارکردنەوە لە ئیمکانبوونی روودانی لە دین پاشگەزبوونەوە لە نێوان ئیمانداراندا و ، لەوانەشە هەندێ لەوانەی کە بە ناوی ئیسلامەوە کار ئەکەن لە ئایندەدا دەستەوسان بن و نەتوانن ئەو بایەخدان و هەستیارییە دەر ببڕن کە هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتە پێویستیەتی . لەبەر ئەوە کاتێك کە ئومەوییەکان لە هەڵگرتنی ئەمانەتی دین دەستەوسان و لاواز بوون ـ کە ئەوەبوو ماوەیەك شانیان دایە ژێری ـ ئەمانەتەکە گوازرایەوە بۆ عەبباسییەکان ، پاشان بۆ سەلجووقییەکان و ، لەوانیشەوە بۆ عوثمانییەکان . جا ئەو قەومەی کە خوا ئەیان هێنێ بە شێوەی ( نکرة ) ( قَومٍ ) هاتووە . واتە قەومێك ئەهێنێت کە هاوەڵان لە کاتی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەدا نەیان ئەناسین .

ئەبینین ئایەتی ﴿ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ ﴾ صیغەی ئایندەی دوور (سَوْفَ)ی بەکار هێناوە و ، سیفەتی یەکەمی سیفەتەکانی ئەو خەڵکەی کە خوا لە ئایندەی دووردا مژدەی هاتنیانی داوە ، بریتییە لەوەی کە خوای باڵادەست خۆشی ئەوێن

. لێرەدا نوکتەیەکی ورد هەیە . ئەو خۆشەویستی‌یەی کە لە نێوان بەندە و لە نێوان خوادا هەیە ، هەروەك ئەگونجێ بە روونانی بەندە بەرەو خوا دروست ببێ ، لە بەرامبەریشیەوە خۆشەویستیی لە خواوە بەرەو بەندە دێت. ئەمەش یەکێکە لە سیفەتەکانی ( مورید ) . هەروەها ئەگونجێ لە خواوە بەرەو بەندە ببێ و ، لە بەرامبەریشیەوە خۆشەویستیی لە بەندەوە روو لە خوا ئەکات و، ئەگونجێت سیفەتی ( موراد ) یش بەسەر ئەمەدا ببڕین . بەڵێ ! خوا هەندێ کەس هەڵ ئەبژێرێ بۆ بەرزکردنەوەی دینەکەی و ، بۆ بەرزکردنەوەی ئەوانیش بە دینەکەی . جا هەڵبژاردنی پێغەمبەران لەم جۆرە هەڵبژاردنەیە . هەروەك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەریش‌دا هاتووە کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ریوایەتی کردووە ، هاوەڵانی پێغەمبەرانیش لەلایەن خواوە هەڵ ئەبژێررێن بۆ بەرزکردنەوەی دینەکەی و خزمەتکردنی .[٢٠] ئەتوانین ئەمە روون بکەینەوە و ئەڵێین : خوای باڵادەست ئەفەرموێ : (( من موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی ـ بۆ نموونە ـ هەڵ ئەبژێرم بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە )) . وەك لە کۆتایی ئایەتەکەش‌دا هاتووە ﴿ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ ئەمە فەزڵی خوایە و بە ویستی خۆیەتی بە هەر کەسێکی ببەخشێت . ئایەتێکی تریش ئەوە ئەفەرموێ کە هیچ کەس مافی ئەوەی نیە ناڕەزایی لەسەر ئەوە دەربڕێ کە خوا بەشی کردووە .

جا هەروەك خوای باڵادەست پێغەمبەرمان و هاوەڵانی لە کاتێکی گرنگ‌دا هەڵبژارد ، ئەوا لەم سەردەمەش‌دا کە خزمەتی دین وازی لێ هێنراوە و ، لە هەموو لایەکیشەوە قەڵاکانی ئیسلام ئابڵوقە دراون ، خوا قەومێکی تر هەڵ

[٢٠] عن عبد الله بن مسعود قال : إنَّ اللهَ نظَرَ إلى قلوبِ العِبادِ فَوَجدَ قَلبَ مُحَمَّدٍ ﷺ خير قلوبِ العِبادِ فاصطَفاهُ لِنَفسِهِ فابتَعَثَهُ بِرِسالَتِهِ ، ثُمَّ نَظَرَ في قُلوبِ العِبادِ بَعدَ قَلبِ مُحَمَّدٍ فَوَجَدَ قُلوبَ أصحابِهِ خَيرَ قلوبِ العِبادِ فجَعَلَهُم وُزَراءَ نَبِيِّهِ يُقاتِلونَ على دينِهِ فما رأى المسلِمونَ حَسَناً فهو ثم الله حسَنٌ وما رأوا سيِّناً فهو ثم الله سيِّئٌ . ( المسند للإمام أحمد : ١ / ٧٩ ، أبو نعيم ، حلية الأولياء : ١ / ٣٧٥ ) .

ئەبژێرێت بۆ بەرزکردنەوەی دینەکەی . راستە لەوانەیە ئەم هەڵبژاردنە لە مانایەك لە ماناکاندا لە جیهانی ئەرواحدا رووی دابێت . بە هەر حاڵ ، خوای باڵادەست جارێکی تر بە هۆی خەڵکانێك و قەومێکەوە ، کە خۆشی ئەوێن و ئەوانیش ئەویان خۆش ئەوێت ، فەرمایشتی ئەم دینە بەرز ئەکاتەوە . لەبەر ئەمە وەسف و ناونیشانی ئەو قەومە گرنگە و ، بەردەوامیی نایەتەکەش گرنگیی ئەو باسە روون ئەکاتەوە .

ئەو قەومە کۆمەڵێکی پاك و خاوێنن ، تا ئەو رادەیە کە بەرامبەر بەوەی خوای باڵادەست کاتێك ئەوانی خۆش ویست و وەك کۆمەڵێك هەڵی بژاردن، ئەوانیش لە قووڵایی دڵیانەوە خوای باڵادەستیان خۆش ئەوێت . نایەتێکی تریش وەسفی ئەو خۆشەویستی‌یە ئەکات و دەریشی ئەبڕێت کە ئەوانە لە ریزی دوژمنانی خوادا نابن ئەگەرچیی ئەو دوژمنانەش باوك یا باپیر یا برا یا کوڕ یا عەشرەتیان بن . خۆشویستنی ئەوان بڕیار دراوە بە تەنیا بۆ خوای باڵادەست بێت: خۆش ویستنیان بۆ خوایە و ، رق لێ بوونیشیان هەر بۆ خوایە .. بۆ خوا ئەبەخشن و بۆ خواش وەرئەگرن . نە دڵیان و نە موعامەلەیان بە هیچ شتێکەوە ناپەشۆکێن جگە لە خۆشەویستیی خوا .. هیچ شتێك نیە لە پێشی خۆشویستنی خواوە بێت ، یان جێی بگرێتەوە . ئەمە سیفەتی یەکەم و گرنگ‌ترین سیفەتە لەم کۆمەڵەیەدا کە لە کاتی هاتنی‌دا دێت و ، لەسەر رێ و شوێنی هاوەڵە بەرێزەکان هەنگاو هەڵ ئەگرێت ، واتە سیفەتی خۆشویستنی خوای باڵادەست و بەردەوام دەست‌خستنی رەزامەندیی ئەو و ، پێش‌خستنی ئەو خۆشەویستی‌یە و ئەو رەزامەندی‌یە بەسەر هەموو شتێك‌دا .

سیفەتی دووهەمیشیان ئەوەیە ئەمانە لەبەردەم ئیمانداران‌دا زەلیلن و، لەگەڵ هەموو ئیماندارێکیش‌دا تا ئەوپەڕی پلە خاوەنی تەوازوعن . جا بە پشت بەستن بە بۆچوونی مامۆستا نوورسیی کە ئەفەرموێ : (( *زۆرکاریی لەگەڵ دەشتەکیی‌دا*

*و قەناعـــەت پـــێ‌كردنیش لەگـــەڵ شـــاریی و مەدەنی‌یـــەكاندا »* ، ئـــەتوانین هەڵسەنگاندنێكی تر پیشكەش بكەین و ئەڵێین :

لە سەردەمی هاوەڵاندا بەرەی دوژمنان لە دەشتەكی‌یەكان پێك هاتبوو ، بۆیە زاڵبـوون بەسـەریاندا پێویسـتیی بـە بـەكارهێنانی جـۆرە هێزێـك هـەبوو ، لـە ئـەنجامی زاڵبـوونی ئیسـلام و ئیمـانیشدا جیابوونـەوە و دووبـەرەكیی لـە نێـوان تاكـەكانی یـەك بنەماڵـەدا سـەری دەرهێنـا و ، ( دەمـارگیریی نـەفامیی ) واتـە پەیوەندیی قەومیەت و هۆزایەتیی بنچینەیەكی گرنگە لە بنچینەكانی پەیوەست و یـەكگرتنی كۆمـەڵ . لەبـەر ئەمـە بـەكارهێنانی توندوتیـژیی لەگـەڵ ئـەو بارودۆخەدا دژی كوفر و ئیلحاد پێویست و گرنگ بـوو . لەبـەر ئەمـە ئـەگونجێ ئەمە بێت حیكمەتی دانانی ئەبوبەكر خوا لێی رازیی بێت ـ كە بـە نـەرم ونیـانیی ناسراوە ـ لەلایەن قەدەری خواییی‌یەوە ، وەك ئاماژەیەك و هێمایەك ، لە مـەقامی یەكەمدا و ، دانـانی عومـەری كـوڕی خـەططـابیش خـوا لێـی رازیـی بێـت ـ كـە بەرامبەر بە كافران بە توند و تیژیی ناسرا بوو ـ لە مەقامی دووهەمدا .

بەڵام جیهانی ئێستا زۆربـەی مەدەنیـەت و شارسـتانیەتی وەرگرتـووە ، لەبـەر ئەمە زاڵبوون ئێستا لە رێی قەناعەت پێ‌كردن و ، لـە رێـی زانسـت و ، لـە رێـی حیوار و وت و وێژەوە دەست ئەخرێت زیاتر لـە رێـی هێـز و توندوتیژی‌یـەوە . لـە بەرامبەر ئەمەیشەوە تاكایەتیی ( الفردیة ) لـە نێـو خـەڵكدا گەشـەی كـردووە و پەیوەنـدیی نێوانیـان لاواز بـووە . لەبـەر ئـەوەش كـە ئێسـتا رۆژ رۆژی كۆمـەڵ و هەستی كۆمەڵی‌یە زیاتر لە كەسان و تاكانی هەڵكەوتوو و تاقانە ، ئەوەی كـە لـە ئیمـاندار داوا ئـەكرێت هـەر ئـەوە نیـە بـە سـۆز و شـەفەقەتەوە هـەڵس‌وكـەوت بەرامبەر بە ئیمانداران بكرێت ، بەڵكو زیاتر بە شێوازێكی نـەرم و بـە تـەوازوع. واتە لەبەردەم ئیمانداراندا زەلیل بوون و ، بەرامبەر بە جنێودانیان بێ‌دەنگیی و، بەرامبەر بە دوژمنایەتییشیان ئـارام‌گرتن . واتـە سـەری بخاتـە ژێـر پێـی ئیمـان دارانەوە . پلەی سۆزیش كە پێویستە لە نێوان ئیمـانداراندا دابـەزرێت زۆر زیـاتر

بێت له پلەی توندوتیژیی پێویست بەرامبەر به کافران و مولحیدان . ئەوەش بزانن
که یەکەم مەرجی دامەزراندنی بەیەکابوون لەم خزمەتە مەدەنییەدا دوای خۆش
ویستنی خوا و دەستخستنی ڕەزامەندیی ئەو بریتییە له دامەزراندنی بارودۆخی
ئەم زەلیلییە له نێوان ئیمانداراندا . واتە حاڵەتی ئەوپەڕی تەوازوع. لەو ڕێیەش
دا هەرچەند کۆشش بکەین ئەوا لەو ئاکامانجە بەنرختر نابێت . ئەتوانین لەم
گۆشەیەوە سەیری ئامۆژگارییەکەی مامۆستا نوورسیی بکەین که پێویستە بە
لایەنی کەمەوە پەیامی ئیخلاص و برایەتیی دوو حەفتە جارێك بخوێنینەوە.
لەوانەشە گەورەترین تاقییکردنەوە بۆمان لە بابەتی ئەو پەیوەندییانەی
برایەتییدا بێت که وان له نێوانماندا .

پاشان ئایەتەکە ئەفەرموێ کە ئیمانداران ﴿ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ ئەبن،
ئەمەش بە پێی ئەوەی که ئێمە لێی تێ ئەگەین شتێکە لە توند و تیژیی کەمترە.
وەك لە سەرەوەشدا وتمان بەرامبەر وەستانی بیروبۆچوونە دژەکان و زاڵبوون
بەسەریانا لەم چەرخەی ئێستاماندا زیاتر له ڕێی حیوار و قەناعەت پێکردنەوە
ئەبێت ، نەك له ڕێی بەکارهێنانی توند و تیژییەوە . لەبەر ئەمە هەڵگرتنی
عیززەت و کەرامەتی ئیسلام بەرامبەریان بەسە . لە بەردەوامیی ئایەتەکەشدا
ئەبینین سیفەتی ﴿ يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ﴾
بەستراوە بەم تێبینییەوە . وەك هەمووشمان ئەیزانین کاتێك هاتبووە بەرەوە کە
تیایا گاڵتە بە ئیمانداران ئەکرا و ، وای لێ هاتبوو وتنی ( من موسڵمانم ) هۆی
گاڵتە پێکردن و سووك سەیرکردن بوو . لەبەر ئەوە لە ڕێی ئەم خزمەتە
ئیمانییەماندا ئەوەمان هەڵبژارد ئاوڕ بەلای جا و مەقام یا پایە یا نیشانەی
ڕەسمیی یا ناونیشان و پلەدا نەدەینەوە ، بەڵکو وامان دانا کە ئیسلام تاقە هۆیە
بۆ عیززەت ، چونکە عیززەت هی خوا و پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانە. لەبەر
ئەوە پێویستە لەبەردەمی مولحید و بێئیماناندا هەست بە کەمیی نەکەین،

بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەوە پێویستە لە قووڵایی دڵمانەوە لە بەرامبەریانەوە هەست بە عیززەتی ئیسلام بکەین و ، بەو هەستەشەوە لە ماڵ و قوتابخانە و ، لە بازاڕ و شەقام و ، لە هەر شوێنێکدا بین ئەرکی سەرشانمان لە ئیرشاد و ڕێنمایی بەجێ بهێنین و ، لە کاری ئیرشادیشدا نوێنەری دینەکەمان بین بێ ئەوەی لە لۆمەی لۆمەکەران بترسین . کاتێکیش کە قورئان سیفەتەکانی ئەم کۆمەڵەیە هەڵئەدات بە شێوەیەکی ئیعجازیی ئاماژە بۆ هەندێ ڕووداوی ئەم زەمانەی خۆمان ئەکات ... بەڵێ ! ئەگەر ماوە بوایە بە تەنها لەم خاڵەوە لەم ئایەتە بکۆڵینەوە ، ئەو کاتە ئەماندیی بۆ چەندین مانای زۆر دەرگای لەسەر پشتە .

هەروەها لەم ئایەتەدا لایەنی هەواڵدانی غەیبیی هەیە کە ئەویش بۆ خۆی بابەتێکی سەربەخۆ پێک دێنێت و ، ئەو ڕووداوەش کە ئایەتەکە بە هۆیەوە دابەزیوە هەرچیی بێت ، ئەوا بە وێنەی چەندین ئایەتی تر حوکمەکەی حوکمێکی گشتییە . جا ئەوە لەم ئایەتە ویستراوە کە سەرنجی ئیمانداران بۆ لای کارێکی یەکجار مەترسییدار رابکێشرێت ، ئەویش بە شێوازێکی وەها کاریگەر کە دەروونەکان بهەژێنێت . ئەو بابەتەیش کە ئیماندارانی لێ ئاگادار کراوە، سەرەڕای ئەوەی کە بابەتێکی گەورە و لق و پۆپدارە ، لە هەموو زەمان و سەردەمێکیشدا بە پێوانەیەکی فراوان کە ئەوەندە ببێت دەروونی موسڵمانان بهەژێنێت ، بڵاوەی کردووە . ئەو بابەتە ئەوەندە بڵاوە ئەو لە دین پاشگەز بوونەوەیەی کە ئەوەی ( مدلج ) بە سەرۆکایەتیی ئەسوەدی عەنسیی و ، پاشان ئەوەی حەنیفەش بە سەرۆکایەتیی موسەیلەمەی درۆزن دەستیان دایە و، طولەیحەی کوڕی خوەیلیدیش کە ئاگری فیتنە و لادانی لەناو ئەوەی ئەسەد و ئەو هۆزانەدا نایەوە کە لە سەردەمی ئەبوبەکردا خوا لێی ڕازیی بێت لە دین پاشگەز بووبوونەوە ، کە لەوانە فەززارە و غەطەفان و ئەوەی سولەیم و ئەوەی یەربوع و بەشێك لە ئەوەی تەمیم و کیندە و ئەوەی بەکر و غەسسان ... هەموو ئەو هۆزانە لەو پاشگەزبوونەوەیە بەشی خۆیان بەر کەوت . هەتا ئومەوییەکان و

عەبباسی‌یەکان و عوثمانی‌یەکان و ئەوانەش کە بە دوایاندا هاتن لەم کارەدا بەشی خۆیان بەرکەوت و ، تاڵی‌یەکەیان چەشت ، ئەگەرچیی بە شێوەیەکی ڕێژەیی و ئیضافییش بووبێت .

لەبەر ئەمە ئەم ئایەتە بە هەموو ئەوانەی کە سەرۆکایەتیی ئوممەتی ئیسلامیی ئەکەن ئەفەرموێت :

ئیمانداران ! هەرکەسێك بە تەواوەتیی یا بە هەندەکیی لەم دینە پاشگەز بێتەوە ، ئەوا با چاك بزانێت کە خوا ئەی‌گۆڕێت بە قەومێکی تر کە هیچ کەس نازانێت لە چ زەمان و سەردەمێکدان و ، هیچ کەسیش شوێنیان نازانێت و ناشزانێت لە کوێوە دێن ، بەڵام کۆمەڵە خەڵکانێکی نەجیبن کە سیفەتەکانیان زانراون ، خوا ئەوانی خۆش ئەوێت و ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێت . ئەوانە خاوەنی تەوازوعن و ، لەبەر دەستی ئیمانداراندا زەلیلن و ، بەسەر کافر و مولحیدە دەست‌درێژیی کەرەکاندا عەزیزن و ، لەسەر ئیمان دامەزراون و ، لە هاوسەنگیی دەوڵەتییش‌دا لایەنێکی گرنگ پێك دێنن . ئامانجیان ڕەزامەندیی خوایە و ، ئەرکی سەرشانیشیان بەرزکردنەوەی فەرمایشتی خوایە . ئەوانە بەردەوام لە پێناوی خوادا جیهاد ئەکەن و ، باکیان لە ڕەنجان و گلەیی خەڵك نیە، بەڵکو تەنها بایەخ بەوە ئەدەن ئەرکی خۆیان بە جوانترین شێوە ئەنجام بدەن. ئەمەش فەزلێکە لە خوای بالادەستەوە بە هەر کەسی ئەدا بە ویستی خۆیەتی.

لەم ئامۆژگاری‌یە گشتی‌یە ئەو کەلکە وەرئەگرین کە ڕووداوەکانی لە دین هەڵگەڕانەوە بە تەنیا بریتیی نیە لە نموونە ڕابوردووەکانی مێژوو ، بەڵکو بە درێژایی مێژوو و لە هەموو ئەو قەومانەدا کە لە مێژوودا جێی خۆیانیان کردۆتەوە دووبارە ئەبێتەوە و ، ئەو هەڵگەڕاوانەش ئەگۆڕرێن بە قەومانێك کە خوا خۆشی ئەوێن و ، ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێت .



﴿جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَـٰمًا لِّلنَّاسِ﴾ ( المائدة : ٩٧ ) .

ئەگونجێ ئەم ئایەتە لە چەند روویەکەوە هەڵبسەنگێنرێت :

١ ) کەعبە لە چاو ئەم زەوی‌یەدا لە جێی دڵی‌دایە و ، بریتییشە لە ستوونێکی نوور کە ئینس و جینن لە چەقی زەوی‌یەوە هەتا ( سدرة المنتهی ) بە دەوریا طەواف ئەکەن . لە هەموو کات و ساتێکیش‌دا بلیۆنەها لە رۆحە پاك و خاوێنە بینراو و نەبینراوەکان شەیدای گەیشتن بە حەرەمی مەککە ئەبن . لەبەر ئەمە ئەتوانرێ تەنها لەم گۆشەیەوە بوترێ کە کەعبە شوێنی داکەوتنی ( سدرة المنتهی ) یە لە زەویی‌دا . هەر وەك خوای باڵادەست کەعبەی کردبێتە دروشمێك تا ئاماژە بۆ نیشانەکە بکات ، هەروەك نیشانە و قەرەوڵی تفەنگ ئاماژە ئەکەن. لەبەر ئەوە ئەتوانین بە دڵێکی پڕ لە متمانەوە بڵێین کە حاڵی کەعبە وەك حاڵی یەکەی پێوانە وەهایە و ، بوونی گەلێك شت ، کە یەکێك لەوانە دنیایە ، بە پێی ئەو بەرنامەی بۆ داڕێژراوە ... بەڵێ ! ئەگەر کەعبە بوونی نەبێت ئەوا ئەو شتانە مانای خۆیان لە دەست ئەدەن . لەبەر ئەوە ئەبینین لە چەندین فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە رووخاندنی کەعبە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی قیامەت .[21] مانای ئەوەش ئەمەیە :

*(( رووخانی کەعبە مانای بچڕانی پەیوەندیی زەوی‌یە لەگەڵ ئاسمان‌دا و ، دنیایەکیش پەیوەندیی بە ئاسمانەوە نەبێت بوونی هیچ مانایەکی نیە . جا مادەم دنیا ئەو پێوەرەی لە دەست داوە کە بە ئامانجی بوونی خۆی ئەگەیەنێت ، کەواتە لەسەری پێویست بوو لەسەر شانۆی ژیان بسڕێتەوە . کەواتە کەعبە بەم پێناسەیەوە بریتی‌یە لە تاقە پەنا و پاڵپشتێك بۆ مانەوەی دنیا و لەم لایەنە مەلەکووتی‌یەیشیەوە ئەم کارە و ئەم فەرمانبەری‌یەی ئەنجام ئەدات . واتە ئەگەر*

---

[21] مسلم ، کتاب الفتن وأشراط الساعة ، باب : لا تقوم الساعة إلا ... ، ٥٧ ، ٥٨ ، ٥٩ .

*رۆژێك لە رۆژان كەعبە مەبەستی بوونی خۆی لە دەست دا ئەگەڕێتەوە سەر بنەڕەتەکەی خۆی »* .

لێرەدا پێم خۆشە بینینێك ( موشاهەدەیەك ) پێشكەش بكەم کە پشتگیریی لەم حەقیقەتە بكات . ئەم بینینەش هی قوتبێکە لە موریدانی ئیمامی رەببانیی کە ئەیبینین ئەڵێت :

« خەریکی طەوافی كەعبە بووم ، لە ناكاو ئەبینم كەعبە بەرەو ئاسمان بەرز ئەبوویەوە ... لەلایەكەوە بەرز ئەبوویەوە و ، لەلایەکیشەوە دادی بوو لە دەست ئەوەی کە خەڵكیی فەرمانبەریی بەندایەتیی راستەقینە بەجێ ناهێنن ... دەستم بە چمكی پەردەكەیەوە گرت و لێی پاڕامەوە کە بگەڕێتەوە » .

جا ئایا بە رۆح و بە ( سر ) یەوە گەڕایەوە و ، ئایا لە شوێنی خۆیدا مایەوە یان نەء ؟ هەتا لەو ئاست و شێوازەدا بینەرێك نەبێت وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە گرانە .

ظەننیش نابەم کە بارودۆخی ئێستاش جیاواز بێت لەو کاتە ، بەڵام دڵمان بە لوطفی فراوانی خوایی خۆشە . كێیش ئەزانێت لەوانەیە هۆی بارودۆخی پڕ ژانی ئێستای ئیمانداران بگەڕێتەوە بۆ ئەو جۆرە سووك سەیركردن و رێزنەگرتنەی کە بەرامبەر كەعبە ئەنجام ئەدرێت !

۲ ) مرۆڤ ئەتوانێت لە ژیانی تاكیی و كەسیی خۆیدا بە ئیسلام بژیت و، ئەشگونجێ لە بەجێ هێنانی ئەو فەرزانەدا کە خراونەتە ئەستۆی سەركەوتن بە دەست بهێنێت . بەڵام ناگونجێ ببێتە پیشاندەری ( ألطاف ) ی خوایی بە مانای گشتیی و ، ببێتە نوێنەری ئەو پیشاندانە بە مانای تەواو بە كۆمەڵ نەبێت. كەعبەش لە پایەیەكی دەسەڵاتدارییدایە بە وێنەی ئەم گلێربوونەوە و، بەرپاكردن و پاراستن و پارێزگارییكردنی كۆمەڵەكاندا ، هەر لە روو لێ نانی ملیۆنەها کەسەوە لە نوێژدا ، هەتا كۆكردنەوەی ملیۆنەها لە حەج و عومرەدا، بەمە ئەبێتە هۆیەك و راسپێرێك بۆ بەهێزكردن و توندوتۆڵ كردن و بەردەوامیی

هەستی کۆمەڵ . لێرەدا پێویستە حیکمەتی بوونی حەج بە کۆنگرەیەکی جیهانیی گشتییمان لە یاد نەچێت . بەڵێ ! بەجێ هێنانی حەج بە شێوە کامڵ و تەواوەکەی بە گرێدانی کۆنگرەیەکی جیهانیی موسڵمانان ئەژمێررێ . جا ئەگەر موسڵمانەکان ئەم هەستەیان ببوایە ، ئەوا لەوانە بوو چارەسەریان بۆ هەندێ لە گرفت و کێشەکانی جیهانی ئیسلامیی دەست کەوتایە . خۆ ئەگەر ئەمڕۆ حەج نەتوانێت ئەو دەورە ببینێت ، ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ناتەواویی وریایی بە لای موسڵمانەکانەوە ، ئەگینا وێنەی ئەم لێهاتن و ئەم توانینە بەردەوام لە حەجدا هەیە . بەم شێوەیە دەرئەکەوێت کە کەعبە بە هەبوونی ئەم وەسفەی و ئەم ناونیشانەی بە مایەی راوەستان و سەرچاوەی هێز و توانا بۆ خەڵکیی ئەژمێررێ.

٣ ) لە لایەنی بەهێزکردن و پشت گیریی هێزە مەعنەوییەکانی ئیمانداراەوە، کەعبە بە مایەی رێك وەستانی هەموو ئیمانداریك بە سەربەخۆ ئەژمێررێت. چونکە هەموو ئیمانداریك کە روو لە کەعبە ئەکات ، رووتێکردنی ملیۆنەها خەڵك ـ کە صەدان هەزار لەو ئەولیا و ئەصفیایانەیان لەگەڵدایە کە لە بەرامبەر حەقیقەتەکاندا چاو و دڵیان کراوەتەوە ـ بە بەڵگەیەکی تەواو ئەبینێت دژی ئەو گومانانەی کە بە دڵیا دێن ، بەمە بە حەسانەوەی دەروونیی ئەگات و ، دڵیشی لە متمانە پڕ ئەبێت . بگرە مرۆڤ ئەتوانێت دەنگی نەفس و شەیتان لە ناو خۆیدا کپ بکاتەوە .. ئەو شەیتانەی کە ئەوە بە دڵیا دێنێت کەعبە هیچ پیرۆزییەکی نیە ، چونکە بینایەکە و لە بەرد و گڵ دروست کراوە . بەڵێ ! مرۆڤ ئیمانی خۆی بەهێز ئەکات و لە دڵی خۆیدا ئەڵێت : ئەگەر کەعبە ئەم جۆرە پیرۆزییەی نەبوایە ئایا لە توانایدا ئەبوو ببێتە چەقی راکێشان و بایەخ پێدانی صەدان هەزار لە گەورە مورشیدە مەعنەوییەکان و بلیمەتەکان ؟

٤ ) کەعبەش ـ کە مایەی رێك وەستانی خەڵکییە ـ پەیوەندییەکی یەکجار پتەوی بە بزووتنەوەی زیندووکردنەوە و نوێکردنەوەوە هەیە . یەکەی پێوانەش بۆ زانینی ئاستی جێبەجێبوونی ئەم بزووتنەوەی زیندووکردنەوەدیە لەگەڵ

تێگەیشتنیا بۆ حەقیقەتی کەعبە ڕێژەیەکی ڕاستەوانەی هەیە . جا ئەگەر ڕۆژێـك لـە ڕۆژان ئـەو تێگەیشـتنە گەیشـتە چـڵەپۆپە ، ئـەوا گیـان بـە بـەرداکردن و زیندووکردنەوەش لە چڵەپۆپەدا ئەبێت .

کورتەکەی کەعبە بەردەوام نووری چاوەکان و ، شیفای دڵەکان و ، سەرچـاوەی حەماسـەت و هێـز بـووە و ، هـەر بـەویش ئیمـانداران پارێزگاریـیان لـە ئـاوازی هاوبەشی نێوان دین و دنیا کردووە و ، بەردەوام ئەرکی هاوکێشەیی لە دڵی ئیمان داراندا ئەنجام داوە . ئەوانەش کە ڕوویان کردۆتە خوا هەر بە هۆی کەعبەوە بـووە و ، هـەر بـەویش فـەرزی نوێـژ و حـەج قبـووڵ ئـەبن . کەعبـە و هەرچـیی وا لـە دەوروبـەریدا پەنایـە بـۆ ئەوانـەی کـە بـە دوای ئـارامیی و حەسـانەوەی دڵدا ئەگـەڕێن. کەعبـە هـاودەمی ئـەو دڵانەیـە کـە بـە دەست ئـازاری غەریبییـەوە ئەناڵێنن و ، تەنیایی و بێکەسییان لە کۆڵ ئـەکاتـەوە . لـەو هێـڵـەدا کـە دڵ و ( سـدرة المنتهـی ) بـە یـەك ئەگەیـەنێت کەعبـە بریتییـە لـە میحـراب و دوای میحـرابیش و ، لـە بـارەی نـاوەڕۆك و مانایشـەوە چـاکترین و دەوڵەمەنـدترینی دەنگەکانە ... کە لە پیرۆزترین ناوچەی زەوییدا گۆڕاوە بۆ بەرد و بینا .

داوا لە خوای باڵادەست ئەکەین تا لە چاودێریی کەعبە بێبەشمان نەکات ..



﴿ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴾ ( الأنعام : ١٢٤ ) .

لە دایك بوونی ئیسلام و پەیامەکەی لە مەککەدا و ، دواتریش بڵاوبوونەوەی لە سەرانسەری زەویی‌دا ، لەسەر چەندین حیکمەت وەستاوە . جا هەروەك ئەتوانرێ ئایەتی پیرۆزی : ﴿ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴾ لەم گۆشەیەوە هەڵ بسەنگێنرێ ، ئەوا ئەشتوانرێ لە بارەی ئەنترۆبۆلۆجیی و جوگرافیی و مێژوویی و مرۆڤایەتیی و ، لەبارەی شوێن و زەمان و دووریی‌یەکانی تری مەسەلەکەوە هەڵ بسەنگێنرێ .. بەڵێ ! خوای باڵادەست هەر خۆی زاناترە بەوەی پێغەمبەرایەتیی و پەیامداریی‌یەکەی بە کێ ببەخشێ و ، لە چ کۆمەڵگەیەكدا پێغەمبەرەکەی هەڵ بکەوێت . هەروەها هەر خۆی زاناترە پەیامەکەی کەی دەربکەوێت و ، لە چ کەش و هەوایەکی مل ملانێی دەوڵەتیی و دینیی و مرۆڤانە و ، دوای گەیشتنی ئەو مل ملانێیە بە چ ئاستێك پێغەمبەرێکی نوێ و دینێکی نوێ رەوانە ئەکات . با ئێستاش سەرنجی ئەم کارانە بگرین :

**١ ـ رەهەندی مرۆڤانەی پەیامی ئیسلام :**

ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە خوای باڵادەست هەر خۆی زانایە کێ بە پێغەمبەر هەڵ ببژێرێت و ، ئەمانەتی تەبلیغی ئەم پەیامە خوایی‌یەی پێ بسپێرێ و ، ئەم پەیامەش ئاراستەی کێ ئەکرێت . لە سەردەمی پێغەمبەریش دا ﷺ هی وا هەبوو زەننی ئەبرد کە وەلیدی کوڕی موغیرە و عوروەی کوڕی مەسعوودی ثەقەفیی بۆ پێغەمبەرایەتیی شیاوتر و گونجاوترن . قورئانیش دەربارەی ئەو دوو کەسە رای ئەوانەی لە ئایەتێکی تردا باس کردووە کە

فەرموویە : ﴿ وَقَالُواْ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴾ ( الزخرف : ٣١ ) . هەروەها قورئان پەرچیان ئەداتەوە کە ئەفەرموێ : ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ ( الزخرف : ٣٢ ) . بێگومان قەزیەیەکی یەکجار پایەدار و کارێکی یەکجار گرنگ بە وێنەی کاری پێغەمبەرایەتیی ناگونجێ بدرێتە دەست رای ئەم و ئەو . جا ئەگەر خوای بالادەست ئاگاداری لەتیفە مرۆڤانەکان بێت ـ بێگومان ئاگاداریشیانە ـ کە لە رۆح و دڵی مرۆڤ دا هەن ، مەبەستیشی ئەوەیە ئەم لەتیفانەی تێدا زیندوو بکاتەوە ، ئەوا بێگومان ئەو لە هەموو کەس زاناترە بە شیاوترین کەس بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە . لەبەر ئەوە ئەو کەسەی کە خوای بالادەست بە کردنی بە پێغەمبەر شەرەفمەندی کردبێت ، شیاوترین کەسە .

هەوڵدانی وەلیدی کوڕی موغیرە و غەیری ئەویش ، بە بچووك دانانی پێغەمبەرمان ﷺ و ، وەها سەیرکردنی کە شیاوی پێغەمبەرایەتیی نەبێت بە تاوانێکی گەورە لە قەڵەم ئەدرێت و ، ئەوانە بەم کارەیان لە بەرچاوی خوای بالادەستدا دابەزیونەتە نزم ترین و سووك ترین پلە و پایە و ، خوای بالادەستیش لە سیاقی هەمان ئایەتدا ﴿سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا كَانُواْ يَمْكُرُونَ ﴾ ( الأنعام : ١٢٤ ) هەواڵی ئەو سووکیی و رسواییەمان ئەداتێ کە تووشی ئەوان ئەبێت .

کە خوای بالادەست ئەفەرموێ : ﴿ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ ( الحج : ٧٥ ) ، ئیتر ئێمە لەسەرمانە رێز و ئیحترام بۆ ئەو کەسە دابنێین کە خوای بالادەست هەڵی بژاردووە و ، گوێڕایەڵییشی بۆ بکەین ، ئەگینا دەربڕینی هەر ناڕەزاییەکی ویژدانیی دژی ئەو کەسەی کە خوا هەڵی بژاردبێت ، پلە و پایەی ئەو مرۆڤە دائەبەزێنێت و ، سووك و رسوای ئەکات و ، لەو فەیض و

بەرەکەتە بێبەش ئەبێت کە دەست پێغەمبەران و ئەولیایان و ئەصفیایان و لە خوا نزیکان ئەکەوێت .

بەڵێ ! ئەم جۆرە کەسە ـ پایە و پلەی هەرچەندە بێت ـ دەست لە ملانی سووکیی و رسوایی ئەبێت و ، لە هەموو ( فیض ) ێکی خوایی بێبەش ئەبێت.

پاشان گەورەیی و شیاویی و لێهاتنی پێغەمبەرمان ﷺ دیارن و لە هەموو چەرخ و سەردەمێکدا و لەلایەن هەموانەوە دانیان پیا نراوە . جا لەگەڵ ئەوەشدا کە کتێبە ئاسمانی‌یە کۆنەکان دەستکاریی کراون ، ئەوا کەڵەزانا پایەدارەکان وەك زانای گەورە ( رحمة الله ) ی هیندیی و ، زانای گەورە ( حسین الجسر ) لەو کتێبە دەستکاریی کراوانەشدا صەد و چواردە مژدە و دەقیان دۆزی‌یەوە دەربارەی هاتنی ئەم پێغەمبەرە بەرێزە . بەڵێ ! پێغەمبەران ـ هەر لە داوود و سولەیمان و مووساوە سەلامیان لێ بێت هەتا ئەگاتە یەحیا و زەکەریا و عیسا سەلامیان لێ بێت ـ لەسەر مژدەی هاتنی ئەم پێغەمبەرە بەرێزە یەك دەنگن و ، هەواڵیان بە ئوممەت و قەومەکانیان داوە کە ئەو پێغەمبەرە هەموو رەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەرانی سەلامیان لێبێت لە خۆ گرتووە . ئیتر بەم پێیە پێغەمبەر ﷺ خاوەنی ( مقام الحج ) ە ، واتە خاوەنی پایە و پلەی کۆکەرەوەی رەوشتە بەرزەکانە .

بەڵێ ! ... یەکێتیی پێغەمبەرە مەزنەکان لە پێغەمبەردا ﷺ درەوشایەوە، واتە پێغەمبەر ﷺ بە پەیامە جیهانی‌یە گشتگیرەکەی کۆکەرەوەی فیکر و پەیامی هەموو ئەو پێغەمبەرە مەزنانەیە کە بۆ مرۆڤایەتیی رەوانە کراون. لەبەر ئەوە ئەو لەلایەنی دامەزراندنی هەموو کێشە پێویستەکانی ئیمانەوە بە دامەزرێنەر ئەژمێررێت و ، لەلایەنی هەڵەگیرییش بۆ دەست کاریی کردنەکان بە هەڵەگیر و ، لەو کارانەشدا کە پێویستی‌یان بە نوێکردنەوە و ، تێر و تەواوکردن هەبوو بە نوێخواز ئەژمێررێت . لەبەر ئەوە ئیتر پێغەمبەری تری بە دوادا نایەت، چونکە کێشەکانی عەقیدە گەیشتوونەتە یەکەیەکی تەواوکراو و ، هەر

کەس دوای ئەو بێت ئەو یەکە تەواوکراوە ئەدرێنیٚ . لە بەر ئەوە ئەو دوا پێغەمبەرە ، واتە کۆتاهێنەری پێغەمبەرانە . چونکە بە هاتنی ئەو مرۆڤایەتیی لە فیکر و شعوردا و ، لە دین و عەقیدەدا و ، لە ئیرادە و سەیر و سلووك و رێبازدا گەیشتۆتە هەموو کلیلێکی داخراو لە عەقیدە و فیکر و ژیاندا، بە رادەیەك کە ئیتر پێویستیی بە پەیامێکی تری نویٚ نیە . لەبەر ئەوە لەسەر تێکرای مرۆڤایەتیی پێویستە هەموو کێشە ژیارییەکانی لەبەر رۆشنایی و لەسەر هیدایەتی ئەم کۆتا پەیامە رێك و پێك بکات .

لایەکەی تری ئەم بابەتە ئەوەیە کە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ و پەیامەکەی پێش هەموو پێغەمبەران بووە . لە یەکێك لە فەرموودەکاندا هاتووە: ( أول ما خلق الله نوري ) .[22] ئەفەرمویٚ : یەکەم شتێك کە خوا بەدیی هێنا نووری من بوو . لە فەرموودەیەکی تریشدا هاتووە : ( كنت نبياً وآدم منجدل في طينته )[23]. ئەفەرمویٚ : لەو کاتەدا کە ئادەم سەلامی لیٚ بێت چەقی بووە ناو قوڕەکەیەوە من پێغەمبەر بووم . واتە نەخشەی رەوانەکردنی بە پێغەمبەر پێش هەمووان بووە . ( تصوف ) خوازانیش لەژێر ناونیشانی ( حەقیقەتی ئەحمەدیی ) دا لەم باسە کۆڵیونەتەوە و ، لە بەردەمیشیا زۆر وەستاون . ئەوان وەهای ئەبینن کە حەقیقەتی ئەحمەدیی لە هەمان کاتدا حەقیقەتی بوونەوەرە و ، بەم کارەش ویستیان مەزنیی پێغەمبەر ﷺ دەربخەن و ، مایەی دەرخستنی مەزنترین پەیامیشە .

وا چاکە لێرەدا ساتێك لەبەدەم ئەم باسەدا بوەستین : پێغەمبەر ﷺ گەیشتۆتە پلەیەك کە هیچ کەس نەیگەیشتۆتیٚ . ئەگەر ئەو نوورەی کە لە بارەی چەند و لە بارەی چۆنیشەوە بڵاوی کردەوە بەرچاو بگرین ، ئەوا هیچ کەسی ناگاتیٚ. ئەمەش

---

[22] العجلوني ، كشف الخفاء : ٢٦٥ .

[23] العجلوني ، كشف الخفاء : ١ / ١٢٩ ـ ١٣٠ ، ١٣٢ .

لەلایەنی (عملي ) یەوە گەورەترین بەڵگە و سەلماندنە لەسەر مەزنیی ئەو پەیامەی کە هێنای و بڵاوی کردەوە .

چونکە صەدەها دین وەك بووذیی و بورهومیی و طوطەمیی و غەیری ئەوانیش ، هەتا دینە ئاسمانییەکانیش وەك مەسیحیەت و یەهوودییەت هەر یەکە بە رێژەیەك دەستکاریی کران و ئاڵ و گۆڕیان بەسەردا هات جگە لە ئیسلام. لەوانەیە مەسیحیەت ئەمڕۆ لە ئیسلام زیاتر بڵاو بوویێتەوە ، بەڵام ئەستەمە ئەمڕۆ مەسیحیەتی راستەقینە ـ بەو شێوەی کە مەسیحی سەردارمان سەلامی لێ بێت هێنای ـ دەست بکەوێت و ، ئەستەمیشە ئەمڕۆ لەو مەسیحیەتە تێ بگەین کە لە لیتەی چەندین تەئویل و تەفسیری قورس و نادیاردا چەقیوە . خۆ ئەگەر لە قورئانی پیرۆزدا چاومان بە پێناسی راستەقینەی مەسیح سەلامی لێ بێت نەکەوتایە ، ئەوا نەمانئەتوانیی بەو شێوەی هاتووە کە لە ( الکتاب المقدس ) دا پێشکەش کراوە ، لە نێو ئەو هەمووە را جیاجیانەی کە دەربارەی ئەو هەن ، وەری بگرین . چونکە کە عیسا سەلامی لێ بێت بە پێی ئینجیل یوحەننا و ئینجیل مەتتا و لۆقا لێمانەوە دەر ئەکەوێت لە هیچ شتێکدا لەگەڵ خوای باڵادەستدا جیاوازییان نیە ( حاشا لله ) . وا لەسەر عەرش لە تەنیشت خوادا دانیشتووە و پەروەردگارێتیی لەگەڵدا ئەکات بە دوو کەرتەوە و، بە پێی قسەی ئەوان ، مرۆڤایەتیی لەو هەڵە بە میرات بەجێماوەی رزگاری نابێت و ، ناشتوانێت بچێتە ئەو بەهەشتەوە کە لە دەستی دا بە فەزڵی ئەو نەبێت.

بەڵێ !... ماهیەتی مەسیح سەلامی لێ بێت تا ئەم رادەیە لە دەقەکانی نێستای کتێبی پیرۆزدا قورس و شڵەژاو و دوور لە تەصدیقە . بە وێنەی هەموو حەقیقەتەکانی تر ، بە فەزلی پەیامەکەی پێغەمبەرمانەوە ﷺ نەبوایە ، حەقیقەتی مەسیحیشمان سەلامی لێبێت نەئەزانیی ....!

٢ ـ رەهەندی پەیامی ئیسلام :

﴿ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴾ پێگەیشتنی پێغەمبەرمان ﷺ لە مەککەدا لەلایەنی پەیامەکەشیەوە چەندین حیکمەتی تێدایە ..

دیارە مەککەی موکەڕڕەمە دەوران دەوری ناوکی زەویی داوە و ، کەعبەش ناوکی زەویی و دڵی ( وجود ) ە . هەندێك لە ئەولیایانی ئەهلی کەشف وتوویانە کەعبە و پێغەمبەر ﷺ پێکەوە بەدیی هێنراون و ، حەقیقەتی کەعبە و حەقیقەتی ئەحمەدیی دوو هاوڕێ و هاودەمن . جا لە هاتنە خوارەوەی حەقیقەتی ئەحمەدیی‌دا هەندێك لە ئەولیایان کەوتنە هەڵەوە کە وتیان : حەقیقەتی کەعبە پێش حەقیقەتی ئەحمەدیی کەوتووە . کەچیی حەقیقەتی ئەحمەدیی هەرگیز لە حەقیقەتی کەعبە دوا نەکەوتووە و ، ئەو دوو حەقیقەتەش دوو دیون بۆ یەکەیەك. ئەگەر بویستریّ هەر دینێکی جیهانیی لەسەر زەوییدا خزمەت بکات، ئەوا مەککەی موکەڕڕەمە ـ کە پێغەمبەر ﷺ تیایا هەڵ کەوتووە ـ چاك ترین شوێنە بۆی . پاشان ئەوە نیە قورئانی پیرۆز بە ( أم القرى ) وەصفی ئەکات ؟ بەڵێ ، مەککە سەرداری شارەکانە ، سەرداری شارە گەورەکانە و ، لە کاتی پیّگەیشتنی پێغەمبەردا ﷺ دایەنی بووە ، بگرە بە وێنەی خۆراك‌دانی رەحەمی دایك بە کۆرپەلە خۆراکی پیّداوە . مووسا پێغەمبەریش سەلامی لیّ بێت ئەو پەیامەی کە هێنای بۆ بەنی ئیسرائیل لە ( ئەیکە ) وەری نەگرت ، بەڵکو لە خاکی پیرۆزی ( طور سیناء ) وەری گرت . جا هەروەك ئەو خاکە بە دینی مووسەویی دەنگی دایەوە و ، هەروەك مووساش سەلامی لیّ بێت یەکەم پەیامی خۆی بۆ بەنی ئیسرائیل لەو خاکەدا ، بە پێی ئاستی خۆیان وەرگرت ، هەروەها ئەبوا پەیامی قورئانی جیهانیی گشتگیر لە زەمان و مەکان‌دا لەو شارەوە دەرچێت کە کەعبەی تێدایە ... هەروایش بوو .

لاکەی تریش لە مەسەلەکەدا ئەوەیە کە مەککە لە چەند روویەکەوە شارێکی ستراتیجیی بوو ، کە ئەو کاتە شوێنی بە یەك گەیشتنی چەند دەوڵەتێك بوو .

مەككە وەك ئەو لێوارەی دەریا وەها بوو کە شەپۆلەکان دایان ئەگرتەوە و لەلایا ئەشکانەوە . هەروەها مەککە و مەدینە لانکە بوون بۆ چەندین شارستانێتیی کۆن وەك شارستانێتیی سەبەء و حەضرەمەوت و صەنعاء . ئەڵێن : ئەو گەشتیارەی کە لە مەدینەوە بەرەو حەضرەمەوت ئەکەوتە رێ لە ژێر سێبەری چڕ و پڕدا ئەڕۆیشت و ، خۆری بەر نەئەکەوت هەتا ئەگەیشتە حەضرەمەوت .. ئەی ئەوە نیە قورئان باسی ئەو بەهەشتانە ئەکات و بە بەهەشتی زەویی ، یان ( جنة عدن ) وەصفیان ئەکات ؟ بەم جۆرە مەککە و مەدینە دوو لانکە بوون بۆ ئەم جۆرە شارستانیەتە کۆنانە ، هەروەها هەردووکیان پەیوەندیان بە شارستانیەتیی بیزەنتە لە رۆما و شارستانیەتیی ساسانیەکانەوە لە ئێران هەبوو. ئەوەبوو بە هۆی شاری ( أنطاکیا ) وە رۆشنبیریی رۆما لەگەڵ رۆشنبیریی میصری کۆندا بە یەك گەیشتن و ، شاری ئەسکەندەرییەی کۆن بووە بەرهەمی ، یان لێی بوو . ئەو کاتە رۆما بە هێزی گەورەی جیهانیی ئەژمێررا و ، سوورەتی ( الروم ) یش دەربارەی دەوڵەتە زل هێزەکانی ئەو رۆژانە هاتە خوارەوە . لە سالانی لەدایك بوونیشدا ئیمپراتۆریەتی ساسانیی بۆ ماوەیەکی دیاریی‌کراو دەسەلاتی خۆی لە یەمەندا چەسپاند و ، هەندێ جاریش یەمەنی دژی ئەهلی مەککە هەڵ ئەنا . هاتنی سوپای ( أصحاب الفيل ) یش بۆ مەککە بۆ وێران کردنی لە ئەنجامی هەڵنانی ساسانیەکان بوو ، بەلام خوای بالادەست رێی نەدا مەککە تووشی هیچ زیانێك ببێت و ، هەروا بە شارێکی پڕ لە ئاسایش هێشتیەوە .

لەبەر ئەمە لەم گۆشەیەوە ئەتوانین بڵێین : دوورگەی عەرەبیی خاکێکی گونجاو بوو بۆ پێشکەش کردنی پەیامی جیهانیی ئیسلام . بەڵێ ، پەیامێك کە هەموو جیهان بدوێنێ پێویستە لە شوێنێکەوە پێشکەش بکرێت کە ئەگەر هەرکەی ئەو پەیامە سەری هەڵ دا لە تواناد‌ا هەبێت لە جیهاندا بلاو بکرێتەوە . جا مەککە و مەدینە لە لایەنی ستراتیجی‌یەوە بۆ ئەو کارە چاك بوون . ئیتر هەرکە

بانگەوازی ئەم پەیامە لە خاکی پیرۆزدا خۆی بەسەر پێوە گرت ، روو بە رووی ئەم دوو شارستانیەتە و ، ئەم دوو رۆشنبیری‌یە بۆوە . پاشان بە هۆی ئەم دوو شارستانیەتە و ، ئەم دوو رۆشنبیری‌یەوە ئەم پەیامە توانیی بگاتە لای چەندین ئوممەت و گەل . ئەوەبوو بە هۆی یەکێکیانەوە گەیشتنە دەروازەکانی ئەوروپا و ، بە هۆی ئەوی تریشیانەوە گەیشتە ئەوپەڕی ئاسیا ، تا ئەرکە جیهانی‌یە گشت گیرەکەی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت .

ئەو کاتە مەککە بنکەیەکی بازرگانیی گرنگ بوو کە لە ولاتە جۆربەجۆرەکانەوە بازرگانی بۆ ئەهاتن ، بۆ هێنان و بردنی شت‌ومەکی بازرگانیی. مەککە بە هاوین و بە زستاندا بۆ بازرگانیی شارێکی چاك بوو و، وەك لە قورئانیش‌دا هاتووە کاروانە بازرگانی‌یەکان لە مەککە بوو بووە دڵی بازرگانیی لەو ناوچەیەدا ، هەتا کە موسڵمانەکان لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە کەوتنە مونافەسەی ئەو بازرگانە یەهوودی‌یانەی کە دەستیان بەسەر بازرگانیی مەدینەدا گرت بوو و ، دوای ماوەیەکیش بازرگانە یەهوودی‌یەکان لە مونافەسەکردنیان دەست کۆتا بوون . ئەمەش ئەوەمان نیشان ئەدات کە بازرگانە مەککەیی‌یەکان بە هۆی سەرقاڵ بوونیانەوە بە بازرگانیی نێو دەوڵەتی‌یەوە شارەزای بنچینەی کۆمەڵایەتیی و رۆشنبیریی دەوڵەتە زلهێزەکان بوون. ئەمڕۆش بە شێوەیەکی چاکتر ئەوە ئەزانین کە تێگەیشتن لە سروشتی کۆمەڵایەتیی و تایبەت‌مەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یە گشتی‌یەکانی هەر ئوممەتێك و ، ئاگادار بوون لەو شتانەی کە بایەخیان پێ ئەدات و ، شارەزای بنچینە ئابووری‌یەکانی ئەو ئوممەتە ببین ، لە گرنگ‌ترین بناغەکانە بۆ بەستنی پەیوەندیی لەگەڵیا . لەو سەردەمەدا دانیشتوانی مەککە شارەزای رۆشنبیریی عادەتی ئوممەتە دراوسێ‌کانیان بوون ، ئەویش بە هۆی ئەو پەیوەندی‌یە بازگانی‌یانەوە کە لەگەڵیانا بەستبوویان . جا بۆ پێك هێنانی بناغەیەکی شیاو بۆ بانگەوازکردن بۆ ئەو پەیامەی کە لەمەودوا لەوێ سەری هەڵ دا ، ئەم کارەش گونجاو بوو.. بەڵێ !... سەرهەڵدانی

موحەممەدی پێغەمبەر ﷺ بە پەیامە جیهانی‌یە گشتگیرەکەیەوە لەو شوێنە پیرۆزەدا ، لە مەککەی موکەڕڕەمەدا ، کارێکی یەکجار گرنگە . خۆ ئەگەر تۆ شوێنەکە بگۆڕیت ، واتە ئەگەر ئەم پەیامە لە مەککە و مەدینە هەڵ بگریت و بی‌گوازیتەوە بۆ طائیف یان بۆ ریاض یان بۆ عەممان ئەوا گۆڕان بەسەر چەندین ( موازین ) دا دێت و ، هەموو ئەو سیفەتانە لە دەست ئەدەین کە لە مەککەدا هەن ، ئەمەش کۆسپ دروست کردن لەبەردەم گەشەکردن و بڵاو بوونەوەی ئەم پەیامەدا ئەگەیەنێت . بەڵێ مەککە و مەدینە دوو شاری پێویست بوون بۆ بانگەوازیش و بۆ پەیامەکەش .

هەروەها پێویستە لە یادمان بێت کە سەرهەڵدانی ئەم پەیامە لە کەش و هەوایەکی بیابانیی گڕگرتوودا بە شتێکی ئیجابیی ئەژمێررێت . وێنەی ئەم بیابانە چەندین سوپای هێرشکەری وەك ناپلیۆن و هیتلەر و فەرمانـدە رۆمانی‌یەکانی قووت داون و لەناوی بردوون . بەڵام موسڵمانە پێشینە موجاهیدەکان کە لەگەڵ نارەحەتی‌یەکانی ئەم ئاو و هەوایە راهاتبوون ، بەژداریی هەر جەنگێکیان کردبێت تیایا سەرکەوتوون ، کەچیی کەسانی تر بە نارەحەتیی لەو ناوچانەدا بەرەو پێش ئەچوون ، بەڵام موجاهیدە موسڵمانەکان ـ کە لەگەڵ سروشتی ئەو ئاو و هەوا و جوگرافیایەدا راهاتبوون ـ بەوپەڕی ئاسانیی و بەوپەڕی گورجی‌یەوە ئەیانتوانیی بەرەو پێش بچن ، هەروەها لە لایەنی ( لوجستیکی ) یەوە دەستی باڵایان هەبوو . بۆ نموونە ئەگەر سوپایەك لەگەڵ ئاو و هەوای تورکیا یان ئاو و هەوای شام راهاتبێ و بەشداریی جەنگی تەبوك بکات ، ئەوا ئیحتیمالی ئەوەی هەیە تیاچوون چارەنووسی ئەو جۆرە سوپایە بێت .

لێرەدا مەسەلەیەکی تریش هەیە کە ئەمەیە : لەبەر ئەوەی دوورگەی عەرەب بیابانێکی وشك و برینگ بوو ئەوا دەوڵەتە گەورەکان تەماعیان تێ نەئەکرد . هەروەها ئەو رۆژە نە نەوت و نە سامانەکانی تریش نەناسرابوون و ، رووەك و درەخت و زەویی‌وزاری صەوزیشی یەکجار کەم بوون . لەبەر ئەمە نە مەککە و نە

مەدینە ـ بەدەر لە کاروباری بازرگانیی ـ ئەو شارە نەبوون کە کەسانی تر تەماعی تێ بکەن ، یان حەز بکەن داگیری بکەن . بۆیە هەردووکیان لە داگیرکردنی دەوڵەتەکانی تر پارێزراو بوون . جا هەرچەندە دەوڵەتە گەورەکانی ئەو سەردەمە بەینا و بەین هەندێ والی‌یان بۆ ئەو شوێنە پیرۆزانە ئەناردن ، بەڵام ئەو دەوڵەتانە ئەیانزانیی لەو شوێنەدا هیچ کەڵکێکیان دەست ناکەوێ ، لە بەر ئەوە رۆشنبیریی ئەو دەوڵەتانە دزەی نەئەکرد بۆ ئەوێ و ، فیترەتی خەڵکی ئەوێشیان تووشی فەساد نەئەکرد . لەبەر ئەوە ئیسلام ئەمەی بە هەل زانیی تا عەقیدە روون و پارێزراوەکەی لە کاریگەریی شارستانیەت و رۆشنبیری‌یەکانی تر ، لە سەرتاسەری جیهان‌دا بڵاو بکاتەوە . خۆ ئەگەر پێچەوانەی ئەمە رووی بدایە ، واتە ئەگەر مەککە و مەدینە بەر داگیرکردنی فیکریی و رۆشنبیریی بێگانان بکەوتایە ، ئەوا پەیامی ئیسلام تووشی نارەحەتیی زیاتر ئەبوو . لە راستیی‌دا رۆشنبیریی ئیسلامیی لەم مەڵبەندە ئەمینەدا لانکەی خۆی دۆزی‌یەوە ، هەروەك باران ئەو زەویی‌وزارە بەپیتە بۆ خۆی ئەدۆزێتەوە کە ئەو کانیاوە دەوڵەمەندانەی لێ هەڵ ئەقوڵێت کە دۆلکەکان ناتوانن لێڵی بکەن . لەبەر ئەمە نە عەقیدەی ساسانی‌یەکان و نە عەقیدەی رۆمای بتپەرست نەیان‌توانیی سەرچەمەی روونی ئەم پەیامە لێڵ بکەن . بە پێی ئەم وتەیە (( دۆلکەکان ناتوانن لێڵی بکەن ))، ئەو دۆلکانە کە شۆڕکرانەوە بۆ ئەم سەرچەمە روونە ـ کە پاڵی بە ( فیض الأقدس ) و بە وەحی‌یەوە داوە و ، لە ژێر ئەمینیی باڵی خوایی‌دا پارێزراوە ـ ناتوانن لێڵی بکەن .

بەم شێوەیە ئەو مەککەیەی کە سیفەتێکی جیاوازی بەدەست هێناوە ، کە ئەویش بریتی‌یە لەوەی مەککە شوێنی داکەوتنی ( سدرة المنتهى ) [24] بێت ،

---

[24] لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس‌ەوە ئەگێڕنەوە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : ( ... ثم البيت المعمور في السماء يقال له الضراح وهو على مثل بيت الله الحرام ، لو سقط لسقط عليه ... ) المعجم الكبير للطبراني : ١١ / ٤١٧ ، شعب الإيمان للبيهقي : ٣ / ٤٣٧ ، المصنف لعبد الرزاق : ٥ / ٢٨٠ فەرموودەکە

هەروەها بە هۆی شوێنە جوگرافی‌یە جیاوازەکەشیەوە خاوەنی گرنگی‌یەکی گەورەبوو بە وێنەی شوێنێکی چاك بۆ گەیاندنی پەیام . ئەوەبوو لەوەو دوا نەمانەتی هەڵگرتنی پەیامەکە ، دوای ئاڵوگۆڕی هاوکێشە دەوڵەتی‌یەکان و تایبەتمەندی‌یە ستراتیژی‌یەکان گوازرایەوە بۆ شاری تر . بەلاّم ئێمە ئێستا سەیری سەردەمی سەرهەڵدانی پەیامەکە ئەکەین ، کە ئەویش ئەو ماوەیەیە کە ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژەی بۆ ئەکات . چونکە ئێمە ئەزانین کە شاری بەغدا و شام و ئەستەنبوڵ لە سەردەمی جیاجیادا ، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بوونەتە مەڵبەندی بلاّوکردنەوەی ئیسلام . هەتا لەو سەردەمەشدا کە ئەستەنبوڵ نوێنەری پەیامی ئیسلام بوو مەککە و مەدینە ، وەك رۆشنایی چاو و تاجی سەری جیهای ئیسلامیی ، پارێزگاری‌یان لە پایە و پلەی موبارەکی خۆیان کرد بوو .

**٣ ـ رەهەندی زمانەوانیی پەیامی ئیسلام :**

لە چەند ئایەتێکدا باسی هاتنە خوارەوەی قورئان بە زمانی عەرەبیی هاتووە. ئەمەش کامڵیی زمانی عەرەبیی دەر ئەخات ، بە تایبەت لەو سەردەمەدا. بەڵێ!... زمانی عەرەبیی لەو سەردەمەدا لە سەردەمی زێڕینی گەشاوەی خۆیدا ئەژیا . هەموو زمانێك سەردەمی زێڕینی خۆی هەیە . بۆ نموونە سەردەمی شاژن ئەلیزابیث و شەکسپیری نووسەر سەردەمی زێڕینی گەشاوەی زمانی ئینگلیزیی بوو و ، واش دەرئەکەوێت ئەوان وەك ئێمە لە بابەتی زماندا نەکەوتنە هەڵەوە. هەروەها دەرگا والاّکردن بە زانینەوە لە سەر زانستی تەکنۆلۆجیا و لەسەر رۆشنبیری‌یە جۆراوجۆرەکان زمان زیاتر دەوڵەمەند و سامان‌دار ئەکات. ئینگلیزەکانیش بەردەوام بە رێز و گەورەگرتنەوە سەیری ئەو سەردەمەیان کرد. ئەو سەردەمەش کە قورئانی تێدا هاتە خوارەوە بە سەردەمی زێڕینی زمانی

---

باسی ئەوە ئەکات کە لە ئاسماندا ( البيت المعمور ) هەیە و لە شێوەی مزگەوتی کەعبەدایە و ، گەر بەر بێتەوە ئەکەوێت بەسەر کەعبەدا ..

عەرەبیی ئەژمێررێت ، بە رادەیەك کە سادەترین ( بیان ) لەو کاتەدا لەوپەڕی قەشەنگییدا دائەڕێژرا . قورئان بە زمانی قورەیش هاتە خوارەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا لە بەردەم شێوە زمانی هۆزەکانی تریشدا دەرگای والا بوو .

زۆرێك لێکۆڵینەوەیان کرد و ، دەربارەی لایەنی ئەدەبیی قورئانی پیرۆز شتیان نووسیی . ئەوەبوو لەو بابەتەدا زۆرێك لە کەڵە زانایان هەڵ کەوتن بە وێنەی عەبدولقاهیری جورجانیی و سەککاکیی و زومەخشەریی لە رابوردوودا ، تا ئەگاتە موصطەفا صادیقی رافیعیی و سەیید قوطب لەم چەرخەی ئێستاماندا و، کەڵەزانا سەعیدی نوورسیی خاوەنی کتێبی ( إشارات الإعجاز ) .

لەو رۆژەوە کە قورئان هاتۆتە خوارەوە هەتا ئەمڕۆ بە بەلاغەت و ئیعجازەکەی تەحەددای نەیارەکانی کردووە . چەند ئەدیب و خاوەن بەلاغەت هەوڵیان دا بە وێنەی قورئان بهێنن یان لاسایی بکەنەوە ، کەچیی نائومێد بوون و شکستیان هێنا و ، چەند خۆشەویستی قورئانیش نووسین و شیعرەکانی خۆیان بە ئایەتەکانی و بە بەلاغەتی ( بەیان ) ەکەی رازاندبێتەوە ؟! بەلام لە توانای تاکە کەسێکیاندا نەبوو بگاتە لوتکەکەی ، یان لێی نزیك ببێتەوە . هەتا ئەمڕۆش قورئان ـ کە لە لایەن بلیۆنەها کەسەوە ئەخوێنرێتەوە ـ ئەچیێنێ بە گوێماندا و ، لە ئاسمانی وەحییەوە زەردەخەنە ئەکات کە گەیشتن بە بەلاغەتی شێواز و بەیانەکەی موستەحیلە . لە سەردەمی نەفامییشدا چەند شاعیر و ئەدیب بە یەك جار بیستنی قورئان تەسلیمی بووبن ؟ بەڵکو وەلیدی کوڕی موغیرە ـ سەرەڕای ئەوەی کە دوژمنایەتیی لەگەڵ ئیسلامدا هەبوو ـ لە بەردەم بەلاغەتی قورئاندا بەزێنرا .

هەروەها بەلاغەتی قورئان دوژمنترین دوژمنی ئیسلامی ، وێنەی عوتبەی کوڕی رەبیعە و ئەبوجەهل ، لە خشتە برد و ، تاکە کەسێك نەیتوانیی تەحەددای بکات . بۆ نموونە سەیری عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی رازیی بێت بکەن کە بە رادەیەك ئاگاداری ئەدەبی نەفامیی و شیعری نەفامیی بوو جارێکیان فەرمووی

ئەتوانێت لە شیعری عەرەبەکان هەزار دێڕ لەبەر بلێت . ئەم عەقڵە گەورەیە کاتێك کە گوێی بۆ سوورەتی ( طـه ) گرت بەزێنرا و لە خشتەی برد ، بۆیە تەسلیمی قورئان بوو ، هەرچەندە بڕیاری دابوو پێغەمبەر ﷺ بکوژێت !

بە پێی هەندێ ریوایەت و گێڕانەوە ئەگەر لەو سەردەمەدا هەرکەسێك بە کۆڵانێك لە کۆڵانەکانی مەککەدا تێپەڕی بکردایە و ، تۆش بتوەستاندایە و داوات لێ بکردایە چەند دێڕە شیعرێکت لەبەر بۆ بلێت ، ئەوا ئەیتوانیی بۆ ماوەی چوار یان پێنج سەعات شیعرت بۆ بلێت ... ئەمە رادەی بلاویی ئەدەب بوو لە نێواندا . کاتێکیش قورئان هاتە خوارەوە ، بەم زمانە دەوڵەمەندە هاتە خوارەوە . بە کۆمەڵە ئایەتێك هاتە خوارەوە کە بیابان نشینێکی ئاسایی بتوانێت لێیان تێ بگات ، هەروەك کەڵە شاعیرێك ئەتوانێت چێژی جوانی‌یە ئەدەبی‌یەکەی بکات . بەڵێ ! ... هەروەك بیابان نشینێك ، لە کاتی لێخوڕینی وشترەکانی‌دا ، چەند ئایەتێك لە قورئانی ئەکردنە ئەو ئاوازەی کە ( حادي ) ئەی‌لێت ، ئەوا فەسیح‌ترینی رەوانبێژ و ئەدیبەکانیش بە لەزەت و چێژێکی رۆحیی و ئەدەبیی بەرزەوە ئەیان‌خوێندەوە .

ئەمە وا لە دووتوێی ئەو مانایەدا کە ئایەتی ﴿ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴾ ئەی‌گەیەنێت .. خوا زاناترینە بە چ زمانێك پەیامی ئیسلام دابەزێنێت . قورئان بە زمانێك هاتۆتە خوارەوە کە پیاوی یاسایی ئەتوانێت لە گۆشەی زانستی یاساوە لێی بکۆڵێتەوە ، ئەو کاتە بە ئاسانیی پێویستیی خۆی دەست بکەوێت . هەروەها پیاوی کاروبار هەڵ سووڕاندن و ، پسپۆڕی زانستی کەلام و تەفسیرنووسان هەریەکەیان لە مەیدانی پسپۆڕی‌یەکەی‌دا ئەتوانێت لێی بکۆڵێتەوە و ، هەموو وردەکاری‌یەکی مەیدانی زانست و پسپۆڕی‌یەکەی تیا دەست بکەوێت و کەڵکی لێ وەربگرێت .. لەگەڵ ئەوەش دیارە زمانی یاسا شتێکە و ، زمانی تەفسیر و ، زمانی کەلام و ، زمانی ئەدەب و ، زمانی

عەقائید شتێکی ترە و ، ئەم زمانانە لە نێوان خۆیاندا جیاوازییان هەیە . بەلاّم قورئان هەموو وردەکارییەکانی زمانەکە لە هەموو ئەو مەیدانە جیاوازانەدا بەرچاو ئەگرێت و ، هیچ یاسا و بنچینەیەکی تێك نادات . ئا ئەوەتا مێژووی ئیسلامیی و ، ئا ئەوەتا زانستە شەرعیی‌یەکان و ، ئا ئەوەتا قوتابخانە فیقهی ( یاسایی ) یە جۆراوجۆرەکان و ، ئا ئەوەتا دەیان قوتابخانەی ئەدەبیی و، ئا ئەوەتاش هەزاران لێکۆڵەر و وردبین و تەفسیرنووس کە ئەو قوتابخانە جۆراوجۆرانە بەرهەمیان هێناون ... هەموو ئەوانە لەسەر هەزارەها مەشرەب و تام و چێژیان قورئانیان بە گرنگترین سەرچاوەی خۆیان لە قەڵەم دا ، بۆیە هەزارەها کتێبیان لە روانگەی ئەوەوە نووسیی .

کەواتە خوای باڵادەست زاناترە پەیامی ئیسلام چۆن دابەزێنێت ... ئەم پەیامە بە کێ ببەخشێت و ، لە چ ولاّتێکدا و بە چ زمانێکیش دای‌بەزێنێت . نالێین لە لایەنی رێژەیی‌یەوە خوا زاناترە بەمە ، بەڵکو ئەوەش ئەڵێین و مەبەستیشمان ئەوەیە کە خۆی زانای تاقانەیە و ، هیچ کەسێکی تر لەو زانستە هیچ بەشێکی نیە و ، هیچ کەسێکی تریش خاوەنی ئەم ( تقدیر ) ە نیە و ، هەرگیز ئەوەشی بۆ جێبەجێ نابێت و ، هەرکەسیش ئەوە رابگەیەنێت سەرشۆڕی دنیاش و قیامەتیش ئەبێت .



﴿ قَالُواْ يَـٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ۝ قَالَ أَلْقُواْ ۖ فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴾

( الأعراف : ١١٥ ـ ١١٦ ) .

بڕوام وایە لێرەدا کارێك هەیە لە خەڵکیی زۆر ناشارڕێتەوە ، کە ئەمەیە سیحر یەکێك بووە لەو کارە گرنگانەی کە خەڵك بایەخی پێ ئەدان و ، ئێمەش لە کۆبوونەوەی ئەو خەڵکە لە مەیدانێکدا و لە ڕۆژی جەژندا ، بۆ بینینی یاریـیە سیحرییەکان ، لێـی تـێ ئەگـەین . مووسا سـەلامی لێ بێـت پێـی بـاش بـوو سیحربازەکان لە پێشەوە دەست پێ بکەن و سیحرەکەیان بنوێنن . کـاتێکیش کـە مووسا سەلامی لێ بێت سیحرەکەی ئەوانی پووچەڵ کردەوە ، خەڵکەکە واقیان وڕ ما و لە پێشیشیانەوە ئەو سیحربازانەی کە گەیشتبوونە چڵەپۆپەی سـیحر بۆیـان دەرکەوت کە ئەوەی مووسا هێناویەتی سیحر نیە ، ئیتر ئەوەبوو ، سەرەڕای نارەزایی فیرعەون و هەڕەشە و گوڕەشەی ، ئیمانیان هێنا . لێرەدا سیحربازەکان بەم ئیمانهێنانە خێراییەیان خزمەتێکی گەورەیان پێشکەش کـرد ، چونکە ئەو خەڵکە کە متمانەیان بەو سیحربازانە هەبوو و ، لە ڕیزی ئەواندا جێـی خۆیانیـان کردبۆوە ، بە ئیمانهێنانی ئەوان ئەمانیش ئیمانیان هێنا .

کەواتە لێرەدا کۆمەڵێك فاڵچیی هەبوون کـە جیهـانی خۆیانیـان لەسـەر درۆ و دەلەسە و خەڵك خەڵەتاندن دامەزراندبوو و ، تاکە دەسـەڵاتدارێکـی موتڵـەقیش هـەبوو کـە خەڵکەکـەی ناچـار کردبـوو تـا ئـەو ڕێیـە بگرنـە بـەر . پاشـان جەماوەرێکیش هەیە کە بەردەوام بە پێی ئارەزووی ئەو دوو چینە ( سـیحرباز و کاربەدەستان ) ئەدرێتە بەر . لەبەر ئەوە کاتێك کە گوریس و داردەستەکانیان بـۆ

ماوەیەکی کەم وەك مار دەر ئەکەون کە هەڵمەت بدەن ،[25] لە ناکاو داردەستە رەق و تەقەکە بووە مارێك و هەموو گەمە و گاڵتەکانی سیحربازەکانی قووت دان. بەڵام جەماوەر کە بە فیز و سەرسامی‌یەکەوە سەیری ئەوەیان ئەکرد کە لەبەر دەمیانا رووی ئەدا ، راچڵەکین . جا شان بە شانی سەرزلانی نارەوا ، کە ئەوان یەکەم کەس بە دەنگی بەرز بەوپەڕی روونی‌یەوە و ، بەبێ هیچ دوودڵی‌یەك، ئەو ئیعترافە گەورەیان دەربڕیی ، دوای ئەوەی کە لە پڕێکدا دڵیان بۆ ئەو نوورە کرایەوە کە لەودیوی ئاسۆکانەوە پێشکەشیان کرا ، ئەوەبوو جەماوەر ئەوەندەیان بۆ مایەوە کە بڵێین : ﴿ ءامنا برب العالمين ﴾ واتە : ئیمانمان بە پەروەردگاری جیهانەکان هێنا .

لە چەند شوێنێکدا و ، بە شێوازی جیاواز و گونجاو لەگەڵ باسەکەدا ، قورئان ئەم دیمەنە دووبارە ئەکاتەوە و ، بەمەش لە روانگەی درزی دەرگای ئەو مێژووەوە کە خۆی دووبارە ئەکاتەوە پەند و ئامۆژگاریمان پێشکەش ئەکات . پەندەکان ئەخاتە پێش چاوان و هەریەکەمان بە پێی لێ‌هاتن و فراوانیی ئاسۆی بیرکردنەوەی خۆی ئەتوانێت کەڵکیان لێ وەربگرێت .

* * *

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ۖ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِۦ ۖ فَلَمَّآ أَثْقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ ( الأعراف : ١٨٩- ١٩٠ )

---

[25] ئیترسا ئەو کارە وێنەیەکی ئەندێشەیی بووێت و لە ئەنجامی چاوبەست کردنی خەڵکەکە وەهایان بۆ دەرکەوتبێت ، یان سیحربازەکان توورەکەی لە پێست دروست کراو و لە شتی تریان لە جیوە پڕ کرد بوو و، کە تیشکی خۆر لەسەری ئەدرەوشایەوە و لەبەر گەرما وەها دەر ئەکەوت بۆ مرۆڤ کە ئەجوولێن و هەڵمەت ئەدەن ، کارەکە زۆر گرنگ نیە .

لێرەدا حەقیقەتێك هەیە كە ئەوەیە هەندێ ئیماندار جار بە جار ئەچنە ناو بازنەی شیركەوە ، ئەگەرچیی بەو چوونە ناوەوە نەبێتە ئەهلی شیرك . هەروەك ئەم ئایەتە پیرۆزەش روونی ئەكاتەوە كە زۆر خۆش ویستنی منداڵ رێیەكە لە رێیەكانی شیرك . جا لە بریی ئەوەی كە وەها سەیری منداڵەكانمان و وەچەكانیان بكەین كە نیعمەت و لوتف و سپاردەن و ، لەلایەن خواوە پێمان سپێرراون و خراونەتە ئەستۆمان ، وەها سەیریان ئەكەین كە ئێمە خاوەنیانین ، بگرە هەندێك بە هۆی منداڵەوە دەست لە نوێژ و لە خواپەرستیی هەڵ ئەگرن ، هەروەك منداڵەكانیان لە خوای بالادەست خۆشتر بوێن و ، لە بریی ئەوەی لە پێناوی خوادا منداڵەكانمان خۆش بوێن ، بەبێ یاد و بیرخستنەوەی خوا منداڵەكانمان خۆش ئەوێن ( ئەگەر ئەم دارشتنە رێی پێ بدرێت ) و ، هەست بە ئاستێك لە پەیوەندیی و لە سۆز و خۆشەویستیی ئەكەین كە بەبێ مەبەست سەر بۆ پلەیەك لە شیركی نادیار ئەكێشێ . كەواتە پێویستە هەڵس و كەوتمان بە پێی دەستووری ( دڵێك جێی دوو خۆشەویستنی تێدا نابێتەوە ) و ،[26] هەمیشە لە ئامادە باشییدا بین دژی شیرك . دیارە ئەمە بە وتن و تەنها بە قسە زۆر ئاسانە ، بەلام جێبەجێكردنی لە ژیاندا لەوەی دەرئەكەوێت گرانترە . لەگەڵ ئەوەشدا لەسەرمان پێویستە چەندە لە تواناماندا هەیە هەوڵ بدەین بۆ پاك بوونەوە لە شیرك و ، هەرچیی بایەخ دانمان هەیە بەختی بكەین تا لەو شوێنانەی كە لە دووریشەوە بۆنی شیركی لێ دێت نزیك نەبینەوە . جا ئەگەر ئەوەمان ئەنجام دا، ئەوا دوعاكەی پێغەمبەر ﷺ بە وێنەی وەصفەیەكی گرنگ و زەروریی لێمان دێتە

[26] یان بە پێی ئەوەی كە لە قورئاندا هاتووە : ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ﴾ ( الأحزاب : ٤ ) .

پێش : ( أللهمَّ إني أعوذُ بِكَ من أن أشرك بك شيئاً وأنا أعلم ، وأستغفرك لما لا أعلمُ ).[27]

ئەشتوانرێ لە بارەی خۆشویستنی منداڵەوە لە گۆشەی جیاوازەوە سەیر بکرێت : لەوانەیە لە مەسەلە سۆزییەکاندا مرۆڤ لێی نەگیرێت ، بەڵام لە لایەنی دینییەوە لەسەری پێویستە هەستە فیطرییەکانی راست بکاتەوە . بۆ نموونە : لەوانەیە کەسێك نان و ئاوی یەکجار زۆر بخوات و ، لەوانەشە ئاواتی بەسەربردنی ژیانێکی ( استقراطي ) بخوازێت و ، حەز و حیرصێکی توندیش لەم کارەدا دەر ببڕێت ، ئیتر ئەو هەڵس و کەوتە ئەکات ، بێئەوەی حیسابێك بۆ سەرەنجامی ئەو رەفتارە بکات . چونکە مرۆڤ بە فیترەتی لە بەردەم ئارەزووەکانیدا بە لاواز و بەرچاو تەنگ و پەلەکار بەدیی هێنراوە . هەروەها لە بن دەستیدا شان بە شانی هەستی رق لێ بوون و خۆشنەویستن و دژایەتیی هەست و سۆزی خۆشەویستیی و هەستی مرۆڤانەی هەڵ گرتووە . جا ئەم سیفەتانە وەك دوو رێڕەو وەهان کە بەرەو خراپە و بەرەو چاکە ئەڕۆن . لەبەر ئەوە لەسەر مرۆڤ پێویستە هەر دەرگا و پەنجەرەیەك لەسەر ماهیەتی خراپە والا بووە دایبخات و ، بە بیر و بۆچوون و هەستە دینییەکانی دەست بەسەر هەستە دژایەتییکەرەکانیدا بگرێت . ئەمەش ئێمە بە دەربڕینی دینیی پێی ئەڵێین : ( دەست خستنی فیترەتی دووهەم ) ، تا بگاتە ئەو کەماڵەی کە بۆی دیاری کراوە . واتە فیترەتی خۆی ـ کە دەرگای بۆ سەر هەموو شتێك بۆ والا ئەکات ـ ئەکاتە تاکە دەرگایەك کە بەرەو خوای باڵادەستی ئەبات و ، پەیوەندیی لەگەڵیا بەهێز ئەکات .

خۆشویستنی منداڵانیش لەو جۆرەیە . ئەو خۆشویستنە لە فیترەتی مرۆڤ دا هەیە . خۆ ئەگەر ئەو خۆشویستنە نەبوایە منداڵەکان هیچ چاودێرییەکیان نەئەکرا ، کەسیش بایەخی بە پەروەردە و فێرکردنیان نەئەدا و ، نە وڵات و نە

---

[27] القرطبي ، الجامع لأحكام القرآن . پەنا بەخوا ئەگرێت لەوەی شتێك بکاتە شەریکی خوا و پێی بزانێ و، داوای چاوپۆشییش لە خوا ئەکات بۆ ئەو شتەی کە بە نەزانیی بیکاتە شەریکی خوا . ( وەرگێڕی کوردیی).

مرۆڤایەتییش پێش نەئەکەوتن . لە دەوروبەرماندا چەندین منداڵی بەدبەخت و یاخیی هەن ، کەچیی لە ژێر چاودێریی باوك و دایکیاندا ئەبن . جا ئەگەر ئەو خۆشویستنە نەبوایە کە لە فیترەتی مرۆڤ دایە بەرامبەر بە منداڵان ، ئەوا شەقامەکان پڕ ئەبوون لە منداڵی لە ماڵ دەرکراو . بەڵام پێویستە سەرنجی زەرورەتی راست کردنەوەی دڵەکان بدرێت لەلایەنی ئەم سۆزەوە ـ وەك سۆزەکانی تر ـ بۆ سۆزی خۆشویستنی خوای باڵادەست تا مرۆڤ بگات بەو ئیستیقامەتەی کە هەوڵی بۆ دراوە . چونکە ئەگەر پەیوەندیی لەگەڵ خوادا تەوەرەی ژیان نەبێت ئەوا دەرباز بوون نیە لە لادان . لەبەر ئەوە گەشەکردن و رەگ داکوتانی خۆش ویستنی خوای گەورە لە هەموو دڵێکدا واجبە . ئەمەش بەستراوە بە وەرزش و راهێنانی دیاریی کراوەوە . واتە ئەگەر هەر مرۆڤێك کە لە ژیانیا هیچ وەرزشێکی رۆحیی نەزانیی بێت وتی : (( پەروەردگارا ! من ماڵ و منداڵم ئەکەمە قوربانی رێگای تۆ )) ئەوە هەندێ جار ئەو وتنە ریایە و ، هەندێ جاریش درۆیە . چونکە پێویستە پێش ئەو بڕیارە هەرچیی سیفەتی ناشیرین هەن لە ناو رۆحدا دەربکرێن و یەك بە یەك سیفەتە چاکەکان لە جێگەیاندا بنێژرێن ، تا قووڵایی دەروونمان ئیسلام هەڵ بمژێت و ، ببێتە پارچەیەك لە سروشت و فیترەتمان، ئەو کاتەش هەڵس و کەوتە جوانەکانمان سروشتیی ئەبن ، ئەگینا ناتوانین لە دوانەیی بیرکردنەوە و ، لە دوانەیی ژیان و هەڵس و کەوت کردن رزگار بین.

ئایەتەکە لە ئادەمەوە سەلامی لێبێ ئەیگوێزێتەوە بۆ نەوەکانی ئادەم یەك بە یەك و کۆمەڵ بە کۆمەڵ و ، بە شێوەی زنجیرەیەکی دوورودرێژ درێژ ئەبێتەوە ، کە لە چوارچێوەی یەك بوونی گشتییدا و ، لە چوارچێوەی جۆرەکەیدا جیاوازیی و ناڕێکیی و ، لە ناوەرۆکیشیدا دەوڵەمەندیی دەر ئەکەوێت . ئەم مرۆڤەی کە ئەگەر سەرکەوت و بە ئامانج گەیشت ئەوا لە پاداشتدا پێشی مەلائیکە ئەداتەوە و ، گەر دڵیشی بە دنیا خۆش کرد ، ئەوا لە شەیتانی لەعنەتیی نزمتر و بێنرختره . جا کاتێك کە ئایەتەکە ئەم ئەڵقە چاك یان خراپانەی ئەم زنجیرەیەی

(سولاله) ی مرۆڤایەتیی باس نەکات ، شێوازێکی دیاریی‌کراو بەکار نەهێنێ بۆ شەرح کردنی دەستەی گشتیی . لەبەر ئەمە کاتێك کە ئێمە ئەوە بزانین ئیتر پێویست ناکات ئەم پرسیارە بورووژێنین : ئەم ژن و مێردانە کێن ؟ ئایا ئادەم و سەلامی لیٚ‌بێت حەوای هاوسەریەتی ؟ یان قوصەی و هاوسەرەکەیەتی لە قورەیش‌دا ؟ یان غەیری ئەوان ؟

ئەم مرۆڤە بە رۆح و ئامادەباشیی‌یەکان و ناوەرۆك و رەوشت و دەوڵەمەندی‌یەکەوە لەگەڵ هاوسەرەکەی‌دا لە یەك ( نفس ) بەدیی هێنراون کە ئەتوانین ناوی ( تاکی راستەقینە ) ی لیٚ بنێین ، پاشان لەو مرۆڤە ـ یان لە توخمەکەی ـ بەدیی‌هێنراوی تریش لە شێوەی جووت‌دا بەدیی هێنران . واتە خوا لە توخمە سەرەکی‌یەکانی ماهیەتی مرۆڤ جووتی مرۆڤی بەدیی هێنا و شێوەی پیٚ بەخشیی و ، بڕیاریشی وەها بوو هەریەکەیان موحتاجی ئەوی تر و ، تەواوکەری بێت و ، لەگەڵیا هەست بە دڵئارامیی و حەسانەوە بکات و ، هەریەکەیان لەوی تر تیٚ بگات و ، هەستی پیٚ بکات و ، بتوانیٚ ئەو شتانەی کە بە دڵی‌دا دێن لای ئەو بیان‌دەرکێنێت .. واتە هەریەکەیان دیوێکی بەدیی‌هێنانە . ئا لێرەدا یەکێتیی بەدیی‌هێنانمان دێتەوە یاد و ، ئەوەشمان دێتەوە یاد کە ئێمە هۆی دەرخستنی بەدیی‌هێنان و نیعمەتەکانین . واتە کاتێك کە دڵەکانمان لە هەستی شوکرانە بژێریی پڕ بوون ، بە هەمان شێوە عەقڵ و ئیدراکیشمان لە هەستەکانی حەمد و ثەنا پڕ ئەبن .



﴿ وَلَٰكِن لِّيَقْضِيَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ ( الأنفال : ٤٢ ) .

له راستییدا به پێی ئایەتی ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ﴾ ( یونس : ٩٩ ) ئەگونجا رژێمێکی تری دیارییکراو له دنیادا بوایه . بەلاّم ویستی خوایی بڕیاری ئەوەی داوه که به درێژایی ژیان لە دنیادا زۆرانبازییەکی نەبڕاوه له نێوان ئیمان و نێوان کوفردا هەبێت . جا بە سەرنجدانی مێژووی مرۆڤایەتیی هەر لە ئادەمەوه سەلامی لێ بێت هەتا ئەمڕۆ ، ئەتوانرێ ئەم حەقیقەته روونه ببینرێت . لەبەر ئەوه مادەم ئێمه ئەمانەوێت له دنیای ئیماندا بژین ، ئەوا لە سەرمان پێویسته ساتێك ئەوەمان لە یاد نەچێت کە ئێمە ئەکەوینە بەر ئازار و ستەم و دەسەلاّت و ناپاکیی و دوژمنایەتیی کوفر. دژایەتیی رەگداکوتاوی کوفر دژی ئیمان پاڵ بە بەرەی کوفرەوە ئەنێت تا بە بەردەوامیی دوژمنایەتیی بەرامبەر بە ئیمانداران بکەن ، جا پێویستە ئەو هەستەیان لەلا دروست نەبێت که ئەوانه به ناو کۆمەڵە مردوویەکدا تێپەڕ ئەکەن که نه هەست ئەکەن و نه هەستیش به هیچ شتێك ئەکەن ، بۆ ئەوەی کە ئەوەی تیا ئەچێت به ئاشکرا تیا بچێت و ، ئەوەش کە سەرفراز ئەبێت بە ئاشکرا سەرفراز ببێت ، تا هیچ کەس بیانووی نەبێت کاتێك کە ئەبرێتە بەردەم خوای بالاّدەست و ، نەتوانێت بڵێت : بۆچیی ؟ و لەبەر چ هۆیەك ؟

لەوانەیە پێچەوانەی ئەوەش روو بدات کە لە پێشەوە خستمانە پێش چاوان. واتە ئیمانداران ژێر بکەون و ، دنیای کوفر سەرکەوتوو بێت . لەگەڵ ئەوەشدا

ئەنجام ناگۆڕرێت و ، هیچ کامیش لەو دوو لایەنە بیانوویەکیان بە دەستەوە نیە لە بەردەم پەروەردگاریاندا دەری بخەن ، چونکە کۆشش و خەباتێکی دیاریی‌کراو ئەنجام درا و تیایا ئەوەی تیاچوو تیا چوو و ، ئەوەش سەرفراز بوو سەرفراز بوو.

با کارەکە زیاتر رۆشن بکەینەوە و بڵێین : خوای باڵادەست وەهای هێنایە پێش کە ئەو دوو کۆمەڵە لە شوێنێکدا بە یەك بگەن ، کە ئەگەر بەڵێنیان بە یەکتر بدایە لە بەڵێنەکەیان دوا ئەکەوتن و ، خوا ئاو و هەوا و بارودۆخی بەرامبەر یەك وەستان و ، ئەو مەرجانەشی هێنایە پێش کە وەهایان کرد کە ئەو بەرامبەر یەك وەستانە پێویست بێت و ، نەخشەیەکی ئەوتۆش بۆ ئەو کارە کێشرا کە لە پەی‌پێ‌بردنی مرۆڤانە تێپەڕی ، هەتا گەیشتە قۆناغی کوشتاری رووبەڕوو، ئەوەبوو بەوپەڕی روونی‌یەوە حاڵی ئەوانەی کە بە ئاشکرا شیاوی ژیان بوون و، حاڵی ئەوانەش کە بە ئاشکرا شیاوی مردن بوون دەرکەوت . ئەوەبوو لاوازەکان بە هەموو رق و ، سڵەمینەوە و ، قین و ، دووریی لە ئیستقامەت و لە بەشداریی کردنی چاکە ، تیاچوون و ، لەوەدا هیچ بیانوویەکیان بە دەستەوە نەما . بەڵام ئەوانەی کە هیچ تاوان و خراپەیەکیان لەدەست دەرنەچوو ، بەڵکو تەنها خەریکی تەئدیبی ئەوانە بوون کە شیاوی تەئدیب بوون لە بەدر و لە غەیری بەدریشدا ، ئەوانە بە هەموو دامەزراوی‌یەکی دڵ و رۆح و ویژدانەوە دەستیان بە ئاسۆی ژیانی راستەقینە گەیشت .

کورتەکەی : ئەوەی لە بەدر و لە هەموو رووبەڕوو بوونەوەیەکی هاووێنەی بەدردا رووی دا ، هیچ شتێك نەما کە بگونجێ لە دەرەوەی دەست نیشان کردنی راستیی کارەکەدا باس بکرێت ... نە لەلای ئەوانەی کە کوژران و ، نە لەلای ئەوانەش کە ژیان ... نە لەلای ئیمان‌داران و ، نە لەلای کافرانیش ... نە لەلای براوەکان و ، نە لەلای دۆڕاوەکانیش ... هیچ شتێك نەما ، چونکە کارەکان بە پێی ئەو نەخشەیە رێیان گرتە بەر کە خوای بیسەر و زانا نەخشەی کێشا ..



﴿ وَإِذۡ يُرِيكُمُوهُمۡ إِذِ ٱلۡتَقَيۡتُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِكُمۡ قَلِيلٗا وَيُقَلِّلُكُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِهِمۡ لِيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا ﴾ ( الأنفال : ٤٤ ) .

ئەمە لە جەنگی بەدردا رووی دا .. ئەو موسڵمانانەی کە لەو جەنگەدا بەشداری‌یان کرد هەتا ئەو رۆژە جەنگی راستەقینەیان نەدیی بوو . پێویستە ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە ئەو موسڵمانانە کاتێك لە مەدینە دەرچوون نیەتیان ئەوە نەبوو بجەنگێن ، بەڵکو ئەیانویست رێ بە کاروانەکە بگرن . لەبەر ئەوە ئەگەر موسڵمانەکان دوژمنەکانیان بە هێز و ژمارەی تەواویانەوە بدیایە ، لەوانە بوو بترسانایە و سامیان لێ بنیشتایە . بەڵام کە جەنگ دەستی پێ کرد و ماوەی گەڕانەوە دوا نەبوو ، خوای گەورە بارودۆخی راستەقینەی دوژمنەکانیانی پیشان دان ، تا پشت بەخوا ببەستن و ، پەنا بۆ چاودێریی ئەو بەرن . خۆ ئەگەر بەردەوام موسڵمانەکان دوژمنەکانیان هەروا بە کەم بهاتایەتە پێش چاو ، ئەوا بە سووك تەماشایان ئەکردن و ، بە جیددیی خۆیان کۆك نەئەکرد بۆیان ، چونکە بە عادەت لە کاتی حەسانەوە و ، خۆشیی و ، خاوبوونەوەدا مرۆڤ چاودێریی خوایی لە بیر ئەچێتەوە .

وا چاکە لێرەدا بچینە بەردەمی کارێکی تر . ئەو مەلائیکەتانەی کە لە رۆژی بەدردا بۆ یارمەتیی رەوانە کران بە وێنەی مرۆڤ جەنگیان نەئەکرد ، چونکە ئەوان بە بۆنەی تێك شکاندنی رۆحی مەعنەویی بەرەی دوژمن و ، بەهێزکردنی رۆحی مەعنەویی موسڵمانانەوە رەوانە کرابوون . خۆ ئەگەر مەلائیکەت بە فیعلیی بەشداریی جەنگیان بکردایە ، ئەوا ترازووی جیهانی هۆکارەکان لارەسەنگ ئەبوو و ، بۆ هیچ کەسێکیش نەئەلوا بگاتە پلەی ( غەزا کەر ) و ، هیممەتەکان سارد ئەبوونەوە و خەڵکیی پشتی بە چاودێریی و کۆمەکیی خوایی ئەبەست . بەڵام

چاودێریی خوایی لەم دنیایەدا کە خانەی تاقیی‌کردنەوەیە لەژێر پەچە و لەژێر پەردەوە دێت .

کەم پیشاندانی خوای گەورە بۆ ژمارەی موشریکەکان لەبەرچاوی موسڵمانەکان پێش دەست‌پێ‌کردن و گەرم‌بوونی جەنگ بۆ ئەوە بوو دڵەکان بێ‌هیوا نەبن ، هەروەها بۆ بەدیی‌هاتنی ئامادەیی رۆحیی و تاسەمەندیی رۆحیی بوو لە ناو دڵەکاندا بۆ شەهیدیی .. ئەمە چاودێریی پەروەردگاریانەی یەکەم و سۆزی پەروەردگاریانەی یەکەم بوو . هەروەها بە کەم بەرچاوکەوتنی ژمارەی موسڵمانەکان لەبەر چاوی دوژمناندا جۆرێکی تر بوو لە چاودێریی پەروەردگاریی. تەنها بەم شێوەیە توانرا هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ گەیشتن بە ویست ( مرام ) ی خوایی بەکار بهێنرێن . پاشان هەر لایەکیان ژمارەی راستەقینەی لایەنی بەرامبەری بینیی ، بەڵام قەدەری خوایی دەستی پێش خستبوو ، ئەوەبوو ئیمانداران خۆیان لە ناوەڕاست و ناوجەرگەی جەنگدا دیتەوە. لە کاتێکیش‌دا کە ئیمانداران ـ بە چاودێریی و پشت‌گیریی خوا و، بە نەخشەی چاکی ستراتیژیی جەنگ ـ گەیشتبوون بە سەرکەوتن ، موشریکەکان ـ کە دوور بوون لە پشت‌گیریی و سەرکەوتنی خوایی ـ تاڵاوی تێک‌شکانیان ئەچەشت و ، بە سەری شۆڕ و زەرەرمەندیی‌یەوە پاشەکشەیان ئەکرد ..

❁ ❁ ❁

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ ( الأنفال : ٤٥ ) .

ئەتوانین لە دەستەواژەی (( ذکر اللە )) ئەمە تێ بگەین :

١ ـ لەم ئایەتەدا ئاماژە بۆ ئەوە ئەکرێت کە پێویستە لە ژیانی ئاسایی و رۆژانەدا ، هەرگیز غەفڵەت و بێ‌ئاگایی بەسەر دڵدا زاڵ نەبێت ، بە تایبەتیی

کاتێ کە بکەوێتە زۆرانبازیی لەگەڵ دوژمناندا و ، پێویستە بەیناوبەینیش خاوەنانی دڵە غافڵەکان بۆ ئەم کارە وریا بکرێنەوە ، بەمە ئیماندار ئاگادار ئەبێتەوە و ، بە دڵ و بە زمان خەریکی ذیکری ئەو پەروەردگارەی ئەبێت کە لە پێناویدا جیهاد ئەکات و ، ئەو شوێنەش کە خەڵکیی تیایا ئەمرن و شەهید ئەبن ئەگۆڕرێت بۆ شوێنێکی پیرۆز و بۆ پەرستگا .

٢ ـ لە هەمان کاتدا ذیکرکردن نرکەیەکی دووبارەوە بووە لە جەنگدا: ألله، ألله ، ألله . ئەم نرکەیە گرنگە چونکە بە شێوەیەکی سەلبیی کار ئەکاتە سەر ورە و مەعنەوییاتی دوژمن و ، مەعنەوییاتی بەرەی موسڵمانان بەرز ئەبێتەوە، بەوەی کە تاسەمەندیی و حەماسەتیان تیا دروست ئەکات . ئەگەر ئەمڕۆ ئێمە بە تەنها بە پڕپەی زمانمان بڵێین (( ألله ، ألله )) حەماسەتمان تیا دروست بکات و، ترس بخاتە ریزی دوژمنەکانمانەوە ، دەی کەواتە بەراوردی بکە ذیکرێکی بە گوڕم کە لە قووولاییی دڵەکانەوە دەر پەڕێت چ توانایەکی ئەبێت و ، ئەتوانێت چییش دەست مرۆڤ بخات !

٣ ـ ئەگەر بێینە سەرباسی ئەوە کە سەرکەوتن بەستراوە بە ذیکری خوا و بە دامەزراوییەوە ، ئەوە باسێکی وەها گرنگە کە پێویستە بەوپەڕی بایەخ پێدانەوە لەسەری بوەستین .

کەواتە دوو کار هەن کە ئەکەونە ئەستۆی ئەو ئیماندارانەی کە بەرامبەر بە دوژمنان وەستاون . ئەو دوو کارەش ئەمەن :

أ ـ لە حاڵەتی هەر بەرەنگار بوونەوەیەکی جەنگییدا ـ ئیتر سا رەهەندی هەندەکیی و چۆنیەتیی هەرچەند بێت ـ پێویستە حاڵەتی مەعنەویی بەرەی خۆمان بەرز بکەینەوە ، ئەویش بە دەرخستنی ئازایەتیی و بە جەرگیی ـ لە چوارچێوەی عەقڵدا ـ تا شۆکە و لەرزە و شیی‌بوونەوەیەك لە بەرەی دژدا بەرپا بکات .

ب - زۆر ذیکرکردنی خوا بۆ بتەوکردن و بەهێزکردنی حاڵەتی رۆحیی و مەعنەویی و ، لەرزە پێخستنی لایەنی بەرامبەر ، ئەویش بە دیەنی ئەو بێباکی‌یەی کە لە بەردەم مردندا دەری ئەبڕین و ، هەموو هەڵس و نیشتێکیشمان ببەسترێت بە لێدانی ئەو دڵانەمانەوە کە بە خواوە بەستراون ..

بەڵێ ! ئەبێت ئەمە هەر هەمووی کۆمەڵە کلیلێکی گرنگ بن بۆ سەرکەوتن، ئەگینا بە بێئارام‌گرتن و دامەزراویی - بە پێی یاسا خوایی‌یەکان - گەیشتن بە سەرکەوتن کارێکی مەحالە ، هەروەها لە جەنگیش‌دا ، لە حاڵەتی غافڵبوون لە ذیکری خوادا سەرکەوتن بەدەست نایەت . هەتا ئەگەر سەرکەوتنیش بەدەست بێت ، پاداشت دەستگیر نابێت . واتە سەرکەوتنی قیامەتیی دەرهەق بەوانە باسێکی نیە .

کەواتە لەسەر ئەوانە پێویستە کە لە پێناوی خوادا ئەجەنگن و جیهاد ئەکەن لە لایەکەوە بە هەموو لێ بڕانێکەوە دامەزراو بن و ، لەلایەکی تریشەوە دەست بدەنە ذیکری خوا و ، خۆیشیان لە هەموو هەوڵ و هێزێك - هەتا لەو حاڵەتانەشیاندا کە زۆر بەهێز و بەتوانان - دابماڵن و ، ذیکری خوا بکەن و ، خۆیان بخەنە پەنای هەوڵ و هێزی ئەوەوە و ، ئەم دوعایەش دووبارە بکەنەوە :

(( أللهُمَّ ! تَبَرَّأْنا مِن حَولِنا وَ قُوَّتِنا وَلَجَأْنا إلى حَولِكَ وقُوَّتِكَ )) .

واتە : خوایە ! وا خۆمان لە هەوڵ و هێزی خۆمان دامالّیی و خۆمان خستە پەنای هەوڵ و هێزی تۆوە ..



﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴾ ( الأنفال : ٧٣ ) .

لە ئایەتی پێشوودا ، واتە لە ئایەتی ( ٧٢ ) ی سوورەتی ( الأنفال ) دا ئەو بڕیارە هاتووە کە ئەنصار و موهاجیرین ، هەرچەندە پەیوەندیی خزمایەتی‌یان لە

نێواندا نەبێت ، میرات لە یەکتریی نەبەن . پاشان ئەم ئایەتە کە ئێمە ئەمانەویّ شەرحی بکەین حوکمێك دەر ئەکات کە نابێت موسڵمانەکان و کافرەکان میرات لە یەکتریی بەرن و ، کافرانیش هەندێکیان کۆمەك و پیشتیوانی هەندێکیانن، واتە میرات لە یەکتریی ئەبەن . فەرموودەیەکی شەریفیش هەیە کە پێغەمبەر ﷺ تیایا شەرحی ئەم ئایەتە ئەکات کە فەرموویە : ( أنا بَريءٌ مِن كُلِّ مُسلِم يُقيمُ بَينَ أظهُرِ المُشرِكينَ . قالوا : يارسولَ اللهِ ! لِمَ ؟ قال : لا تراءى ناراهُما ).[28]
واتە : هەرچەندە ئیمانیان هێنا بێت ، ئەو ئاگرەی کە ئەی‌کەنەوە دەوروبەر رووناك ناکاتەوە و ، ئەو دوو جیهانە جیاوازەش لە یەك جیا ناکرێنەوە.

ئەتوانین ئەم هەڵسەنگاندنە پێشکەش بکەین :

ئەو ئاگرەی کە لە بیاباندا دا ئەگیرسێنرێت ، لە لایەنی چاوساغیی و زانینی شوێنەوە ... تد زۆر گرنگە . جا ئەم نموونەیە لە گۆشەی جیا نەکردنەوەی ئاگری دوژمن و ئاگری دۆستەوە هەڵ ئەسەنگێنرێت .

ئەگەر ئاگردانی کافر و ئیماندار ـ یان سەرچاوەی رووناکی‌یان ـ پێکەوە و لە تەنیشت یەك‌دا بن ، ئەوا بە نارەحەتیی جیا ئەکرێنەوە . ئەبیّ ئەوەش بزانین کە پێویستە ئاگردانی ئیماندار جیا بێت و ، ئاگردانی کافریش جیا ، بۆ ئەوەی هەرکەس هەر کامیانی ئەوێت لێی تێك نەچێت .

لە هەموو ئەمە گرنگ‌تر موەحید و ئیماندار ـ بەدەر لە بازنەی چاوپۆشیی بەرامبەر بە یەك و قبووڵکردنی یەکتر ـ ئەگەر ئەو ناکۆکی‌یە بنەرەتی‌یانەی کە لە بارەی میللەت و رەوشت و بیر و بۆچوونەوە وا لە نێوانیاندا کزبوون ، ئەوا ئەو جیاوازی‌یانەی کە پێویستە لە نێوانیاندا هەبن نامێنن . جا ئەگەر ئەو بارودۆخە هەروا بەردەوام بوو ئەوا هەردوو لا بۆگەن ئەکەن ، بە تایبەت ئەو لایەنەیان کە

---

[28] أبوداود ، الجهاد : ٩٥ ، النسائي ، القسامة : ٢٧٠ پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لەو موسڵمانە دانەماڵێت کە لەناو کافراندا ئەمێنێتەوە ، کە لە هۆی ئەمە ئەپرسن ، وەڵام ئەداتەوە کە ئاگری کافران و موسڵمانان جیا ناکرێتەوە .

پێی خۆشە جیهانە تایبەتی‌یەکەی خۆی لەسەر دەستکەوتە مێژوویی‌یەکانی دابمەزرێنێت و بەرەو پێشی بەرێت .

هەروەها لە گۆشەی یاسای میرات بردنەوە ، لە نێوان ئیماندار و کافردا، بە هۆی جیاوازیی هەردوو میللەتەکەوە ، میرات بردن نیە . خۆ ئەگەر لەسەر زمانی فەقیهەکان ئەمە دەربڕین ئەوا ئەڵێین جیاوازیی نیشتمان ( الدار ) و جیاوازیی دینیش میرات بردن قەدەغە ئەکەن .

جا لە لایەنی خۆشویستن و تێگەیشتنی مرۆڤایەتی‌یەوە ئەگەر پارێزگاریی لە جیایی هێڵەکان نەکرێت و ، گەر بەبێ هیچ حیسابێك یان کاتێکی دیاریی‌کراو تێکەڵیی رووی دا و ، چاوپۆشییش لە هەندێ بنەمای یاسایی کرا ، ئەوا ئێمە ـ بەو کردەوە و هەڵس و کەوتانەمانەوە کە بە تەمای چاکسازیی بووین ـ ئەبینە هۆ بۆ بەرپابوونی فیتنە و فەساد . کەچیی گەورەترین فیتنە و فەسادیش بریتی‌یە لەو فیتنە و فەسادەی کە هەڵقوڵاوی ئەو کردەوانەیە کە لە بنەڕەتدا بە نیەتی چاکسازیی و خێر ئەنجام دراون . چونکە ئەو خراپکاری‌یانەی کە لە نیەتە چاکەکانەوە پەیدا بوون لەوانەیە سیفەتی بەردەوامیی وەربگرن و ، جەماوەری تێنەگەیشتوویش کاتێك کە تووشی بە تووشی ئەو گێژاوەوە ئەبێت خۆدامالینی لێی کارێکی گران ئەبێت .



﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَـٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾ ( التوبة : ٢٠ ) .

هەمیشە ، جگە لە ئایەتێك یان دوو ئایەت ، لە قورئانی پیرۆزدا جیهاد بە ماڵ و سامان پێش جیهاد بە گیان کەوتووە . بەڵێ ! وەها بە بیرمدا دێت کە مرۆڤ هەتا گیانی تێدا بێت بەردەوام فەزڵی ماڵ و سامانەکەی بەسەر ژیانی خۆیدا ئەدات . فەرموودەی شەریفیش ئەفەرموێ : ( مَن قُتِلَ دونَ مالِهِ فَهُوَ شَهيدٌ ) .[٢٩] واتە : هەر کەس لە سەر بەرگریی ماڵ و سامانی بکوژرێت ئەوە شەهیدە . لە کاتێکدا کە ئەم فەرموودەیە حوکمێکی دیاریی‌کراومان فێر ئەکات، لە لایەکی تریشەوە ئاماژە بۆ ئەم سیفەتە مرۆڤانەیە ئەکات . ئەو نموونە میللی‌یەشمان کە ئەڵێت : ( سامان برای دایك و باوکیی رۆحە ) دەربڕینی هەمان حەقیقەتە بە شێوەیەکی تر .

بەڵام خەڵکانێك هەن کە بە دڵ نەك بە کردەوە و بە دەست خستن دەستیان لە دنیا هەڵگرتووە ، کە لەوانە ئەبوبەکر و عوثمان و عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوفن خوا لێیان رازیی بێت . خەڵکانێکی تریش هەن کە لە سەرەتاوە لە ماڵی دنیا هیچیان نەبووە . لە حاڵەتی ئەوانەدا گیان پێش سامان دێت . دیارە ئەگەر نەگەیشتبنە ئەوە کە پەی بە بەدیلی راستەقینەی بەرن .

بەڵێ ! هەروا ئاسان نیە ـ وەك بە زەینـدا دێت ـ ئیمان‌هێنان و ئەنجامدانی هەموو ئەو شتانەی کە ئەو ئیمانە داوایان ئەکات . ژیان بەسەر بردنیش لەگەڵ هەست و شعووری ئەو عادەتانەی کە لە چەندین ساڵی دوور و درێژدا پێك هاتوون و رەنگیان داکوتاوە و ، کە فیترەتیش بۆ ئەو ژیانە زیاد ئەکرێت ، کارێکی یەکجار گرانە لە سەرشانی مرۆڤ سەروماڵی بکاتە قوربانیی . ئەوەتا حەمزەی

[٢٩] البخاري ، المظالم : ٣٣ ، مسلم ، الأيمان : ٢٢٦ ، الترمذي ، الدية : ٢١ .

سەردارمان خوا لێی رازیی بێت ، برای شیریی و مامی پێغەمبەر ﷺ پێش ئاشکراکردنی ئیمانهێنانی ماوەیەك دوودڵ بوو . کەواتە لە بریی رق هەڵگرتنمان لەو کەسانەی کە ناتوانن ئەو تاقیی‌کردنەوە قورسە ، لە بابەتی سەروماڵ بە قوربانیی‌کردندا ، ببڕن ، کە بە راستیی بۆ هەموان تاقیی‌کردنەوەیەکی قورسە ، لەسەرمان پێویستە گرنگی‌یەکی زۆر بەوانە بدەین و ، بە دوعای غەیبیی کۆمەکی‌یان بکەین .

بەڵێ !.. ئەگەر ئیمانهێنان بریتیی بێت لە بڕینی یەکەم کۆسپی شەیتان ، ئەوا دەست هەڵگرتنی مرۆڤ لە قەوم و هۆز و کەس‌وکار و خزمانی و ، کۆچ‌کردن بۆ وڵاتێکی تر بڕینی کۆسپێکی ترە کە لە قورسیی‌دا لە کۆسپی یەکەم کەمتر نیە. دەست هەڵگرتن لە نیشتمان و ناوچە و ، واز نەهێنانیش بەوە ، بەڵکو لە نیشتمانی تازەش‌دا جیهادکردن لە پێناوی خوادا بە بڕینی کۆسپێکی تری قورس ئەژمێررێت ... جا هەرکەس لەمەدا سەرکەوتوو بێت ئەوا لە نەفسی خۆی ترازاوە و بە سەرفرازیی گەیشتووە .

* * *

﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَـٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّـٰتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ ( التوبة : ٧٢ ) .

بەهەشتی ( عەدن ) وەك لەم ئایەتە پیرۆزەوە دەر ئەکەوێت و ، وەك لە چەندین فەرموودەی پێغەمبەریش‌دا ﷺ وەسف کراوە [٣٠] بەهەشتێکە هەندێ نیعمەتی رۆحانیی تێدایە ، بەڵام زۆربەی نیعمەتەکانی جەستەیی و ماددیین .

---

[٣٠] إبن كثير ، تفسير القرآن العظيم : ٢ / ١٥٥ .

بەڵێ ! بەشێك لە خەڵكیی ئارەزووی ماددییان لەلا بەهێزە و ، داواكارییە جەستەییەكانیان بەلاوە زاڵن . جا بۆ ئەو جۆرانە بەهەشتی ( عَدن ) كە هەموو نیعمەتێكی تێدایە ، خەڵاتێكی چاكە . بەڵام هەندێكی تر مەڵەكە رۆحییەكانیان بەلاوە بەهێزە ، لەبەر ئەوە نیعمەتە ماددییەكان وەك خواردن و خواردنەوە و حووری عین ... تد شتێكی ئەوتۆ نیە ، چونكە ئەوان چاو ئەبڕنە تێركردنی رۆح و چێژە مەعنەوەیەكان . جا بۆ ئەوان بەهەشتی ( فیردەوس ) ئامادە كراوە و ، ئایەتی ﴿ وَرِضْوَانٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴾ ( التوبة : ٧٢ ) یش ئاماژە بۆ ئەم حەقیقەتە ئەكات .

لەبەر جیاكردنەوەی بەهەشتی فیردەوس پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەكیا رێنموویی كردووین بۆ ئەوە : ( فَإذا سَألتُمُ اللهَ فَسَلُوهُ الفِردَوسَ ) .[31] ئەفەرموێ: ئەگەر داوای بەهەشتتان لە خوا كرد داوای بەهەشتی فیردەوسی لێ بكەن.

یەكەم و پێش هەموو شتێك : بەهەشتی فیردەوس ، بە بینا قووچەكییەكەیەوە، خاڵی چاودێریی و بینینی مەركەزییە بەسەر هەموو بەهەشتەكانی تردا.

دووهەم : ئیمان بە غەیب لەلای ئوممەتە پێشینەكان فراوان و پێشكەوتوو نەبوو ، لەبەر ئەوە لەو كاروبارانەدا كە بە غەیب و ، بە مانا رووتەكانەوە پەیوەست بوون ئەو ئوممەتانە پێش نەكەوتن و ، ئەم مانایانەشیان لەلا قووڵ نەبوونەوە . بەڵام ئوممەتی موحەممەدیی بە هۆی زیاتر قووڵ بوونەوەیەوە لە چاو ئوممەتە پێشینەكاندا ، لە بابەتی ئیمان بە غەیب و ، لەو كارانەشدا كە پەیوەندییان بەوەوە هەیە بە نیعمەت و لەزەتە رۆحانییەكان نەبێت رۆحی تێر نابێت . لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاریی ئوممەتەكەی ئەكات تا لە دۆعاكانیدا داوای بەهەشتی فیردەوس بكات . واتە ئەتوانین بڵێین بەهەشتی

---

[31] الترمذي ، الجنة : ٤٠

عەدن ئاسۆی نیعمەتەکانی ئوممەتەکانی ترە ، بەڵام بەهەشتی فیردەوس بەهەشتی ئوممەتی موحەممەدە ﷺ .

بێگومان هەرکەسێك بچێتە بەهەشتەوە ڕەزامەندیی خوای دەستگیر ئەبێت ، بەڵام گەورەترین ڕەزامەندیی ـ کە بە بڵندترین و مەزنترین نیعمەتی بەهەشت ئەژمێررێت ـ ئاسۆیەکی تری فراوانیی و گشتگیریی و دەوڵەمەندییە کە هەرکەس دەستگیری ببێ موحتاجی هیچ شتێك نابێت .. ئەمەش تەنها بۆ ئوممەتی خاوەنی مەقامی ( سوپاس کراو ـ مەحموود ) و خاوەنی ( سوپاس ـ حەمد ) دەست ئەدات . بەرەو پێش چوونی پێغەمبەر ﷺ ، کە هەڵگری ئاڵای سوپاس و ستایشە ، بۆ خزمەت زاتی مەزن و ، گەیشتنی بە مەقامی مەحموود ، کە هەرچیی تێدا ئەبیسترێت سوپاس و ستایشە و ، هاوئاواز و گونجاوە لەگەڵ شەرافەتی ئوممەتە موستەحەققەکەی بۆ فیردەوس و ڕێزلێنانی بە گەورەترین ڕەزامەندیی .

ألّلهم عفوك وعافيتك ورضاك ، أللهم وفقني إلى ما تحب وترضى .

* * *



﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ ﴾
( التوبة : ١١١ ) .

مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە کە خوا داوای بەخشینی سەروماڵی تیاچووی ئیمان داران ئەکات بەرامبەر بە سەروماڵێکی هەمیشە ماوە و تیانەچوو !.. داوای سەروماڵیان لێ ئەکات تا لە بەرامبەریانا و لە قیامەتدا بەهەشتیان بداتێ . بەڵام هەروەك تێبینیی ئەکەین لەم ئایەتەدا سەر پێش ماڵ کەوتووە ، چونکە لە قیامەتدا سەر زیاتر گرنگە و ، دوای ئەویش ئەو سامان و ماڵە دێت کە لە

پێناوی خوادا خەرج کراوە و ، ئەو خەرجکردنەش بەها و نرخی زیاتر کردووە. واتە ئەگەر من نەچمە بەهەشت و نەتوانم بچمە ناویەوە ، ئەو ماڵ و سامانەی کە زینەتێکی سادەی زینەتەکانی بەهەشتە چ مانایەکی هەیە ؟ لەبەر ئەمە دەربڕینی ئەم حەقیقەتە لێرەدا بە پێش خستنی ( سەر ) ئەبێت بەسەر ( ماڵ ) دا، بە پێچەوانەی ئەو ئایەتانەی کە لە شوێنەکانی تردا هاتوون ..

راستییەکەی هەموو ئەو شتانەی کەوا دەر ئەکەوێت موڵکی کاتیی مرۆڤن لە راستییدا موڵکی خوای باڵادەستن . لە کاتی یەکەم بوونی مرۆڤەوە ، هەروەها هەموو ئەو هۆکارە پێویستانەی کە بۆ بەردەوام بوونی ئەو بوونە خەڵاتی مرۆڤ کران ، میهرەبانییەکی دڵدانەوە و چاکەکارییە . هەروەها دەرخستنی ئەو هەموو میهرەبانیی و پێشکەشییانە کە هەروەك موڵك بن بەلای خاوەنی سپاردەوە و ، دەسەڵاتی یاسایی و مافیی دیاریکراوی پێ ئەدات تا کەڵکیان لێ وەربگرێت ، ئەوەش چاکەکاریی دووهەمە . بەڵام کڕینی ماڵ و موڵکی ئەو مرۆڤە لەلایەن خواوە ، هەروەك ماڵ و موڵکی تایبەتیی بێت لە دەستی خاوەنی سپاردەدا ، بۆ ئەوەی لە بریی ئەو ماڵ و موڵکە تیاچوو و فانییە هەزار ئەوەندەی پێشکەش بکات ، ئەوە بەخشندەییەکە لە سەرووی هەموو چاکە کارییەکەوە .. ئەوە بەخشندەییەکی وەها گەورەیە کە ئەگەر ئێمە وامان دانا بوونی نەبێت ، ئەوا خاوەنانی سپاردە یا ئەوەتا ئەو سپاردەیەی ، کە وا لە دەستیاندا ، بە ئاراستەی هەوا و ئارەزووەکانیان بەکار ئەهێنن ، بەمە لەگەڵ خاوەنی راستەقینەی ئەو ماڵەدا ناپاکیی ئەکەن ، یان هەر کە کاتی بەفەناچوون هاتە بەرەوە ، ئەو سپاردانە تیا ئەچن و بەفەنا ئەچن ، بەمەش ئەوانە چاکترین بازرگانیی و گەورەترین و بەبەرەکەت ترین قازانجیان لە دەست دەرئەچێت.

بەڵێ ، کاتێك کە ئەم بەڵێننامەیە ، کە بە میهرەبانیی و سەخاوەت ناسراوە، سەر ئەگرێت زێندەوەرە فانییەکان شوێنەکانی خۆیان چۆڵ ئەکەن تا بە بوونی ئەبەدیی بگەن و ، کەلوپەلی فانیی دنیاییش تیائەچێت تا نیعمەتە

هەمیشەیی‌یەکان لە خانەی نەمریی‌دا جێی بگرنەوە ... دنیای کەم تەمەن نەکرێت بەژێر گڵەوە ، تا لە جیهانی هەتاهەتایی‌دا گوڵی بەهەشتە نەمرەکان سەر دەربێنن ... نەفس بە شێوەیەکی هاوسەنگ دەست لە حەز و لەزەتەکانی هەڵ نەگرێت ، تا لە بەرامبەر ئەوەدا بە رەزامەندیی خوای باڵادەست بگات . جا لە کاتی ئەنجامدانی ئەم ئاڵ و گۆڕەدا ، کە لە چوارچێوەی ویستی ئازادی مرۆڤانەدا جێبەجێ ئەکرێت ، لە شێوەی کڕین و فرۆشتن ، یان وەرگرتن و لێسەندنی زۆرکاریی‌دا پیشان ئەدرێت .

وێنەی ئەم پەیمانە کە لە ئەزەلەوە درێژ بۆتەوە پەیمانێکی نادەمی‌یانەی بوونەوەریی قووڵە تا ئەو رادەیە کە لە تەورات و لە ئینجیل و لە قورئان‌دا باسی هاتووە و ، لەم کتێبانەدا دووبارە بۆتەوە و ، جەختیشی لەسەر کراوەتەوە ئەگەرچیی لە شێوازی جیاجیاش‌دا بێت .



﴿ وَلَوۡ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسۡتِعۡجَالَهُم بِٱلۡخَيۡرِ لَقُضِيَ إِلَيۡهِمۡ أَجَلُهُمۡۖ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾ ( یونس : ١١ ) .

یەکێك لە میهرەبانی‌یەکانی خوای بالادەست لە گەڵماندا ئەوەیە بە خێرایی دوعای شەڕمان لیّ گیرا ناکات ، هەرچەندە زمانمان هەمیشە بە دوعای شەڕ لە دژی خۆمان و لە دژی غەیری خۆمان راهاتووە ، وەك : (( خوا بی‌کوژێت )) یان (( خوا تووشی بەلای بکات )) . بەلام خوای بالادەست ، کە پەروەردگاری بەخشندە و چاوپۆشیی‌کەرە ، وەك ئێمە لە گیراکردنی ئەم جۆرە دوعایانەدا پەلە ناکات . خۆ ئەگەر بۆ گیراکردنی هەموو دوعایەك پەلەی بکردایە ، ئەوا بە ساتێك هەمووان تیا ئەچوون . بەلام ماوە و کاتی دیاریی‌کراو هەن کە دوعایان تێدا گیرا ئەبێت ، کە ئەگونجیّ خوای گەورە بفەرموێت : ( لەم سەعاتەدا هەموو دوعایەك گیرا ئەکەم ) . واتە : ئەو سەعاتە سەعاتی گیرابوونی هەر دۆعایەکە کە لەو کاتەدا بەندە پێی بپاڕێتەوە .

ئەمەش بە تەنیا دۆعای ( قَولي ) ناگرێتەوە ، بەڵکو هەندیّ جار دۆعای ( فِعلي ) ش ئەگرێتەوە .[٣٢] واتە کار و کردەوە ئەنجامدراوەکانیش لەو سەعاتەی گیرابووندا ئەچنە چوارچێوەی دوعاوە . لەبەر ئەمە پێویستە بەردەوام ئاگاداری ئەمە بین . پێغەمبەریش ﷺ بەردەوام ئاگادار و وریامان ئەکاتەوە کە ئەفەرموێت

[٣٢] دوعای فیعلیی بریتی‌یە لە گوێڕایەڵیی بەندە بۆ ئەو یاسا و سوننەتە خوایی‌یانەی کە لە کۆمەڵگا و لە بوونەوەردا پەیڕەو ئەکرێن . بۆ نموونە هەر کەسێك تۆو بچێنێت درەوی دەغڵ ودان ئەکات . ( وەرگێڕی عەرەبیی ) .

: ( لا تَدْعُوا عَلى أنفُسِكَم ولا تدعوا عَلى أولادِكُم ، ولا تدعوا على أمـوالِكُم لا توافِقُوا مِنَ اللهِ ساعةً يسألُ فيها عطاء فيستجيب لكم ).[33] ئەفـەرموێت : دۆعـا لە خۆتان و ماڵ و منداڵتان مەکەن نەوەکو بەر ئەو سـەعاتە بکـەوێت کـە دۆعـای تێدا گیرایە . لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە نەیارانی پێغەمبەران و نـەیارانی خەلیفـە و جێنشینانیان بۆ تەحەددا و ئینکاریی پێیان ئەوتن:

﴿ وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ ( الأنفـال : ٣٢ ) .[34] یـان هاووێنـەی دەسـتەواژەی ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾ ( یـونس : ٤٨ ، الأنبياء : ٣٨ ، النمل : ٧١ ) [35] یان دووپارە ئەکردەوە .

لەوانەیە هەندێکیان لە ساتێك لە ساتەکانی تەنگانە و تووڕەبوون و ، لە دوای تەواوبوونی ئارام و دان بەخۆداگرتن دۆعا لە دوژمنە دەستدرێژیی‌کەر و زاڵمەکان بکەن ، کەچیی خوای گەورە لەکاتی گونجاودا تۆڵە لەو دەستدرێژیی‌کەر و زاڵمانە بکاتەوە . لەبەر ئەمە لەسەر ئیمانداران پێویستە ، لەبـەردەم بـەڵا و موسـیبەتی کاتییدا ، ئارام بگرن و دان بـە خۆیـاندا بگـرن . کـاتێکیش کـە دۆعـا ئەکـەن ، پێویستە دوعـای هەڵگرتنی بەڵا بکەن و ، کاری سزادانی دوژمنانی دیـن و ئیمـان بە خوای ( علام الغيوب ) بسپێرن و ، لـە تۆڵەسـەندن و سزادانی ئەوانـەدا پەلـە نەکەن و ئارامیان لێ نەبڕێت . چونکە خوای باڵادەست ئەگەر بی‌ویستایە زوو بـە زوو تۆڵەی لێ ئەسەندن ، یان بە پێی گەورەیی و قەبارەی تاوانەکە دوای ئەخست،

---

[33] مسلم ، الزهد : ٧٤ ، الدارمي ، الوتر : ٢٧ .

[34] داوایان لە خوا ئەکرد کە ئەگـەر ئەمـە دینـی ئـەوە بـا لـە ئاسمانـەوە بـەردیان بەسـەردا بباریێنێ ، یـان سزایەکی سەختیان بۆ بنێرێت .

[35] رەخنەیان لە پێغەمبەران ئەگرت کاتێك کە هەڕەشەیان لێ ئەکردن کە ئەگەر ئیمان نەهێنن خوا سزایان بۆ ئەنێرێت و ، ئەیان پرسیی : کەی سزای خوایان بۆ دێت ئەگەر راست ئەکەن ؟

یان سزا پڕ ژانەکەی هەڵ نەگرت بۆ ڕۆژی قیامەت ، یان ڕێی هیدایەتی بۆ ئاسان نەکردن و ، هیدایەتیان وەر نەگرت و نەبوونە برا .

لەبەر ئەمە لەسەر ئیماندار پێویستە دۆعای شەڕ لە هیچ کەس نەکات ، بەڵکو کەسێکی پێش بینیی‌کەر بێت و ، بە ڕێز و ویقارەوە لە بەردەم حوکم و بڕیاری خوادا بوەستێت ، تا مەنەکەی پڕ ببێت و ، چیی تر ماوەی ئارام‌گرتن نەمێنێت . لەسەر ئیماندار پێویستە بەردەوام بەم دۆعایە بپاڕێتەوە :

ئەی جێبەجێ‌کەری پێویستی‌یەکان ! ئەی هەڵگری بەڵاکان ! پێویستی یەکانمان بۆ جێبەجێ بکە و ، بەڵاکانیشمان لەسەر هەڵ گرە .

ئەمە بڵێت و ، دادی حاڵی خۆی و بێ‌توانایی بۆ بەرگەگرتنی زیاتر لە بەردەم پەروەردگار و گەورەی خۆیدا بکات .



﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا وَٱجْعَلُوا۟ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ( یونس : ٨٧ ) .

لە ئایەتی : ﴿ وَٱجْعَلُوا۟ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً ﴾دا ئەتوانین ئەمە تێ بگەین :

ماڵەکان ڕوویان لە قیبلە بێت ، واتە ڕوو لە باشوور بکەن ، بەمە کێشەی تیشك و گەرمای خۆریش چارەسەر ئەکرێت .

ماڵەکان وەهایان لێ بکرێت بۆ ئەنجامدانی کاری مزگەوت تیایانا گونجاو بن. لە لایەکەوە جەخت لەسەر :

﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ ﴾ ( النور : ٣٦ ) کرایەوە و ، لەلایەکی تریشەوە ئاماژە بۆ کۆمەڵە ماڵێك کرا کە ئەرك و فەرمانبەریی گرنگ ئەنجام ئەدەن .

ئەگەر باسی دەرچوونی فەرمان بکەین بەوەی کە هەموو ماڵێك بکرێتە قیبلە و مزگەوت ، ئەوە تێ ئەگەین کە پێویستە هەموو مرۆڤێك ئەو ماڵەی تیایا ئەژیت بکاتە پەرستگا و ، خۆیشی بکاتە خواپەرستێکی هەمیشەیی تیایا و ، ماڵەکەی بە خواپەرستیی برازێنێتەوە و ، نەیکاتە قەبرێکی خاڵیی لە ژیان ..

راستە وا دەرئەکەوێت کە ئایەتەکە ئامۆژگارییەکی تایبەتیی بێت بۆ مووسا و هاروونی برای سەلامیان لێ بێت ، بەڵام دوای ئەوە ئایەتەکە ئامۆژگارییەکی گشتییان ئەکات : ﴿ وَٱجْعَلُوا۟ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ ( یونس : ٨٧ ) .

واتە : ئەگەر بارودۆخ و هەل و مەرجەکان گونجاو نەبوون و ماوەی خواپەرستیی بە ئاشکرا نەبوو ، ئەوا ماڵەکانتان بکەنە پەرستگای نهێنیی ، یان لەسەرتان پێویستە ، بۆ ذیکری خوای باڵادەست ، لە هەموو حاڵەتێکدا پەرستگا دروست بکەن.



﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ۖ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴾ (یونس : ٨٨ ) .

هەندێك لە تەفسیرنووسان ئایەتی ﴿ لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ﴾ یان بەم جۆرە تەفسیر کردووە :

پەروەردگارم ! ئایا زینەت و سامان و ماڵت بە فیرعەون و دار و دەستەکەی بەخشیوە بۆ ئەوەی خەڵك لەسەر ڕێی تۆ گومڕا بکەن ؟ بەڵام ئەم مانایە تەواو نیە.

پیتی لام لە ﴿ لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَ ﴾ لامی ( العاقبة ) یە و ، مووساش سەلامی لێ بێت لە هەموو کەس چاکتر ئەزانێت کە خوای باڵادەست بۆ مەبەستێکی ( سوبحانیی ) ئەو هەمووە ماڵ و سامانەی پێ داون و ، ئەو سەرەنجامەش کە بەخشینی ئەو ماڵ و سامانە پێی ئەگات سەرەنجامێکی دیارە . بۆیە مووسا سەلامی لێ بێت پرسیار ئەکات : ئایا ئەم ماڵ و سامانەیان بۆ ئەوە پێ دراوە تا خەڵکیی لەسەر ڕێی تۆ گومڕا بکەن ؟ ڕاستە خوای گەورە کوفر و گومڕایی و یاخیی‌بوونی پێ خۆش نین و چارەشی ناوێن ، ئەگەر وا دابنێین پێچەوانەکەی ڕاست بێت ، ئەوا ماناکەی وا دەرئەچێت کە کاتێك ئەوانە ئەو تاوانانە ئەنجام ئەدەن گوێڕایەڵی‌یان بۆ خوا کردووە ، بەڵکو وا دەر ئەکەوێت کە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران سەلامیان لێ بێت لە پێناوی ئەو مەبەستەدا بووە. بەڵام کارەکە هەرگیز وەها نیە ، چونکە ئایەتی زۆر لە قورئانی پیرۆزدا هەن کە لامی ( العاقبة ) یان تیایە ، وەك : ﴿فَٱلۡتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرۡعَوۡنَ لِيَكُونَ لَهُمۡ عَدُوّٗا وَحَزَنًاۗ﴾ ( القصص : ٨ ) .

جا ئەگەر ئایەتەکان بەو شێوە تێ ئەگەین ئەوا مانای ئایەتەکەی سەرەوە ئەوە ئەگەیەنێت کە فیرعەون بۆیە مووسای سەلامی لێ بێت گرتۆتەوە تا ببێتە دوژمنیان و خەم و خەفەتیان بۆ بسازێنێ . ئەمەش تەفسیرێکی وەرنەگیراوە .

دووهەم : لە بەر ئەوەی کە قەدەر بەستراوە بە هۆکاریش و سەرەنجامیشەوە ، لێرەدا تەنها ئاماژە بۆ ئەو سەرنجامە کراوە کە بەستراوە بە ئیرادەی خواوە ، بێ ئەوەی لێرەدا حەز و ئیرادەیان بەرچاو بگیرێن . لە کاتێکدا کە بنچینەی مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەوان لە ئیرادە ڕێژەیی‌یە دەست کەوتەکەیان ئاراستە کرد

و، ماڵ و منداڵەکانیشیان کردە هۆی گومڕایی و فەساد و کوفر . واتە ئەو ماڵ و سامانەی کە هەیان بوو بووە هۆ بۆ عاقیبەت شەڕییان . بەڵام ئەش‌توانرا ئیرادەی مرۆڤیش بەشی خۆی پێی بدرێت . واتە ئەوانە لە بریی داواکردنی هیدایەت داوای گومڕایی‌یان ، بە وتەیش و بە کردەوەیش ، کرد . ئیتر ئەوە بوو خوای باڵادەست ئەوەی بەدیی هێنا کە ئەوان ئەیان‌ویست و داوایان ئەکرد . یان ماڵ و منداڵ ئەگونجێ ببنە دوو ڕێگا یا بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ . بەڵام ئەوانە بیریان لە ئیحتمالی یەکەم نەکردەوە ( واتە ئیحتیمالی بەهەشت ) ، بۆیە نیعمەتەکە بووە نیقمەت واتە تۆڵە و پێ‌تواندن . کاتێکیش کە کەسێکی هەژاری وەك مووسا سەلامی لێ بێت لەبەردەم فیرعەونی خاوەن ماڵ و سامان و شوێن کەوتوودا ئەوەستێت و ، هەموو هۆکارەکانی ( کِبر ) و ( غروور ) و جەور و ستەم و لادان کاری خۆیان ئەکەن ، سەرەنجامەکەی دیارە و ، تاکە ڕێگای بەردەمیشیان ڕێی گومڕایی ئەبێت . مووسا پێغەمبەریش سەلامی لێ بێت ئەوە چاك ئەزانێت ، لەبەر ئەوە سەرەنجامە حەتمی‌یەکەی بوونی ماڵ و منداڵ و ، ئەو عاقیبەتەی کە لە دەستی قوتاربوون نیە ئەزانێت ، ئەگەر ڕەحمەت و ڕەحمانیەتی خوا فریای مرۆڤ نەکەون . بەڵام تیاچوون و لەناودانی ماڵ و سامان : ئەگونجێت هەموو ئەو ماڵ و سامانەی کە بوویانە تیاچووبێت ، یان خوای باڵادەست سامان و زینەتی دنیای پێ بەخشیی بن ، بەڵام ئیمکانیەتی کەڵك لێ وەرگرتنی پێ نەدابن . وا دابنێین دەوڵەمەندێك تووشی نەخۆشیی شەکرە بوو بێت ئیتر ئەو کەسە ناتوانێت هەرچیی حەز لێ ئەکات بخوا و بخواتەوە . جا لەم جۆرە حاڵەتانەدا بوون و نەبوونی نیعمەت وەك یەکە . بەم مانایە تیاچوونی سامانەکان تیاچوونی ڕاستەقینە نیە ، بەڵکو تیاچوونی مەجازی‌یە .



﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾ ( يونس : ٩٠ ) .

له هەندێ فەرمووده‌دا هاتووه كه مرۆڤ پێش مردنی حەقیقەتی به روون و گەشاوەیی بۆ دەر ئەكەوێت . واته ئەتوانین بڵێین هیچ كەسێك ناگاته ئەو دنیا بەبێ ئیمانهێنان ، بەڵام ئیمانهێنان دوای قۆناغێكی دیاریی‌كراو كەڵكی نیه . بەم شێوەیه ئیمانهێنانی فیرعەونیش لەم جۆره بوو و دوای بەسەرچوونی كات ئیمانی هێنا . بەڵێ !... فیرعەون وتی : ( ئیمانم هێنا ) . بەڵام ئەمەی كاتێك وت كه هیچ كەڵكێكی ( عملي ) تێدا نەبوو . لەبەر ئەوه ئەبینین دوای ئەوه ئایەتەكه پرسیار ئەكات : ﴿ آلآن ؟ ﴾ ، كه ئەمه كورت ترین دەربڕینه بۆ روون كردنەوەی ئەم كاره . واته : ئێستا ئیمانت هێنا ؟ ئایا ئەمه ئێستا به مێشكتدا هات ، كەچیی پێشتر یاخیی بوویت ؟ له پرسیاری ( آلآن ؟ ) ئەمه تێ ئەگەین كه فیرعەون هەتا ساتێك پێش ئەم وتنەی یاخیی بووه ... كاتێك كه ئەسپەكەت و سوپاكەت ئاماده كردن بۆ دواكەوتنی مووسا سەلامی لێ بێت یاخیی بوویت . خۆ ئەگەر ئەو كاته بت‌وتایه وا ئیمانم هێنا و بگەڕایتەوه و سوپاكەتت بگێڕایەتە دواوه ، ئەوا وەك بەندەیەكی پیاوچاك هەلی ژیانت ئەبوو . بەڵام كار له كار ترازا.

كورتەكەی هەر بەندەیەك رووی له خوا كردبێ و ئیمانی هێنابێت خوای بالآدەست ئیمانی ئەوی نەداوەته دواوه ، بەڵكو وەری گرتووه . تەنها ئەوەنده هەیه كاتی تەوبەكردن بەسەر چووه و تەواو بووه . ئەمەش سالم ترین رێگای هەڵ سەنگاندن و تێ‌گەیشتنی ئایەتەكەیه .

ئایا لەو كاتەدا كه فیرعەون خەریك بوو ئەخنكا به زمانی وتی ئیمانم هێنا ؟ یان ئەو ساته ئەوه به دڵیدا هات ؟ به پێی عەقیدەی ئەهلی سوننه و جەماعەت

بەدڵداهاتنی خورپەی تەوبە بە شێوەیەکی راست و لە کاتی راستدا بە ( تَلَفُّظ ) ئەژمێررێ ، بگرە ( تَلَفُّظ ) بە ( ظرف ) ێك ئەژمێررێ بۆ ئەو مانایەی کە لە ناو دڵی مرۆڤ دایە . بەڵام فیرعەون بە پێی ئایەتێکی تر ئەو هەلەی لە دەست دەرچوو بوو : ﴿ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَـٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا﴾ ( غافر : ٨٥ ) .

یان بۆیە ئەوەی وتووە تا لەو هەڵوێستە سەختە خۆی دەرباز بکات . لەبەر ئەوە خوای گەورە جەستەکەی لە نوقم بوون رزگار کرد تا ببێتە پەند بۆ هەمووان. جگە لەمە ، کە فیرعەون لەو ساتە سەخت و سامناکەدا بوو پەنای بۆ خوای بالآدەست و زاتی مەزن نەبرد کە لەلایەن مووسا و هاروونەوە سەلامیان لێ بێت بۆی وەسف کرا بوو . بەڵکو بە دەربڕینێکی ناتەواو وتی وا ئیمانم بەو خوایە هێنا کە بەنی ئیسرائیل ئیمانیان پێ هێنا . واتە رووی لە تێگەیشتنێك نا کە هێشتا لە پەی پێ بردن و تێگەیشتنی بەنی ئیسرائیلدا تەماوییە ، بەمە بەو هەڵەیەی ئاراستەی تەوبەکەی لا پێ دا .

ئەگەر سەیری مێژوویش بکەین ئەبینین کە فیرعەون دەهریی بووە و، ئەشگونجێ بڵێین بۆچوونی ماددیی بووە و ، ئیمان هێنانی گورج و ناخلۆفییش بەلای ئەو جۆرانەوە قورس ئەبێت . ئەوەش بزانین کە مەرجی ئیمانی راستەقینە ئەگەر بریتیی بێت لە ئیمان هێنان بە پێغەمبەرایەتیی مووسا سەلامی لێ بێت شان بە شانی ئیمان هێنان بەو خوا تاك و تەنیایە کە شەریکی نیە ، ئەوا ئیمان هێنانی فیرعەون لەو ساتە ناهەموارەدا ئیمانێکی کامڵی پاڵفتە نەبووە ، بەڵکو کە ئەیوت وا ئیمانم هێنا کوفری ئەنجام ئەدا ..



﴿ فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴾ ( يونس : ٩٨ ) .

لادانی سزا لە قەومی یوونس پێغەمبەر سەلامی لێ بێت :

١ ـ لەوانەیە موعامەلەیەکی تایبەت بێت لەلایەن خواوە بەرامبەر بەو قەومە کە نە لەوەو پێش و نە لەوەو دوا خوای گەورە موعامەلەی وەهای لەگەڵ هیچ قەومێکدا نەکردووە .

٢ ـ لەوانەیە نیشانەکانی هاتن و روودانی بەڵاکان بە دەرکەوتنی هۆکارەکانیان روو بدەن ، بەڵام ئەنجامدانی کردەوەیەکی خێر و چاکە لەو کاتەدا ئەبێتە هۆیەك و کارێکی وەها کە غەزەب و سزای خوا هەڵ بگرێت . قەومەکەی یوونسیش کە نیشانەکانی سزایان دیت ، بە خۆیاندا هاتنەوە و ، روویان کردە خوا و ، تەوبە و پەشیمانیی خۆیانیان بۆ لای خوا راگەیاند . لە ریوایەتێکی لاوازیشدا دەست ئەکەن بە وتن و دووبارە کردنەوەی : ( سبحانك لا إلـه إلا أنت إنا كنا من الظالمين) . بە پێی روون کردنەوەی خاوەن تەقوایەکیش ـ بە رێگەی کەشف نەك بە رێگەی ریوایەت ـ تەسبیح و تەحمید و تەکبیر و حەوقەلەیان بریتیی بووە لە : (سبحانَ اللهِ ، والحمدُ للهِ ، ولا إلـه إلا الله ، والله أكبر ، ولا حول ولا قوة إلا بالله)، ئیتر خوای باڵادەست سزا و ئازاری لەسەر لادان و، تا ماوەیەك خۆش گوزەرانیی پێ بەخشین و ، جۆرە ژیانێکیشی پێ بەخشین کە بەشی خۆ ئامادە کردنیشی تیدا بێت بۆ قیامەت .

٣ ـ بە پێی عادەتی ( سوبحانیی ) خوا ، هەر قەومێك کە سزایان لە چارە نووسرا بێت خوای باڵادەست فەرمانی بەسەر پێغەمبەری ئەو قەومەدا داوە تا شارەکەی بەجێ بهێڵێ . بەڵام یوونس پێغەمبەر سەلامی لێ بێت ، بەر لەوەی فەرمانی بەجێ هێشتنی شارەکەی بۆ بێت ، بە ئیجتیهادی تایبەتیی خۆی بە جێی هێشت . لەبەر ئەمە هەروەك ئەو گلەیییە کە لە خوای باڵادەستەوە

ئاراستەی ئەو پێغەمبەرە بەرێزە کرا بە شێوەیەکی لەبار و گونجاو بە مەقامی پێغەمبەرایەتیی ئەو ، بە تەواویی هۆیەکی شارراوەش بوو بۆ لابردنی سزا لەسەر قەومەکەی ، هەروەك دژە هەورە بروسکە مەترسیی هەورە بروسکە هەڵ ئەمژێت، پاشان ئەو رووداوانەی کە بەرەنگاری بوون و هەمووان بە درێژە لێیان شارەزان یەك لە دوای یەك روویان دا ..

وشەی ( هَلاّ ) ش کە لە قورئاندا هاتووە هاومانای وشەی ( فَلَولاَ ) یە کە بە مانای ( یا لیت : خۆزگە ) دێت و ، کورتەی مانای ئایەتەکەش بەم شێوە ئەبێت:

(( خۆزگە لەناو ئەو شارانەدا کە لەناومان بردن شارێك بوایە کە پێش دیتنی سزا و ئازار ئیمانیان بهێنایە و ئیمان هێنانەکەش بەکەڵکیان بهاتبایە )) .

هەروەها مانایەکی پێچراوەشی تێدایە بۆ دڵ گەرم بوون بۆ تەوبە و گەڕانەوە بۆ لای خوا و پەنابردنە بەر رەحمەتی بەر لە رووداني سزا و ئازار ، یان لەو کاتەدا کە نیشانەکانی رووداني سزا و ئازار یان سەرهەڵدانی بەلاّ و موسیبەت دەر ئەکەون.

بوونی ئەو قەومە لە نزیك شاری مووسڵ و لە شاری نەینەوا ، گرنگ نیە و، کرۆکی حەقیقەتەکە و سەرەنجامەکەی ئاڵوگۆڕ پێ ناکات . ئەوەی لێرەدا گرنگ بێت بریتیە لە هەڵسەنگاندنی راست بۆ ( تقدیر ) ە خوایی و پێغەمبەرییەکان و ، تەفسیرکردنی ئەو ناونیشان و ئاماژانەی کە ( تأویل الأحادیث ) رێیان رۆشن ئەکاتەوە و ، ژیان بە وریایی و ، بە ئاگابوون لە دژی هەموو ئەو مەترسییانەی کە ئیحتیمالی رووداننیان هەیە و ، رووکردنە خوا لە هەموو بارودۆخێکدا.

رَبّنا أرِنا الحَقَّ حَقّاً وارزُقنا إتّباعَهُ ، وَأرِنا الباطِلَ باطِلاً وارزُقنا إجتِنابَه .

﴿ فَلَمَّا رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ نَكِرَهُمۡ وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۚ قَالُواْ لَا تَخَفۡ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمِ لُوطٖ ۝ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴾ ( هود : ٧٠ ـ ٧١ )

به پێی باو و عورفی ئەو کاتە ئەگەر میوان دەستی بۆ ئەو نان و خواردنە درێژ نەکردایە کە لەلایەن خاوەن ماڵەوە بۆی دانرا بوو ، ئەوە نیشانەی ئاگادار کردن بوو لەسەر نیەت خراپیی ئەو میوانە و نیەت خراپیی لەو سەردانەدا . لە راستییشدا ئەو نامەیەی کە میوانەکان هێنابوویان سەیر و سەمەرە بوو ، بە تایبەت بۆ پێغەمبەرێکی خۆگر و روو لە خوای وەك ئیبراهیم سەلامی لیٚ بیٚ . راستە میوانەکان مەلائیکەت بوون و خواردن و خواردنەوەش لە سروشتی ئەوان نیە ، بۆیە ئەیان‌بینین بە شێوازە مەلائیکەتی‌یەکەی خۆیان و بە پێشکەش کردنی هۆیەکانی سەردانەکەیان بە شێوەیەکی لەسەرخۆ و گونجاو لەگەڵ ئەو بەیەك گەیشتنەی کە بە سەلام کردن لە هەردوو لاوە دەستی پیٚ کرد پەستانی ئەو کارە ناخۆشیە سووك ئەکەن . چەند ساتێك ئیبراهیم سەلامی لیٚ بیٚ لە ترسی ئەو ئاماژە و پەنجە بۆ کێشانانە ژیا کە ئاراستەی کران و سەرنجی دان ، ئەمەش ئەنجامی فەراسەتی پێغەمبەراتیی و تەئویل کردنی فەرمووده بوو . بە پێی ئاسۆکانی ئەو زانستەی کە هەی‌بوو هەستی کرد کە چەندین رووداوی سەیر و سەمەرە روو ئەدەن ، لەبەر ئەوە ترسێکی دوور لە تۆقین بە هەموو ئەندامەکانی‌دا هات . ئەوەبوو دوای چەند ساتێك لە سەرسوورمانی ئەو خورپەیە رزگاری بوو و ، ژیربێژیی پێغەمبەرایەتیی جێی هەستە هەڵچووەکانی گرتەوە و، جووتە سیفەتی لەسەرخۆیی و ئاشتییش بە لای ئەوەوە بە وتە و بە وتار دەستیان دایە خۆ دەربڕین ، بەڵام دوای ئەوەی کە ، وەك لە سەرەوە باسمان کرد ، لەگەڵ ساتەکانی سەرەتادا ژیا .

بەلام دەربارەی سارەی هاوسەری سەلامی لێ بێ کە بە پیرە وەستا بوو ئەتوانین ئەمە باس بکەین :

سارەخان بە پیرە وەستا بوو چونکە ئەیویست خزمەتی میوانەکان بکات . هەتا ئەگەر وەهاش دابنێین کە خزمەتکاری بوو بێت ، ئەوا پێی خۆش بووە ، لەبەر بە گەورەگرتن و رێزلێگرتنی میوانەکان ، خۆی خزمەتیان بکات .

یان رەفتاری سەیری میوانەکان وەهای لێ کردووە کە هەم ترسا بێت و هەم شڵەژا بێت . ئیتر بە پیرە ئەوەستێت و چاوەڕوان ئەبێت و ، ترس و شڵەژانەکەشی هەتا کاتی مژدە پێدانی میوانەکانی بەردەوام ئەبێت ، یان تا کاتی هەست کردنی بەو ئاڵوگۆڕەی کە بەسەر خۆی و بەسەر لاشەیدا هات .

یان هەر بە دیتنی مەلائیکەتەکان ، بە موعجیزەیەك لە لایەن خواوە سکی پڕ بووە ، بە وێنەی مەریەم سەلامی لێ بێ کە بە دیتنی مەلائیکەتەکە لەبەردەمیدا سکی پڕ بوو . جا کە سارە لە خۆیدا هەستی بەوە کرد شڵەژانەکەی گۆڕا بە پێکەنینی سەرسامیی و شادمانیی .

ئیحتیمالی بەهێزیش ئەوەیە کە سارە سەلامی لێ بێ دەستی لە خۆی شتبێ، واتە لە سکوزا نیشتبێتەوە ، لەبەر ئەوەی کە تەمەنی زۆر بووە بە پێی هۆکارەکانیش نە ئەگونجا ئافرەتێك لە حەیزی شەرعیی نیشتبێتەوە سکی پڕ ببێ، لەبەر ئەوە لەوانەیە لەو کاتەدا کەوتبێتە حەیزەوە . ئافرەتیش ئەگەر بە پیرە بێت و وەستا بێت زۆر جار هەست بەوە ئەکات ، لەبەر ئەوە کاتێك کە سارە سەلامی لێ بێ هەستی بەوە کرد و ، کاتێکیش مەلائیکەتەکە مژدەی ئیسحاق و یەعقووبی پێ دا دەستی بە پێکەنین کرد ، چونکە نیشانەکانی مژدەدان هاتنە دیی . لە زمانی عەرەبییشدا رستەی (( ضحكت المرأة )) بە مانای (( حاضت المرأة )) دێت ، واتە حەیزی ئافرەت پێکەنینیشی پێ ئەوترێ . ئەمەش ئەم تێبینییە و ئەم ئیحتیمالە بەهێز ئەکات و خوای گەورە چاکتر ئەزانێ ..



﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴾

( یوسف : ٢٠ ) .

(( زوهد )) بە مانای نەویستن و ، داوا نەکردن و ، بایەخ پـێ نـەدان و ، واز لێ هێنان و ، فڕێدان دێت . جا هەروەك هەموان ئەیزانن (( زاهیـد )) ئـەو کەسـەیە کە پشت لە دنیـا هـەڵ ئـەکات و روو لـە قیامـەت ئـەنێت . لەبـەر ئـەوە مانـای ئایـەتی ﴿ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴾ ئـەوە ئەگەیـەنێ کـە ئـەوان نـەیان ئەویست و دەستیان لێ هەڵ گرتبوو .

بـەڵام ئـەی کـێ یووسـفی سـەلامی لێ بـێ بـە نرخێکـی هـەرزان ، بـە چـەند دیرهەمێك فرۆشـت ؟ ئایـا براکـانی فرۆشـتیان ، یـان کـاروان چـی‌یەکان ؟ لەبـەر ئەوەی ئایەتەکە دیاریی نەکردووە ، ئەوا هەردوو ئیحتیمالەکە ئـەگونجێن . لەبـەر ئەوە ئەبینین دەربارەی ئـەم باسـە تەفسـیرزانەکان جیـاوازیی لـە بۆچـوونەکانیان‌دا هەیە.

جا ئەگەر براکانی فرۆشـتبێتیان ، ئـەوا لەبـەر ئـەوەبووە کـە نـەیان‌زانیـوە لـە دوارۆژدا ئەبێتە کەسێکی گرنگ ، یان ئەبێتە پێغەمبەرێکی بەرێز ، لەبەر ئـەوە ویستوویانە بە زووترین کات لێی رزگار بن ، ئەوەبوو فرۆشتیان ، بە مەرجێ ئـەو مرۆڤێکی ئازاد بـوو و سـامانی هـەموو دنیـا نەیئـەتوانیی هاوسـەنگیی بکـات. کەچیی ئەوان بە نرخێکی هەرزان ، بە چەند دیرهەمێك فرۆشتیان و ، تاوانی ئـەم کارەشیان درا بە کۆڵیان‌دا و ، هەموو ئـەو سـاڵانەش ، هـەتا پێـك گەیشـتنەوە ، ئەوان لە پەشیمانیی‌دا ژیانیان بەسەر برد .

کاتێك کە براکانی ئەو کارەیان ئەنجام دا لە بارودۆخێـك‌دا نـەبوون کـە بتـوانن لەسـەر خـۆ بـیر بکەنـەوە .. ئـەوەبوو نـوقمی دەریـای شـڵەژاویی بـوو بـوون و، سەرسامیی و دوودڵییش باڵی بەسەریان‌دا کێشا بوو . لەبەر ئەوە ویستیان زوو بە

زوو لێی رزگار بن ، بۆیە بە نرخێکی هەرزان ، بە چەند دیرهەمێك فرۆشتیان. ئەم دیمەنە دەروونی‌یەی کە لێرەدا وێنەی کێشراوە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە ئەوانەی فرۆشتوویانە تەنها براکانی بوون و لە غەیری ئەوان کەسێکی تر نەبووە. چونکە بەندەفرۆشتن کارێکی رێ پێدراو بوو و ، فرۆشتنی ئەو بەندەیەش لەلایەن ئەو کاروانچی‌یانەوە کە کڕیی‌بوویان تا لە میصر بی‌فرۆشنەوە و ، بازرگانیی پێوە بکەن ، کارێکی سروشتیی بوو .. لەبەر ئەوە ئەو حاڵەتە دەروونی‌یە لەگەڵ کاروان چی‌یەکاندا ناگونجێ .. بەڵام لێرەدا تەنها ئیحتیمالێك هەیە ، کە ئەویش ئەوەیە کاتێك کە کاروانچی‌یەکان یووسفیان لەو بیرە سەیرەدا دۆزی‌یەوە زانی‌یان کە کوڕێکی ئاوەها ناگونجێ بکەوێتە ئەو بیرەوە . لەبەر ئەوە ئەبێ ئەم کوڕە کوشتەی رووداوێکی سەیر و سەمەرە بێ . ئەمەش ئەوەیە کە ئایەتی : ﴿ قَالَ يَـٰبُشْرَىٰ هَـٰذَا غُلَـٰمٌ ﴾ بە وتە و ، بە دەنگ و ، بە مۆسیقا تەفسیری ئەکات. لەبەر ئەوە ئەبوایە لە فرۆشتنی ئەو منداڵەدا پەلەیان بکردایە تا بچن بە لای کارەکانی تریانەوە . جا ئەترسان ئەگەر ئەوە نەکەن و ، داوای نرخی راستەقینەی ئەو منداڵە بکەن و لێی بکۆڵنەوە ، هەتا ئەو نرخە هەرزانەشیان لە کیس بچێ ، کە فرۆشتوویانە پێی .



﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ ۖ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ۚ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾ ( یوسف : ٢٤ ) .

لە کاتی پێشکەش کردنی ئاکام و تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا بە ئاسایی دوو هەڵە ئەکرێن :

( ١ ) کەسێکی وەك یووسف سەلامی لێ بێ پیاوچاك و دڵسۆز لە هەموو حاڵەتێك و لە هەموو کارێکی‌دا بە وێنەی هەر کەسێکی ئاسایی پیشان ئەدرێت

کە دیلی هەست و ئارەزووەکانی بێت . لەبەر ئەوە کاتێك کە تەفسیری ئەم ئایەتە ئەکەن ئەبینین وەهای لێك ئەدەنەوە کە ژنەکەی عەزیز مەیلی بۆ ئەو چوو بێت و، یووسفیش سەلامی لێ بێ مەیلی بۆ ئەو چوو بێت ، بەلاّم یووسف چاودێریی پەروەردگاری خۆی بینیی . بەلاّم شێوازی ژیانی رابوردووی کە بە راستگۆیی و پیاوچاکیی رازابوویەوە ، هەروەها ئەو مانایەی کە لە بەردەوامیی ئایەتەکەدا هەیە ، واتە لادانی خراپە و رەوشت پیسیی لێی و ، گێڕانی بە یەکێ لە بەندە موخلیصەکان ، چونکە رستەکە بە صیغەی ( إسم المفعول ) هاتووە ، واتە گێڕانی یووسف سەلامی لێ بێ بە کەسێکی موخلیص و ، گەیشتوو بە پلەی ئیخلاص بە پێشکەشیی و سۆزی پەروەردگاریی ، کە هیچ دەستێکی خۆی تێدا نەبێت. لەبەر ئەوە ئەم ئایەتە بەو مانایە تێ ئەگەین کە ناهێلێ هیچ زەنێکی سەلبیی دەرهەق بەو پێغەمبەرە بەرێزە بە دلّماندا بێت .

( ٢ ) بەلاّم ئەوانەی کە ئایەتەکە بە شێوازێکی پێچەوانە بە فیطرەت و سروشتی مرۆڤایەتیی لێك ئەدەنەوە ، ئەلّێن یووسف سەلامی لێ بێ دارای هیچ ئارەزوو و حەزێکی شەهەویی نەبووە .

بێگومان شێوازی ئەم دوو فیکرەیە چەندین ناتەواوییان تێدایە . بەلّێ پێغەمبەرانیش مرۆڤن ، بەلاّم لەو گۆشەوە کە بە مەعصووم بەدیی هێنراون و لە گوناە پارێزراون ، ئەوا لەم گۆشەوە ، واتە گۆشەی مەعصوومیی و پارێزراوییەوە، ئەوان لە ژوورووی مرۆڤەوەن و ، ئارەزواتیشیان هەیە ، بەلاّم ئارەزواتێکن لە ژێر فەرمانداییەتیی و دەسەلات و بڕیاری ویستی دامەزراوی پێغەمبەرایەتییدا . جا ئایەتەکە لێرەدا ئەیەوێ بێتاوانیی یووسف سەلامی لێ بێ تۆمار بکات . لەبەر ئەوە لەگەلّ ئەوەشدا کە ئارەزووی هەبوو پەنای بردە بەر پاراستن و چاودێریی خوایی و ، ئیرادەی بەهێزی خۆیشی خستە کار و بە هیچ شێوەیەك ملی بە ئافرەتەکە نەدا .

جا کاتێك که قورئانی پیرۆز نەخشەی ئەوە ئەکێشێ کە لەوێ روو ئەدات، دەستەواژەی ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ ﴾ بەکار ئەهێنێ ، کە بە راشکاویی بەڵگەیە لەسەر مەیلی ئافرەتەکە بۆی و، ناشتوانرێ ئەو مەیلە بە گاڵتەکردن یان تاقیی کردنەوە تەفسیر بکرێ . واتە لەو شوێنە داخراوەدا هەتا کۆتایی ماوە لەبەردەم یووسفدا سەلامی لێ بێ هەبوو . بەلاّم ئەو بەردەوام لە چوارچێوەی چاودێریی پەروەردگاریدا بوو .. واتە لە چوارچێوەی بازنەی ئیمان و خواناسیی و پەیوەندیی موخلیصانە بە خواوەدا بوو ، لەگەڵ ترس و هەیبەتێك لێی کە هەموو گیانی بگرێتەوە . بەمە چاکترین نموونەی ویستی بەهێز و پتەوی پێشکەش کرد . لەگەڵ ئەوەدا هەموو بارودۆخ و مەرجەکان لە باربوون و لاشەیان لە خشتە ئەبرد، کەچیی ئەو بە فەرمایشتی ﴿ مَعَاذَ ٱللَّهِ ﴾ دەرگای ئەو بارودۆخانەی هەر هەموو داخست و ، بەسەر ئەو هەموو بارودۆخانەدا بەرز بوویەوە و، هەموویانی لە ناو برد و ، قووڵیی تایبەتیی خۆی کە شایانی گەورە پیاوان بێت دەرخست . ئەوەی ئەوی پاراست لەو ساتەدا کە هەموو مەرجێکی راکێشانی مرۆڤی تێدا بوو بۆ ناو چاڵی تاوان ، تەنها داوێن پاکیی و خۆ لە گوناه پاراستنی بوو ، لەگەڵ ئەو ئیرادەیەی کە ـ بە بیری پڕ دڵسۆزیی خۆی ـ بەرەو مرۆڤی کامڵ رووی نابوو.

پاشان یووسف سەلامی لێ بێ دەربارەی پەرستنی خوا و بانگ کردنی خەلکەوە بۆسەر ئەو خواپەرستی‌یە پێشەوایەکی هەڵبژاردە و ، پیاوی بانگەواز و پەیامیش بوو . لە راستییشدا کە کاتی گونجاو هاتە بەرەوە زلێخا لەسەر داوێن پاکیی و خۆ لە گوناه پاراستنی شاهێدیی دا و ، وتی : ﴿ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ ﴾ .

کاتێکیش کە قورئانی پیرۆز ئەوەی کە رووی داوە وێنەی ئەکێشێ ئەفەرموێ:
﴿ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴾ ( یوسف : ٣٢ ) .

یووسف سەلامی لێ بێ نموونەی گەنجی لاوچاکی پیاوانە بوو و ، ـ بە وێنەی پێغەمبەرەکانی تریش ـ دارای جوانی‌یەکی دەروونیی و جوانی‌یەکی ناوەکیی بوو. واتە جوانی‌یە دەرەکی‌یەکەی تەواوکەر و کامڵکەر و هاوتەریبی جوانی‌یە ناوەکی‌یە قووڵەکەی بوو .

بەڵام زلێخا نەی‌توانیی بگاتە ئاستی ئەو خەڵکەی کە روو لە فانی‌یەوە بەرەو باقیی و ، لە تیاچووەوە بەرەو نەمر وەرئەگێڕن ، بەڵکو هەوا و ئارەزووەکانی بەسەری‌دا زاڵ بوون و ، ئەو حەزە گڕگرتووە و ئەو خۆشەویستی‌یە کڵپە سەندووە تەنها لە چوارچێوەی جەستەدا مایەوە . خۆ ئەگەر جوانیی ناوەکیی و دەرەکیی یووسف سەلامی لێ بێ بخەینە سەر ئەوە ، ئەبینین ئەو هەڵەیەی کە لە سەردەمی ئادەمەوە سەلامی لێ بێ هەتا ئێستا بەردەوام بووە ، دووبارە بۆتەوە و، جارێکی تریش ئادەمیزاد خەڵەتاوەتەوە .

لەم ئایەتەی سەرەوەش‌دا ئەبینین کە هاوسەری عەزیز دوای ئەوەی کە دیتی چۆن ئافرەتەکان دەستی خۆیانیان بڕیی ، دەستی دایە بەرگریی لە خۆی و، پاساوی لاوازی‌یەکەی خۆی دا و گلەییشی لەو ئافرەتانە کرد کە لە نێوان خۆیان ئەو دەنگ و باسەیان بلاو کردۆتەوە کە زلێخا شەیدای بەندەکەی بووە ، ئەوەبوو وتی : ﴿ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمۡتُنَّنِى فِيهِ ﴾ . حاڵی ئەو ئافرەتانەش شاهێدیی بوو لەسەر ئەو جوانی‌یەی دەرەوەی یووسف سەلامی لێ بێ کە دڵانی حەیران ئەکرد و، یەکەم دان پیانانی ئافرەتانەش بوو . بەڵام دان پیانانی دووهەم لەلایەن هاوسەرەکەی عەزیزەوە بوو کاتێک کە وتی : ﴿ وَلَقَدۡ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ فَٱسۡتَعۡصَمَ ﴾ ئەمەش شاهێدی‌یە لەسەر داوێن پاکیی و دامەزراویی و خۆ لە گوناه پاراستن و پاکژیی ئەو پێغەمبەرە سەلامی لێ بێ .

  

﴿ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُاْ ٱلْآيَـٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾ ( يوسف :٣٥).

ئەگونجێ لە چەند گۆشەیەکەوە ئەم ئایەتە تەفسیر بکرێت :

( ١ ) ئەم باسەی کە لەو رۆژەدا ئەو ئافرەتانە بلاوەیان پێ کرد لە سەرانسەری میصردا بلاو بوویەوە و ، خەلك بیستی . جا لەبەر ئەوەی کە ئەو دەنگ و باسانە لەو کۆمەلگایەدا نەمێنن ، بە پێویستیان زانیی یووسف سەلامی لێ بێ تاوانبار بکەن و بیخەنە بەندیخانەوە ئەگەرچیی بێتاوانیش بێت ، ئەمەش بۆ ئەوەی کە هاوسەرەکەی عەزیز بە رواڵەت بێتاوان دەربکرێ .. لە هەموو سەردەمێکدا رژێمە یاساییەکان وەها راهاتوون کە لە بەردەم هێزی چینی دەسەلاتداردا بچەمێنەوە .

( ٢ ) کاتێك کە یووسفیان سەلامی لێ بێ خستە بەندیخانەوە ، ئەو بەرگریی لە خۆی نەکرد ، چونکە هەر بەرگرییەك ئەو لە خۆیی بکات ، مانای وایە ئەوە دانانی نیشانەی سەرسوڕمانی زۆرە دەربارەی شەرەف و پاك داوێنیی بەرامبەرەکەی . بە مەرجێ لەسەر هەموو پێغەمبەرێك پێویستە کە پارێزگاریی لە شەرەفی خۆی بکات و ، پاك داوێنیی و رێز و حورمەتی بەرامبەرەکەشی بپارێزێ . واتە لە کاتێکدا کە خۆی لە زینا ئەپارێزێ ، زمانیشی لە غەیبەت ئەپارێزێ . بە راستییش ئەمەی ئەنجام دا . دوای ئەوەش کە پێنج هەتا دە ساڵی تەمەنی لە بەندیخانەدا بەسەر برد ، ئەو دەنگ و باسانە دەمێك بوو لە بیر چووبوونەوە و ، بەرەی تازەش لێیان ئاگادار نەبوو . جا کاتێك کە یووسف سەلامی لێ بێ لە بەندیخانە هاتە دەرەوە ، هیچ شوێنەوارێکی ئەو دەنگ و باسانە نەمابوو . بە دەربڕینێکی تر : یووسف سەلامی لێ بێ وای پێ باش بوو پێنج یان دە ساڵی تەمەنی لە بەندیخانە بەسەر بەرێت ، لە پێناوی پاراستنی سومعە و شەرەفی بەرامبەرەکەی تردا ..

سەرەنجام ، دوای دە ساڵ ئەوانەی کە یووسفیان سەلامی لێ بێ بە ناڕەوا تاوانبار کرد وتیان : ﴿ ٱلْـَٔـٰنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ ﴾ و ، جاڕی بێتاوانیی ئەویان دا. جا هەر وەك هەموان بڕوا بەمە ئەکەن ، ئەوا جیاوازییەکی یەکجار گەورە هەیە لە نێوان ئەوەدا کە ئەو کەسە خۆی جاڕی بێتاوانیی خۆی بدات و ، لە نێوان ئەوەشدا کە کەسانی تر جاڕی ئەو بێتاوانییە بدەن . بێ تاوانیی یووسفیش سەلامی لێ بێ لەلایەن بەرامبەرەکەیەوە جاڕ درا ، ئەو جاڕدانەی کە لە نێو خەڵکییدا کاریگەرییەکی زیاتری هەبوو .

جا هەر چەندە لەسەر بێتاوانیی یووسف سەلامی لێ بێ بەڵگە زۆر بوون ، بە پێی هەڵسەنگاندنیان کە ئایا کراسەکەی لە پێشەوە دڕاوە یان لە دواوە و ، ئەو ئافرەتانەش کە دەستی خۆیانیان بڕیی و ، لەوەو دواش شاهێدییان لەسەر بێتاوانیی ئەو دا ... لەگەڵ ئەمەشدا ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە ، وەك نموونە و پێشەنگ بۆ بەندکراوە بێتاوانەکان ، ئەویش بەند کرا ، تا ئێش و ئازاری بەندیخانە بچێژێ و ، لەوێ پێ بگات ، پاشان بە وێنەی خۆشەویستی دڵان و فیکرەکان و ، بە وێنەی خۆشەویستی واقیعیی گەلی میصریی لەو بەندیخانەیە بێتە دەرەوە ، کە وەك دیلێك و خزمەتکارێك چووە ناویەوە .

لە راستییدا لەو ساتەوە کە یووسف سەلامی لێ بێ چووە بەندیخانەوە و سەربەستیی لە دەست دا ، چووە قۆناغی حوکم کردنی دڵەکان و دەست رۆیشتن بەسەریاندا . جا لە کاتێکدا کە ئارەزووەکان و ئەنانییەت ئەویان بەرەو تاریکایی بەندیخانە راپێچ ئەکرد ، ئەو بەرەو زیندووکردنەوەیەکی نوێی ژیانی رۆح و دڵ هەنگاوی هەڵ ئەگرت . شان بە شانی ئەوەش کە کەماڵی مرۆڤانەی خۆی دەست ئەخست ، رۆحی ژیانیشی بە بەری کۆمەڵگایەکی مردوودا ئەکردەوە و، رێیەکیشی رۆشن ئەکردەوە کە هەتا سەردەمی مووسا و داوود و سلێمان و عیسا سەلامیان لێ بێ و ، هەتا سەردەمی فەخری کائینات ﷺ درێژ ئەبوویەوە. رۆشن کردنەوەی ئەم رێیەش لەسەر هەرەمەکانی فیرعەونەکانەوە بوو .. ئەمەش هەر

هەمووی هاتە دیی و یووسفیش سەلامی لیّ بیّ بووە بیرەوەرییەکی جوان بۆ ئەوانەی کە لە دوای ئەو هاتن .

* * *

﴿ وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ ﴾

( یوسف : ٦٧ ) .

ئەوەی کە بە بیردا دیّت لەم وەسیەتەدا کە یەعقووب سەلامی لیّ بیّ پیّشکەش بە کوڕەکانی کرد ، ئەتوانریّ ئەمەی بە کورتە لیّ وەربگیریّ :

هەندیّ لە تەفسیرنووسان ئەلیّن : کوڕەکانی یەعقووب سەلامی لیّ بیّ لە یەکەم سەردانیان‌دا بۆ میصر دیمەنیان جوان و ، شیّوە و سیفەتیان چاك و ، دەم و چاویان گەشاوە بوون و ، بالاّ و هەیئەتیّکیان هەبوو کە سەرنجی رائەکیّشا .. ئەوەبوو سەرنجی پادشا و سەرنجی گەلی میصریان راکیّشا . لەبەر ئەوە دەرکەوتنیان لە دووهەم جاردا لەبەردەم خەلکییدا لەوانە بوو کە هەندیّ حەسادەتیان پیّ ببەن .

هەروەها سەردانیان جار لە دوای جار بۆ میصر و ، لە ماوەی نزیك‌دا و، پەیداکردنی پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەلّ یووسف سەلامی لیّ بیّ ، ئەگونجا کار بکاتە سەر پایە و پلە و کاری رەسمیی یووسف سەلامی لیّ بیّ و ، ئەشگونجا پاگاندەی بۆ بکەن وەك ئەوە بلیّن : (( ئەم موعامەلە جیاوازە لەگەلّ ئەمانەدا بۆچ ؟ )) . یان (( دە براکە جاریّکی تر هاتنەوە )) .

هەروەها ئەگونجا کە یەعقووب سەلامی لیّ بیّ بترسیّ کوڕەکانی هەمان موعامەلەی یووسف سەلامی لیّ بیّ لەگەلّ بنیامینیش‌دا بکەن ، بۆیە ویستی بە دوو دوو بەشیان بکات تا لەو بارەوە رایان یەك نەگریّ .

کاتیّکیش کە بەنی‌ئیسرائیل ئەچوونە میصرەوە ئەگونجا لە لایەنی مەعنەوییەوە دەست بە بووژاندنەوەی میصر بکەن ، لەبەر ئەوە چاکتر وابوو بۆ

بەجێ هێنانی ئەم خەوە و ئەم ئەندێشەیە پشت بە مەبدەئی نهێنیی ببەستن. واتـە کۆنەبنەوە و، وەك کۆمەڵەیەك بەرچاو نەکەون ، بەڵکو دانە دانە دابەش بن.

دیارە ئەمە هەر هەمووی بە نەخشەکێشانی جیهانی هۆیـەکان ئـەژمێررێت و، ئەم فەرمانبەرییەش پێویستە لەم جیهانەدا بەرچاو بگیرێ . بـەلاَم نەخشەکێشـان و پلان‌دانان ئەوە ناگەیەنێ کـە هـەر ئـەبێ قەدەغـەی ئـەو موسـیبەت و بەلاَیانـە بکات کە لەو نەخشە و پلانانە تێپەڕ ئەکەن . لەبەر ئەوە یـەعقووب سـەلامی لێ بێ ئەوەی وەها دەربڕیی کە لەگەڵ ئـەوەدا نەخشـە و هۆیـەکان بەرچـاو ئـەگیرێن، بەلاَم ئەو پشت بە خوای بالآدەستی دروست‌کەری هۆیەکان ئەبەستێ ، لەبەر ئـەوە ئـەی‌بینین ئـەڵێت : ﴿ وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴾ ( يوسف : ٦٧ ) .

ئێمەش ئەوە ئەڵێین کە یەعقووب سەلامی لێ بێ فەرمووی :

﴿ رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ۝ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغۡفِرۡ لَنَا رَبَّنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ .



﴿ وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ﴾ ( الرعد : ٣١ ) .

وەك تەفسیرەكانی ئەم ئایەتە دەریان خستووە ، ئەگەر بەڕێوەبردنی چیاكان و، پارچە پارچەكردن و تێك شكاندنی زەویی و ، قسەكردن لەگەڵ مردوواندا بە هەر كتێبێك بگونجایە ، ئەوا ئەو كتێبە تەورات یان ئینجیل یان زەبوور نەئەبوو، بەڵكو قورئان ئەبوو . بەم جۆرە خوای بالاْدەست سەرنجی خەڵك بۆ لای قورئانی پیرۆز رائەكێشێ ..

ئەگەر ئەم كارانە هەر هەموویان روویان بدایە ، ئەوە مانای وابوو كە موعجیزە رووی داوە و ، روونەدان و جێ بەجێ نەبوونی موعجیزەكانیش ، وەك جار جار پێغەمبەران سەلامیان لێ بێ ، لە پێناوی هیدایەتی قەومەكانیاندا داوایان ئەكەن ، مانای وەهایە ئەم موعجیزانە كە بۆ تەصدیقی پێغەمبەرایەتیی روو ئەدەن ، پەیوەندییان تەنها بە ویستی خواییەوە هەیە .

ئایەتی : ﴿ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ﴾ فیكرە چەوتەكان راست ئەكاتەوە و ، بە ئاشكرا دەری ئەبڕێ و دیاریی ئەكات كە پێویستە هاوار لە كێ بكرێ و لە كوێش داوا بكرێ و ، هەموو هێزە ماددیی و مەعنەوییەكان و ، هەموو هۆكارەكانی كاریگەریی لە دەستی خوای بالاْدەست خۆیدایە و ، هەر كەی ویستی لەسەر بوو ئەتوانێ هەموو ئەو كارانەی كە ئاماژەیان بۆ كراوە ئەنجام بدا و جێ بەجێ بكات و، ئەشتوانێ ، هەتا بەبێ دەرخستنی موعجیزە و كاری لە عادەت بەدەر، هیدایەتی دڵەكان بدات و بیشیان گەیەنێتە كەناری ئاسوودەیی و ، بە لای ئەوەوە هیچ شتێك نیە كە قورس بێت . ئەگەر بیەوێ چیاكان ئەبات بەڕێوە ، یان زەویی ئەڕووخێنێ و پارچە پارچەی ئەكات ، یان وا لەو مردووانە ئەكا ، كە هەزارەها ساڵە مردوون و جەستەیان رزیوە ، قسە بكەن . لە راستییشدا ئەم هەموو

موعجیزانە ـ ئەگەر روو بدەن ـ کاریگەرییان لەگەڵ ئەو کاریگەرییەدا پێوانە ناکرێ کە قورئان لەو دڵانەدا رووی پێ ئەدا کە خوا بیەوێ هیدایەتیان بدات. لەبەر ئەوە ئەم کارە سەیرانە و ئەم موعجیزانە کە ئێوە بە گەورەیان ئەبینن لە چاو ئەو شۆڕشە جیهانییە گشتگرەدا کە قورئان بەرپای ئەکات شتێکی بچووک دەرئەچێت . خۆ ئەگەر بشتانەوێ بکۆڵنەوە و بە دوای هۆی ئەو رووداو و موعجیزانەدا بگەڕێن ، کە لەبەر چاو و ئەندێشەتاندا لە عادەت بەدەر و سەیرن، ئەوا قورئان ئەو هۆیەیە ، ئەگەر لە گۆشەی هۆیە گشتیی و ریشکییەکانەوە سەیری باسەکە بکەین . خۆ ئەگەر خوای باڵادەست بیویستایە ئەوا چیاکانی بەڕێوە ئەبرد و، زەویی پارچە پارچە ئەکرد و ، گیانی بە بەر مردوواندا ئەکردەوە و، ئەشیهێنانە قسە . بەڵام ئەم کارانە هۆی هاتنە خوارەوەی قورئان نین..

جا حیکمەتی ناردنی قورئان بریتییە لە دامەزراندنی شێوازێکی نوێ لەم مرۆڤەی کە ئێستا هەیە و ، چوونە ناو ئەو دڵانەوە کە غەیری قورئان کەسێکی تر ناتوانێ بچێتە ناویانەوە و ، دامەزراندنی حاکمیەتی ئیمان تیایاندا و، دەرخستن و دیاریی‌کردنی رێبازەکانی نەمریی و هەمیشەمانەوە لەبەردەم مرۆڤی فانییدا و ، بەڵێن پێدانی جێبەجێ‌کردنی هەموو ئاوات و هیواکانی ، بگرە وەها لێ‌کردنی ئەو مرۆڤە تا بتوانێ لە دەلاقەی دڵ و ویژدانیەوە بەسەر نەمریی و بەسەر بەختەوەریی هەمیشەییدا بڕوانێ ، کە هێشتا نەگوازراوەتەوە بۆ جیهانەکەی تر . کەواتە ئەوەی لە هەموو شتێ گرنگ تر بێ بریتییە لە زانینی ئەم لایەنانەی ناردنە خوارەوەی قورئان .

بەڵێ ، کاریگەریی کاتیی بەڕێوەبردنی چیاکان و ، فڕێدانیان بە راست و چەپدا و ، پارچە پارچە کردن و ورد و خاش کردنی زەویی و ، ، هێنانە قسەی نیسقانی مردووان ، بە هیچ ناژمێررێ لە پاڵ کاریگەریی هەمیشەیی و هەمیشە ماوەی قورئاندا لەسەر مرۆڤ ، بگرە کاریگەرییەکی کەم و کزی ئەبێت .

﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ﴾.

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾( ابراهيم : ٥ ) .

لە قورئاندا چوار شوێن هەیە کە بەم ئایەتە کۆتاییان پێ دێت ، کە بریتییە لە ئایەتی پێنجەمی (( إبراهيم )) و ، ئایەتی سیی و یەکەمی سوورەتی (( لقمان )) و ، ئایەتی نۆزدەهەمی سوورەتی : (( سبأ )) و ئایەتی سیی و سێهەمی سوورەتی (( الشورى )) . جا ئەگەر بە جوانیی لە سیاقی ئەم ئایەتانە ورد ببینەوە ، تێبینیی ئەوە ئەکرێ کە ئەم بەشە ئایەتە دوا بە دوای باسی ئەو نیعمەتانە دێت کە خوای بالآدەست بە مرۆڤی بەخشیون . پاشان ئەوترێت کە دەربارەی بوون و تەنیایی خوا چەندین بەڵگە و نیشانە هەن بۆ هەموو ( صبار ) و ( شكور ) ێك ، کە هەردووکیان لە شێوەی سیفەتی موبالەغەدان بۆ مرۆڤی ئارامگر و سوپاسکەر . جا هەروەك قورئان ئەفەرموێ ، نیعمەتەکانی خوا بەسەر مرۆڤەوە ئەوەندە زۆرن ، ئەگەر دەست بە ژماردنیان بکەین توانامان نابێ بیان ژمێرین ﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴾ ، بەلآم ئەو خوو پێوەگرتن و باوەی کە ئەو مرۆڤەی پەیوەستە بە جەستەیەوە لە سایەیدا ئەژیی ، وای لێ ئەکات هەتا ئەو نیعمەتانە تیا نەچن ئەو هەست بە قەدر و بەهایان نەکات..

بەلآم ئەسڵ وەهایە کە کاتێ ئەو نیعمەتانە هەن و نزیکن مرۆڤ نرخیان بزانێ و، بە هەموو ئەندامێکیەوە روو لە خوا بکات و ، کاتێکیش کە ئەو نیعمەتانەمان لێ ئەسەنرێنەوە ـ بە پێی چەندین حیکمەت ـ بەندایەتییەکەمان لەسەرمانی فەرز ئەکات کە لە هەموو حاڵەتێکدا خۆمان بە ئارامی جوان ( الصبر الجميل ) برازێنینەوە و ، لەسەریشمان پێویستە بەردەوام بڵێین: ((

پـەروەردگارمان ! لوتـف و قـەهرت یەکسـانن )) و ، هـیچ هـەڵس و کـەوتێکی سەلبیی ئەنجام نەدەین کە پێچەوانەی بەندایـەتییمان بـۆ خـوا بێـت . ئەمـەش بـە پشت گیریی فەرموودەی شەریفی پێغەمبەر : ( عَجَباً لأمرِ المُؤمِنِ إنَّ أمرَهُ كُلَّهُ لَـهُ خيرٌ ، وليس ذلك لأحَدٍ إلا للمُؤْمِنِ . إنْ أصابَتهُ سَرَّاءَ شَكَرَ فَكَانَ خَيراً لَـهُ ، وإنْ أصابته ضَرَّاءَ صَبَرَ فكان خيراً له ) .[36]

راستە کە قورئان سیفەی موبالەغەی بۆ مرۆڤی نارامگر و سـوپاسکـەر بـەجێ هێناوە ، بەڵام بۆ ؟

لەبەر ئەوەی کە لە نێوان ئـەو نیعمەتانـەدا کـە خـوای باڵادەست بـە مرۆڤـی بەخشیون نیعمەتێك نیە بچووك بێت . چ نیعمەتێك بە بچووك ئەژمێررێ ؟ پێـنج پەنجەکە نیعمەتێکی بچووکن ؟ یان لووە لیکیـیەکانی نـاو دەمـان و کارەکـەیان ؟ یان ئەو نیعمەتانەی کە لەم ئایەتانەدا باس کراون لە بەڕێوەبردنی کەشتییەکان لە ناو دەریاکاندا ؟ یان هەوا ؟ ... یان ئاو ... یان ژیـان .. یـان ئیمـان ؟ کامیـان؟ ... نەخێر ... نیعمەتێك نیە ئێمە بتوانین پێی بڵێین نیعمەتێکی بچووکە. کەواتـە پێویسـتە لەسـەر ئـەو نیعمەتانـە سوپاسـێکی زرۆ بکرێـت . کـاتێکیش کـە ئـەو نیعمەتانە ـ بە پێی یەکێ لە حیکمەتەکانی تاقییکردنەوە ـ تیا ئەچن ، ئـەوا ئـەو تیاچوونەش نارامێکی جوانی پێویستە .. ئەییووب پێغەمبەریش سەلامی لێ بـێ نموونەیەکی زیندووە لەسەر نارامی جوان. مامۆسـتا بـەدیعوززەمانی نوورسـییش بـە (( پاڵـەوانی ئـارامگـرتن )) ی دانـاوە . ئـەوەبوو دوای وەرگرتنـەوەی هـەموو نیعمەتـە دنیاییـیەکان لێـی حاڵـەتی ، یـان رەفتـاری ، یـان روو لـە خـوا کردنـی نەگۆڕان . پاشان ئـەم پاڵـەوانی ئـارام و چاکەکارییە ، کـە ئـارام گرتنەکـەی لـە ئەنجامی ئیمانداریی‌دا بوو ، لەبەردەم هەر هەموو مەینەت و تەنگانەکاندا ، کـە ئـارام بـە لای مرۆڤـەوە نـاهێڵن ، رووی لـە نائومێـدیی نـەکرد، چـونکە مانـای راسـتەقینەی هۆیـەکانی تـەنگ و چـەڵەمە و مەینـەتیی ئـەزانیی و، چـاکیش

---

[36] مسلم ، الزهد : ٦٤ ، المسند : ٥/ ٢٤ ، الدارمي ، الرقائق : ٦١ .

ئەیزانیی کە خراپەکان لایەنی چاکیشیان هەیە . لەبەر ئەوە دڵی لە ئیمان پڕ بوو و، بەرەو دڵەتەپێ پێی هەڵ نەخلیسکا ، بەڵکو لە کاتی ئارامگرتنیدا لەسەر مەینەتی‌یەکان بەرەو سوپاس و ستایش رووی نا ..

پاشان پێویستە بە هەست و سۆزێکەوە ئارامگرتن و سوپاس‌کردن ئەنجام بدرێت. ئەمەش لەگەڵ هێزی ئیمان و چاکەخوازیی مرۆڤ دا ، لەناو چوارچێوەی فەرمانبەری‌یەکەی و لێ پرسراوی‌یەکەیدا ئەگونجێت . جا ئەو پێغەمبەرەی کە بە ئایەتی : ﴿ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾ ( إبراهيم : ٥ ) . دوێنرا، واتە : قەومەکەت لە تاریکایی دەربهێنە بۆ ناو رووناکیی ، فەرمانی بەسەردا درا بوو تا تەنها قەومەکەی خۆی لە تاریکیی دەربهێنێ بۆ ناو رووناکیی . کەچیی پێغەمبەری خۆمان ﷺ بە ئایەتی : ﴿ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾ ( إبراهيم : ١ ) واتە : بۆ ئەوەی هەموو خەڵکیی لە تاریکیی دەربهێنی بۆ ناو رووناکیی . واتە ئەرکی دەرهێنانی هەموو خەڵکیی لە تاریکی‌یەوە بۆ ناو رووناکیی خرایە ئەستۆی و ، لە کەش و هەوای ئەم ئەرکەدا ژیانی دایە سەر.



﴿ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴾ ( الحجر : ٢٤ ) .

لە کاتێکدا کە زانینی پێشینەکان و پاشینەکان ئاماژە بۆ قەدەری خوایی ئەکات ، لە لایەنێکی ترەوە ئاماژەش بۆ تەوحید ئەکات . چونکە ئەو زاتەی کە رابورووی بەدیی هێناوە ، هەر ئەوە کە دوارۆژیش بەدیی ئەهێنێ . پاشان لەوانەیە ئەم تێبینییانەی خوارەوە دەربارەی زانینی پێشینەکان و پاشینەکان بە زەیندا بێن :

ئێمە پێشینەکانی ئەوانەی کە هاتوونەتە ئەم دنیاوە ئەزانین کامانەن ، بۆ نموونە ئەوانەی کە لە سەردەمی ئادەمدا سەلامی لێ بێ هاتوون و ، ئەشزانین ئەوانە کامانەن کە دوای ئەو هاتوون .

هەروەها لە روانگەی هاتنە ناو ئیسلامیشەوە ئەزانین پێشینەکانتان و پاشینەکانتان کامانەن .

هەروەها ئەزانین کامانەتان لە ریزەکانی نوێژدا پێش کەوتوون و کامانەشتان دوا کەوتوون .

هەروەها سەرەتا و کۆتایی ژیانتان ئەزانین . واتە ئەتۆم و گەردیلەکانی جەستەتان و بارودۆخی ئێستاتان ئەزانین ، پاشان لە قەبرەکانتاندا چۆن ئەبنە کۆمەڵێك ئێسقانە رزیوە .

ئەگەر بە دارشتنێکی گشتگیرتر و فروانتریش ئەمە دەربـڕین ئەڵێین : ئێمە خۆمان ئەزانین کەسانی ریزەکانی پێشەوەی ئیمان و ئیسلام و ئیحسان کامامەن و، ئەو کەسانەش کە ریزەکانی دواوەی ئەم کارانەن و ئەوانەش کە پێیان هەڵ کەوتووە کامانەن . هی واش هەیە لەم کارەدا ئەمەندە چۆتە ناو درێژە و ناو

فەرعەکانەوە هەتا گەیشتۆتە ئەو رایەی کە ئەوانەش بگرێتەوە کە زوو ئەچن بۆ مزگەوت ـ واتە ریزی یەکەمی نوێژ ـ و ، ئەوانەش کە درەنگ دێن بۆ مزگەوت و لە ریزەکانی دواوەدان .



﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴾ ( الحجر : ٢٦ ) .

بۆگەنکردنی ئەو قوڕەی کە مرۆڤی لێ بەدیی هێنراوە لەوانەیە بە هۆی ئەو بەکتریایانەوە بێت کە وان تیای‌دا . سەرەتا قوڕێکی لینجی گەنیو بوو ، پاشان بە تێپەڕبوونی رۆژگار لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر و ، لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر گۆڕا ، هەتا ئەوەبوو لە (( حَمَإٍ مَّسْنُونٍ )) ەوە بۆ گلێنەیەکی سووتێنراو گۆڕا ، کە ئەگەر نووکی لێ بدەیت ئەزرنگێتەوە . واتە گۆڕا بۆ (( صلصال )) . ئەگونجێ پێچەوانەکەیشی راست بێت ، بەڵام ئەنجامەکەی گۆڕانی زۆری بەسەردا نایەت. لەلایەکەوە قوڕێك هەیە ، لە ئەنجامی بوونی گیانداری گەردبینیی ( أحیاء مجهریة ) تیای‌دا ، لەوانەیە ئاڵ و گۆڕی بەسەردا بێت ، واتە وەك تێکەڵەیەکی پرۆتینیی وەهایە و ، لەلایەکیشەوە قوڕێکی وشکی رەقە و هیچ گیاندارێکی گەربینیی تێدا نیە و ، هەتا زانست و توانست و ویستی خواییشی ئاراستە بوون بۆ ئەوەی ئەو قوڕە بخرێتە قاڵبێکەوە و ، شێوەیەکی مرۆڤانەی پێ ببەخشرێ و ، گیان بەبەردا کردنەوەیەکی خوایی ئاراستە بکرێ ، وەك موعجیزەیەکی بە دیی‌هێنان ، تا ئەم مرۆڤە تەوەرەیەك بێت بۆ ناو و سیفاتە خواییەکان ... هەتا ئەو کاتەش مرۆڤ لە بەرزەخێكدا لە نێوان ناو و قوڕدا مایەوە ، دوور لە ژیان..

پاشان ئەم قوڕە بووە مرۆڤ .. مرۆڤێك کە چەند کەسێکی ناتوانن لە مەلائیکەت تێپەڕ بکەن ، بەڵام ئەو لە پاڵ ئەمەدا هەتا ئەمڕۆش توانای بۆگەن

کردن و ئیحتیمالی خاڵیبوونی لە هەموو چاکەیەك لەگەڵ خۆیدا هەڵ گرتـووە.. جا لەگەڵ ئەوەشدا کە ئیحتیمالی چاکەی تیا بە رێژەی پەیوەنـدیی بوونیـەتی بـە سیفات و ناوە جوانەکانی خواوە ، ئەوا لەو کاتەدا کە ئەو سیفاتانەی تێـدا نیـە، هەموو تایبـەت مەندییـەکانی دروسـت بـوونی یەکـەم جـاری لـە ( حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ) ئاوەژوو ئەکاتەوە .

بەڵێ ، ئەگەر مرۆڤ هەوڵی بەجێهێنانی ئەو مەبەستە نەدات کە لە پێنـاویدا بەدیی هێنراوە و ، توانای خۆی لەو پێناوەدا نەبەخشێ ، تا بۆ بەرزترین پلە بـەرز ببێتەوە و ، ئەم لێهاتنەش دەر نەخا ، ئەوا هەرگیز ناتوانێ لە بۆگەنیی و بۆگـەن کردن رزگاری ببێ .



﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾ ( النحل : ٩٠ ) .

ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە ئایـەتێکی گشـتگـرە و ، شـەش بنچـینەی تێدایـە کـە هەندێکیان ئیجابیین و هەندێکیشیان سەلبیین .

عەدالەت رژێمێکی یەکجار زیندەگی‌یە لە دین‌دا .. هەندێکیش بـە یـەکێ لـە چوار بنچینە گرنگەکەی دینی ژمـاردووە . ئـەو تێگەیشتنەش کـە لـە قورئـان و سوننەتی صەحیح‌دا لە ژێر دەربڕینی ( بەندایەتیی ـ عبودیـة ) دا و جـار جـاریش عەدالەت‌دا دێت ، ئەوە تێگەیشتنێکی گشتی‌یە و زۆر شـتی بـۆ لا ئەگەڕێتـەوە. بۆ نموونە : هەموو ئەو رووە چاکانەی کە لەم ئایەتەدا باس کراون ، لە ئیحسـان و دەستگرۆیی کردنی خزم و کەس‌وکار ، ئەتوانرێ بگێڕێتـەوە بـۆ عـەدالـەت .. بـە مـەرجێ عـەدالـەت بـە مانـای بەندایـەتیی ، ئەگـەر لـە مـرۆڤ دا نـەبێت و لـە کۆمەڵگاش‌دا جێگیربـوونێکی راسـت و دروسـت جـێگیر نـەبووبێت ، چاوەڕوانیی رووە چاکەکانی تر ناکرێت ، نە لە مرۆڤ دا و نە لە کۆمەڵگاش‌دا . کەواتـە بـەبێ عەدالەت ئیحسان نابێت و ، ناشتوانرێ بەبێ عەدالەت چاکە بەرامبەر بـە خـزم و کەس‌وکار بکرێت ، بە تایبەتیی ئەگەر ئەو پێناسە سەرسوڕهێنەرەی ئیحسـان لـە فەرموودەی شەریفی پێغەمبەردا : (( أن تَعبُدَ اللهَ كَأنَّكَ تَراهُ ، فـإن لَّـم تَكـن تَـراهُ فَهُوَ يَراكَ )) .[٣٧] بخوێنینەوە .

---

[٣٧] البخاري ، تفسير القرآن : ٣١ ، الترمذي ، الإيمان : ٢٤ ، الإيمان : ٣٧ ، إبن ماجه ، المقدمة : ٩ ، مسلم ، الإيمان : ٥٧ ، أبوداود ، السنة : ١٦ .

واتە ئیحسان ئەوەیە کە بە شێوەیەك بەندەی خوا بێت هەروەك بی‌بینی. بەلاَم پێویستە ئەم هەست و بیرکردنەوە و بیر و بۆچوونە لەسەر ئیمانێکی توند و تۆلّ و دامەزراو بینا کرابێت و ، ئەو ئیمانەش بە بنچینە ئیسلامی‌یەکان قوولّ کرابێتەوە ، بە رادەیەك کە هەستی ئیحسان بتوانیّ ئەوە پێشکەش بکات کە هیوا و چاوەڕوانیی لێوە ئەکریّ .

بەخشین بە خزمان و ، بە شێوەیەکی گشت‌گرتریش چاکەکردن لەگەلّ هەموو خەلّکیدا ، مانای بلاّوبوونەوەی بیروباوەڕ و فەلسەفەی ئیحسان ئەگەیەنیّ . جا ئەگەر لەم گۆشەیەوە ئەم ئایەتە شیی بکەینەوە ئەبینین کە عەدالەت سەرچاوە و بناغەی ئیحسانە و ، ئیحسانیش سەرچاوە و بناغەی خێر و چاکەیە .

خۆ ئەگەر ئاوڕ لە بنچینە سەلبی‌یەکانیش بدەینەوە ئەبینین کە یەکەم دوورە پەرێزیی لە داوێن پیسیی ( فحشاء ) کراوە .

لەوانەیە هۆی ئەمەش ئەوەبیّ کە داوێن پیسیی سەرەتایە بۆ هەموو کارێکی خراپی مرۆڤ وەك دانە و ، کۆمەلّگا وەك گشت ، بۆیە ئەو پێش خراوە . جا هەروەك هەموان ئەیزانن هەر کۆمەلّگایەك داوێن پیسیی تیایا پەرە بسێنیّ، ئەوا کردەوە خراپەکانی تریش یەك لە دوای یەك دەست بە بلاّوبوونەوە ئەکەن و، ئەو کۆمەلّگایە تووشی لادانێکی گەورە ئەبێت . لەبەر ئەوە هیچ کاتێك ناتوانریّ مەترسیی داوێن پیسیی بە کەم لە قەلّەم بدریّ .

مانای ( مُنکر ـ خراپە ) ش بریتی‌یە لە بە ئاشکرا ئەنجام دان و کردنی هەر شتێك کە خوا حەرامی کردبیّ . ئەمە بە مانای یاخیی بوون و هەلّگەڕانەوە لە یاسا و رێك و پێکیی حەقیقەتە کەونی‌یەکان ، کە ئەمەش کارێکە لە هەموو دینێك و ، لە هەموو ئوممەت و میللەتێکدا دراوەتە دواوە .

بەلاّم ( بغي ) مانای لە سنوور دەرچوون ئەگەیەنیّ . جا ئەم سیفەتە خراپە لە ژیانی تاکە کەس و ، لە ژیانی کۆمەلاّیەتییشدا ، لە چەندین شێوە و دیمەنی جیاوازدا دەرئەکەویّ . هەر لە ستەم‌کردنی مرۆڤ لە خۆی و ، یاخیی بوون لە

فەرمانی دایك و باوك و ، بەرزكردنەوەی ئالای یاخیی بوون لە دەولەت و ، تێك دانی دڵئارامیی كۆمەڵگاوە ، تا ئینكاریی بوونی خوای بالادەست و سپلەیی بەرامبەر بە نیعمەتەكانی ..

جا هەروەك لە بابەتی عەدل و ئیحسان و دەستگرۆیی خزم و كەسوكاردا چاكەمان دیی ، ئەوا داوێن پیسییش بنچینە و سەرچاوەی كردەوەی خراپە و، كردەوەی خراپیش بنچینە و سەرچاوەی زۆرداریە .

بەلام مەزهەبی حەنەفیی وای بۆ ئەچێ كە ( واو ) لێرەدا كۆی رەها ئەگەیەنێ، كەچیی لە ئایەتە پیرۆزەكەدا بۆ سیفاتە ئیجابیەكان و هەروەها بۆ سیفاتە سەلبیەكانیش بە پیتی ( واو ) عەطف كراوە . لەبەر ئەوە لەوانەیە لێرەدا تەرتیب كردن و پاش و پێش كردن باسی نەبێت . كەچیی مەزهەبی شافیعیی وای بۆ ئەچێ كە ( واو ) لێرەدا تەرتیبیش بگەیەنێ . جا لەم گۆشەوە بە دوای یەكدا هاتنی هۆكار و ئەنجام ـ وەك لە پێشەوە باسمان كرد ـ لەوانەیە باسی هەبێ و ، لەوانەشە ئەم جۆرە پەیوەندیەش هەبێت .

پوختەی باس ، ئەم ئایەتە كۆترین ئایەتە لە قورئانی پیرۆزدا دەربارەی خێر و شەڕ وەك عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود خوا لێی رازیی بێت وتوویە .[٣٨] ئەم ئایەتە ئەوەندە مانای لە خۆ گرتووە كە ئەگونجێ لە چەندین بەرگدا راڤە بكرێن.



[٣٨] إبن جرير الطبري ، جامع البيان في تفسير الآية .

﴿ وَكُلَّ إِنسَـٰنٍ أَلۡزَمۡنَـٰهُ طَـٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦۖ وَنُخۡرِجُ لَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَـٰمَةِ كِتَـٰبٗا يَلۡقَىٰهُ مَنشُورًا ﴾ ( الإسراء : ١٣ ) .

ئەم ئایەتە دیمەنی ئەو کەسە دێنێتە یادی مرۆڤ کە حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەرچووبێ و ، فەرمانی لە سێدارەدانەکە و هۆیەکەشی کرابێتە ملی و ، بەرەو پەتی سێدارەش درابێتە بەر . ئەشتوانین لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا هەندێ مەسەلە باس بکەین :

باڵندە ناوبراوەکە بریتی‌یە لە کردەوەی مرۆڤ کە - وەك لە فەرموودە شەریفەکاندا هاتووە - لەبەردەم ئەو مرۆڤەدا کە کردەوەکانی چاکن بە شێوەی مرۆڤێکی دیمەن جوان و ، ئەگەر کردەوەکانیشی خراپ بن بە شێوەی مرۆڤێکی دیمەن ناشیرین دەر ئەکەوێ .

کە خوا ویستی بەندەیەك لە بەندەکانی ئابڕوو بەرێ ، واتە ویستی بە هۆی ئەو تاوانانەوە کە ئەنجامی داون بە پێی عەدالەت سزای بدات ، نووسراوی کردەوەکانی بە ملیا هەڵ ئەواسێ و نهێنی‌یەکانی ئاشکرا ئەکات . بەلاّم کە ویستی چاوپۆشیی لە بەندەیەك لە بەندەکانی بکات خۆی و تاوانەکانی دائەپۆشێ و ، بۆ هیچ کەسیان دەر ناخات .

لەوانەشە - لە روویەکی ترەوە - بوترێ : ئەو باڵندەیەی کە بە ملی مرۆڤەوە هەڵ ئەواسرێ ئەو ویژدانەیەتی کە هەرگیز لێی جوێ نابێتەوە و ، بەردەوام لە قووڵایی ناخی‌دا هەستی پێ ئەکات و ، بە شێوەی (( حەسانەوەی ویژدان )) یان (( سزادانی ویژدان )) - وەك لەسەر زمانی خەڵك باوە - خۆی ئەنوێنێ ، ئەویش بە پێی ئەو کردەوە چاکانە یان ئەو کردەوە خراپانەی کە ئەنجامیان ئەدات .

پوختەی باسیش ئەو قەدەرەی کە بە دەوری ئیرادە رێژەیی و هەندەکی‌یەکەی‌دا چنراوە ، هەروەها بەشەکەی و پەیوەندیی رۆحەکەی بە جەستەیەوە بەو شێوەی کە سێبەری پەیوەستە بە لاشەیەوە ... ئەمە هەمووی بە ملیەوە هەڵواسراوە و بە گەردنیش هەڵی گرتووە و ، ئەبێتە سەرچاوەی دڵکرانەوە و شادمانیی بۆی، یان سەرچاوەی سزا و ئازارێك کە لە کۆڵی نابێتەوە .. لە کۆڵی نابێتەوە و، رۆژی قیامەتیش بە وێنەی تۆمارێك یان کتێبێك دەرئەکەوێ و ئەخرێتە بەردەمی و پێی ئەوترێ : ﴿ ٱقۡرَأۡ كِتَـٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ﴾ .

بەڵام ئەو کەسەی کە هەموو رۆژێك بە خۆی‌دا ئەچێتەوە و، موحاسبەی ئەکات ، ئەوا رۆژی قیامەت ئەمین و دڵ پڕ لە ئاسوودەیی ئەبێت و ، بەرەو بەهەشت و بەرەو رەزامەندیی خوای بالادەست ئەکەوێتە رێ ، چونکە لە دنیادا موحاسەبەی نەفسی خۆی ئەکرد .. بەڵام هەر کەسێ لە دنیادا دەرهەق بە خۆی زیادەڕەویی کردبێ ، ئەوا لە رۆژی قیامەت‌دا سەرسام ئەبێ و ئەڵێت : ﴿ يَـٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَـٰبِيَهۡ ۝٢٥ وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ ﴾ .

* * *

﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴾ ( الكهف : ١٣ ـ ١٤ ) .

(( أصحاب الكهف )) واته : هاوه‌لانی ئه‌شكه‌وت . له‌گه‌ل ئه‌وه‌دا كه وتراوه ئه‌مانه له شوێنكه‌وتووانی ( عیسی ) پێغه‌مبه‌رن سه‌لامی لێ بێ و ، له شوێن كه‌وتووانی ئینجیلن ، یان له شوێنكه‌وتووانی پێغه‌مبه‌رێكی ترن ، به‌لام ـ به پێی ئه‌وه‌ی كه له قورئاندا هاتووه ـ ئێمه ئه‌توانین بلێین كه هاوه‌لانی ئه‌شكه‌وت كۆمه‌لێكن هێمای زیندووكردنه‌وه و گیان به به‌ردا كردنه‌وه ئه‌نوێنن هه‌تا رۆژی قیامه‌ت . چونكه هه‌موو بزووتنه‌وه‌كانی زیندووكردنه‌وه و گیان به به‌ردا كردنه‌وه به كاتی ناره‌حه‌تیی و كاتی ژیان له ئه‌شكه‌وته‌كاندا یان له ژێر زه‌ویی‌دا تێپه‌ریون . ئه‌مه‌ش له ئاینده‌دا دووباره ئه‌بێته‌وه .

ئه‌گه‌ر بێینه سه‌ر باسی ژماره‌یان ، قورئان ئه‌وه ئه‌داته دواوه كه سێ كه‌س بن، به‌لام وه‌ها گه‌یاندن كه پێنج كه‌س بن قورئان به ( رجم بالغیب ) وه‌صفی ئه‌كات و ، له‌وه‌ش كه حه‌وت كه‌س بن و صه‌گه‌كه‌شیان هه‌شته‌میان بێت، قورئان بێ‌ده‌نگ ئه‌بێت . واته ده‌رگا بۆ ژماره حه‌وت ئه‌خاته سه‌رپشت . زانایانی ته‌فسیریش به پشت به‌ستن به شێوازی ده‌ربڕینی قورئان لێره‌دا ، ئه‌م قه‌ناعه‌ته وه‌رئه‌گرن . لێره‌دا نوكته‌یه‌كی ناسك هه‌یه : دوای ئه‌وه‌ی قورئانی پیرۆز باسی ئه‌وه ئه‌كات كه ژماره‌ی هاوه‌لانی ئه‌شكه‌وت حه‌وت كه‌س بوون ، ( واوی عطف ) به‌كار ئه‌هێنێ و ئه‌فه‌رموێ : ﴿ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾ و ئاماژه بۆ ئه‌وه ئه‌كات كه مرۆڤ و صه‌گ پێكه‌وه كۆ نابنه‌وه . كه‌واته ئه‌گه‌ر ئه‌و صه‌گه له‌گه‌ل هاوه‌لانی

ئەشکەوتدا چووە بەهەشتەوە ـ وەك لە ریوایەتێکدا هاتووە ـ ئەوا خەڵك بە سیفەتی مرۆڤ و سەگیش بە سیفەتی سەگ ئەچنە بەهەشتەوە .

با ئێستا بگەڕێینەوە بۆ سەرەتا و جارێکی تر پێکەوە ئەم ئایەتە بخوێنینەوە :

﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى ﴾ .

ئەمانە کۆمەڵە گەنجێکی ئازان ... بە دڵ ئازان ... بە بیر ئازان ... بە ویژدان ئازان .. بە رەوشت و هەڵس و کەوت ئازان .. ئەمانە کۆمەڵە گەنجێکی ئیمان بەهێزن بەو رادەیە کە گوێڕایەڵیی بۆ ناڕەوا ناکەن . جا لەگەڵ ئەوەشدا کە دەستەیەکی کەم بوون ، دوودڵییان نەنواند بۆ دەست پێکردنی ئەو جموجوڵەی کە هەڵقوڵاوی هیدایەت و ئیمان بەو پەروەردگارەیان بوو کە لەلایەن خۆیەوە هیدایەتی زیاتری خستە سەر ئەو هیدایەتەیان کە بە کۆششی خۆیان بە دەستیان هێنابوو ... بە رەحمەت و سۆزی فراوان و گشتگیری خۆی هیدایەتی قووڵتری پێشکەش کردن و ، کۆمەڵێك گەنجی تەواو ئیمانداری لێ پێك هێنان .

بە پێی ئایەتی ﴿ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴾ ئەوەش ئەزانین کە پشتگیریی خوایی بۆ ئیمانەکەیان و ، بەهێزکردنی ئەو ئیمانەیان لەلایەن پەروەردگاریانەوە و، بن داکوتانی لە ناو کرۆکی دڵیاندا یارمەتیی و کۆمەکیی روون و راستەوخۆ لەلایەن خوای بالادەستەوە جار بە جار باسی هاتووە ، کە ئەمەش هۆیەکی گرنگە بۆ دڵ بێخەمیی ، چونکە ئەوە پەیوەندیی بوون ئەگەیەنێ بە خوای بالادەستەوە . فەرموودەیەکی شەریفی پێغەمبەریش ﷺ هەیە کە ئاماژە بۆ حاڵەتی جۆرێك لە ئیمانی تاکە کەس ئەکات کە هەموو ساتێك خەریکی ذیکری خوایە ... هەمیشە ذیکری ئەکات ... بەردەوام بە دڵی هەستی پێ ئەکات و، بەردەوامیش بە رۆحی ئەیبینێ و ، هەست بە هێز و توانای ئەکات و ، بەردەوام بە دوای رەزامەندیی ئەودا ئەگەڕێ ..

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ باسی حاڵەتی تایبەتیی نەکات ، وەك دەست نوێژ گرتن لە هەل و مەرجی سەختدا و ، رۆیشتن بۆ مزگەوتە دوورەکان تا ژمارەی هەنگاوەکانی زیاتر بێت و ، چاوەڕوانیی نوێژ لە دوای نوێژ لە مزگەوتدا و ، فەرمایشتی : (( فذلکم الرباط ... فذلکم الرباط ... فذلکم الرباط )) [٣٩] یش کۆتایی بە فەرموودەکە نەهێنیێ .

(( رباط )) یش بریتییە لە پاسەوانیی لە کەلێنەکاندا . کەواتە مانای : ﴿ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴾ ئەمەیە : بە چاودێریی و پارێزگاریی خوایی پشت گیریمان لە دڵەکانیان کردووە . شتێکی سروشتییشە کە هەرکەسێ گەیشتە وێنەی ئەم ( رباط ) ە و ئەم دڵدامەزراوییە ، شوێنکەوتووی حەق ئەبێت و ، ئازا و چاونەترسیش ئەبێت ..

وێنەی ئەو خەڵکەی کە ئەم جۆرە ئیمانەیان هەیە ﴿ إِذْ قَامُوا ﴾ هەستانە سەرپێ تا دەنگی حەق لە دژی دڵە مردووەکان و لە دژی لادان لە ژێریی بەرز بکەنەوە . ئەوەتا سارتەر و کامۆ و مارکۆس ، بە هۆی ئەو ئەدەبی یاخێتییەوە کە گوزارشت لەو فەلسەفەی وجوودییە ئەکات کە بڕوایان پێی هێناوە ، لەناو ئەدەبی جیهانییدا جێی خۆیان کردۆتەوە . لە دژی هەموو عادەت و باوێکی کۆمەڵگا و هەموو بەهایەکی دینیی و خێزانیی یاخیی بوون و ، بە گاڵتەجاڕیان وەصف کردن ..

بەڵام یاخییبوونی هاوەڵانی ئەشکەوت لەو شێوازە نەبوو .. ئەوان یاخیی بوون، بەڵام دوای ئەوەی کە ( بەدیل ) یان دیاریی کرد : ﴿ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ . واتە یاخییبوونەکەیان بریتیی نەبوو لە کاری رووخاندن و ریشك بڕین ، بە وێنەی کردەوەی وجوودییەکان . بەڵکو بریتیی بوو لە کاری بنیات نان

---

[٣٩] مسلم ، الطهارة : ٤١ ، النسائي ، الطهارة : ١٠٦ ، الترمذي ، الطهارة : ٣٩ ، الموطأ ، السفر : ٥٥ .

و، چاك كردنەوە و ، كاری پەیوەندیی دروست كردن لەگەڵ پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوییدا ، كە هەموو شتێكی لە ئاسمانەكان و زەوییدا بەدیی هێناوە و ، جوانترین شێوەش تەقدیری كردوون . واتە ئەوان پێشەنگی هەڵمەتێكی نوێخوازیی ئاڵوگۆڕكردن ( بدیل ) بوون . پاشانیش : ﴿ لَن نَّدْعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴾ . كەواتە :

١ ـ ناتوانین جیابوونەوەیان لە كومەڵگا و پەنابردنیان بۆ ئەشكەوتەكە بە كاری هەڵاتن سەیر بكەین . بەڵێ ... دووركەوتنەوە و جیابوونەوەیان لە كۆمەڵگاكەیان وەك دووركەوتنەوە و جیابوونەوەی ترسنۆكان نەبوو ، بەڵكو ئەوە هەڵ ئەگرێ كە كۆچ كردنیان لە شارەكەیان بە وێنەی كۆچ كردنەكەی عومەری كوڕی خەططاب بووبێ خوا لێی رازیی بێت ، كە ئەوەبوو كەمێك پێش كۆچ كردنی چوو بۆ كەعبە و بە خەڵكەكەی فەرموو : ( هەر كەس ئەیەوێ ژنەكەی بێوەژن بخات و منداڵەكانی هەتیو بخات با دوام بكەوێ ).[٤٠]

بەڵێ ، هەڵاتن بوو ، بەڵام هەڵاتنێك لە جۆری ئەوەی كە قورئانی پیرۆز باسیكردووە : ﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ ( الذاريات : ٥٠ ) . واتە هەڵاتن بۆ لای خوا و پەنابردن بۆی .

٢ ـ ئەم جۆرە یاخییبوونە كە دووركەوتنەوەشی بە دوادا هات ، هۆیەك بوو بۆ رەنگدانەوەیەكی نوێ بۆ فیكر و بیروباوەڕیان لەسەر كۆمەڵگاكەیان لە دووتوێی چەندین تەفسیری جۆر بە جۆردا بە بۆنەی جیاوازیی كاتەوە . ئەو هاوارە بە جەرگەیان بووە هۆی شۆكاندنەوەی مێشكی خەڵكێكی زۆری كۆمەڵگاكەیان و، نەرم كردنی دڵی زۆرێك لێیان . ئەوەبوو فیكر و بیروباوەڕ و دەنگ و باسی رەفتاری ئازایانەیان لە زمانێكەوە بۆ زمانێك و ، لە دڵێكەوە بۆ دڵێك

---

[٤٠] الحلبي ، ( إنسان العيون ) الجزء الثاني : ١٨٣ ـ ١٨٤ .

گوازرانەوە، هەتا هەموو کۆمەڵگایان گرتەوە ، بە وێنەی کۆمەڵە تۆوێـك کـە لـە ناو گڵدا بچێنرێن ، پاشان سەوز بن و ، گەشە بکەن و ، ببنەگوڵی گەشاوە .

٣ ـ ئەگێڕنەوە کە هاوەڵانی ئەشکەوت کەسانێکی سەر بـە دەسـتەی کۆشـکی پادشا بوون . نەبووە کەسێکیش سەر بە دەستەی کۆشك بێت و ، واز لەو ژیانە پڕ خۆشیی و بەختـەوەریی و خـۆش گوزەرانی‌یـە بهێنـێ کـە تیایا ئـەژیی و ، بچـێ رێگایەك کە دژی پادشـا و هـەر هـەموو کۆمـەڵگا بێـت بی‌گرێتـە بـەر . ئـا لـەو کاتەدا رەفتارێ لەو شێوەیە شتێك نەبووە کەسێك دیبێتی، یان ئالوودەی بووبێ .
بێگومان ئەم رەفتارە کـە لـە هـاوەڵانی ئەشـکەوت وەشـایەوە سـەرنجی خـەڵکیی راکێشا بۆ لایان . جا ئەنجام دانی رەفتارێکی وەها کە لـەوەو پـێش رووی نـەدابێ لـە پێنـاوی دینێکـی دیـاریی‌کراو و فیکرێکـی دیـاریی‌کراودا و، قبـووڵ‌کردنی قوربانیی‌دانێکیش بەوپەڕی سنگ فراوانی‌یەوە کە بە بیری کەسێکیاندا نـەهاتبێ، شۆکاندنەوەیەکی توندی لە کۆمـەڵگادا بـەرپا کـرد ، کـە سـەرنج و وردبوونـەوەی خەڵکیی بۆ لای بانگەواز و پەیامەکەیان راکێشا .

٤ ـ ئەگەر هاوەڵانی ئەشکەوت بڕیاریـان دابـێ پـەنا بەرنـە بـەر ئەشـکەوت و تیایا بمێننەوە ، هەتا پادشا بمرێ و زوڵم و ترسی دەوڵەت نـەمێنێ و ، دوای ئـەوە سەر لە نوێ بگەڕێنـەوە نـاو خـەڵك و بـانگ بـۆ دینـە حەقەکـەیان بکـەن ، ئـەوا ماوەی مانەوەیان لە ئەشـکەوتەکەدا (( واتـە مـاوەی ٣٠٩ سـاڵ ، ﴿ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعًا﴾ )) . هەر هەمووی بە خواپەرسـتیی ئەنووسـرێ بۆیـان و، بە هۆی نیـەتی چـاك و قـووڵیی ئـەو نیەتەیانـەوە ، پاداشـتەکەی وەرئـەگرن .
لەبەر ئەوە بە هـەر شـێوەیەك بێـت بـە سـەرکەوتوو لـە قەڵـەم ئـەدرێن . چـونکە کەسێکی ماندوو کە سەر ئەخاتە سەر سەرین بە نیەتی هەستان بۆ نوێـژی عیشـا بە شێوەیەکی چاکتر و لە حاڵەتی حەسانەوەدا ، ئەوە خەوەکەشی بە خواپەرسـتیی بـۆ ئەنووسـرێ . لەبـەر ئـەوە پێویسـتە خۆشـاردنەوەی هـاوەڵانی ئەشـکەوت بـە

شێوەیەك سەیر بکرێ کە نیەتیان وەها بووە جارێکی تر ، دوای تێك شکانی توندوتیژیی کوفر ، بگەڕێنەوە بۆ بلاوکردنەوەی بانگەوازەکەیان . جا ئەگەر تۆ لەسەر ژیانی خۆش‌گوزەرانی کۆشك و ، خەوتن لەسەر فەرشی نەرم و شل ڕاهاتبی و ، وازت لەو ژیانە هێنا و ، فەزڵی خەوتن لەسەر بەردی ڕەق و تەق بدەی بە سەریا و، فەزڵی هاوەڵێتیی صەگێك بدەی بەسەر هاوەڵێتیی کۆمەڵێك خەڵك‌دا کە بە ژن و بە پیاوەوە بە ڕێز و ئیحترامەوە لەبەر دەمت‌دا بوەستن ... ئەگەر تۆ وەها بی ، ئایا شتێکی سروشتیی نیە کە چاوەڕوانی ئەو جۆرە پاداشتە ببی ؟ ... بەڵێ .. شتێکی سروشتی‌یە خوای گەورە پاداشتێکیان بداتەوە کە هاوتا بێ لەگەڵ قووڵیی نیەتە چاکەکەیان‌دا .

٥ ـ لە ڕاستییش‌دا ئەشکەوت شوێنی تەواوکردنی کاری خۆ کۆك‌کردنە و، جێگای ئەوەیە مرۆڤ خۆی تیایا بدۆزێتەوە ... بۆچ ؟ چونکە خەبات کردن لە دژی کوفر ( بە تایبەت لەو کاتانەدا کە هیچ هاوسەنگی‌یەك لە نێوان هێزی کوفر و هێزی ئیمان‌دا نیە ) و ، شۆکاندنەوەی و ، پاشان زاڵبوون بە سەری‌دا مەگەر بە عەزمێك ئەنجام بدرێ کە لە عەزمی پێغەمبەرانەوە نزیك بێت .

سەرنجی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بدە : ئایا لە ئەشکەوتێك‌دا شەش مانگی بەسەر نەبرد بۆ سەرنج‌دان و بە خۆداچوونەوە لە پێناوی تەواوکردنی خۆ ئامادەکردنی پێویست بۆ وەرگرتنی وەحی ؟ دەش‌بینین ئەوانەی دوای ئەویش هاتن ، ئەوانەی کە لەسەر بەرنامەی ئەو ڕۆیشتن ئەبێ ماوەیەك ژیانیان لە ئەشکەوتێك‌دا بەسەر بردبێ . بەڵێ ، ئیمام غەزالیی و ، ئیمام سەرهەندیی و، مەولانا خالید و ، بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسیی ماوەیەك لە ژیانیان لە ئەشکەوت‌دا بەسەر بردووە . ماوەیەك بۆ خۆ کۆك‌کردن و ، ماوەیەك بۆ پیاچوونەوەی نەفس . ماوەیەك کەنارگرتن بۆ کۆکردنەوەی وزە و هێز ، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئیلحاد و ، تێکۆشان لە دژی . بڕی ئەم ماوەیەش بۆ پێغەمبەرمان ﷺ شەش مانگ و ، پێنج ساڵ یان دە ساڵیش بۆ ئەولیا و

ئەصفیاکان ، بگرە هی وایان هەبووە کە ماوەی ژیانی گۆشەگیریی شەصت ساڵی خایاندووە .

لە راستیی‌دا هەمان شت ، لە سەردەمە مێژوویی‌یە جیاجیاکان‌دا ، بۆ ئەو کۆمەڵانەش دووبارە ئەبێتەوە کە بزووتنەوە نوێ‌خوازی‌یەکان ئەنجام ئەدەن و، مرۆڤایەتیی ئەگێڕنەوە بۆ سەر عەقڵ و ژیریی خۆی و ، بۆ سەر شەقامی رەوتی راست و دروستی خۆی .

بەڵێ ، ئێمە ماوەی گۆشەگیریی ئەشکەوت بە لای هەموو ئەوانەوە ئەبینین کە بوونەتە نوێنەری رۆحی ئەم گەنجێتی‌یە. مرۆڤ بۆ ئەوەی ببێتە دەرخەری هەندێ لە نیعمەتە خوایی‌یەکان و ، ئیلهامە ئاسمانی‌یەکان ، پێویستە ماوەیەك ژیانی ئەشکەوت بەسەر بەرێت .

دوای پیشان‌دانی ئەمەی پێشەوە دەربارەی ئەم مەسەلەیە ، ئیتر ورووژاندنی هەندێ پرسیار و ، چوونە ناو چەندین کاری چەواشەکەرەوە کە قورئان و سوننەت لەم مەسەلەیەدا ئاماژەیان پێ نەکردبێ ، وەك دیاریی‌کردنی شوێنی ئەشکەوتەکە، یان دیاریی‌کردنی ناوی ئەو کاربەدەستە زاڵمانە و قەومەکەیان کە زوڵمیان لە هاوەڵانی ئەشکەوت کرد شتێکی راست نیە . هەر شتێ لە شێوەی ئەمە بە نوقلانە و پاشخوانی زانیاریی ئەژمێررێ و ، هیچ زانستێکی رۆحانیی، یان دڵیی ، یان تاسەمەندیی دەست رۆح و ئیمان ناخات .

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴾ وصل اللهم على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه أبداً .



﴿ وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ ۚ لَوِ ٱطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴾ ( الكهف : ١٨ ) .

هاوەڵانی ئەشکەوت کۆمەڵە گەنجێکی پاڵەوان بوون کە لە پێناوی گەیاندنی دینەکەیان دا گیانیان خستە سەر لەپی دەستیان . کاتێکیش کە قورئانی پیرۆز بە شێوازە تایبەتی‌یە پەسەندەکەی خۆی باسەکەیان پێشکەش ئەکات ، ئیشارەت و ئاماژەی جۆر بە جۆر هەتا رۆژی قیامەت بە خاوەن بانگەوازەکان ئەدات. بەڵێ... لەسەر بانگەوازکاران و ئیرشادکاران پێویستە ، هەر لە سەرەتاوە ، بە وێنەی هاوەڵانی ئەشکەوت ، بە چەندین ( شحنە ) ی رۆحیی خۆیان کۆك بکەن و، بەم جۆرە قۆناغەش‌دا تێپەڕ بکەن ..

جا هەروەك ئەگونجێ ئەمە بە بەسەربردنی ماوەیەك لە ئەشکەوتەکان‌دا ئەنجام بدرێ ، وەهاش ئەگونجێ ئەمە بە رێگای ئەو هاوەڵانە خوا لێیان رازیی بێ ئەنجام بدرێ ، کە بە ماوەیەکی کۆك کردن و تیژکردنەوەی هێزی رۆحی‌یان‌دا لە ( دار الأرقم ) تێپەڕیان کرد .

دیارە مەرج نیە لێك چوونێکی حەرفیی لەم باسەدا هەبێت ، چونکە رووداوە مێژوویی‌یەکان ، لە چوارچێوەیەکی گشتیی‌دا ، لە چەندین شێوازی لێك چوودا روو ئەدەن .

لەبەر ئەوە شتە گرنگەکان بە نیسبەت ئەوانەوە ، بە پێوەرێکی گەورەش بە نیسبەت ئێمەوە گرنگن ، ئەمەش دوای تێگەیشتنێکی جوان لەو بانگەوازەی کە ویستراوە بڵاو بکرێتەوە و ، تەبلیغ بکرێ و ، پەی پێ ببرێ . هەروەها ئەنجام دانی ئەم بانگەوازە ، بەوپەڕی هیچ نەویستیی و ئیخلاصەوە ، ئەمەش دوای بەسەربردنی ماوەیەك ئیعتیکاف و خەڵوەت و روو لە خوانان بۆ گەیشتن بەو ئاستە رۆحی‌یە پێویستەی کە توانای لێ‌چوون و تێگەیشتن لە بانگەواز و توانای تەمسیل کردنی بانگەوازیان بۆ جێبەجێ ئەکات .

ئەگەر بێینە سەر ئایەتەکەش ئەبینین صەگەکەیان لـە دەرگـای ئەشـکەوتەکەدا خۆی مەلاس داوە و فـەرمانبـەرداریی پاسـەوانیی‌یان و پاراسـتنیان لـە مەترسـیی ئـەنجام ئـەدا ، بـەلام یـەکێك نیـە لـەوان و ، قورئـانی پیرۆزیـش بـە شـێوازە پەسەندەکەی خۆی ئەو جیاوازی‌یە سروشتی‌یە دەست نیشان ئەکات و ئەفەرموێ :

﴿ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾ واتـە : کاتێـك باسـی ژمـارە و کۆیـان ئەکات صەگەکە بە جیا ناو ئەبات . سەرەڕای ئەوەش کاتێك کە حاڵ و بارودۆخی صـەگەکە دەرئەکـەوێ ، کـە بـە شـێوەیەکی پڕ سـام و هەیبـەت بـۆ پاصـەوانیی وەستاوە و ، دڵی کەسانی تری پێ دائەکـەوێ ، بـە رادەیـەك کـە هـەر کەسـێ لـە دوورەوە چاوی لێیـان بوایـە لـە ترسـاندا لێیـان هـەڵ ئـەهات . ئەمـەش چـەندین دیمەنی جوان وەصف کراون .

١ ـ ئێستاش با هەوڵ بدەین بە پەلە چاوێك بـەو نوکتانـەدا بخشـێنین کـە ئـەم ئایەتە پیرۆزە بە ئیلهام ئەی‌خاتە دڵەوە : لـە هـەموو سـەردەمێکدا پالـەوانان بـە وێنەی هاوەلانی ئەشکەوت هەڵ ئەکەون و ، کەسانێکیش هـەن کـە پەیوەنـدی‌یان پێوە ئەکەن و ، پێکەوە لە چوارچێوەیەکی گشتیی فیکر و هەستدا رێگا ئەگرنـە بەر ، ئەگەرچیی لە هەموو وردەکاری‌یەکاندا لەسەر هەمان رێ نەبن .

٢ ـ بـەردەوام لـە هـەموو سـەردەمێکدا کەسـانێك هـەن کـە ئـەم ژیانـەی ئەشکەوت بەسەر ئەبـەن ، یـان ناچـاری ئـەم جـۆرە ژیانـە ئـەکرێن . لەبـەر ئـەوە لەسەریان پێویستە کە پاصەوانیی خۆیان پشت گـوێ نەخـەن ، چـونکە لەوانەیـە ـ دوای قۆنـاغێکی دیـاریی‌کراو ، دەسـت بکـرێ بـە هێـرش کردنـە سـەر خۆیـان و ماڵەکانیان و دامەزراوەکانیان . لەبەر ئەوە لەسەریان پێویستە تەگبیری پێویسـت بکەن ، بگرە پێویستە صەگی راهێنراو لەبەر دەرگای ماڵەکانیان راگیر بکەن .

٣ ـ پێویستە ئەو جۆرە صەگانە صەگی ئاسایی نەبن ، بەڵکو لەو جۆرە بن کە روو بـە رووی هـەموو ئـەو مەترسـی‌یانە بوەسـتن کـە لـە دەرەوە دێـن و

بەزەنگارییشیان بکەن و ، پێویستە بارودۆخ و دیمەنیشیان بە جۆرێك بێت کە ترس بخەنە دڵی زەلامە خراپ ویستەکانەوە .

مرۆڤ بە رادەی لەخۆگرتنی بەها مرۆیی‌یەکان مرۆڤە . هەر کاتێك ئەو بەهایانەی لە دەست دا ئەوا ﴿ کالأنعام بل هم أضل ﴾ . وەك ئاژەڵ وەهایە ، بەڵکو گومڕاتریش . ئایەتێکی تریش هەیە کە روون کردنەوەی زیاتر بەم باسە ئەبەخشێ .



﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُوا۟ بَيْنَهُمْ ۚ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۚ قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ ﴾

( الكهف : ١٩ ) .

کاتێك کە شەرحی ئایەتی چواردەهەمی ئەم سوورەتەمان کرد ، شەرحی پاڵەوانێتیی هاوەڵانی ئەشکەوتمان کرد . بەلاَم لێرەدا باس لە پاڵەوانێتیی دووهەمیان ئەکەین . کورتەکەشی ئەمەیە کە کاتێك یەکێکیان چوو بۆ بازاڕی شارەکە تا شت بکڕێت ، سەرنجی خەڵکەکەی راکێشا ، سا ئیتر بە جل و بەرگەکەی بێت ، یان بە جۆری پارەکەی ، تا ئەوەبوو خەڵکی شارەکە ـ لە ریوایەتێکیش‌دا والیی ـ کەوتنە دوای ، تا ئەوەبوو هاوەڵانی ئەشکەوتیان لە ئەشکەوتەکەیاندا دۆزینەوە.

ئەمە بووە مایەی ئیمان زیاد بوونی هەزارەها و سەدان هەزار لەوانەی باسەکەیان لە باوك و باپیریانەوە گێڕایەوە ، یان لە کتێبەکاندا خوێندیانەوە .

ئەوەبوو ئەو ئیمانەیان لە (علم الیقین ) ەوە گۆڕرا بۆ پلەی ( عین الـیقین ) ، یـان بـۆ دواتریشـی و، ئـەم رووداوە ئـەو کۆمەڵـەی بـە توندیی هەژانـد و ، خـەڵکیی دەستیان دایە پێشـبڕکێ بـۆ وەرگرتنـی دیـن . بـەم جۆرە قـەدەری خـوایی کـاری دووهەمی بانگەوازی بۆ ئەم پاڵەوانانـە ئامـادە ئـەکرد و ، کـاتێکیش کـە خۆیـان ماڵ ئاواییی‌یان لە ژیانی دنیا ئەکرد ، هەزارەها کەسیان بۆ ئاسۆی بانگەکـەیان و فیکرەکەیان بەرز کردەوە .

دووهەم شتێکیش کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا سەرنج رائەکێشێ بریتی‌یە لە پـارە و سامان . ئەنجامەکەشی هەر چۆنێك بوو بێت ، ئەوا پارە ـ واتە مـاڵی دنیـا و زرق و برقی ـ خۆیان و شوێنەکەیانی ئاشکرا کرد. چونکە خەڵکی شـارەکە (یـەملیخا) یـان ـ ئەگـەر کڕیارەکـە ئـەو بـووبێ ـ لـە رێـی پارەکەیەوە ناسـیی . ئـیتر کـە سەرەنجامەکە بە ئیجابیی ئەبێت ئەوە لوتفێکی خوایی‌یە . بـەلاّم پارەکـە ئـەوانی ئاشـکرا کـرد . کەواتـە پیـاوی فیکـر و بانگـەواز ئەگـەر حـەز ناکـات لـە لایـەن دوژمنانەوە ، یان لـە لایـەن دۆسـتانەوە ، یـان لەلایـەن کۆمەڵگاکەیـەوە تووشـی گرتن ببێت ، ئەوا لەسەری پێویستە نەك تەنها لە خۆش ویستنی قازانج و دەسـت کەوت دوور بکەوێتـەوە ، بـەڵکو پێویسـتە لـە هـەموو لاوازی‌یـەکی دنیـایی لـەو بوارەدا دوور بکەوێتەوە .

داخۆ رابووردوو چەند پیاو و چەند سـوڵتانی گـەورەی بـە خـۆوە دیبـێ بوونـە دیلی ماڵ و سامانی غـەددار ؟ داخۆ چەند جاریش ئەو لاوازی‌یەی کە لە فیطرەتـی مرۆڤ دایە وەبەر هێنرابێ ( ئیستیغلال کرابێ ) و ، بەو بۆنەوە چـەندین کۆمـەڵگا تیاچووبن و ، چەندین ئوممەتیش زەلیل بووبن ؟ بەلاّم لەگەڵ ئەوەش‌دا ئێستا بـلاّو بوونەوەی دین لە جیهان‌دا پشت بە پـارە نەبەسـتێ ، واتـە پشـت بـە سـەرمایە و پشت بە پڕۆژە بانگەوازی‌یەکان ئەبەستێت .

تکایە سەرنجی ئەوە بگیرێ کە کاتێ هاوەڵانی ئەشکەوت بە پارەیەکی کەمەوە لە ماڵ دەرچوون ، چۆن تـەقینـەوەی دینیـی دووهـەم لـەو کۆمـەڵگایـەدا رووی دا ،

لەبەر ئەوە ئەمە لایەنێکی گرنگە لەم باسەدا . واتە نابێ بابەتی سامان بەخشینی ماددیی پشت گوێ بخرێ ، بەڵام بەو مەرجەی کە دەقە ئیسلامییەکان چ ئایەت و ، چ فەرموودە و ، چ هەڵس و کەوتەکانی پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ و چاوساغ بن بۆمان .

بەڵێ پێویستە موسڵمان کاسپیی بکات و دەوڵەمەندیش ببێ ، بەڵام بەو مەرجەی خۆشویستنی پارە بەسەر دڵ و دەروونیدا زاڵ نەبێ . بەڵکو ئەو پارەیە لە شوێنێکی پارێزراودا دابنێ ، بە تەعبیری فەقیهەکان لەوە دوور بێ کە دەستی دزانی بگاتێ ، پاشان لە کەڵك و قازانجی ئوممەتدا خەرجی بکات . جا ئەگەر ئەو سامان بەخشینە نەبێ ئایا ئەو پرۆژە گەورانە جێ بەجێ ئەکرێن ؟ ... کەواتە هێزی ماددیی رۆڵێکی گەورەی هەبووە لە بلاوکردنەوەی دینی ئیسلامییدا . لەبەر ئەمە لەم لایەنەوە هەر کۆششێك بۆ دەست خستنی سامان بکرێت ئەوا بە خواپەرستیی لە قەڵەم ئەدرێ ... بە خواپەرستیی لە قەڵەم ئەدرێ، ئەگەر ئەو سامانەی کە بە رەنج و تەقالایەکی ماددیی و فیکریی زۆر کۆ کراوەتەوە لە پێناوی بانگەوازی بەرز و بڵنددا خەرج بکرێ ، نەك لە پێناوی هەوا و ئارەزووەکاندا .



﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَهۡدِيَنِ رَبِّي لِأَقۡرَبَ مِنۡ هَٰذَا رَشَدٗا﴾

( الكهف : ٢٤ ) .

ئەگەر ئەو رێگایەی کە بۆ هیدایەت بۆ لای خوا مەبەستە ، بریتیی بێ لە گەیشتنی دین بە دڵ و رۆحی مرۆڤ و چوونە ناویانەوە و ، ویژدانی مرۆڤیش ئەو دینە و هەموو پێشکەشییەکانی قبووڵ بکات ... ئەگەر ئەمە ئەو رێگایە بێ کە

ئاماژەی بۆ کراوە ، ئەوا ئەوە لە یەهوودییەت و مەسیحییەت و ئیسلامدا لە سەردەمی جۆراوجۆردا بەدیی هاتووە . بۆ نموونە : لە ماوەی ساڵەکانی سەرگەردانیی دا ( تیە ) واتە لە ماوەی چل ساڵدا جوولەکە گەیشتنە ئەو ئاستە رۆحیيە . بەڵام مەسیحییەت کە بە درێژایی سێ صەدە تووشی چەرمەسەریی و چەوساندنەوە بوو ، ئەویش قبووڵ کرا و بڵاوەی کرد . بەڵام ئەگەر بێینە سەر باسی ئیسلام ئەبینین ئەو لە ماوەیەکی کەمتردا ، کە ماوەی بیست و سێ ساڵ بوو ، بە چاك ترین شێوە قبووڵ کرا . واتە ـ وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە ـ هیدایەتی لەوەش چاك تر و نزیك تر بوو . لەوانەشە ئەم ئایەتە لە بابەتی هەواڵی غەیبییەوە ئاماژە بۆ ئەمە بکات .

بەڵام ئەو فەرمانەی کە لە ئایەتی : ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴾ دا هاتووە ئەوە بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەوانەیە کە ذیکری ( إن شاء الله ) یان لە یاد ئەچێت ، یان ئەوانەی کە سەرنج دانی ئایەت و نیشانەکانی خوایان لە یاد ئەچێت و ، لە یاد و ذیکری خوا بێئاگا ئەبن و ، بە ئایەتی : ﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ﴾ ( البقرە : ٢٨٦ ) . ئاگاداریان ئەکاتەوە هەتا بگەڕێنەوە بۆ لای و ، لەو بێئاگاییەیان بە خەبەر بێن و رزگاریان بێت و ، پەنا بەرنەوە بۆ لای خوا و، پێیان ئەفەرموێ : کەفارەتی لەیادکردن و بێئاگایی ذیکری خوای باڵادەستە.

بەم شێوەیە و ، بەم جۆرە ذیکرەی خوا و ، بە گەیشتن بە ئاستی بەرزی هاوەڵانی ئەشکەوت کە بە ذیکری خوا کۆك کرابوون ، ـ بە لوطفی خوای باڵادەست ـ کورت ترین رێگا بۆ گەیشتن بە ویژدانی کۆمەڵگا دەرئەکەوێت و، سەرکەوتنیش ئەچێتە ناو بازنەی چاکویستییەوە . ئەمەش ئەوەیە کە کۆتایی ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ ئەکات .

  

﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴾ ( الكهف : ٢٨ ) .

ئەوەبوو موشریکەکانی قورەیش داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کردبوو کە هاوەڵە هەژارەکانی لە کۆڕەکانیدا دەر بکات و ، تایبەت مەندێتیی و یەکەمیی بۆ ئامادەبوونی ئەوان دابنێ . ئەوەش لەوانە بوو ، کە ئەگەر تایبەت مەندی‌یەکانی قەوارەی کۆمەلایەتیی ئەو دەمە بەرچاو بگرین ، وەها بیر بکرێتەوە کە بەجێ هێنانی ئەم داواکاری‌یە ئەبێتە هۆی هیدایەت‌دانی ئەوانە و ، موسلمان بوونی زۆرێکی تریش بە شوێن‌کەوتنی ئەوان .. بەلام وەحی ئاسمانیی هاتە سەر پێغەمبەر ﷺ ( کە هێشتا بڕیاری لەسەر ئەو باسە نەدابوو ) تا لە بڕیاردانی راست‌دا یارمەتیی و هاوکاریی بکات و ، جارێکی تریش جەختی لەسەر بکاتەوە کە بە دەست هێنانی رەزامەندیی خوای بالادەست بنچینەیە و، زۆریی و چەندێتیی هیچ بایەخێکیان نیە و ، ئەوانەی ئەو مەرجانەی بۆ ئامادەبوونیان لە کۆڕی پێغەمبەردا داناوە بێ‌ئاگان و تەنها دنیا و ئارەزواتی دنیایان مەبەستە .

ئێمە چاك ئەزانین کە ئیسلام ، بێ ئەوەی خۆی بەسەر گۆچانی هیچ رژێمێك یان هیچ کەسێك‌دا بدات ، ئەتوانێ لەسەر هەردوو پێی خۆی بووەستێ و ، بە شوێن‌کەوتنی ئەم دەولەمەندە یان ئەوی تر ، یان ئەم چینە ئوروستوقراتی‌یە یان ئەوی تر هیچ ناوبانگ و بلندی‌یەکیش بە دەست ناهێنێ . ئیسلام تەنها ئەو دینامیکی‌یە خۆیی‌یەی کە هەیەتی بەسیەتی .. هەر بەو هاتۆتە بوون و، هەمیشەش پێی دێتەوە بوون ، چونکە ئەو هێزەی ئەو کە تێك ناشکێنرێ لە خوای بالادەستەوەیە . کەواتە هەرکەس دەستی پێوە بگرێ ، بەهێز و شکست نەخواردوو ئەبێت و ، هەرکەسیش پشتی تێ بکات زەلیل . لە مێژووی ئیسلامیی‌ش‌دا بەلگەی زۆر لەسەر ئەوە هەن ..

قورەیش بە هۆی غروور و خۆ بەگەورە زانین و خۆپەرستیی و زوڵمیەوە ئەمەی داوا ئەکرد ، بەڵام ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەبوایە لە کۆڕی ئەو دوور بخرێنەوە و لێی بێبەش بن ، صوهەیب و بیلال و عەممار و یاسر بوون خوا لێیان رازیی بێ ، کە لە موسڵمانە هەژارەکان بوون . قورەیش وەهایان ئەگەیاند کە ئامادەی کۆڕی پێغەمبەر ﷺ نابن مەگەر ئەوانە لە کۆڕی دانیشتنی دەر بکات و نەهێڵێ ئامادەی بن . ئای چ مەرجێکی ناماقوڵە و ، چ داوایەکی ناپەسەندیشە !!

سووك سەیرکردنی موسڵمانە هەژارەکان ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نووح پێغەمبەر سەلامی لێ بێ ، کە ئەوەبوو موسڵمانەکانیان بە ( أراذل ) وەسف ئەکردن و ، داواشیان لە نووح پێغەمبەر ئەکرد کە لە خۆی دووریان بخاتەوە ، بەڵام ئەو وەڵامی دانەوە و فەرمووی: ﴿ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾( الشعراء : ١١٤). لەبەر ئەمە لە فەخری کائیناتیش موحەممەد ﷺ چاوەڕوان نەئەکرا هەڵس و کەوتی پێچەوانەی ئەوە ئەنجام بدات ، بەڵکو بۆ دەربڕینی خۆشویستنیان ئەیفەرموو : ( المحیا محیاکم و الممات مماتکم ) . هەتا بە حزووری خوا گەیشتەوە هەر وای ئەفەرموو .



﴿ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴾ ( الكهف : ٥٠ ) .

هەندێك بە پشت بەستن بە وشەی (( ذریته )) وتیان : شەیتان ژن و منداڵی هەیە . لەبەر ئەوە بە سوودبەخشی ئەزانم باسی دوو بابەتی بچووك بکەین :

١ ـ هەتا ئەگەر شەیتان ژن و منداڵی هەبێ ، ئەوە پەیوەندیی بە جیهانێکی ترەوە هەیە کە بە تەواویی لەم جیهانەی ئێمە جیاوازە . جا هەروەك لە خەوماندا

ئەبینین وا نان ئەخۆین ، یان ئاو ئەخۆینەوە ، یان نەخۆش ئەکەوین ، یان ژن ئەهێنین ، ئا ئەمە لە جیهانی خەو و خەوبینیندا روو ئەدات کە جیهانێکی ترە .
کەواتە پێویستە وەچە و بەرەی شەیتان لەبەر رۆشنایی ئەمە تێ بگەین . ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەوەی نەکردووە کە ئێسقان رزقی جیننییە کە ئەفەرموێ : (( لا تستَنجوا بالرَّوثِ وَلا بالعِظامِ ، فإنهُ زادُ إخوانِكُم منَ الجِنِّ )).[41]
ئەفەرموێ : خۆتان بە شیاکە و ئێسقان پاك مەکەنەوە ، چونکە ئەوە خۆراکی خوشك و برا جیننییەکانتانە . ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر بوونی جیهانێکی تر کە شێوەی لەم جیهانەی ئێمە جیاوازە .

٢ ـ پێویست ناکات وشەی (( الذریة )) بە مانا راستەقینە و حەرفییەکەی لێك بدەینەوە . چونکە وەك ئەگونجێ مانای وەچە و بەرە بگەیەنێ بە پێی ئەو مانایەی کە ئەیزانین ، هەروەها ئەش گونجێ بە مانای وەچە و بەرەی مرۆڤ بێت .
لێرەدا چەندین فەرموودەی پێغەمبەر و حەقیقەتی کۆمەڵایەتیی و مێژوویی هەن کە پشتگیریی ئەم مانایە ئەکەن . بۆ نموونە کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاریی ژن و مێرد ئەکا بۆ وتنی دوعایەکی دیاریی کراو لە کاتی ژن و مێردییدا ، ئەفەرموێ ئەو منداڵەی کە لەو ژن و مێردییە پەیدا ئەبێ لە شەیتان پەنادراو ئەبێت .

جا لەوانەیە موسڵمانەکان لە سەردەمێك لە سەردەمەکاندا ، کاتێ کە ئەو دوعایەیان ئەخوێند ، وەچە و بەرەیەکی پاکیان لێ کەوتبێتەوە کە خزمەتی ئیسلام و موسڵمانان و قورئانی کردبێ . پاشان کە لەو دوعایە بێئاگا بوون ، یان کاتێك کە لە ئیسلام و لە ژیانی ئیسلامیی دوور کەوتنەوە بەرەیەکی شەیتانیی پێ گەیشت ، یان بە وتەی خەڵك بەرەیەك پێ گەیشت کە ئەتوانێ شەیتانیش بخەڵەتێنێ .

---

[41] مسلم ، الصلاة : ١٥٠ ، الترمذي ، الطهارة : ١٤ .

لەبەر ئەوە وای بە چاك ئەزانین وشەی (( ذرية الشيطان )) بە مانای مەجازیی لێك بدەینەوە ، چونکە ئەگونجێ ئەم مانایە لەسەر ئەو بنچینەیە تێ بگەین کە مرۆڤ هەرچەندە مرۆڤە بەلاّم ئەتوانێ بە وێنەی شەیتان بیر بکاتەوە و ، بە وێنەی شەیتان رەفتار بکات . قورئانی پیرۆزیش ئاماژە بۆ ئەوانە ئەکات کە ئەوانە ﴿ كَانُوٓاْ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ ﴾ ( الإسراء : ٢٧ ) .

* * *

﴿ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴾ ( الكهف : ٨٥ ) .

( ذولقەرنەین ) هێزی توانین و جێبەجێکردن و ، هەروەها هێزی ئاسان کاریی پێ بەخشرابوو .. هێزێکی وەهای پێ بەخشرا بوو کە بەوپەڕی ئاسانی‌یەوە بتوانێ بەسەر هەر کۆسپ و هێزێك‌دا ، کە بێنە بەردەمی ، سەر بکەوێ .

لەو ئایەتانەش‌دا کە باسی ( ذولقەرنەین ) ئەکەن ، ئەوە تێ ئەگەین کە ئەو لەبەردەم هاوسەنگیی جیهان‌دا نوێنەری ئیسلام بووە و ، بە سوپاکەشیەوە بەرەو ئەو ناوچانە رووی ناوە کە پڕ بوون لە ئاژاوە و پشێویی و فەساد و ، لەو ناوچە پڕ پشێوی‌یانەش‌دا بەنداو و بەربەستی لەبەردەم فەسادا دروست ئەکرد و، هاوسەنگیی و ئاشتیی دەستەبەر ئەکرد . واتە یەکێ بووە لەوانەی کە خوا دەسەلاّتی سەرزەویی پێ داوە و ، بنەڕەتێکیش بووە بۆ هاوسەنگیی لە نێوان دەوڵەتان‌دا . لەبەر ئەوە خوای گەورە هەموو ئامێر و هۆیەکی پێ بەخشیوە ، کە توانای ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی سەرشانی پێ ببەخشن و ، ئایەتی : ﴿ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴾ ( الكهف : ٨٤ ) . یش پشتگیریی ئەم مانایە ئەکات .

( ذولقەرنەین ) یش ئەیزانیی حیکمەتی پێبەخشینی ئەم توانایە و ، ئەم دەست رۆیشتنە زۆرە چی‌یە ، بۆیە ئەویش تا دوا مەودا ئەوانەی لە پێناوی بە دەست هێنانی رەزامەندیی خوایی و ، لە پێناوی جێبەجێکردنی هاوسەنگیی

سەرزەویی‌دا بە کار هێنان . بەمە بووە پیاوی هەڵگری فیکر و مەبدەء و، ئەوەش کە بۆی رام کرابوو لەو پێناوەدا بە کاری هێنا .

* * *

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴾ ( الكهف : ٩٠ ) .

کاتێک کە ( ذولقەرنەین ) خوا لێی رازیی بێت لە خۆرئاواوە رووی لە خۆرهەڵات نا ، وەك لە وەسفی ئەو خەڵکەدا دەرئەکەوێ کە لەوێ دیتنی، ئەگاتە ئەفریقیا . ئەو خەڵکە لەوێ خانوو بەرەیان نەبوو و ، نەشیان ئەزانیی خۆیان داپۆشن ، بەڵکو بە رووتیی ئەسووڕانەوە . واتە لە هەموو دیاردەیەکی شارستانیی بە دوور بوون .

هەروەها ئەتوانین ئەم مانایەی خوارەوەش لەم ئایەتانە دەربهێنین ، کە بریتی‌یە لەوەی کە کاتێ ( ذولقەرنەین ) دەستی دایە گەشت بەرەو خۆرهەڵات، گەیشتە شوێنێك کە هیچ بەربەستێك لە گرد یان چیا یان دار و درەخت لەبەردەم تیشکی خۆردا نەبوو . واتە ئەو خەڵکە هەر لە خۆر هەڵاتنەوە هەتا خۆر ئاوابوون تیشك و گەرمای خۆر لێی ئەدان ... یان جل و بەرگێکیان نەبوو کە لە تیشك و گەرمای خۆر بیان پارێزێت . تا ئێستاش لە هێڵی ئیستیوادا ، یان لە ناوچە گەرمەکانی بیابان‌دا چەندین نەتەوە هەن کە بە رووتیی یان نیوەڕووتیی ئەسووڕێنەوە . واتە نە داپۆشەرێکی سروشتی‌یان هەبوو و ، نە خانووبەرە و، نە جل و بەرگێکی ئەوتۆیان بە پێی جل و بەرگی ئەمڕۆ هەبوو ، بەڵکو چەند نەتەوەیەکی سەرەتایی و هیچ نەزان بوون .

* * *

﴿ قَالُواْ يَـٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴾ ( الكهف : ٩٤ ) .

لەوانەیە ئەم بەنداوە بەنداوی چین ، یان بەنداوی ( دمیرکابی ) لە قەفقاسیا ، یان بەنداوێك بێت لە شوێنێکی تردا .. بەڵام دوای هاتنی پێناسەی ئەم بەنداوە لە ئایەتەکانی داهاتوودا ، قسەکردن دەربارەی بەنداوێکی دیاریی‌کراو شتێکی گران ئەبێت . هەتا ئەگەر ئەو بەنداوەش هەبێ ئەوا دیاریی‌کردنی شوێنەکەی پێویستیی بە لێکۆڵینەوەیەکی ورد ئەبێت . لەبەر ئەوە پێویستە سەرنجی خەڵك بۆ لای ئەو کەسانە رابکێشرێ کە وان لە پشتی بەنداوەکەوە ، زیاتر لەوەی بایەخ پێدان ئاراستە بکرێ بۆ لای خودی بەنداوەکە . جا وا دەرئەکەوێ کە ئەو خەڵکە لە خێر و بێرەوەیی‌دا بێننەوە ، مادەم دەستیان بە بەها مەعنەوی‌یەکانیانەوە گرتبێ و، بتوانن فیتنەی یەئجووج و مەئجووج قەدەغە بکەن ، یان بە لایەنی کەمەوە بتوانن سنوور بۆ ئەو زیانانە دابنێن .

ئێمە وای بۆ ئەچین کە لەسەرمان پێویستە لە چیرۆکی ( ذولقەرنەین ) دا بە دوای چەندین حوکمی گشتیی‌دا بگەڕێین ، وەك مەرجەکانی مانەوە و بەردەوامیی دەوڵەت و ، مەرجەکانی سەرۆکی دەوڵەت ... تد ، خۆ بە پێچەوانەی ئەوەشەوە ئەوا ئێمە تەنها رووداوێکمان لە دوو توێی مێژوویەکی دووردا گێڕاوەتەوە . ئەمەش ئەو مانایە ئەبەخشێ کە ئێمە ئەتوانین سوودێکی زۆر لە قورئان وەربگرین ، یان ئەو سوودە یەکجار کەم ئەبێت .

شتێکی تریش هەیە و پێمان خۆشە ئاماژەی پێ بکەین ، کە بریتی‌یە لەوەی کە ( ذولقەرنەین ) ـ کە نوێنەری عەدالەت و راست ڕەویی بووە لە سەرزەویی‌دا ـ یارمەتیی دەستەوسانەکان و ماف پێشێل کراوەکانی داوە . ئەگونجێ ئەو ستەم

لێکراوە دەستەوسانانە تورك بووین ، یان ئوممەتێکی تری ستەم لێکراو بووبن. ستەمکار و خراپەکارەکانیش قەومی یەئجووج و مەئجووج بوون . ( ذولقەڕنەین ) یش لە وەستان لەبەردەم ئەو خراپەکارە توغیانکەرانەدا ، کە دوژمنی دین و شەرەف و ئوممەتن ، هیچ دوودڵی‌یەکی نەنواند . لەو بارەشەوە مێژوو دووبارە ئەبێتەوە و ، ئەوانەش کە لە هەموو سەردەمێکدا خوا کاروباری سەرزەوی‌یان پێ ئەسپێرێ هاووێنەی ئەو ستەمکارانە لە سنووری خۆیاندا ئەوەستێنن ، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴾ ( الأنبياء : ٩٦).

واتە: ئەو بەنداوە بە هێزە توند و تۆڵە دائەڕمێ و ، فەسادکارە ستەمکارەکانیش، کە لە وەچە و بەرەی ئەو کۆمەڵە ستەمکارەن ، دەست ئەدەنە بلاوەکردن لە هەموو دەشت و دەر و ولاتێکدا ..



﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ (الكهف : ١١٠).

واتە لە بارەی بەدیی هێنانەوە و ، لە روانگەی ریزەمانەوە بۆ پەرستراو هیچ جیاوازی‌یەك لە نێوانماندا نیە . بە دارشتنێکی تریش بۆ زاتی خوایی دەربارەی نزیکیی لێمانەوە و حوکمی بەسەرماندا و ، لە روانگەی دوورییمانەوە لێی و بەندایەتییمان بۆی .

بەڵێ ! ... لە غەیری خوای پاك و بالادەست هیچ کەسێکی تر نیە ئەوەندە بلند و بێ ئاتاج بێت ، بە جۆرێ کە ئێمە ملی بەندایەتیی بۆ کەچ بکەین و، هیچ بەدیی‌هێنراوێکیش نیە ئەوەندە بچووك و سووك بێت ، بە جۆرێ کە لەبەردەم هیچ کەسێکی تردا لە غەیری خوا بچەمێتەوە و زەلیلیی بنوێنێ ..

بە دارشتنی بەدیعوززەمانی نوورسییش :

*(( هەروەك هەموو مەوجوودات لە بارەی دووری‌یانەوە لەوەی کە مەعبوود بن یەکسانن ، هەروا لە بارەی ئەوەش کە مەخلووق بن یەکسانن ))* .[42]

لە هەمان کاتدا ئەم ئایەتە پەرچ و وەڵامە لەسەر ئەو زیادەڕەوی‌یەی کە دەرهەق بە چەندین پێغەمبەری بەڕێز ، وەك عیسا و عوزەیر سەلامیان لێ بێ ، ئەنجام دراوە کە ئەوەبوو بۆ پایەی خوایەتیی بەرز کرابوونەوە . بێگومان شتێکی سروشتی‌یە کە مرۆڤێك ـ بە تایبەت ئەگەر پێغەمبەرێکی بەڕێز بێت ـ جۆرە نزیکی‌یەکی لە خواوە هەبێت ، بەڵام ئەو نزیکی‌یە نابێتە بەڵگە و پاساو بۆ بەرزکردنەوەی هەر مرۆڤێك بۆ پلەی خوایەتیی . جا لەبەر ئاگادارکردن بۆ ئەم کارە وردە پێغەمبەر ﷺ ـ سەرەڕای کەمالاتی زۆر و زەبەندەی ـ ئەفەرموێ : ( إنني بشر مثلكم ) . منیش مرۆڤێکم وەك ئێوە ، بەڵام جیاوازی‌یەك لە نێوان من و ئێوەدا هەیە کە ئەویش ئەوەیە من ( يوحى إلي ) وەحیم بۆ دێت . بەڵام خواتان هەر یەك خوایە . واتە لە دوو توێی ئەم جیاوازی‌یانەدا جەخت لەسەر یەکسانیی لە بەندایەتیی‌دا ، لەبەردەم یەك مەعبووددا ، کرایەوە . بەم جۆرە ئەبینین ئەم ئایەتە سەرەڕای ئەوەی کە پەرچە بۆ ئەوانەی عیسا و عوزەیریان سەلامیان لێ بێ گەیاندبوونە پلەی خوایەتیی ، لە هەمان کاتدا موسڵمانانیش لە پلەی راستەقینەی پێغەمبەری بەڕێزمان ﷺ ئاگادار ئەکاتەوە .

* * *

---

[42] كليات رسائل النور ، اللمعات ، الجزء الأول ص ٦٤٢ .

﴿ وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِى وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴾ ( مريم : ٥ ) .

تەفسیرکردنی داواکاریی کوڕێك لەلایەن زەکەریاوە سەلامی لێ بێ لە پەروەردگاری ، بەوەی کە قەدەری خوایی بە دڵ نەبووبێ و لێی نارازیی بووبێ، شتێکی راست نیە . چونکە چەندین کار هەن کە لەسەر ئەو داوایە وەستاون. یەکەم زەکەریا سەلامی لێ بێ پێغەمبەرێکی خاوەن پەیامە بۆ سەر بەنی ئیسرائیل رەوانە کراوە و ، بەنی ئیسرائیلیش هەتا ئەو رۆژە لە کاروباری دینیش و دنیاش‌دا پێغەمبەران نوێنەری‌یان ئەکردن . خۆ هەڵس و کەوت و رەفتاری بەنی ئیسرائیل ، کاتێك کە طالووت بە پادشا و بە فەرمانڕەوایان هەڵ بژێررا ، بەسە بی‌هێننەوە یاد . ( سەیری سوورەتی ( البقرة : ٢٤٧ ) بکە ) . لەبەر ئەوە زەکەریا سەلامی لێ بێ لەوە ئەترسا کە بەنی ئیسرائیل دان بەو کەسەدا نەنێن کە دوای ئەو دێت و ملی پێ نەدەن . ئەمەش لێك ترازانی گرێی یەکێتیی نێوان بەنی ئیسرائیلی ئەگەیاند .

ئەشتوانین لە گۆشەیەکی ترەوە سەیری ئەم ئایەتە بکەین :

مرۆڤ بە هەموو کارێکی دنیایی تاقیی کراوەیە . جا ئەتوانین ئیبراهیم پێغەمبەر و زەکەریا پێغەمبەر سەلامیان لێ بێ وەك نموونە بهێنینەوە . ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی لێ بێ حەزێکی شاراوەی لە دڵدا بوو، کە ئەوەبوو ئەو حەزەی بە پێ‌خۆش‌بوونی مژدەی پێ‌بەخشینی منداڵ ، کە مەلائیکەتەکان پێیان دا ، بە ئاشکرا دەرکەوت . بەڵام زەکەریا سەلامی لێ بێ بە ئاشکرا لە پەروەردگاری پاڕایەوە و داوای لێ کرد کە کەسێك لە دوای بەجێ بمێنێ و ، قورئانیش ئەم دوعایەی هێناوە . جا بە پێی حیکمەتی خوایی ئەم دوو

پێغەمبەرە بە جووتە کوڕەکەیان تاقیی کرانەوە و ، هەر وەك پاڕانەوەی نهێنیی ئاسانتر بێت ، ئەوەبوو ئیبراهیم سەلامی لێ بێ بە داوای سەربڕینی کوڕەکەی تاقیی کرایەوە . بەڵام زەکەریا سەلامی لێ بێ چونکە داواکەی بە ئاشکرا بوو، ئەو بە تاقییکردنەوەی توندتر تاقیی کرایەوە ـ ئەگەر چیی سەرەنجامەکەی بە خێر دەرچوو ـ کە ئەویش بریتیی بوو لە سەربڕانی زەکەریا و یەحیای کوڕی سەلامیان لێ بێ لەلایەن قەومەکەیانەوە . جا توندیی تاقییکردنەوە هاوڕێژەیە لەگەڵ پلەی نزیکیی لە خواوە . ئەم دوو پێغەمبەرەش هەردووکیان لەوانە بوون کە لە خواوە زۆر نزیك بوون ، لەبەر ئەوە تاقییکردنەوەکەشیان یەکجار توند و سەخت بوو.

هەروەها پاڕانەوە و داواکەی زەکەریا سەلامی لێ بێ لەم ئایەتەدا ، تا وەچەیەك لە دوای بەجێ بمێنێ ، لە ترسی ئەوەیە نەوەکو بە تەنیا بمێنێتەوە و، لە کەسوکاری یارمەتییدەر و پشتیوانێکی نەبێت بۆ کاروباری دین و دنیای . لەبەر ئەوە ئەبینین سوورەتی ( آل عمران ) دوعاکەی تۆمار ئەکات : ﴿ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ﴾ ( آل عمران : ٣٨ ) . هەروەها ئەم دوعایەش لە سوورەتی ( الأنبياء ) : ﴿ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ ﴾ ( الأنبياء : ٨٩ ) . واتە داوای وەچەیەکی لە پشتی خۆی کردووە تا لە کاروباری پێغەمبەرایەتییدا و لە بریی خانەوادەی یەعقووب میراتگری بێت .

پێغەمبەری بەڕێزیشمان ﷺ ئەفەرموێ : (( إنا معشر الأنبياء لا نورث ، ما تركناه صدقة )) .[٤٣] ئەفەرموێ : ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران میراتمان لە دوا بەجێ نامێنێ بۆ کەس و کارمان . هەرچییمان لە دوا بەجێ ما صەدەقەیە . واتە پێغەمبەران سەلامیان لێ بێ هیچ خەم وخەفەتێکی میرات بۆ منداڵەکانیان یان بۆ خزمەکانیان لە دڵیاندا نیە . لەبەر ئەوە ئەم دوعایە لێرەدا ( وأنت خير

---

[٤٣] البخاري ، الإعتصام : ٥ ، مسلم ، الجهاد : ٥١ ، ٥٢ ، ٥٤ ، ٥٦ ، الخمس : ١ ، النفقات : ٣ ، فضائل الصحابة : ١٢ ، الفرائض : ٣ .

الوارثین ) بۆ پاراستنی میراتی پێغەمبەرایەتی‌یە ، کە بریتی‌یە لە دینی خوا.
ئەوەبوو خوای ( خیر الوارثین ) یش بە ئیحسان و فەزڵی خۆی ئەو دوعایەی گیرا کرد و داواکەی جیٚ بەجیٚ کرد . ئەوەبوو خوای بالآدەست ـ بۆ دەرخستنی شکۆداریی و مەزنی خۆی ـ پیاوێکی پیر و ئافرەتێکی بە ساڵدا چوو ئەکاتە پەردەیەك بۆ ئیحسان و فەزڵی خۆی ..

بۆ ئەوەش کە هەست بکریٚ خوای گەورە خۆی میراتگری راستەقینەیە ئەوا ئەوەی کە بە رێگەیەکی هەلآوێژن و نائاسایی بەخشیی ، بە هەمان شێوە بە رێگەیەکی نائاسایی بردیەوە بۆ لای خۆی .



﴿ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابًا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴾

( مریم : ۱۷ ) .

مەریەم سەلامی لیٚ بیٚ لە خێزانەکەی کەناری گرت و لە شوێنێکدا بڕیاری گۆشەگیریی دا . ئەو بە کەنارگرتن و گۆشەگیریی وازی نەهێنا ، بەڵکو لە نێوان خۆی و خێزانەکەیدا پەردەیەکی راکێشا . جا وەك ئەگونجیٚ هۆی راکێشانی ئەم پەردەیە ئەوە بیٚ کەسانی تر لەم شوێنە چۆڵە بیٚدەنگەدا هەست بە حاڵی ئافرەت نەکەن و ، لەبەر پێویستیی ئافرەتەکەش بیٚ بۆ پاك و خاوێن کردن ، هەروەها ئەشگونجیٚ هۆی ئەوە بیٚ مەریەم پێی خۆش بوویٚ لە کەش و هەوایەکی هێمن و بیٚدەنگدا خواپەرستیی بکات ، تا بتوانیٚ لەو خواپەرستیی و نوێژەیدا بە جوانیی ورد ببێتەوە ..

جا لە ئەنجامی ئەو پاکژی‌یە ماددیی و رۆحی‌یەدا کە مەریەم لە قووڵایی رۆحی‌دا هەستی پیٚ ئەکرد و ، بە پێی فەرمایشتی (( الطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ )) و لەو کەش و هەوا پاك و خاوێنەدا ، ( رۆح ) ی لیٚ دەرکەوت و هاتە لای . ئەوەبوو

مرۆڤایەیتی سەر لە نوێ بەمە ئەبووژایەوە و ، ئەم ژیانە تازەوەبووەش هەتا رۆژی قیامەت ئەخایێنێ .

ئەم ( روح ) ە چیی بوو ؟ زۆربەی تەفسیرەکان ئەڵێن وشەی ( روحنا ) کە لەم ئایەتەدا هاتووە ئاماژە بۆ جیبریل ئەکات سەلامی لێ بێ . جا لە دیاریی کردنی ئەو کەسەدا کە ( روح ) پێی مەبەست بێ جیاوازیی هەیە و ، سنووری ئیحتیمالەکانیش لە چوارچێوەی جیاوازیی تێپەڕ ئەکات و ، تا ئەو رادەیەش فراوانە کە جێی رۆحی پێغەمبەریشمانی ﷺ تێدا بێتەوە . بەڵێ ! ... ئەمەش ئیحتیمالی هەیە ، چونکە مەریەمی پاکداوێن سەلامی لێ بێ ئافرەتێکی یەکجار پاکداوێن و یەکجار رەوشت جوان بوو . لەبەر ئەوە هیچ ئەندێشەیەك کە بگونجێ ئەو پاکداوێنیی و ئەو رەوشتبەرزیی‌یە لەکەدار بکات بە دڵیدا نەهاتووە و، نەش ئەبوو شتی وای بە دڵدا بێت و ، جگە لە مەحرەمی خۆیشی نەئەبوو هیچ کەس سەیری بکات . ئەو مەحرەمەش پێغەمبەرمانە ﷺ ، چونکە لە یەکێ لە فەرموودەکانیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە مەریەمی نیکاح کردووە.[44] لەبەر ئەوە یەکێکیش لەو ئیحتیمالانەی کە بەرچاو گیراون ئەگونجێ ئەوە بێت کە ئەو رۆحەی هاتبێتە لای مەریەم رۆحی پێغەمبەرمان بووبێت. بەڵام ئەمە شتێکی قەطعیی نیە و ، هەر ئیحتیمالێکیش بە بەڵگە بەهێز نەبێت، هەر بە ئیحتیمالیی ئەمێنێتەوە .



﴿ يَـٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَـٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴾ ( مريم : ٢٣ ) .

هەندێ رستە هەن کە هەموو مرۆڤێك ـ بە پێی هەڵسەنگاندنی تایبەتیی خۆی ـ لەو مەسەلانەدا کە یەکجار بە مەترسیی‌دار و گەورە و گرنگیان ئەبینێ ، بە

---

[44] كنز العمال لعلي المتقي ١١ / ٤٢٤ .

کاریان ئەهێنێ . بۆ نموونە دوعایەکی ئەبوبەکری صددیق خوا لێی رازیی بێت هەیە ـ ئەگەرچیی بە پێی زانستی فەرموودە لاوازە ـ تیایا داوا لە خوا ئەکات کە جەستەی ئەوەندە گەورە بکات کە دۆزەخ پڕ بکاتەوە و ، جێی کەسێکی تری تێدا نەبێتەوە .

یان وەك بەدیعوززەمانی نوورسیی ئەڵێت :

*(( ئەگەر سەلامەتیی ئیمانی ئوممەتەکەم ببینم ، ئیتر من رازییم لە ناو ئاگری دۆزەخدا بسووتێم ، چونکە کاتێك کە جەستەم ئەسووتێ ، دڵم لە خۆشیی و بەختیاریی پڕ ئەبێت ))* .

ئەم جۆرە مەسەلانە بە لایانەوە ئەبنە فیکر و هەست . جا لەبەر ئەوەی کە پاكداوێنییش بە لای مەریەمەوە بوو بووە فیکر و هەستێکی بەهێز ، ئەوا ئەو پاگاندە و قسە هیچ و پووچانەی کە دەربارەی ئەو ئەوتران ئازارێکی زۆریان پێ گەیاند ، بە رادەیەك کە ئاواتی خواست بمردایە و لە بیر بچوایەتەوە ..

بەڵێ ! ... مەریەم نموونەی پاك داوێنیی بوو و، بەرگەی نەئەگرت گوڵێکی بۆ فڕێ بدرێ ، چ جای بوختان کردن بۆ شەرەف و پاك داوێنی‌یەکەی !! لەبەر ئەوە لە کاتی نارەحەتیی ساتە یەکەمەکانی ئەو شۆکاندنەوە توندەدا کە بەرەنگاریان بووەوە و ، لەو کاتەدا کە نەی‌ئەتوانیی ژیربێژیی خۆی بەکار بهێنێ تا کاریگەریی ئەو شۆکاندنەوەیە کەم بکاتەوە ، ئەو ئاواتەی خواست ، هەروەك گەیشتنەوە بە حزووری خوای بالآدەست لە ناو کرۆکی ئەو ئاواتەدا بوو بێت و ، ئەنجامێکیش بووبێت بۆی .

لە راستیی‌دا ئەم جۆرە فەرمایشتانە ، وەك فەرمایشتەکەی ئەبوبەکری صددیق خوا لێی رازیی بێ کە چاوی لە باڵندەیەك ئەبێ بەسەر درەختێکەوە و ئاوات ئەخوازێ وەك ئەو بەری درەختە بێت کە ئەو باڵندەیە کونی تێ ئەکات و، وەك فەرمایشتەکەی عومەری کوڕی خەططابیش خوا لێی رازیی بێت کە سەیری پووشکەیەکی ئەکرد بە دەستیەوە و ئاواتی ئەخواست کە ئەو پووشکە بووایە و،

فەرمایشتێکی تریش کە ئاواتی ئەخواست درەختێک بوایە و خەڵك بیان بڕیایەتەوە .

ئەم وتانە چەند وتەیەکن و ، لەو ساتانەدا وتراون کە بێژەرەکەیان هەستی کردووە لە ژێر چەندین پەستانی یەکجار گەورەدایە ، بە رادەیەك کە بەرگەی نەگرتوون .

* * *

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا ﴾

( مريم : ٩٦ ) .

ئەو ئیماندارانەی کە کردەوە چاکەکان ئەنجام ئەدەن ، ئەوانە لە لایەن ئینس و جینن و مەلائیکەتەکانەوە خۆشەویست ئەبن ، ئەگەرچیی بۆ خۆشەویستکردن بە لای خەڵکەوە هیچ کارێکیان نەکردبێ .

لە زمانی عەرەبییدا ( کردار ) نوێ بوونەوە ئەگەیەنێ و بەڵگەیشە لەسەری. وشەی ( آمنوا ) ش کرداره . کەواتە ئیمانداران دوای ئیمان هێنانیان نازانن بوەستن ، بگرە بەردەوام خۆیان و ئیمانەکەیان نوێ ئەکەنەوە ، ئەویش بە دۆزینەوەیەکی نوێ و ، فیکرێکی نوێ و ، سەرنج دانێکی نوێ . بەمە بەردەوام روو لە ئاسۆ نوێ و پێشکەوتووەکان ئەنێن . هەر بەوەشەوە ناوەستن ، بەڵکو ( وعملوا ) ، واتە ئەو کردەوانە ئەنجام ئەدەن کە لەگەڵ ئیمانەکەیاندا ئەگونجێن. واتە: تەمەنیان لە ئەنجامدانی کردەوە چاکەکاندا بەسەر ئەبەن . کەواتە ئەو خەڵکە ئیماندارە ، پاشان ئەو خەڵکە ئەنجامدەری ئەو کارانە کە خوا پێیان رازییە و ، لەوانیشی داوا کردوون ، یەکەم جار خۆشەویستیی خوای بالآدەست و، پاشان خۆشەویستیی خەڵکییان دەستگیر ئەبێ . واتە ﴿ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا ﴾ . ئەم فەرموودەیەش ئەم کارە بە تەواویی روون ئەکاتەوە . ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ :

( إذا أحَبَّ اللهُ العبدَ نادى جبريلَ إنَّ اللهَ يُحِبُّ فُلاناً فَأحِببْهُ فَيُحبُّهُ جبريلُ ، فيُنادي جبريلُ في أهل السماءِ إنَّ اللهَ يُحبُّ فلاناً فَأحِبُّوهُ فَيُحِبُّهُ أهلُ السماءِ ، ثم يوضَعُ له القَبُولُ في الأرض ... ) [٤٥]

ئەفەرموێ : ئەگەر خوا بەندەیەکی خۆش ویست ، بانگ ئەکاتە جیبریل و ئاگاداری ئەکات کە خوا فلاْنەکەسی خۆش ئەوێت ، تۆش خۆشت بوێ ، بەمە جیبریلیش خۆشی ئەوێ . پاشان جیبریل بانگ ئەکاتە دانیشتوانی ئاسمان کە خوا فلاْنەکەسی خۆش ئەوێ ، ئێوەش خۆشتان بوێ . بەمە دانیشتوانی ئاسمان خۆشیان ئەوێ ، پاشان لە سەرزەوییش‌دا وەرئەگیرێت ..

لە راستیی‌دا خۆشەویستیی هەمیشە لە خواوە دەست پێ ئەکات ، پاشان لەوەوە دێتە خوارەوە بۆ ئاسمان و ، پاشانیش بۆ زەویی و ، چواردەوریان ئەگرێ . ئەمەش یان یەکەم جار بە بەدیی هێنانی هۆیەکانی خۆشەویستیی لەلایەن خوای بالآدەستەوە ئەبێت و ، خۆشەویستی‌یان لەسەر بینا ئەکات ، یان وەك پێشەکی‌یە کرێیەك ـ بە بۆنەی ئەوەوە کە لە ئایندەدا لەسەری ئەبن ـ یەکەم جار خۆشی ئەوێن ، پاشان روونان بەرەو خێر و ، بەرەو جوانیی و ، بەرەو کردەوە چاکەکان بۆ دڵەکانیان ئاسان ئەکات . جا لە هەردوو بارەکەدا ئەبینین نیەتی چاك بنچینەیە و، سەرچەمەی سەرەکییش بریتی‌یە لە خۆشەویستیی خوایی .

ئەمرۆش ئەگەرچیی باس کردنی ئەم جۆرە نیعمەت پێ بەخشینە دەربرینێکی گومان لێ کراوە . بەلاْم سەربازەکانی ئیمان کە لە چەندین ولاْتی جیهان‌دا خزمەتەکانیان پێشکەش ئەکەن ، [٤٦] شیاوی ئەو نیعمەت پێ بەخشینەن و ، بۆ

---

[٤٥] البخاري ، بدء الخلق : ٦ ، الأدب : ٤١ ، التوحيد : ٣٣ ، مسلم ، البر : ١٥٧ ، الترمذي ، تفسير سورة مريم : ٣١٦ .

[٤٦] ئەوانەی کەلکیان لە موحازەرە و کتێبەکانی دانەر وەرگرتووە ، لەو قوتابخانە زۆر و زەبەندانەدا ، کە لە زیاتر لە دووصەد ولاْتی جیهان‌دا کردوویانەتەوە ، خەریکی فەرمانبەریی فێرکردن و تێگەیاندن و ئیرشاد کردنن و ، دانەریش ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات . ( وەرگێڕی عەرەبیی ) .

ئەوان عەینی حەقیقەتە . جا ئەگەر ئەو بە چاك قبوولکردنەی کە ئەو سەربازانەی خزمەت لە ولاتە جۆربەجۆرەکانی جیهاندا دەستی ئەخەن بە وردیی سەرنج بدرێت ، ئەوا هیچ کەس گومانی لەوە نابێ کە من لە وەسف کردنیاندا راست ئەکەم . چۆن نا ، ئەوان لە دەشتەکانی ئاسیای ناوەڕاستەوە بۆ ناو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ، لە ئەوروپاوە بۆ باکووری ئەفریقیا و ، بۆ باسفیك و ئوستورالیا خەریکی خزمەتن . ئاینده کەفیلی حوکم دانە بەسەر ئەم خزمەتانەدا کە ئەو سەربازانە ، چ لە بارەی چەندێتی‌یەوە و چ لە بارەی چۆنێتی‌یەوە ، بە ناوی ئومەتەکەمانەوە و ، بۆ بەرژەوەندیی مرۆڤایەتییش ئەنجامیان ئەدەن . خۆ ئەگەر تەنها لە بارەی بلاوبوونەوەی جوگرافی‌یانەوە کاریان هەل بسەنگێنیت، ئەوا خۆت پێ ناگیرێت ئەلێیت : *(( ئەگەر خوای بالادەست خۆشویستنی ئەمانە نەخاتە دلی دانیشتوانی ئەم ولاتانەوە ، ئەوا بەم شێوە چاکە قبوولیان نەئەکردن ))* ..

ئەم دۆستانەتان لەم سەردەمە سەختەدا ، کە پڕیەتی لە کارەساتی یەك لە دوای یەك و ، گیروگرفتی بە دوا یەکدا هاتوو ، دەستیان بە دینەکەیانەوە گرتووە و، جگە لە خزمەتی ئەم دینە هیچ مەبەستێکی تر بۆ خۆیان پێ نازانن و ، بە پێی ئەوەش ژیانیان رێك خستووە . ئەوان لە کاتی هەلسان و دانیشتنیاندا و لە کاتی سەیران و هات و چۆیاندا ، یان لە کاتی خواردن و خواردنەوەیاندا ئەلێن : ( پەروەردگارا ! ... چۆن بتوانم رەزامەندییت بە دەست بهێنم ؟ ) . بەردەوام بیر لەمە ئەکەنەوە .. لەبەر ئەوە زۆرێك لە هاوێنەی ئەمانە بە ئاست و پلە جیاوازەکانیانەوە ... بە پیاو و ئافرەتیانەوە ... بە گەنج و بە سالەوە چوو و بە پیریانەوە ، کاتێك کە لەسەر یەك فیکر و یەك چالاکیی کۆبوونەوە و یەکیان گرت، واتە بە پێی دەربڕینی ئایەتە پیرۆزەکە ، کاتێ کە ئیمانیان هێنا و کردەوەی چاکیان ئەنجام دا ، خوای بالادەست بە چاك قبوول کردن لە دنیادا نیعمەتی بەسەردا پەخشان کردن . من خۆم جگە لە نرخاندنی ئەم تەفسیرە هیچی‌ترم لێ نایەت ، دەربارەی گەیشتنی ئەمانە بەم ئاستەی خزمەتی ئیمانیی

لە سایەی ئەو هەمووە کۆسپانەدا کە ئەم سەردەمە لیّیان پڕە . لە کاتێکیش‌دا کە هەست کردن بە نیعمەت و فەزڵی خوا دەورەی دڵم و ئەندامەکانی داوە ئەڵێم: ( خوایە گیان ! هەموو ئەم نیعمەتانە تەنیا لە خۆتەوەن ! ) ... ئەمە ئەڵێم و بە خشووعەوە ئەچەمێمەوە .

بۆ تەواوکردنی ئەم ئایەتە خوای باڵادەست ئەفەرموێ : ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا ﴾ ( مريم : ٩٧ ) .

لێرەدا باسی ئاسان‌کارییەك ئەکات کە بە چەندین نهێنیی دەورەی گیراوە. خۆ ئەگەر مەسەلەکەمان لە ناو باسەکەی و بابەتەکەی‌دا هەڵسەنگاند ، ئەبینین کە قورئان باسی کارێك ئەکات کە قورسیی پێوە دیارە ... بەڵێ ! ... مژدە پێدان قورسە و ، ئاگادارکردنەوەش هەر قورسە و ، لە هەردووکیشیان قورس‌تر بریتییە لە چوونە ناو دڵەکانەوە . کاتێکیش کە مەرجەکان و بارودۆخەکان تەواو و گونجاو نەبن ، ئەوا ئەوانەی کە توانایان بەسەر کارەکەدا هەیە و ئەنجامی ئەدەن کەمن ، ئەو کاتە قورسییەکەش ئەگاتە پلەی موستەحیل . چونکە بزواندنی شتێکی وەستاو و ، گۆڕینی کارێکی سەلبیی بۆ کارێکی ئیجابیی پێویستیی بە سەرف کردنی وزەیەکی زۆر هەیە . کاتێ کە فڕۆکەیەك ئەخرێتە ئیش خستنە ئیشەکە ئەبێتە یەکەم ئامانج و ، کاتێکیش کە ئوتومبێلێك ئەخرێتە ئیش گڵۆپ و رادیۆ و تەسجیلەکە ئەکوژێنرێنەوە ، تا هیچ وزەیەك بە زایە نەچێت . بەڵام دوای فڕینی فڕۆکەکە و ، دوای کەوتنە ئیشی ئوتومبێلەکە و جووڵانی ، هەموو شتێك ئەگەڕێتەوە دۆخی سروشتیی خۆی و هەموو شتێك بۆ خۆی ئەکەوێتە گەڕ. هەروەها کاری خزمەتی ئیمانییش ـ بە پێی جۆراوجۆریی قوتابخانەکانیان و تێگەیشتنیان ـ بە هەمان شێوەیە . هەرچەندە قۆناغی یەکەم پێویستیی بە رەنج و کۆششێکی گران هەیە ، بەڵام کە کارەکان رەوتی خۆیان بە شێوەیەکی سروشتیی وەرگرت ، ئەوا ئەوەی کە ئەگونجێ ناوی (( الدائرة الخيرة )) ـ ضد

(( الدائرة المفرغة )) ـ ی لێ بنرێ ، واتە بازنەی بەرهەم هێن ، دەست پێ ئەکات. تا ئەمە ئێستا رۆژانە لە زۆرێـك لـە شـێوە خزمەتـە ئیمانی‌یـەکانمان‌دا ئـەی‌بینین. ئەمەش ئەوەیە کە ئایەتێکی تـری قورئـانیی باسـی ئـەکات : ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ ﴾ ( العنكبوت : ٦٩ ) .

بەڵێ ئەم خزمەتە ئیمانی‌یانەی کە ئـەمرۆ پێشـکەش ئـەکرێن و ، ئـەو تـاك و کۆمەڵ و ئوممەت و دەوڵەتانەش کە پێشکەش‌کـەری ئـەم خزمەتانـەن و ، شـەرەف مەندیی چوونە ناو بازنەی رەزامەندیی خوایی‌یان دەست‌گیر بووە ، دیارە ئەوانیش بەشی خۆیان لەو ئاسان‌کاری‌یە وەرئەگرن ، بگرە بە راستییش وەریان گرتووە. خـۆ ئەگەر لەم لایەنەوە لە مێژوو ورد ببینەوە ، ئەوا هەزار و یەك بەڵگە لەسەر ئـەوە بـەدیی ئەکـەین .. هـەر لـە سـەردەمی خەلیفـە راشـیدەکانەوە هـەتا دەوڵـەتی ئومـەویی و دەوڵـەتی عەبباسـیی و ، پاشـان دەوڵـەتی سـەلجووقیی و دەوڵـەتی عوثمانیی و ، هەتا ئەم سەردەمە کـە مـژدەی بووژاندنـەوەی سـەر لـە نـوێی پێـوە دیارە ، ئەتوانین چەندین نموونە لەسەر پێشکەش‌کەرانی ئەم خزمەتە ببینین.

هەروەها ئەتوانین لە روانگەیـەکی تـرەوە سـەیری ئـەو باسـە بکـەین ، ئـەوەتا خوای بالادەسـت ئەفـەرموێ : ﴿ فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ۝ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ﴾ ( الليل : ٥ ـ ٧ ) .

کەواتە بەخشین و تەقوا و تەصدیق‌کردنی چاکە ـ لـە ئـەنجامی ئـەو فیطـرەتـە ساغ و دروستەوە کە مـرۆڤ هەیـەتی ـ هـەموویان چـەند کـارێکن لـە چوارچـێوەی کردەوە چاکەکان‌دان و ، هەمووشیان ئەبنە مایەی ئاسان و سووك‌کردنـی کارەکـان ـ ئەمەش ئەوەیە کە ئێستا دۆستەکانمان ئەنجامی ئەدەن . ئەوان بە شەو و بـە رۆژ کار ئەکەن و ، ماوا و مـەنزڵی خۆیـان بـەجێ هێشـتووە و ، کۆچیان کـردووە بـۆ ناوچە ناوەڕاستەکانی ئاسیا ، یان بۆ چەندین ناوچەی تر لـە جیهـان‌دا ، بێ‌ئـەوەی گـوێ بـە دەسـت‌کـورتیی بـدەن ، هـەتا ئامادەشـن فـەیض و بەرەکەتـە

مەعنەویـیـەکانیش بکەنـە قوربـانیی .. کەواتـە ئەگـەر بڵـێین هاووێنـەی ئەمانـە مایەی دەرخستنی ئەو ( وُدّ ) ەن کە لە ئایەتەکەدا باسی هاتووە ، زیادەڕەویـیمان نەکردووە . چونکە مافدان بەو خزمەتانەی کە ئەوان روویان لێ ناون و ـ بە چاك ترین شێوە و ، بێ هیچ کەم و کوڕییەك ـ پێشکەشیان کـردوون ، شـتێکی هـەروا ئاسان نیە . بەڵام من وا ئەزانم ئەو دۆستانەمان ئەو خزمەتەی پێشکەشی ئەکەن ـ کە بۆ کەسانی تر وەها دەرئەکەوێ لەوپەڕی قورسیی‌دایە ـ ئەوان بە بەشـێك لـە ژیانی خۆیانی لە قەڵـەم ئـەدەن ، لەبـەر ئـەوە ئـەبینیی ئـەوان شـەو و رۆژ .. لـە هەڵسـان و دانیشـتنیان‌دا .. لـە جووڵـە و وەسـتانیان‌دا .. پێیـەوە سـەرقاڵن .. کەواتە گیانمان بە فیدای ئەو خاوەنی فەزڵ و منەتـە کـە هـەموو قورسـی‌یەکی بـۆ ئاسان کردوون ، زەحمەت و مەینەتەکانی لەسەر سووك کردوون .

* * *

﴿ وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴾ ( طه : ١٣ ) .

هەڵ بژاردنی مووسا سەلامی لێ بێ لە ناو بەنی ئیسرائیلدا بۆ پێغەمبەرایەتیی پلەیەکی وەها شکۆدارە کە لەلایەکەوە توانای پێگەیشتنی نیە و، لەلایەکی تریشەوە تاقییکردنەوەیە . ئەوەبوو لە پاداشتی پێشەکیی و کرێی بەپلەدا ، لەسەر عەزمی بەهێزی و ئازایەتیی و چاونەترسانی لە ئایندەدا و، لەسەر هەستی تەواوی بە گەورەیی ئەو لێپرسراوییەی کە خراوەتە ئەستۆی و، لەسەر تەوازوع و راستگۆیی و ئیخلاص و بەردەوام پشتگیریی‌کردنی لە حەق، ئەو پلە بەرز و بڵندەی دەستگیر بوو و ، سەرەنجامیش ئەو دەستمایە قیامەتی‌یەی نەمریی و هەتاهەتایی وەر گرت .

مووسا سەلامی لێ بێ لە کۆشکی فیرعەونددا بە وێنەی شازادەکان پێ گەیشت کە بە چاودێریی و بایەخ پێدان دەورە درا بوو و ، رێز و گەورەیی بۆ دەر ئەبڕرا . لەبەر ئەمە گەڕانەوەی کەسێکی وەها بۆ ناو ئەو خەڵکەی کە فیرعەون بە سووك سەیری ئەکردن و بە بەندەی خۆی لە قەڵەمی ئەدان ، بگرە هیچ باکێکی نەبوو بە ئاسانیی بیانکوژێت ، پاشان تێکەڵ بوون و هۆگر بوون لەگەڵیان هەرگیز شتێکی ئاسان نیە لەسەر دەروون ، بگرە گرفتێکی گەورەیە و مووسا سەلامی لێ بێ توانیی بەسەریا سەرکەوێ و ، لەم گۆشەی مرۆڤایەتی‌یەوە گەیشتە چڵەپۆپە ، کە جگە لە چەند کەسێکی کەم بە ئەندازەی ژمارەی پەنجەکانی یەك دەست هیچ کەس ئەوەی لێ نەهاتووە . جا ئەم ماهیەتە و ئەم دیمەنە مرۆڤانەیە کە ئەو خاوەنیان بوو ، لە هۆیەکانی هەڵ بژاردنی ئەو بوون بۆ پێغەمبەرایەتیی (( وأنا اخترتك )) ، هەروەها لە هۆیەکانی ستایشی خوایی بوون بۆی .

ئەم هەڵبژاردنە نە لەلایەن دەست و پێوەندی کۆشکەوە بوو ، نە لەلایەن بەنی ئیسرائیلەوە بوو ، بگرە هەڵبژاردنێکی ئاسمانیی بوو لەلایەن خوای بالآدەستەوە، تا یەکەم جار شیاو بێ خوا فەرمایشتی لەگەڵدا بکات و ، نوێنەریشی بێت، پاشان تا لە ژێر چاودێریی و سەروکاریی جیهانی غەیبدا جیهانێکی نوێی پێ بنیات بنێ . لەبەر ئەمە ئایەتە پیرۆزەکە باس ئەکات : ﴿ وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴾ . جا شان بە شانی ستایش و نەرم و نیانیی خوایی ، مووسا سەلامی لێ بێ رێنمایی ئەکرێت و دەرگای بۆ ئەخرێتە سەرپشت بۆ پێك هێنانی ئوممەتێك لەسەر ئەو هیممەتە کەسیيە بەرزە و ، بە شێوەیەکیش کە لەگەڵیا بگونجێ .

لەم فەرمایشتەی خوادا ئەبینین کە هەڵبژاردن لەگەڵ ئاگادارکردنەوە بۆ لێپرسراوێتیی تێهەڵکێش کراون و ، لەگەڵ مژدەی هەڵبژاردنەکەشدا یادخستنەوەی لێ پرسراوێتیی ئەبینین . جا کاتێك کە فەرمایشت فەرمایشتی حەق تەعالا بێت و ، دوێنراویش پێغەمبەری ( کلیم ) بێت ، ئەوا شتێکی سروشتیی ئەبێت کە وت و وێژەکە بگاتە ئەو جۆرە جوانیی و ناسکیيە .

* * *

﴿ ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ﴾ ( طه : ٤٣ ـ ٤٤ ) .

لێرەدا ، بە شێوازێك کە شایانی پێغەمبەر بێت ، خوای بالآدەست تەبلیغی پێغەمبەرەکەی ئەکات کە پێویستە بانگکەر بۆ لای خوا بە شێوازێکی نەرم بانگەکەی تەبلیغ بکات ، ئەگەرچیی ئەو کەسەی ئەم بانگی ئەکات لەوانە بێ کە هەموو رێگایەکی هیدایەت و ئیمانیان لەسەر دڵیان داخستبێ بە وێنەی فیرعەون

و نەمرووود و شەدداد . لێرەدا کارێکی تری گرنگیش هەیە بریتی‌یە لەوەی کە ئەگەر ئەم وتە نەرم و نیانە بووبێتە سیفەت و ناونیشانێکی رەسەن بەلای بانگ کەر و تەبلیغ‌کارەوە و ، بە تەواویی تێکەڵ بە فیکر و هەستی بووبێ ، ئەوە ئەبێتە هۆی ئەوە کە کاریگەریی زیاتری لەسەر خەڵك هەبێت و ، لەسەر ئەوەش کە بانگی ئەکات . خۆ ئەگەر رێگایەکی تری جیاواز لەمە بگرێتە بەر ئەوا بێ‌گومان چەندین گیروگرفت و حاڵەتی تێ شکان روو ئەدەن . واتە ئەگەر ئەو وتە نەرم و نیانە تێکەڵ بە فیطرەت و رەوشتی رەسەنی بانگەوازکار و ئیرشادکار نەبێ، ئەو رەوشتە بە شێوەیەکی سروشتیی ناژی و ، کاتێکیش کە تووشی هەر ورووژاندنێك ببێت سروشتە بنەڕەتی‌یەکەی - زوو بێ یا درەنگ - سەر ئاو ئەکەوێ و، ئەو کاتەش هەرچیی لەوەو بەر بنیاتی نابێ ئەیڕووخێنێ ، واتە ئاوەدان کردنەوەکە ئەبێتە وێران‌کاریی و ، ئەوانەش کە ئەکەونە بەر خەشم و قینی ئەو لەو بیروبۆچوونە و لەو بانگەوازەش کە ئەو رای ئەگەیەنێ دوور ئەکەونەوە.

لەبەر ئەمە زۆر گرنگە وتەی نەرم و نیان بکرێ بە سروشت و فیطرەت. ئەمەش بە حاڵەتی نەرم و ، رەفتاری نەرم و ، دڵی نەرم نەبێ نایەتە دیی .

بەڵام ئەگەر باسەکە بریتیی بوو لە (( رق لێ‌بوون لەبەر خوا )) ، ئەوا هەتا ئەگەر ئێوە لە یەکێکیشیان بێزار بوون پێویستە رووی ئەو بێزاری‌یەتان بکەنە سیفەتەکانیان ، بۆ ئەوەی لەسەر نەرمیی و بەزەیی سوور بن ، بە تایبەت لە کاتی فەرمان‌بەریی بانگەوازدا .. ئەوەشتان لە یاد نەچێ کاتێك کە ئێوە کەسێکی یاخیی و دڵ ڕەق بۆ سەر هیدایەت بانگ ئەکەن ، پاداشت دەست خۆتان ئەخەن ، ئیترسا ئەو کەسە هیدایەت وەربگرێ یان وەرنەگرێ ..

پاشان لێرەدا خوای بالآدەست رای ئەسپێرێ و ، فەرمان بە رۆیشتنی دوو کەس ئەدا بۆ لای فیرعەون . ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هەندێ کار بە کۆمەکیی کۆمەڵیی بە شێوەیەکی چاکتر ئەنجام ئەدرێن ، بە تایبەت لە کۆڕی ئەو کەسانەدا کە ئیددیعای گەورەیی و فیز و دەمار ئەکەن . ئەمەش بۆ پشت گیریی

مەعنەویی و ، بۆ کۆمەکیی یەکێکیان بۆ ئەوی تریان لەلایەکەوە سوودی هەیە و، لە لایەکی تریشەوە کاری شاهێدیی‌دان جێبەجێ ئەبێت . هەروەها بۆ رزگار بوون لە شلەژاویی و هەستکردن بە تەنیایی روالەتییش گرنگە .

جا ئامۆژگاریی‌کردنی پێغەمبەر سەلامی لێ بێ بە بەکارهێنانی فەرمایشتی نەرم هەرچەندە کەسی دوێنراویش لەوپەڕی یاخێتیی‌دا بێت و .. ئاگادار کردنەوەشی تا ئەو شێوازە ـ کە لەگەڵ فیطرەت و لەگەڵ سروشتی رەوشتی‌دا گونجاوە ـ لەبەر هۆکاری لاوەکیی نەگۆڕێت و .. بانگ کردنیشی بۆ گرتنە بەری رێگایەکی پاك و خاوێن لەگەڵ کەسێکدا کە لەگەڵ بیستنی وتەی زبر و دڵ شکێن‌دا رانەهاتبێ ، بۆ ئەوەیە کە ئەو کەسە بێزار نەبێ و دوور نەکەوێتەوە.

ئەو شێوازە نەرمە و ، ئەو دواندنە نەرمە بۆ مووسا سەلامی لێ بێ پێویست تر بوو ، چونکە ئەو لە لای ئەوان پێ گەیشتبوو و ، لە ناویان‌دا گەورە بوو بوو و، فەزڵ و چاکەیان بەسەریەوە هەبوو . جا لەبەر ئەوە ـ بۆ دان‌نان بە فەزڵ و چاکەیان‌دا ـ کاتێك کە ئەو ئەرکە ئاسمانی‌یەی خۆی ئەنجام ئەدا ، لەسەری پێویست بوو بەوپەڕی نەرمیی و لەسەرخۆیی‌یەوە لەگەڵیان‌دا وت و وێژ بکات، بە تایبەت ئەو ئەی‌ویست قیامەت و ژیانی هەتا هەتایی‌یان بهێنێتەوە یاد .

لەوانەشە بەکارهێنانی ئەم شێوازە ناسکە هۆی ئەوە بووبێت کە ئایەتەکە بە ﴿ لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴾ کۆتایی هاتووە . جا لەگەڵ ئەوەش‌دا کە هەندێ تاکیان پەشیمان نابنەوە و هیدایەت وەرناگرن ، بەڵام هیوای ئەوە هەیە کە لەسەر ئاستی جۆر هیدایەت وەربگرن .



﴿ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى ۝ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴾ ( طه : ٥٨ ـ ٥٩).

داخۆ چەند نهێنیی و چەند نوور لەم ئایەتانەوە ، کە پەیوەندییان هەیە بە کەلیمی خواوە ، سەردارمان مووسا سەلامی لێ بێ ، تیشك بە دڵەکانمان بگەیەنن ؟ یەکەم جار لەسەر کێوی طوور لەگەڵ رووداوێکدا ژیا کە پڕی بوو لە نهێنیی . بە چاوی خۆی گۆچانەکەی دیی کە بوو بە مارێك و هەڵمەتی ئەدا .. دەستیشی دیی کە سپیی هەڵ گەڕا .. بەمە ئاسۆی یەقینی واقیعیی بە لای ئەوەوە لەگەڵ ئاسۆی یەقینی نادیار بە لای ئەو پێغەمبەرە مەزنەوە کە متمانە و یەقینی بە تەواویی بە پەروەردگاری هەبوو ، جووت بوو بوو . بوو بووە یەقینێکی تەواو کە سیحربازەکانی فیرعەون هەرچیی بکەن ئەم بەسەریاندا زاڵ ئەبێ و ئەیان بەزێنێ . لەبەر ئەوە بە زیرەکیی و وریایییەك کە تایبەت بێ بە پێغەمبەرانەوە سەیری مەسەلەکەی ئەکرد و بەم شێوەیەی خوارەوەش شیی ئەکردەوە :

١ ـ ئەم بابەتە کە بریتییە لە چەسپاندنی حەق و پووچ کردنەوەی باطیل پێویستە لە پشتی دەرگای داخراوەوە ئەنجام نەدرێ ، ، بەڵکو لەبەردەم هەموو خەڵکدا و ، هەموو دانیشتوانی میصر لە شوێنێکدا ئامادە بن و بە ئاسانیی بیبینن .

٢ ـ پێویستە رۆژێکی جەژن و بۆنەیەکی ئاهەنگ گێران هەڵ ببژێررێ ، تا هەموو ئەو خەڵکەی کە لەو کاتەدا وان لە پشوودا بتوانن لەو شوێنەدا ئامادە بن.

٣ ـ گونجاوترین کاتیش بۆ ئەو کۆبوونەوەیە بریتییە لە کاتی چێشتەنگاو، چونکە لەو کاتەدا هەر هەمووان خەو بەری داون و ، لەوپەڕی چالاکیی و وریاییدان و ، لەو کاتەدا ئەتوانن حوکمی راست بدەن .

بەم جۆرە و لە کاتی چێشتەنگاودا پۆل پۆل میصرییەکان هاتن بۆ شوێنی بە یەك گەیشتن ، تا ئەو پێشبڕکێیەی نێوان سیحربازەکان و مووسا سەلامی لیٚ بیٚ ببینن . لەو سەردەمەدا سیحربازێتیی پیشەیەکی بەرێزی ئاست بەرز بوو . ئەو سیحربازانەش خەڵکێکی سادە و ئاسایی نەبوون ، بەڵکو کەسانێك بوون کە پەیوەندییان بە جینیی‌یەوە هەبوو و هەواڵیان لیٚ وەرئەگرتن و، گیان بازییشیان ( تحضير الأرواح ) ئەزانیی و ، ئەشگونجیٚ ئەوانە هەندیٚ زانستی سەرەتایی پاراسایکۆلۆجییان زانیبیٚ . واتە لە چینی رۆشنبیری ئەو سەردەمە ئەژمێرران . لەبەر ئەوە بەزینیان لەبەردەم مووسا پێغەمبەردا سەلامی لیٚ بیٚ و ، پاشان ئیمانهێنانیان لە دوای ئەوە ، ئا لەو کاتەدا بە گەردشێك ئەژمێررا لە سەربازگەی ئیماندا . هەروایش بوو و کت و مت ئەوە رووی دا ..

ئەو سیحربازانەی کە دەرکیان کرد و بە تەواویی یەقینیان هەبوو کە ئەوەی لەسەر دەستی مووسادا سەلامی لیٚ بیٚ رووی دا کاری سیحر نەبوو ، لەبەردەم پیاوماقوولاّن و لەبەر چاوی هەمواندا ئیمانیان هێنا ، هەرچەندە فیرعەون هەڕەشەی بڕینی دەست و پێی چەپ و راستی لیٚ کردن . جا دوای ئیمانی عامەی خەڵك و جەماوەر ـ جگە لە چەند کەسێکی دەمارگیر ـ کە ئیمان هێنانی سیحربازەکانیان بە مووسا و تەسلیم بوونیان پێی بە چاوی خۆیان دیی و ، دوای ئەوەش کە خەڵکەکەی تر گومان و دوودڵیی ( دەرهەق بە فیرعەون ) لە دڵیانا دروست بوو ، ئەوەی مەبەست بوو بە تەواویی هاتە دیی .. بە راستیی کوفری ئاشکرا و کوفری دیار رمان . خەڵکەکە وایان لیٚ هات کە ئەیانتوانیی بە ویستی خۆیان مووسا سەلامی لیٚ بیٚ یان فیرعەون هەڵ ببژێرن .

ئەو شتە سەرەکی‌یە کە ئێمە لە شیی‌کردنەوەی ئەم ئایەتەدا ئەمانەویٚ لەسەری بوەستین ، بریتی‌یە لەو شوێن و کاتەی کە مووسا سەلامی لیٚ بیٚ بۆ ئەو بەرەنگاربوونەوە گرنگە هەڵی بژاردن . ئەمڕۆش موسڵمانان ئەتوانن پەند و ئامۆژگاریی گرنگ لەم رووداوە وەربگرن .. ئیماندار کاتیٚ کە توانا و دەسەڵاتە

سنووردارەکەی خۆی نەبینێ نابێ تووشی رەش بینیی ببێ و ، لەسەری پێویستە هەر فەزڵێك کە خوا پێی بەخشیوە بە شێوەیەکی حەکیمانە بەکاری بهێنێ ، بەڵام بەبێ کەڵك بە کاری نەهێنێ . واتە کاری «لێدانی دوو چۆلەکە بە بەردێك » ئەنجام بدات ، وەك لە پەندەکەدا هاتووە .

بەڵێ ! موسڵمان لەسەری پێویستە هەردەم خەریکی نەخشەکێشان بێ و پرۆگرام دابڕێژێ ، تا بزانێ چۆن بە بەردێك لە صەدان چۆلەکە ئەدات . هەروەك لە چەندین کارڕایی پەروەردگارییدا ئەیبینین . هەروەك لە دەنکە تۆوێك کە لە کێڵگەدا ئەیچێنین حەوت ، یان حەفتا ، یان حەوت صەد دەنکە تۆومان دەست ئەکەوێت ، پێویستە لە خزمەتێکیشدا کە لە پێناوی ئیمان و ، لە پێناوی ئوممەتدا ئەمانەوێ بەجێی بهێنین ، نەخشەی ئەوە بکێشین کە حەوت ، یان حەفتا ، یان حەوت صەد قاتمان دەست بکەوێ . مووساش سەلامی لێ بێ هەر ئەم کارەی ئەنجام دا .. بە پێی ئەو متمانەیەی کە بە خوا هەی بوو و پشتی پێ ئەبەست ، نەیویست ئەوەی کە ئەنجامی دا تەنها لەبەر چاوی فیرعەون و هاماندا و ، لە پشت دەرگای داخراودا ئەنجامی بدات ، بەڵکو شوێن و کاتێکی گونجاوی هەڵبژارد و لەبەردەم هەر هەموو خەڵکەکەشدا . بەمە توانیی هەزاران و، صەدان هەزار شوێن خۆی بخات .

لە کاتێکدا کە قورئان هەموو ئەمەمان وەبیر دێنێتەوە ، سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ بە نموونەیەکی تر ئەم باسە قووڵ ئەکاتەوە .[٤٧] پێغەمبەر ﷺ روونی کردۆتەوە کە ویستوویانە منداڵێك لەسەر ئەوە بکوژن کە نەچۆتە سەر دینی یەکێك لە پادشاکان . لەسەر لوتکەی چیایەکی بڵند ئەیخەنە خوارەوە، کەچیی بە پێی خۆی ئەگەڕێتەوە لایان . ویستیان لە دەریادا نوقمی بکەن، کەچیی لە دەستی شەپۆلە توند و تیژەکانی دەریا رزگاری بوو و ، بە سەلامەتییگەڕایەوە لایان . هەرچەندە هەوڵی کوشتنیان دا سەرنەکەوتن و،

---

[٤٧] مسلم ، الزهد : ٧٣ .

هەموو جارێك منداڵەكە رزگاری نەبوو . دواجار منداڵەكە بەو پادشایەی وت كە ئەیویست لە دەستی رزگاری ببێ : ئەگەر ئەتەوێ بمكوژی ئەوا بەو شێوە بكە كە من پێت ئەڵێم : ( خەڵكەكە لە یەك شوێندا كۆ بكەرەوە و ، منیش بە قەدی درەختێكەوە ببەستەرەوە و ، پاشان تیرێك لە تیردانەكەم دەربهێنە و ، پاشان تیرەكە بخەرە ناو كەوانەكە و ، پاشان بڵێ : بەناوی خوای پەروەردگاری منداڵەكە، پاشان تیرەكەم تێ بگرە . جا ئەگەر تۆ ئەمەت ئەنجام دا ئەوا ئەم كوژیی ).[48] ئا ئەمەیە ژیربێژیی راست و دروستی ئیمان . بێگومان ئەو لە كۆتاییدا ئەمرێت. كەواتە كاتێك كە ئەچێت بۆ ئەو لا ، پێویستە بە شێوەیەكی هەرزان و بە خۆڕایی نەچێت . ئا ئەمە باسەكەیە . ژیربێژیی كاركردن لە پێناوی خوادا هەتا لە دوا ساتەكانی ژیاندا و ، ئەو كەسەش لە گەیشتن بە خوا نزیك كەوتبێتەوە . جا ئەگەر لەم گۆشەیەوە باسەكە هەڵ سەنگێنین ، ئەبینین ئەم جۆرە بیركردنەوە و نەخشەكێشانە هەتا پێشی شەهیدبوون ( هەرچەندە پلەیەكی بەرزە ) ئەداتەوە و لێیشی تێپەڕ ئەكات . واتە مرۆڤ بە هۆی چەندین خزمەتەوە ـ هەتا لە ئاستە قیامەتییەكەیشیاندا ـ كە لەوانەیە لە پلەی شەهیدییش خۆی تێپەڕ بكەن، ئەتوانێ كەڵك بە میللەت و نیشتمان و دینی خۆی بگەیەنێ و ، لەسەریشی پێویستە بەردەوام بیر لەو رێگایانە بكاتەوە كە بە هۆیانەوە ئەتوانێ ئەم جۆرە دەست كەوتە دەست بخات . ئەم جۆرە كارەیش ، وەك من بۆی ئەچم ، لەوانەیە پێشی شەهیدییش خۆی بداتەوە .

بەڵێ ، ئەگەر منداڵەكە كاتێك كە لە شاخەكە فڕێ ئەدرایە خوارەوە ، یان كاتێك كە لە دەریاكەدا ئەخنكا ، ئەگەر بمردایە ئەوا پلەیەكی دەست ئەكەوت ، بەلام تەنها تاكە شتێكی دەست ئەكەوت .. لە ژیانی قیامەتیدا تەنها پلەی شەهیدیی دەستگیر ئەبوو . بەلام بە شێوە مردنەكەی تر لە پێناوی خوادا و،

---

[48] الترمذي ، تفسير السور : ٢ / ٨٥ .

لەبەر چاوی خەڵکدا ، بەو شێوەیەی کە لە پێشەوە باسمان کرد ، بووە هۆی ئیمان هێنانی صەدان کەس .

لەبەر ئەوە لەسەر مرۆڤ پێویستە ، ، بەتایبەت موسڵمان ، قەدری خۆی بزانێ و، بشزانێ و کە ئەو بەدیی هێنراوێکی چەندە بە نرخە و ، ئەم بوونەوەرە زەبەلاحەش لە پێناوی ئەودا بەدیی هێنراوە و هەموو شتێکیشی بۆ رام کراوە. لەبەر ئەوە کاتێك کە لێرە کۆچ ئەکات ، پێویستە بە شێوەیەکی هەرزان کۆچ نەکات و ، لە دڵی خۆیدا بڵێت : چاکە من کۆچ ئەکەم ، بەلاّم ئەم دنیایەی کە من لە دوای خۆم بەجێی ئەهێڵم ، ئەبێ دوای من بگاتە ئەو هێڵە و ئەو ئاسۆیەی کە لەگەڵ نهێنیی بەدییهێناندا گونجاو بێ و ، پێویستە مردنیش ببێتە کلیلێکی سیحریی بە جۆرێك کە کاتێك تیشکێکی بچووك ئەکوژێتەوە ، لە بریی ئەو صەدان ، بگرە هەزاران تیشکی بەهێز ببریسکێنەوە .

  

﴿ لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَـٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ ( الأنبياء : ١٠ ) .

خوای گەورە رووی فەرمایشتی ئەکاتە ئەو موسڵمانانەی کە قورئان دابەزییە سەریان و ، پاشانیش ئەوانەی کە بە دوایاندا هاتن و ، بە رێنموویی و ئاماژە پێکردنەوە بۆیان روون ئەکاتەوە کە ئەو کتێبێکی دابەزاندۆتە سەریان مایەی بەرزیی و پایەدارییانە و ، بە شێوەیەکی تەئکیدیی ئەمەیان بیر ئەخاتەوە ، تا ئاراستەی ئاسۆکانی سوپاس و ستایشیان بکات .

ئەتوانین لەوەی لەم یادخستنەوەیە بە دڵدا دێت ئەم خاڵانە باس بکەین :

١ ـ یادخستنەوەی هۆ و رێگا حەق و راستەکان ، وەك ئەو فەرمان و قەدەغانەی کە روویان لە ئامانجە حەقەکان کردووە.﴿وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ﴾ ( الزخرف : ٤٤ ).[٤٩]

٢ ـ لەوانەیە ( ذکر ) بە مانای ئامۆژگاریی و نەصیحەت بێت چونکە (( الدين النصيحة )) وەك لەو فەرموودە شەریفە گشتگیرەدا هاتووە کە بۆ ئەو تایبەتمەندییە ئاماژە ئەکات . ئەم ئایەتە پیرۆزەی سوورەتی ( الذاريات ) یش ﴿ وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ( الذاريات : ٥٥ ).[٥٠]

٣ ـ لە کاتێکدا کە ئوممەتەکانی دەوروبەرتان ، لەسەر شانۆی مێژوو ئامێنن ، ئەمەش دوای تەواوکردن و بەسەربردنی تەمەنی سروشتیی خۆیان ، ئێوە ـ ئەی

---

[٤٩] ئەم ئایەتە دەری ئەبرێت کە ئەم قورئانە پیرۆزە مایەی پایەداریی و بڵندییە بۆ پێغەمبەر و ئوممەتەکەی. ( وەرگێڕی کوردیی ) .

[٥٠] ئەم ئایەتە فەرمان بەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەدات کە ئامۆژگاریی ئیمانداران بکات ، چونکە بەو ئامۆژگارییە ئەوان تووشی قازانج ئەبن .. ( وەرگێڕی کوردیی ) .

موسڵمانەکان !ـ بە بەرەکەتی ئەم ( ذکر ) ەوە کە دابەزیوەتە سەرتان ، دەست نیشانکراون بۆ مانەوە بە درێژایی مێژوو . ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا نَأْتِي ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ۚ وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ ۚ ﴾ ( الرعد : ٤١ ) .

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ۚ ﴾ ( العنكبوت : ٦٧ ).[٥١]

لەم دوو ئایەتەدا ئاماژە بۆ ئەمە کراوە .

٤ ـ هەروەها ئەم ئایەتە پیرۆزە لەو کاتەدا دەربارەی ئەو پلە و پایەیە کە موسڵمانان لە ئایندەدا بە پێگەیەکی وەها بڵند ئەگەن کە هیچ ئوممەتێکی تر ناتوانێت بیگاتێ و ، ئەم قورئانە پیرۆزەش زمانەکەتان لە تیاچوون و دۆڕان نەپارێزێت و ، زمانی عەرەبییش ئەبێتە سەرچاوە و پەنا بۆ هەرکەسێك کە بیەوێ لە دینەکەی تێ بگات و ، ئەم مانایەش لە وشەی (( ذکرکم )) دا بەدیی ئەکەین ، کە هەر تەنها مانای ئامۆژگاریی نابەخشێت ، بەڵکو مانای مانەوە و، لەیادنەچوون و ، تیانەچوونی یاد و باسیشتان ئەبەخشێت ..

* * *

﴿ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ( الأنبياء : ٨٧ ) .

ئەم ئایەتە تایبەتە بە باسی بوونی پێغەمبەرەوە سەلامی خوای لێ بێت و، بە پێی چەند ریوایەتێکیش ئەم پێغەمبەرە بەرێزە ـ دوای ئەوەی کە قەومەکەی

[٥١] قورئانی پیرۆز وەبیری موسڵمانانی دێنێتەوە کە خوای گەورە کەعبەی ئەمن و ئاسایشی بەوان بەخشیوە و ، ئێمان لە پەنایدا بژێوی و سەلامەتن ، لە کاتێکدا کە خەڵکی تر دەست درێژییان ئەکرێتە سەر . ( وەرگێری کوردیی ) .

ئیمانیان هێنا ـ هەندێ نیشانەی بەلاّ و تاقیی‌کردنەوە و ، ئاماژەی هاتنیانی دیی، کە زۆرێك لە ئوممەتە پێشینەکانیان لە ناو بردبوو . ئیتر ئەوەبوو بەر لە وەرگرتنی فەرمانێکی روون و ئاشکرا لە خوای گەورەوە ، شارەکەی خۆی بە جێ هێشت . جا لەبەر ئەوەی کە ئەو کارە ـ بە نیسبەت کەسانێکی نزیك لە خوای گەورەی وەك ئەوەوە ـ بە زەللەیەك ئەژمێررێ ، بە پێی قەدەرێکی خوایی نەخشە کێشراو و رێك‌خراو ، نەهەنگەکە قووتی دا .. ئیتر دوای ئەوەی کە هەموو هۆکارەکان لە کار کەوتن و ، هیچ کاریگەرییەکیان نەما ، یوونس پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێت ، بە پێی پەیبردنی پێغەمبەرانەی رووی کردە خاوەنی هەموو هۆکارەکان .. رووی لێ نا و دەستی دایە نزا و پاڕانەوە و ، داواکاریی . ئەوەتا قورئانیش دەربارەی ئەو هەواڵمان ئەداتێ و ئەفەرموێ : ﴿ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ ﴾ . نە هاوەڵت هەیە و ، نە هاوشێوە و ، هەرچیی لە جیهاندا روو ئەدات بە فەرمان و ماوەدانی خۆتە . بە راستیی بە ماوەدانی خۆت فڕێ دراومەتە ناو دەریاوە و ، رزگاربوونیشم تەنها بە ماوەدان و فەرمان و ویستی خۆتە ﴿ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾.

لە راستییدا هەموو پێغەمبەرێك کە هەڵە یان زەللەیەکی لە دەست دەرئەچوو، خێرا ئەگەڕایەوە و ، پەنای بە خوا ئەبرد داوای لێ خۆش بوونی لێ ئەکرد.

ئەوەتا حەزرەتی ئادەم سەلامی لێ بێت لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ئەڵێن :

﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ ( الأعراف : ٢٣ ).[٥٢]

---

[٥٢] بەم فەرمایشتەیان پەشیمانیی و هەڵەکاریی خۆیان دەربڕیی ، بەوەی کە ستەمیان لە خۆیان کردووە و هیوای ئەوەشیان ئەخواست کە خوا لێیان خۆش ببێ و بەزەیی پیایا بێتەوە ، تا تیا نەچن ( وەرگێڕی کوردیی ).

حەزرەتی مووساش سەلامی لێ بێت بە پاڕانەوەوە ئەیفەرموو :

﴿ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي ﴾ ( القصص : ٢٨ ) . [٥٣]

بەڵام هیچ شتێك لەو بارەوە لە پێغەمبەری بەرێزمانەوە ﷺ پێ نازانم ، هەر چەندە دوعایەك هەیە کە پیشانی ئەبوبەکری صدیقی خوا لێی رازیی بێت داوە و، هەمان وشەی تیا بەکار هێناوە : (( اللهم إني ظلمت نفسي ظلماً كثيراً )) . [٥٤]

ئەگە جارێکی تر بچینە خزمەتی ئایەتە پیرۆزەکە ئەبینین بە هەموو هێزێکەوە ئیعلانی گەورەیی و تاك و تەنیایی خوا ئەکات : ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ ﴾ .

دوای بە دەستەوە نەمانی هۆکارەکان و و تیاچوونیشیان ، ئەبینین یوونس پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بە تەواویی ئەو هۆکارانە فڕێ ئەدات . ئەمەش شتێکی زۆر گرنگە .. لە راستییشدا کاتێك کە هۆکارەکان کەڵکیان نامێنێ مرۆڤ ـ بیەوێ یان نا ـ روو لە خوا ئەکات بە تەنیا و ، ئەمەش ئەو مانایەیە کە ئایەتەکە ﴿ سُبْحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ئاماژەی بۆ ئەکات ..

لێرەدا ، دەربارەی دان نان بە دەستەوسانیی و زوڵم‌کردنی مرۆڤ و ، پاشانیش رووکردنە خوا و ، داواکردنی سۆز و شەفەقەتی ئەو ، باسەکە چڕ ئەبێتەوە . لە راستییدا چاکترین رێگا بۆ دەست‌خستنی سۆز و چاوپۆشیی خوا بریتی‌یە لە دان نانی مرۆڤ بە کەم و کورتیی خۆیدا . ئەمەش رێبازی پێغەمبەرە مەزنەکانە سەلامیان لێ بێت .

لێرەدا شتێك هەیە کە بدیع الزمان مامۆستا سەعیدی نوورسیی ئاماژەی پێ کردووە ئەویش بریتی‌یە لەوەی کە رستەی ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ ﴾ رستەیەکە ئاماژە بۆ ئایندەمان ئەکات . بەڵێ ! ئەگەر بابەتەکەمان بە پێی یاسای (( الإنطباق مع

---

[٥٣] دانی پیا ئەنێت کە زوڵمی لە خۆی کردووە و ، دوای چاوپۆشییش لە پەروەردگاری ئەکات . ( وەرگێڕی کوردیی ) .

[٥٤] دەری ئەبڕێت کە زوڵمێکی زۆری لە خۆی کردووە . ( وەرگێڕی کوردیی ) .

مقتضى الحال )) وەرگرت ، ئەوا خوای بالادەست هەر خۆی بە تاك و تەنیا ئەتوانێت ـ چ لە ئاستی تاكدا بێت ، یان لە ئاستی كۆمەڵگادا ـ لە تاریكیی رزگارمان بكا بەرەو نوور و ، بە كەناری سەلامەتییمان بگەیەنێت .. ئەمەش بە دروشمی (( لا إله إلا أنت )) دێتە دیی كە هەموو جۆرەكانی تەوحیدی تێدایە .

بەلام پێویستە لێرە دا ئاماژە بۆ كارێكی تر بكرێت ، ئەویش ئەوەیە كە یوونس پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بە بۆنەی بارودۆخێكی تایبەتییەوە كە لێی هاتبووە پێش بانگی كرد : (( لا إلـه إلا أنت )) ، بەلام ئێمە بە بۆنەی ئەو بارودۆخانەی كە لێمان هاتوونەتە پێش لە بریی (( لا إلـه إلا أنـت )) ئەڵێین (( لا إله إلا الله )) .

هەروەها وا چاكترە كە ئاماژە بەم كارانەش بكەین ، كە بریتین لەوەی كە دوعا و پاڕانەوەكەی یوونس پێغەمبەر سەلامی لێ بێت لە ناو جەرگەی شەودا رووی دا و گیرا بوو و ، وەك ئایەتی : ﴿ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾(البقـرة:٢٥٦) و ئایـەتی : ﴿ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَـٰتٍ ﴾ (البقرة:١٧)شدا هاتووە چەند تاریكایییەك هەبوون لە كاتی دووركەوتنەوە لە نوور چەند تاریكایییەك روو ئەدەن ، بەلام یەكەم تاریكایییەك كە یەخەی بە یوونس پێغەمبەر گرت سەلامی لێ بێت ، بریتیی بوو لە زەڵلەیەی كە جیهانی ناوەوەی خۆی تەماویی كرد .. پاشان تاریكایی راستەقینەش بریتیی بوو لە تاریكایی شەو و ، تاریكیی و بێكەسیی ناو سكی نەهەنگەكە ، واتە چەند تاریكییەك..

بەر لەوەی یوونس پێغەمبەر سەلامی لێ بێت دووچاری ئەم مەینەتە ببێت، لەبەر ئەوەی كە پێغەمبەری خواناس بوو ، بە تەوحیدی قووڵی راستەقینە چاك زانا بوو و ، بە نزاكەی (( سبحانك )) مەبەستی ئەمە بوو : پەروەردگارم ! من پەنات پێ ئەبەم و ، دەرك بە ماف و حیكمەتی خوایەتییت و پێداویستیی ئەو حیكمەتە ئەبەم و ئیعلانیشی ئەكەم و ، ئیعلانی دەسەوسانیی و لاوازییشم لە

بەرامبەرتدا نەکەم . کە ئەشفەرموێ : ﴿ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ئەوە ئەگەیەنێت کە پێغەمبەرە مەزنەکان ئەو زەللە بچووکانەی کە لە دەستیان دەر ئەچن بە هەڵەی گەورەیان ئەژمێرن و ، وەك ئەوە وەهایە یەکێك بڵێت : (( ئەمە حاڵی منە و ، خۆیشت چاکتر لێی ئاگاداری )) و ، وەك وتەی شاعیرێکی مەزنە کە وتوویەتی :

پێویستییم زۆرە و خۆیشت پێی زاناتری
بێدەنگییشم ئاخاوتنە و وتاری راستەقینەمە

بۆ پێغەمبەرێکی هەڵبژاردەی ئاوەها و ، بۆ پاڕانەوەیەکی هەڵبژاردەی ئاوەها لە سەرووی ئاسمانەکانەوە وەڵام هات : ﴿ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ ﴾ ( الأنبياء : ٨٨ ) .

خوایە ! وەك ئەوت رزگار کرد ، لەبەر رێز و حورمەتی ئەو کەسەی کە بە شێوەی ( رحمة للعالمين ) رەوانەت کرد ، ئێمەش لە خەم و خەفەت رزگار بکەیت . وصلى الله عليه وسلم وعلى آله أجمعين .



﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴾
( الأنبياء : ٩٨ ) .

گەیشتنی موشریکان ، لەگەڵ ئەو خوایانەی کە ئەیانپەرستن ، بە ئاگری دۆزەخ و ، پێکەوە چوونیانە ناویەوە و ، گلەییکردنیان لەوێ لە یەکتریی ، بەوەی کە هەریەکەیان تاوانەکەی ئەخستە سەر ئەوی تریان ، وێناکردنە بۆ دەسەوسانیی ئەو بەخوا کراوانە و ، بێتوانایییان بۆ کەڵك یان زیانگەیاندن . بەم هەموو ئاگادارکردن و ورياکردنەوەیە لە کەوتنە ناو چەندین سزا و ئازاری ویژدانییەوە کە چوون بە ناو یەکدا ، هەرەشەکانی ئەم ئایەتە دەر ئەکەون .

دەستەواژەی ( حصب جهنم ) ـ واتە : سووتەمەنیی دۆزەخ ـ لێرەدا، سەرەڕای ئەوەی کە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئەوانەی لە غەیری خوا پەرستراون لە دۆزەخدا ئەبنە ماددەیەکی سووتێنەر کە هەموو شتێك ئەسووتێنن ، ئاماژەشە بۆ ئەوە کە پەرستنی بتەکان تاوانێکە چاوپۆشیی لیّ ناکرێت و ، ئەو پەرستراوانەش خۆیان ئەبنە خودی سزا و ئازار و ، ناش‌توانن لەو سزا و ئازارەی کە دەورەی داون خۆیان رزگار بکەن .

چەند کارێکی پڕ ژانە بۆ مرۆڤ ـ کە لە بارەی بەدیی‌هێنانی یەکەم جارەوە و، ئەو لیّ‌هاتنانەی کە پێی بەخشراون ، خوای گەورە بە بەرێزترینی بە دیی هێنراوانی گێڕاوە ـ کەڕ و لاڵ و کوێر بێت و ، لەگەڵ پەرستراوی دەستەوسان‌دا، کە دارای هیچ هەوڵ و هێزێك نەبن ، هاوبەشی سزا و ئازاریان بێت .

لە زمانی عەرەبییش‌دا کرداری (( ورد )) بە مانای هات و گەیشتە سەر ئاو بە کار ئەهێنرێت ـ لێرەدا وێنەی چەند کەسێك بە بیردا دێت کە سەتڵی ئاویان بە دەستەوە بێت ـ ( إسم الفاعل ) یش بۆ ئەو کردارە وشەی (( وارد )) ە . بەڵام کاتێك کە ئەم مانایە لەگەڵ ئەوەدا کە لە ئایەتەکەدا هاتووە بەراورد ئەکەین، ئەبینین ئایەتەکە ئەم کردارەی بەو مانایە بەکار نەهێناوە . کەواتە لێرەدا هەست بە گاڵتە و قەشمەریی ئەکەین . ئەمەش لەوە ئەچێت کە لەم ئایەتەدا هاتووە :

﴿ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ ( آل عمران : ٢١ ) .[**]

بەڵیّ ! ئەوانە لەسەریان پێویست بوو لە دنیادا بهاتنایە و سەتڵی ئاویان بە دەستەوە بوایە ، هەتا لە فەیض و بەرەکەتی حەقیقەتی موحەممەدیی و لە سەرچاوە سازگارەکەیەوە ئاویان دەست بکەوتایە ، بەڵام ئەوان ئەوەیان نەکرد و، کەڵکیان لەو هەلە وەر نەگرت ، تا ئەوەبوو بەو کۆتاییە پڕ ژانە کۆتایی‌یان

---

[**] خوای گەورە فەرمان بەسەر پێغەمبەر دا ﷺ نەدات تا مژدەی سزایەکی پڕ ژانیان پیّ بدات . دیارە مژدەش بۆ شتنی دڵ خۆش کەر نەبێت . ( وەرگێڕی کوردیی ) .

هات. هەمان ناوەرۆکیش لە ئایـەتی ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ ﴾ ( مريم : ٧١ ) دا ئەبینین.

هێنانی وشەی ( وَرَدَ ) لێرەدا ئاماژە بـۆ ئـەو هەڵـە بـە نرخـە ئـەکات کـە لـە دەستیان دا و ، ئاوی سازگاری گێڕا بـە سـزا و ئـازار و ، بـۆ دەربڕینـی هەسـت و شعووری پەرۆشیی و ئازارە .

لەوانەشە ئایەتی ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ ﴾ وەلأمێك بێت بۆ ئەو کەسـانەی کـە وەهـا بـە دڵیـاندا بێـت ئـاگری دۆزەخ نایـان سووتێنێ ، ئەم ئایەتە پێیان ئەفەرموێ : ئێوە بە نیسبەت ئەو ئاگرەوە کە ئـەتان سووتێنێ وەك سووتەمەنیی دۆزەخ وەهان ، بەمـە دەرس و پەنـدێکیان دا ئـەدا و داخ و پەرۆشی‌یان چەند قات ئەکاتەوە ..

* * *

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةَ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴾ (الحج : ١١) .

لە قورئانی پیرۆزدا ، چەندین ئایەت لە بارەی ئەم بابەتەوە هەن . بەڵێ ! ... بەردەوام خوای بالآدەست ئیماندار و مونافیق و کافر تاقیی ئەکاتەوە ، تا ئەو جیاوازییانە دەربخات کە لە جیهانی ناوەوەیاندا هەن . بە بەلآ و موصیبەتی جۆراوجۆر و ، بە تاقییکاریی دڵیی و ویژدانیی ، بگرە هەتا بەو کارانەی کە وابەستەی خێرن ، تاقییان ئەکاتەوە و ، لە بەهای خۆییان ئاگاداریان ئەکات .

بە چەندین تاقییکاریی ئەوە چەسپاوە کە خەڵکێکی زۆر ـ هەتا لەوانەش کە لە پێناوی خوادا قوربانیی ئەدەن و خاوەنی ئیخلاصن ـ تووشی تەنگ و چەڵەمەی ماددیی ئەبن و ، لەوانەشە بازرگانییەکەیان تیا بچێت و ، لە ژیانیاندا تووشی لەرزینی جۆراوجۆر بن . ئەمەش تەنها تاقییکردنەوەیەکی ئەو بەندەیە لەلایەن خوای بالآدەستەوە .

ئەمەش هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت کە خوای بالآدەست ، کە دەوڵەمەندی رەهایە ، دەست بەرداری ئەوانە ئەبێت کە بە هەموو ئیخلاص و قوربانیی دانێکەوە هەوڵ ئەدەن تا فەرمایشتی ئەو سەر بخەن و ، بە تاقی تەنیا لێیان بگەرێت لەم ژیانەدا بهارێن . بەلآم خوای دروست کار ، کە هەر کارێك ئەنجام بدات چەندین حیکمەتی تێدایە و ، لە گاڵتەجاریی بەدوورە ، بەندەی خۆی تاقیی ئەکاتەوە ، تا رادەی ئیخلاص و رادەی پەیوەندیی بە خواوە لە هەڵس و کەوتیدا و لەبەردەم ویژدانییدا دەربکەوێت .. لەوانەشە هەندێکیان لەو تاقییکردنەوەیەدا

بدۆڕێن ، بەمە دنیاش و قیامەتیشیان لە کیس بچێت . ئەمەش ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز وەصفی ( الخسران المبین ) ی بەسەردا ئەبڕێت .

جا ئەوانەی کە لەم تاقیی‌کردنەوەیەدا ئەدۆڕێن و ، بەو بۆنەشەوە دنیاش و قیامەتیشیان لە کیس ئەچێت ، بە زۆریی مونافیقەکانن . ئەوانە نەیان‌توانیوە بگەنە رادەیەك کە زمان و دڵیان وەك یەك بێت ، واتە نەگەیشتوونەتە ئیمانی کامڵ . ئەوان هەندێ وشەی ئیمان لە دەمیاندا ئەگلێنن و ، بە لا چاوێکەوە سەیری ئایەتەکانی خوا ئەکەن .. لە بارەی کارکردنیشەوە ئەوان لە ناوجەرگەی دین‌دا نابن ، بەڵکو لەسەر پەڕی‌دا و ، هەوڵ ئەدەن کار راپەڕێنن و ، لە هەموو کارە ئیجابیەکانی ئیماندا لە کەڵك و قازانجی راستەقینە بەدوورن . هەندێك کاتیش کە لێ‌پرسراوی‌یەك و ئەرکێك ، یان زەرەر و زیانێك بە رواڵەت لە ئاسۆدا دەر ئەکەون ، ئەبینین وا هەموو پارێز و پیلانێکیان بەرچاو گرتووە بۆ دوورکەوتنەوە و هەڵاتن ، بۆیە ئەوان هەمیشە لە پەراوێزی کاری ئیمانیی ، یان لە گۆشەیەکی‌دا ئەوەستن و ، خۆشیان ئامادەی پاشگەزبوونەوە و خۆ دزینەوە کردووە ..

جا لەم هەڵوێستە پڕ لە ترس و لەرزەیانەوە پلانی ئەوە دائەنێن کە هەرچیی دەست موسڵمانان بکەوێت ، ئەوان کەڵك لە هەمووی وەربگرن و ، هەرکە شتێکیشیان دەست کەوت کە هیوایان پێی هەبێت ، توند قەپی پیا ئەکەن و لەوپەڕی ئاسایش و دڵنارامییش‌دا دەر ئەکەون . بەڵام ئەگەر تاقیی‌کردنەوەیەك و هەڵسەنگاندنێك هاتە بەرەوە خێرا پاشگەز ئەبنەوە .

ئیمان‌داران هەر هەموو هەڵگری هەموو سیفەتێکی ئیمان‌دار نیین ـ خۆزگە وەها نەبوونایە ـ ، چونکە هەندێ ئیمان‌دار ئەچنە ژێر کاریگەریی هەندێ سیفاتی مونافیقانەوە . ئەوانە حەز ئەکەن باکان بە ویستی ئەوان هەڵ بکەن و ، هەر کاتێکیش ئەوان پێیان خۆشە باران ببارێت و ، قەدەری ئەم بوونەوەرەش بە ئارەزووی ئەوان بێت ! جا هەروەك وێنەی ئەوانە لە سەردەمی ئیسلامیی یەکەم‌دا

هەبوون ، کە هەڵگری وێنەی ئەو ئاواتە منداڵانەیە بوون و ، هەرکەی ئەوەی ئەوان حەزیان لێ بوو بۆیان نەهاتە دیی ، پشتیان لە ئیسلام کرد و ، روویان لێ وەرگێڕا ، هەروەها چار نیە و وێنەی ئەوانە ئێستاش هەر ئەبن ، ئەمەش هۆی زۆربەی لادانە ناوخۆیی‌یەکانە ، کە ئێستا روو ئەدەن ، کاتێک کە هەندێ کەس خەریکی ئارەزووبازیی ئەبن .

﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴾ ( آل عمران : ٨ ) .

  

﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ ( النور : ٣٥ ) .

خوای باڵادەست ئەو خوایەیە کە بوون ( وجود ) ی بۆ چاوان دەرخستووە و، بوونەوەریشی بەم شێوەی ئێستای هێناوەتە وجوود و ، لەبەر چاوان‌دا گێڕاویەتی بە پیشانگایەك و کتێبێك تا بخوێنرێتەوە . هەروەها ئەو خوایەیە کە نووری بە چاوان و ، کرانەوەی بە دڵان بەخشیوە و ، بەبێ نووری ئەویش نە چاوەکان ئەبینن و، نە بەصیرەتەکانیش پەی بە شت نەبەن ، ئەو کاتەش وەهمەکان تێکەڵ بە زانستەکان و ، گریمانەکانیش تێکەڵ بە راستی‌یەکان ئەبن و ، هەموو بوونەوەریش ئەبێتە ئاژاوەیەکی بێ‌مانا ، ئیتر نە فەلسەفەیەکی زانستەکان لە مێشکەکان‌دا دەستگیر ئەبێت و ، نە نووری زانیارییش لە سنگەکان‌دا .

لە خاڵی بە یەك‌گەیشتنی نێوان ( آفاق ) و ( أنفس ) دا ، بە خوای باڵادەستی نووری ئاسمانەکان و زەویی و ، نووری هەرچیی وا لە ئاسمانەکان و زەویی‌دا و ، رووناك کەرەوەی نوورەکان نەبێت ، گەیشتن لە زانستەوە بە ئیمان و، لە ئیمانیشەوە بە مەعریفە و ، لە مەعریفەشەوە بە هەست کردنی قووڵ بە بەندایەتیی خوا ، ناگونجێت .

بە هۆی ئەم نوورەوە بوونی خۆر یان خۆرەکان لە ئاسمانەکان‌دا و ، رەنگەکان و، وێنەکانی جوانیی لەسەر زەویی‌دا دێتە دیی و ، لە دڵەکانیش‌دا بە بەصیرەت و ئیدراك گەشە ئەکەن و ، لە عەقڵ و دەماغیش‌دا زانیاریی و خۆشەویستیی و شەیدایی و تاسەمەندیی و ، بیرکردنەوە و شیی‌کردنەوە و مەنطیقیش گەشە ئەکەن و ، ئەوانەش کە لە رێی بەڵگەوە بەرەو حەقیقەت هیدایەت وەرئەگرن ، ئەوا بە فەزڵی ئەم نوورەوە هیدایەت وەرئەگرن .

بە فەزڵی ئەم نوورەوە ئادەمیزاد ڕەنگەکان و ، نیسبەتی نێوانیان و ، ئەو ناوازەی کە لە نێو هەموو شتەکاندا هەیە ئەبینێت و ، دەرکیش بەو شیعرە ئەکات کە لە ناو ئەو ناوازەدا هەیە . پاشان ئەمە لە قاڵبی زانست و زانیاریی‌دا ڕەوانەی دڵ ئەکات و ، بەصیرەتیش ئەم زانستە هەندەکی‌یانە ئەخاتە سەر یەك، یان شیی‌کردنەوە و ، ناوێتەکردنی ئەو زانیاری‌یە گشتی‌یانە ئەنجام ئەدات تا بی‌گۆڕێت بە مەعریفە .. پاڵدان بە ( حەق ) ەوە و ، سەیرکردنی هەموو شتێك بە نووری مەعریفەی خوا ، حەقیقەتی ئادەمیزاد ـ کە بریتیی بوو لە دڵۆپە ئاوێکی بێ‌نرخ ـ ئەگۆڕێت بە دەریایەك و ، مەعریفەی ئادەمیزادیش لە ئەتۆمێکەوە ئەگۆڕێت بۆ خۆرێك و ، دڵی ئادەمیزادیش ـ کە شتێك نیە باس بکرێت ـ ئەگۆڕێت بۆ لێدانی ( دڵی ) بوونەوەر و ، لە بەرامبەر ئەوەی کە ئادەمیزاد نەتوانێت بە چاوی ئاگاداری دوێنێ و سبەینێی خۆی بێت ، بگرە هەتا بە هەموو دووری‌یەکانی ئێستا و ئەمڕۆی نەتوانێت ، ئەوا بە بەصیرەتی ئەتوانێت خۆیشی و هەموو شتە هەست پێ‌کراوەکان بە هەندەکیی و گشتیی دەرك پێ بکات . دەرك بە شتەکان و حەقیقەتیان و دەلالەتیان و حەقیقەتیی ئەوانیش ئەکات ، پاشان دەرك بە حەقیقەتی هەموو حەقیقەتەکان ئەکات کە پەروەردگاری باڵادەستیەتی ، ئەویش بەو ئاماژە و ئیشارەتانەی کە لەلایەن خۆیەوە دەر ئەچن. بە پێی پلەی یەقینی خۆی دەرکیان پێ ئەکات و هەستیشیان پێ ئەکات و، لەگەڵ پەروەردگاری‌دا پابەندی پەیوەندی‌یەکی بەندایەتییش ئەبێت .

ڕێگە چارەش بۆ خۆ لادان لە لێ تێك چوون لەو ئیدراکە عەقڵی‌یە ، یان لەو مەعریفەیەی کە ئەگونجێ ناوی ( البصیرة الوجدانیه ) ی لێ بنێین ، بریتی‌یە لە روونان بەرەو بە دیی‌هێنەر و وێنەکێشی نوورەکان ، ئەویش لە کاتی گەشتدا بە ناو بەڵگەکان و ئاماژەکان و ئاماژەکارەکاندا ـ سەرەڕای سەرنج‌دانی لاوەکیی لە وجوود و لە ڕووداوەکان ـ ، تا زانستەکان بتوانن بگۆڕێن بە زانیاریی و ، تا هەستەکانی ئادەمیزادیش لێیان تێك نەچێت . ڕێگە چارەش بۆ ڕوو‌لێ نان و

سەیرکردنی نووری هەموو نوورەکان ، بریتی‌یە لە سەیرکردنی قورئانی پیرۆز کە خۆری خۆرەکانە ﴿ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَـٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ ( النساء : ١٧٤ ) و، سەیرکردنی چرای پێغەمبەرایەتیی سەرداری پێغەمبەران ، ئەو چرایەی کە مانگی مێشکمان و ، خۆری ویژدانمانە و ، لە ئاسمانیشدا هاوتای خۆر و مانگە ﴿ وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴾ ( الفرقان : ٦١ ) .

بەڵێ ! ... ئەگەر نووری خوایی بەرچاو نەگرین ، ئەوا بوونەوەر و هەرچیی وا تیایا ئەگۆڕێت بۆ تاریکیی . خۆ ئەگەر بەرچاومان گرت ، ئەوا هەموو شتەکان ـ بینراو و نەبینراو ـ نوورانیی ئەبن و ، بە روومەتی گەشاوە و ، ماهیەتی راستەقینەیانەوە دەر ئەکەون .

پوختەی باس : هەموو شتێك لە نووری خوای گەورەیە و ، بە تیشك دانەوەی ئەو نوورەش هەموو شتێك دروست بووە و ، گەشەی کردووە و ، باش گۆڕانی بەسەردا هاتووە .. نووری رەها نووری خوایە بە تاك و تەنیا .. ئیتر سپاردنی نوور بە غەیری خوا یان کارێکی مەجازە لە لایەن ( خواص ) ەوە ، یان نەزانی‌یە لە لایەن ( عوام ) ەوە . جا ئەگەر هەموان ئەمەیان نەزانی ، ئەوە بە هۆی توند دەرکەوتنیەتی لە ویژداندا بەبێ چەند و چۆن و ، بەهۆی تیشك دانەوەی بریسکەداریەوە .. بەڵێ ! ... هەر وەك ئەگونجێ غەیب دەرگایەکی گرنگ بێت بۆ زانست و زانین ، هەروەها ئەگونجێ تیشك دانەوەی بریسکەدار و توندیش بۆ دەربازگەیەکی شاردنەوە سەر بکێشێ .

زاتی ( الله ) نووری ئاسمانەکان و زەوی‌یە و ، هەموو شتەکانیش تیشك دانەوەی جۆراوجۆری شەپۆلە جۆراوجۆرەکانی ئەو نوورەن و ، دیوی دەرەوەی داپۆشیون .

هەروەها ئەمەوێت سەرنجتان بۆ لای هەندێك لایەنی ئەم ئایەتە رابکێشم . هی وا هەیە هەست بە جیاوازیی نێوان نوور و تیشك ناکات ، پاشان ئەڵێت :

گورجیی تیشك دیاره ، ئەی گورجیی نوور چەندە ؟ منیش لێرەدا ئەمەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە پێویستە نوور و تیشکمان لە لا تێکەڵ نەبن . چونکە خوای بالآدەست نەیفەرمووە کە ئەو تیشکی ئاسمانەکان و زەوییە . کەواتە بۆ تێگەیشتن لە نوور لەسەرمانە لە سەرچەشمە و سەرچاوەکەی نزیك بکەوینەوە و، سەرچاوەی نووریش زاتی ( ألله ) یە و ، خوای بالآدەستیش لە کاریگەریی زەمان و شوێن بەدوورە . کەواتە پێویستە بە شێوەیەکی هەندەکیی لەم گۆشەیەوە مەزەندەی نوور بکەین . ئەگونجێ نووریش و شتە نوورانییەکانیش لە هەمان ساتدا لە ملیۆنێك جێدا بن و ، ئەشگونجێ نوور لە ساتێکی تێپەڕیودا لێرەوە بۆ ئەوێ بگوازێتەوە . لەبەر ئەوە پێغەمبەرمان ﷺ ـ کە تەنی پیرۆزی گۆڕرا بۆ بارودۆخێك بتوانێت هاوڕێیەتیی رۆحی بکات کە چوو بوویە دۆخی حاڵەتێکی نوورانییەوە ـ توانیی لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا میعراجەکەی تەواو بکات و بگەڕێتەوە دوا . لە کاتێکدا کە ئەم گەشتە لە باری ئاساییدا پێویستی بە تریلیۆن کەرەت تریلیۆن ساڵ هەیە ، کەچیی ریوایەتە صەحیحەکان هەواڵمان ئەدەنێ کە پێغەمبەرمان ﷺ رۆیشتووە و گەڕاوەتەوە و ، هێشتا نوێنەکەی سارد نەبۆتەوە . واتە هەر وەك لێرەدا ، لەم گەشتەدا زەمەن پشت گوێ خرابێ.

پێویستە لەم وتەیەمان وەها تێ نەگەن کە ئێمە وتبێتمان ئەو نوورەی کە لەم ئایەتەدا باس کراوە مەخلووقە . جا بۆ ئەوەی رێگە بەو تێگەیشتنە هەڵەیە نەدەم ، ئەوا وشەی ( كأنَّ ) م بە مەبەست بەکار هێناوە . بەڵێ ! ... نوورەکانی تر مەخلووقن و ، بەدیهێنەریشیان خوای بالآدەستی نوورانییکەری نوورەکانە.

لەم روانگەیەوە ئەتوانین ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر : ﷺ (( أول ما خلق الله نوري ))[٥٦] ناو ببەین ، واتە یەکەم تۆوێکی نوور کە خرایە رەحەمی وجوودەوە نووری موحەممەدیی بوو .

---

[٥٦] العجلوني ، كشف الخفاء : ١ / ٢٦٥ ـ ٢٦٦ .

کورتەکەی پێویستە نوور و تیشکمان لێ تێک نەچن . ئەگونجێ سەرچاوەی تیشك نوور بێت و ، تیشکیش تەجەللای نوور بێت لە دنیادا و ، نوور هەر لە زەوییەوە هەتا سورەییا خاوەنی تەجەللای زۆرە .

أللهم ! يا منور النور ، يا مصور النور ، يا مقدر النور ! نوّر قلوبنا وحواسنا بنور معرفتك ، وأيدنا بروح من عندك . وصل اللهم على سيدنا محمد الذي جعلته قمراً منيراً وعلى آله وأصحابه الذين اقتدوا به شبراً شبراً .



﴿ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴾ ( الشعراء : ٦١ ـ ٦٢ ) .

هاوەڵانی حەزرەتی مووسا سەلامی لێ بێت لە گۆشەیەکی ماددییەوە سەیری باسەکەیان ئەکرد ، ئەویش کاتێك کە فەرمایشتی لەگەڵیانا ئەکرد ، ئەوەی بەرچاو ئەگرت . بەڵێ ! ... بۆچوونی ماددیی بەسەر ئەم کۆمەڵەدا زاڵ بوو بوو، بەمە مێشکیان لە بواری ئەو شتەدا کە تەنها بە چاو ئەیان دیی بەند بوو بوو و، لە بەرامبەر جیهانی میتافیزیقییدا داخرا بوو . لەبەر ئەمە کۆمەڵێك کە ئەم تایبەتمەندیی و سیفەتانەی هەبێت موحتاجی فێرکردن و راهێنان ئەبێت و، پێویستییشی بە کۆششێکی گەورە هەیە تا بتوانێت لە بیرکردنەوەدا شوێن رێبازی پێغەمبەرایەتیی بکەوێت . بۆیە حەزرەتی مووسا سەلامی لێ بێت ، بە درێژایی تەمەنی ئەم رێگایەی هەڵبژارد . ئەوەبوو بەبێ کۆڵدان و بێزاربوون ئەوپەڕی کۆششی کرد . ئەم ئایەتە پیرۆزەش ئەم تایبەتمەندییەی جوولەکە دەرئەخات . لەو کاتەشدا کە فیرعەون و سوپاکەی دوای جوولەکە کەوتبوون ، حەزرەتی مووسا بە هۆی موعجیزەیەکی روونەوە دەریای لەبەردەم جوولەکەدا لەت کرد تا بە سەلامەتیی لە دەریا بپەڕنەوە . بەڵام جوولەکە هەتا لەم کاتەشدا ئەو موعجیزە خوایییە روونەیان لە بیری خۆیان بردەوە و ، وتیان : دوژمن پێمان ئەگاتەوە ، واتە سوپای فیرعەون لە دواوە پیایانا ئەگاتەوە . حەزرەتی مووساش سەلامی لێ بێت ئەوەی پێویست بوو پێیان بوترێت پێی فەرموون : ﴿ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴾ . فەرمووی : نەخێر دوژمن پێمان ناگاتەوە ، من پەروەردگارمم لەگەڵدایە و بۆ سەر رێی راست هیدایەتم ئەدات .

قاضیی بەیضاویی لە تەفسیرەکەیدا لە کاتی شیی‌کردنەوەی ئەم ئایەتەدا بەراوردی‌یەك لە نێوان حەزرەتی مووسا سەلامی لێ بێت و حەزرەتی موحەممەددا ﷺ ئەکات و ئەڵێت : حەزرەتی مووسا سەلامی لێ بێت لەو ساتەدا کە مەترسیی لێ نزیك ئەکەوێتەوە ئەفەرموێ : ﴿ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴾ واتە بە شێوەی ئایندە دەری بڕیی ، کەچیی موحەممەدی پێغەمبەرمان ﷺ کاتێك کە لەگەڵ ئەبوبەکردا خوا لێی رازیی بێت لە ئەشکەوتەکەدا بوون و موشریکەکان لێیان نزیك کەوتبوونەوە ، بۆ دڵدامەزراندنی پێی فەرموو : ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ﴾ ( التوبة : ٤٠ ) . فەرمووی : ئەبوبەکر خەمبار مەبە ، خوامان لەگەڵە. بەمە پێغەمبەری بەڕێز ﷺ بە شێوەیەکی بێ‌سنوور متمانەی خۆی بە خوای بالأدەست دەربڕیی .

بێ‌گومان جیاوازیی نێوان فەرمایشتەکەی حەزرەتی مووسا سەلامی لێ بێت بۆ قەومەکەی و ، فەرمایشتەکەی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێت لە باسی پشت پێ‌بەستن و کار پێ‌سپاردن و خۆ تەسلیم‌کردندا ، بەشێکی ئەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی نێوان ئەوانەی کە حەزرەتی مووسا سەلامی لێ بێت فەرمایشتی لەگەڵ کردن و ، ئەوەش کە پێغەمبەری خۆمان ﷺ فەرمایشتی لەگەڵ کرد . بێ‌گومان جیاوازی‌یەکی گەورە هەیە لە نێوان کەسێکدا کە گەیشتبێتە پلەی ( صدديقيين ) و ، هەر رستەیەك لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ دەرچێت ، بەبێ هیچ دوودڵی‌یەك ، وەری بگرێت و خۆی تەسلیمی بکات و، لە نێوان کۆمەڵێکدا کە لە هەموو کارێك و لە هەموو بارێکدا مشت و مڕ و چەند و چۆن لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا بکەن .



﴿ وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ۝ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴾

( الشعراء : ٨٤ ـ ٨٥ ) .

حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی لێ بێت کەسێك بوو کە بە تەواویی بەو نیعمەتانەی کە پەروەردگاری بەسەریدا رێژابووی و ، بە میهرەبانی‌یە کۆتایی نەهاتووەکانی پەروەردگاری ئەزانیی . جا وێنەی خاوەنی ئەو پێزانینە بەرزە ئەیزانیی کە هەموو شتێك لە لایەن خوای بالادەستەوەیە . هەر خۆی خواردن و خواردنەوە و هێزی قسەکردن ئەبەخشێ . واتە خۆی بە تەنیا حاکمی رەهایە نەك کەسێکی تر . جا ئەگەر خاوەنی ئەو جۆرە پێزانینە لە خوا بپارێتەوە و بلێت : ﴿ وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾ ،[٥٧] ئەوا ئەبێت خوای بالادەست خۆی ئەو جۆرە دوعایەی بە ئیلهام خستبێتە دڵیەوە . واتە خوا زمانی گۆیای ئەو کەسە بووە و ، هەر خۆی بۆ ئەم دوعایە هێناویەتە گۆ ، پاشان هەر خۆیشی ئەم دوعایەی گیرا کردووە و ، ئەگەر گیراکردنی ئەم دوعایەی نەویستایە بە ئیلهام نەی‌ئەخستە دڵیەوە . بەڵێ ! ... ئەڵێین خوا ئەم دوعایەی گیرا کردووە و، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە بەردەوام موسڵمانان لە نوێژەکانیاندا ناوی ئەبەن و دوعاشی بۆ ئەکەن .

لێرەدا کارێکی تری گرنگ هەیە کە ئەمە : وەك شتێکی زانراوە پێغەمبەران سەلامیان لێ بێت کاتێك کە ئەمرن نە سامانێك و نە موڵکێك بۆ وەرەثەیان بەجێ ناهێڵن . بەڵکو بانگەوازەکەیان میراثیانە . حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی لێ بێت ، کە زنجیرەی پێغەمبەرایەتیی کەوتبووە دەستی و ، شتی زۆری لە سەردەمی خۆیدا گۆڕی ، واتە پێغەمبەرێکی نوێخواز و چاك کارێکی گەورە بووە ، بە هیممەتی مەزنی حەزی ئەکرد دەروو لە هەموو مرۆڤایەتیی بکاتەوە.

---

[٥٧] لە خوا ئەپارێتەوە تا زمانێکی راستگۆی پێ ببەخشێت . ( وەرگێڕی کوردیی ) .

ئەوەبوو ئاواتەکەی ، وەك سەرەنجامێکی سروشتیی بۆ گیرابوونی دوعاکەی، هاتە دیی . واتە حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی لێ بێت ، لە ئەنجامی بەسەربردنی ژیانی نەفی دوو جاری گرنگ لە ژیانی ، گۆڕرا و بووە سێبەرێکی چڕ و پڕ بۆ مرۆڤایەتیی . جا لەو هێڵەوە کە بە ئیسحاقی کوڕی سەلامی لێ بێت دەستی پێ کرد بە حەزرەتی مەسیح سەلامی لێ بێت گەیشتەوە و ، لەو هێڵەشەوە کە بە ئیسماعیلی کوڕی سەلامی لێ بێت دەستی پێ کرد بە موحەممەدی پێغەمبەرمان ﷺ گەیشتەوە . ئەوەبوو لە هەردوو هێڵەکەدا حەزرەتی ئیبراهیم بووە پێشەنگ و پێشڕەو بۆ هەموان و ، ناو و یادیشی لەسەر زمانی هەموو یەکێك لەو پێغەمبەرانە بوو . جا لەگەڵ ئەوەش‌دا کە پێغەمبەرمان ﷺ کۆتا پێغەمبەر بوو، کەچیی بیرەوەریی حەزرەتی ئیبراهیم هەر بەردەوام بوو . وەك لە سەرەوەش باسمان کرد خۆشەویستیی حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی لێ بێت ، کە بە ئاراستە کردن و فێرکردن لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ ، چوو بووە ناو کرۆکی دڵی موسڵمانەکانەوە ، وای لە موسڵمانەکان کرد تا بەردەوام لە دوعاکانی نوێژەکانیان دا ناوی بەرن . ئەوەش هەڵ ئەگرێت کە حەزرەتی ئیبراهیم لە ئەنجامی ئەم دوعا و پاڕانەوە و صەڵەواتدانەدا ببێتە میراتگری ( جنة النعیم ) .

دوا باسێك هەیە کە پێمان خۆشە باسی بکەین . ئەو کارە گرنگەی کە پێغەمبەران سەلامیان لێ بێت ئەنجامی ئەدەن و ، ئەو بانگەوازەش کە تەبلیغی ئەکەن بریتیی نیە بە تەنیا لە فیکرێك یان بە تەنیا لە ئەنجامێکی بەرز ، یان بە تەنیا مەبەستێك بێت و هەوڵی جێبەجێکردنی بدەن . ئەم کارانە لە بەرامبەر ئەو بانگەوازە مەزنەدا کە ئەوان خزمەتی ئەکەن ، بە کارێکی یەکجار لاوەکیی لە قەڵەم ئەدرێت . پێغەمبەرانیش سەلامیان لێ بێت فەرمانبەری خوایین - بە تایبەت حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی لێ بێت - پێیان خۆش نەبوو بانگەوازەکەیان بە مردنیان کۆتایی پێ بێت ، بەڵکو دوعایان ئەکرد ئەم بانگەوازە هەتا هەتایە

بژیت . لەم روانگەیەوە هەڵ ئەگرێت کە حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی لێ بێت ویستبێتی بەرەکانی داهاتوو بە چاکە ناوی ببەن .

بەڵام دوعاکەی ﴿ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ بۆ ئەوەیە تا دەری بخات کە ئەو هەر چەندە هۆیەکە بۆ چەندین پێغەمبەری مەزن کە لەسەر ئەم رێگا راستە رۆیشتن و ، هەرچەندەش ئەو رابەر و چاوساغە بۆ ئەم رێگا راستە ، داوای دۆعای ئەو پێغەمبەرانە ئەکات کە لە پشتی خۆی کەوتوونەتەوە و، دۆعای میرات گرانی ئەو پێغەمبەرانەش ، چونکە ئەزانێت کە پێویستە هەموو شتێك و هەموو هیوایەك لە سازێنەری هۆیەکان چاوەڕوان بکرێت و ، بەهەشتیش بە لوتف و نیعمەت بەخشینی خوای بالآدەستە و ، بە کردەوە دەستگیر نابێت ، بەڵکو بە سۆز و رەحمەتی فراوانی خوای بالآدەست و ، لە ئەنجامی داواکردن و دوعای بەردەوام دەست ئەکەوێت . ئەمەش کارێکی گرنگە و پێویستە جەختی لەسەر بکرێت .

* * *

﴿ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ ( الشعراء : ١٤٢ ) .

فەرمایشتی پێغەمبەران بۆ قەومە کافرەکانیان کە ئەوانە برایانن ، هەر تەنها صالح پێغەمبەر سەلامی لێ بێت ناگرێتەوە . بەڵکو هەمان فەرمایشت لە دەمی پێغەمبەری تری وەك هوود و شوعەیب و نووح و لووط سەلامیان لێ بێت دەرئەچێت . جا هەر چەندە ئەو پێغەمبەرانە لەو هۆزانە بوون و ، لە ناویاندا هەڵکەوتوو بوون ، لە لایەنی بیرکردنەوە و هەستکردندا ، یان خزمایەتییدا لەوان نەبوون .

هەڵ ئەگرێ جۆرە دارشتنی وەها لە پێناوی دەربڕینی ئەو سۆز و شەفەقەتەدا بێت کە ئەو هۆزانە دەرهەق بەو پێغەمبەرانەی کە لە نێوانیاندا پێگەیشتوون

دەریان بڕیوە و ، بۆ دەرخستنی ئەو گۆشەیەی کە پێغەمبەران لێیەوە سەیری ئەوانەیان کردووە . ئەگینا صالح پێغەمبەر سەلامی لێ بێت ، نە لە لایەنی خزمایەتیی و خوێنەوە و ، نە لە لایەنی برایەتیی دینەوە ، لەوان نەبووە .. بەڵام لە لایەنی مرۆڤایەتییەوە یەکێك بوو لەوان و ، لە لایەنی بەزەیی و شەفەقەتیشەوە بۆیان وەك برایان وەها بوو . قەومەکەشی لە نزیکەوە ئەویان ئەناسیی و شارەزای ئەمانەت و راستگۆیی و داوێن پاکیی و بیر و هەستیشی بوون ، بۆیە بە کەسێکی نزیکی خۆیان وەك برایەکی خۆیانیان ئەژمارد ..

ئەگونجا بە (( باوك یان خاڵۆ یان باپیرە )) فەرمایشتیان لەگەڵ بکات . بەڵام ئەو جۆرە فەرمایشت کردنە لەوانەیە جۆرێك لە بە گەورە سەیرکردنیان دەر بخات، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو فەرمایشتکردنە وەك فەرمایشتکردنی برا فێنکیی دەر ناخات..

* * *

﴿ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴾  ( الشعراء : ٢١٨ ـ ٢١٩ ).

(( تَقَلُّبَ )) لە بابی (( تَفَعَّلَ )) یە و، ئەمەش ئاماژە بۆ تەکلیفی شتێك و، رەنج و کۆشش بەخت کردن تیایا ئەکات . واتە ئەنجامدانی کارێك لە لایەن مرۆڤەوە ، ئەویش بە بەخشیینی ئەوەی کە لە توانایدا هەیە و ، سووربوون لەسەری . ئەمەش ئەو داڕشتنەیە کە خوای بالادەست لە وەسفی سەجدەبردنی پێغەمبەرە بەرێزەکەیدا ﷺ وێنەی کێشاوە . واتە پێغەمبەر ﷺ ، لە کاتێکدا کە لە سەجدەدا بوو ، واتە لەو کاتەدا کە لە هەموو کاتێك لێیەوە نزیکتر بوو، بۆ دەرخستنی بەندایەتیی خۆی بۆ پەروەردگاری ، ئەوپەڕی توانای خۆی ئەبەخشیی و ، خەریك بوو لە سەجدەکەیدا بتوێتەوە .. بەڵام لێرەدا کارێك هەیە کە پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێت ، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر هەستێکی دەروونیی زۆر

و زەبەندە نەبێت ، هەرگیز گەیشتن بە وێنەی ئەو پۆپەیە لە توانادا نابێت و، هەرکەسیش وێنەی ئەو هەستەی نەبێت ، ئەوا دەربڕینی خشووع لە سەجدەدا جگە لە ریا هیچی تر نیە .

بەڵێ ! ... ئەم هەستە دەروونی‌یە و ، ئەم مەعنەوی‌یاتانە یەکجار گرنگن، بە تایبەتیی لە باسی بەندایەتیی خوادا . جا لەسەر ئیمان‌دار پێویستە ، لە هەموو کارێکدا ، بە زوهدی تەواو و ، تەقوای تەواو و ، ئیخلاصی تەواوەوە روو لە خوا بکات و ، ئەو روو تیٚکردنەش تاکە مەبەستی بێت ، بە مەرجێك ئەمە بە تەرکی دنیا و گۆشەگیریی لێی تیٚ نەگات . جا لە لایەکەوە روو لە خوا کردن بۆ ئاوەدان کردنەوەی دنیا و ، گێڕانی بە بەهەشت ئەبێت و ، لە لایەکی تریشەوە دڵەکان بەرەو خۆش ویستنی خوایی ، بۆنە و بەرامەی ئیمان بۆ پەرەسەندنی ژیان، ئاراستە ئەکرێن . واتە لە کاتێکدا کە دنیا ئاوەدان ئەکرێتەوە و ، رێك و پێك ئەکرێت ، بۆ دەست‌خستنی رەزامەندیی خوا و ، بۆ والا کردنی دەرگای گەیشتن بە خوا ، رووش لە خوا ئەنرێت .

ئایا ئەمە ئەوە نیە کە قورئانی پیرۆز ئەیفەرموێ کاتێك کە باس ئەکات : ﴿ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ﴾ ( البقرة : ١١٥ ) ؟ من وەهای ئەبینم کە ئەم ئایەتە زۆر گرنگە و ، لە وەسفی بارودۆخی گشتیی ئیمان‌داری کامڵدا و، لە دەرخستنی پێوەرەکانی پەیوەندیی و وابەستەیی ئیمان‌دار بە خوای باڵادەستەوە، چەندین مانای قووڵ ئەبەخشێت .. فەقیهەکان ئەڵێن : کاتێك کە مرۆڤ لای قیبلە نازانێت پرسیاری بۆ ئەکات و ، بە پێی توانای خۆی هەوڵ ئەدات بی‌دۆزێتەوە.. خۆ ئەگەر بەرەو لایەکی پێچەوانەی قیبلەش نوێژ بکات ، ئەوا لەو حاڵەتەدا نوێژەکەی هەر دروستە . بەڵام راست نیە مانای ئایەتەکە تەنها بۆ ئەمە لێك بدرێتەوە ، چونکە مرۆڤ لە هەموو حاڵەتەکانی‌دا : کاتێك ئەخوات و ، کاتێکیش ئەخواتەوە ... کاتێك هەڵ ئەسێت و ، کاتێکیش ئەخەوێت ... کاتێك کە لە نێوان کەس وکاری‌دا ئەبێت ... کاتێك کە سەیران ئەکات .. لەم هەموو حاڵەتانەی‌دا ،

لەسەری پێویستە رووی لە خوا بێت و ، بە چاودێری بزانێت و، هەست بە بوونی بکات . بەڵێ ! ... ئایەتەکە ئاماژە بۆ ئەم مانایەش ئەکات.

لە راستیی‌دا لەسەر مرۆڤ پێویستە لە هەموو ساتێك‌دا پەیوەندی‌یەکانی لەگەڵ پەروەردگاری‌دا نوێ بکاتەوە و ، بەردەوام دەروونیشی تەڕ و تازە بێت.. راستە خوای باڵادەست لە نوێکاریی و ئاڵ و گۆڕ بەدوورە ، بەڵام هەست کردنمان پێی و ، پەیوەندیمان لەگەڵیا پێویستە بەردەوام نوێ ببنەوە . پێشینان دەربارەی خوا ئەیان وت : (( منظور إليه )) و ، نوێکردنەوەی پێویستیش لە لایەنی ئەوانەوەیە کە سەیری ئەکەن . ئەو نوێکردنەوەیەش نوێکردنەوەیەکە لە لایەنی لێکۆڵینەوەی بەردەوام لە تەجللا نوێیەکانی ئەو ( المعبود بالحق ) ەو، ئەو ( المقصود بالإستحقاق ) ەو ، ناسینی سەر لە نوێ بۆ گەیشتن بە ناخی ئیمانی تر. ئێمە ناچاری ئەوەین ، ئەگینا دوور نیە ئیمانمان دووچاری بۆگەن کردن و رزین ببێت .

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئایەتە پیرۆزەکە ئەڵێین : سەجدەبردنی پڕ خشووع و پاك و خاوێن بە شێوەیەکی راستەوانە لەگەڵ بڕی ئامادەبوونی خوا لە دڵدا گونجاو ئەبێت . جا مرۆڤی دوور لە خوا ، ئەگەرچیی لە ناو نیعمەتەکانی خوادا نوقوم بووبێت و ، ئەو دڵەش کە ئەوەندەی مسقاڵە زەڕڕەیەك هەست بە منەت باریی و سوپاس و شوکرانە نەکات ، لە هەموو ژیانی‌دا تەنها جارێکیش بێت، ناتوانێت لەو جۆرە سەجدەیە نزیك ببێتەوە ، یان ئەوە یەکجار قورس ئەبێت..

پاشان کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانبەریی بەندایەتیی بە قووڵیی ئەنجام ئەدا، ئەویش لە ئەنجامی قووڵیی هەست کردنی بە چاودێریی خوای باڵادەست بۆ هەموو هەڵس و کەوت و جم و جووڵێکی : ﴿ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴾ .

بەڵێ ! ... لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو بە خشووعەوە سەجدەی ئەبرد ، کەچیی لە لایەکی ترەوە فەرمانەکانی خوای باڵادەست جێبەجێ ئەکات ، واتە ئەو وا لە حاڵەتی ئەنجامدانی رۆحیی‌دا . ئەو نیوەی شەو هەڵ ئەسێت بۆ شەونوێژ و، لە

هەمان کاتدا ، بەوپەڕی سۆزی بە تین و ، بەوپەڕی گوێڕایەڵیی تەسلیم بوونەوە فەرمانەکانی دین جێبەجێ ئەکات و ، بەوپەڕی تەسلیم و مل کەچی‌یەوە بۆ گەورەکەی پێویستیی ماددیی و مەعنەویی ئیمانداران رائەپەڕێنێ . واتە لە هەموو هەڵس و کەوتێکی‌دا لە بەندایەتیی خوادا ئەژیا ، بەوەی کە چاوەڕوانی فەرمانی خوا بوو و جێبەجێی ئەکرد . کاتێکیش کە سەجدەی ئەبرد و ، ناوچاوی ئەبردە ناستی هەردوو پێیەوە ، بەرز ئەبوویەوە بۆ چڵەپۆپەی بەندایەتیی و، هەر خۆیشی فەرموویە : (( أقربُ ما یکونُ العبدُ مِن رَبِّهِ و هو ساجدٌ )) . واتە: کاتێك کە بەندە سەجدە ئەبات لە هەموو کاتێك زیاتر لە خوای پەروەردگاریەوە نزیکە .

* * *

﴿ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾ ( الشعراء : ٢٢٤ ـ ٢٢٧ ) .

لە گرنگ ترین تایبەت مەندی‌یەکانی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ئەوەیە ئەو کەسانەی کە ئایەتەکان راستەوخۆ روویان تێ ئەکەن و ، ئەو کەسانەش کە ناڕاستەوخۆ ئەیاندوێنن ، لەگەڵ ئەوەدا کە جیاوازن ، هەر لایەکیان ئەتوانن دەرس و ئامۆژگاریی جۆراوجۆر بە نیسبەت هەر یەکەیان دەربهێنن .

بۆ نموونە : ئەبینین شاعیرەکانی سەردەمی نەفامیی دوێنراوی راستەوخۆی ئەم ئایەتانە بوون و ، شاعیرەکانی ئەو سەردەمە نەفامی‌یەش وەهایان رائەگەیاند کە پەیوەندیی بە جنۆکەوە ئەکەن و ، ئەشتوانن لە هەواڵی غەیب ئاگادار بن. ئەوانە بە شێوەی ( سەجەع ) وتەیەکیان ئەوت کە دڵی گوێگرانیان کەمەندکێش ئەکرد،

واته له وەسیطه رۆحی‌یەکانی ئەم زەمانەی خۆمان ئەچوون و ، ئەوانە بە نەیاریی کردنی قورئان ناسراو بوون و ، کە قورئانیش لەم ئایەتەدا باسی شاعیرەکانی کردووە مەبەستی لەو شاعیرانەی سەردەمی نەفامی‌یە . هەروەها کە قورئان وەصفی شوێن کەوتوان و هەوادارانی ئەو شاعیرانە ئەکات کە ئەوانە ( غاوي ) واتە : دەست بڕ و خەڵك خەڵەتێنن ، ئەوە دەرئەخات کە ئەو شاعیرانە تا چ ئەندازەیەك لایان دابوو .

له لایەکی ترەوە ئەم ئایەتانە هەندێ شاعیری هەموو سەردەمێك ئەدوێنن، ئەگەرچیی ئەو دواندنە بە پلەی دواندنی شاعیرەکانی سەردەمی نەفامیی نەبێت. جا ئەگەر ئایەتی : ﴿ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴾ مان لەم چوارچێوەیەدا هەڵ سەنگاند ، ئەبینین ئاماژە بۆ ئەوانە ئەکات کە دین و هەرچیی وابەستەی دینە لە ژیانیان دووریان خستۆتەوە و ، هەوا و ئارەزووی خۆیان کردووە بە بت و، کەوتوونەتە دوای هاووێنەی ئەو شاعیرانە .

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴾ واتە : ئەوانە مانا و ناوەرۆك و بابەت پشت‌گوێ ئەخەن و ، ئەی‌خەنە ئەولاوە و ، جارێك لە ژێر ناو و دروشمی رۆمانسیی و ، جارێك واقیعیی و ، جارێکی تریش فیعلیی‌دا سەر بە ناو شێوی جۆراوجۆری شیعر و پەخشان‌دا ئەکەن .

﴿ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴾ . واتە : پیشەیان درۆکردنە و ، لەو راوچی‌یە درۆزنانە ئەچن کە شانازیی ئەکەن کە گوایە راوچیی چاکن ، کەچیی درۆزنن . چونکە ئەوەی ئەی‌ڵێن بە جێی ناهێنن . دەم لە ئەدەب و لە نووسینی رۆمان ئەدەن ، بەڵام بەردەوام درۆ ئەکەن .

﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ ... ئەوانە لەگەڵ ئەوەدا کە شاعیرن ، ئیمان‌داریشن . بۆیە ئەوانەی کە شوێن ئەوان ئەکەون لە هەمان هەست و هەمان ئیمان‌دا هاوبەشیانن . جا لەبەر ئەوەی کە ئەوانە رێبازی قورئانیان

کردۆتە پرۆگرامی ژیانیان ، ئەوا لا نادەن و ، سەر بە هەموو شیوێکیشدا ناکەن و ، بەو بۆنەشەوە کە ئەگەر شتێك بلێن و بە جێی نەهێنن ، بە گەورەترین تاوانی ئەژمێرن بە لای خواوە ، هەرگیز درۆ ناکەن و ، ئەو بەهایانەش کە ئیمانیان پێیانە لە قەسابخانەی ئەدەب و شیعر و رۆماندا نایانکەنە قوربانیی ، ئەمەش بە هۆی ئەوەوە کە ئیماندارن . واتە ئەمانە نوێنەرایەتیی ئەمن و ئاسایش ئەکەن لە دنیادا و ، بەردەوام جێی متمانەن ، چونکە وتە و کردەوە بە لای ئەمانەوە لە نێو یەك چوارچێوەدایە و ، هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نیە . هەروەها لەو کەسانەش کە لە هەستان و دانیشتن و پاڵکەوتنیاندا خەریکی ذیکری خوان و، هەر کاتێکیش زوڵمیان لێ کرا مافی خۆیان وەرئەگرنەوە و ، بۆ بەرگریی لە خۆیان مافی خۆیان بە کار ئەهێنن ، چاوەڕوانیی شتێکی تر ناکرێت ..

هەروەك دیمان لە گرنگترین مەرجی کەڵك وەرگرتن لە قورئان ئەوەیە کە بە پەیامێکی جیهانیی بۆ هەموو چەرخەکان قبووڵ بکرێت و ، هەموو مرۆڤێکیش وەهای بخوێنێتەوە کە لەگەڵ ئەودا فەرمایشت ئەکات . تەنها لەم حاڵەتەدا قورئان ئەتوانێت خزمەتی خۆی دەر ببڕێت و ، ئێمەش ئەتوانین کەڵکی لێ وەر بگرین .

کورتەکەی شیعر و پەخشان ـ وەك کار و پیشەکانی تر ـ بە پێی جیاوازیی ئەوانەی ئەنجامیان ئەدەن ، بە شێوەیەکی جیاواز تیشك ئەدەنەوە. جا لە کاتێکدا کە ئەو کەسەی ئیمانی هێناوە و ، کردەوەی چاکی ئەنجام داوە ، بنچینەکانی ئیمانەکەی لە شیعر و پەخشانەکەیدا تیشك پێ ئەداتەوە و ، بەردەوام حەق رائەگەیەنێت و ، لێ هاتنە هونەریی و ئەدەبییەکانی لە ئەندێشەی هیچ و پووچ دا سەرف ناکات ، بەڵکو بۆ جێبەجێکردنی حەق و کەرەسەی بینای حەق بە کاریان ئەهێنێ . ئەو کەسە ئەگونجێ سەر بکەوێ ، یان تێك بشکێت ، بەڵام هەرگیز دەستبەرداری پشتگیریی حەق نابێت .

شیعر و پەخشان و وتاردان بە لای خەنساء و ، کەعبی کوڕی زوهەیر و، کەعبی کوڕی مالیك و ، حەسسانی کوڕی ثابیت و ، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەوە ـ لەوانەی کە لە لایەن ( روح القدس ) ەوە سەرکەوتنیان پێشکەش کرا ـ ئامرازێکی کاریگەر و ، سیحرێکی حەلاڵ بوون ، کە سەرنجی خەڵکێکی زۆریان ڕاکێشا و ، لە شمشێری بڕندە زیاتر کاریان تێ کردن .

لە کاتێکیش‌دا کە نرکەیەك لە پێناوی حەق‌دا ، یان وتارێکی نووسراو کە حەقیقەتەکان بخاتە ڕوو هۆیەکە لە هۆیەکانی سەرخستنی حەق ، ئەش بێ شیعر و پەخشانیش ئامرازێك بن بۆ گڕ پێ‌گرتنی هەوا و ئارەزووەکان و ، ئامرازێکیشە لە ئامرازەکانی لادان و گومڕاکردنی مرۆڤ .

بۆ نموونە : ڕەنگە یەکێك لەو ئەدیبانە ڕۆژێکیان ستایشی دارمێو بکات و، ڕۆژێکیش دوای ئەوە بە دەست بلاّویی وەسفی بکات و ، ئەو کەسەش کە ئەمڕۆ ستایشی ئەکات و بۆ ئاسمانی بەرز ئەکاتەوە ، سبەینێ هێرشی بکاتە سەر و بێ‌بات بە ناخی زەویی‌دا .. جارێك ئەیان‌بینیی وەسفی خەیاڵێکی هەڵ بزڕکاو ئەکەن ، کە گوایا ئەمە حەقیقەتێکی گەشاوەیە ، یان ئەیان‌بینیی پشت لە حەقیقەتە درەوشاوەکان ئەکەن و ، وەهایان وەسف ئەکەن کە کۆمەڵە خەیاڵێکن. کاتێکیش کە باسی جوانیی ئەکەن ئارەزووە جەستەیی‌یەکان ئەورووژێنن و، ناتوانن جوانیی بە تەنیا ببینن . کاتێکیش کە باسی سروشت ئەکەن ، وەهای باس ئەکەن کە سروشت بەدیی‌هێنەرە و شایانی پەرستنە .. دەربارەی شتانێك باس ئەکەن کە نە بوون و نە ئەش‌گونجێ ببن . ئەوانە ئەدەب و هونەر ئەکەنە هۆیەك و بۆ درۆکردن و زیادەڕەویی و دیماغۆغییەت بە کاریان ئەهێنن . لەبەر ئەوە هەموو ئەم حاڵەتانانەیان حاڵەتی شەیتانیین ..



﴿ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَدۡخِلۡنِي بِرَحۡمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ ( النمل : ١٩ ).

ئـەو وشـە و كـردار و شـێوازانەی كـە قورئـان بـۆ روون‌كردنـەوەی مەبەسـت و ئامانجەكانی هەڵیان ئەبژێرێ دارای گرنگی‌یەكی گـەورەن . قورئـانی پـیرۆز مانـای وەها دێنێت كە روون‌كردنەوەیان پێویستیی بە چەند لاپەڕەیـەك هەیـە ، وەك لـەم ئایەتانەدا هاتووە .

بۆ نموونە : كرداری ( أنعمت ) لێرەدا بە كار هێنراوە و مەبەست پێی ئەمەیە:

(( خوایە ! نیعمەتێكی زۆرت پێ بەخشیوم و ، بووم بە ژێر چاكەكانتەوە )).

واتە : (( خوایە ! ... لە بەندی‌خانەی عەدەمدا بە بەندیی نەمامـەوە ، بـەڵكو هاتمـە وجـوود ... بـوونم پـێ بەخشـرا ... بـەرگی وجـوودم پۆشـیی و ، بوومـە ئاوێنەیەك بـۆ درەوشـانەوەت .. هەركـەس بم‌بینـێ و ، هەركـەس سـەیرم بكـات، دەركی پێ ئەكات كە مـن ئامـاژەیـەكم بـۆ لات و ، نیشـانەیەكم لـە خۆتـەوە ... كاتێك كە بۆ ئەم ئاستە بەرزت كردمەوە نیعمەتت پێم بەخشیی . كـاتێكیش كـە ژیانت پێم بەخشیی هـەموو لێ‌هـاتنێكی فراوانـت ئاسـان كـرد بـۆ دەرخسـتنت . هەندێ جار ئەبە شمشاڵێك و ئەناڵێنێ و ، هەندێ جاریش ئەبـە ژێیـەكی ژەنـراو، یان ئەبمە عوودێك و ئاوازەكانی بەر ئەدا بۆ ئاماژە پێ كردنت ... پاشان منت بـە مرۆڤ گێڕا ... بەوەشەوە نەوەستایت ، بـەڵكو بـەرزت كردمـەوە و بـە مرۆڤێكـی ئیمـانـدارت گێـڕام . ئـیتر بیـنین و ناسـینی ( وجـود ) ت لـە گۆشـەنیگای مرۆڤایەتی‌یەوە بۆم ئاسان كرد ، وەك ئەو كەسەی كە پیشانگایەك ببینـێ ، یـان ـ

بە وێنەی کەسێك کە کتێبێکی کراوە بخوێنێتەوە ـ چەند لاپەڕەیەکی ئەو پێشانگایە بخوێنێتەوە . بە راستیی ئەوە شەرەف مەندییەکی گەورە بوو بۆم .. بەڵێ ! ... سەیرکردنی بووەنەوەر ، بە وێنەی ئەم سەیرکردنە ، بە لێهاتن و ئامادەباشییە تایبەتییەکانی مرۆڤ نەبێت سەرناگرێت . پەروەردگارم ! ... ئەم سەیرکردنە کە بە شێوەی نیعمەت پێمت بەخشیوە وەهای لێ کردووم پابەندی هیچ جێگایەك نەبم ، بەڵکو بە جوولاندنی لێهاتنی بیرکردنەوە ئەتوانم لە مەیدانەکانی خود و سیفات و ناوە جوانەکانتدا هاتوچۆ بکەم و ، بەو هاتوچۆ کردنەش لەو بازنە فراوانەدا ، لەبەر دەمتدا بە سەرسوڕمان و هەناسە سوارییەوە ئەوەستم )) .

بەڵێ ! ... سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت کاتێك کە وشەی ( أنعمت ) ەی بەکار هێنا ، مەبەستی هەموو ئەمانە بوو ، بگرە بە پێی پایەی بەرز و بڵندی لەم مانایانە زۆر زیاتری مەبەست بوو .

کاری دووهەمیش لەم بارەوە بریتییە لە سۆز راکێشانی سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێ بە کرداری ( أنعمت ) ، وەك بفەرموێ :

(( ئەی پەروەردگارم ! ئەوەی دوای کەمێك داوای ئەکەم لێت لە عادەتی سوبحانییت جیاواز نیە . چەند لوطفت بەسەرمدا رژاندووە بێئەوەی داوای بکەم لێت ، لەبەر ئەوە بڕوام وەهایە ئەوەی کە ئێستا لێتی داوا ئەکەم پێمی ئەبەخشیت ، چونکە تۆ بۆ بەخشین و گیراکردن بە توانای )) . بەمە ئەیەوێ سۆز و بەزەیی خوا بخرۆشێنێ .

خۆ ئەگەر ئەمە بە شێوازی ئیمام ( ئالوارلی ئۆفە ) دەربڕین ، ئەوا داواکردنەکەی بەم شێوە ئەبوو :

(( پەروەردگارم ! چیی روو ئەدات ئەگەر دوعامان گیرا بکەیت ؟ .. چیی روو ئەدات ؟ پەروەردگارم ! تۆ هیچ کەم ناکەیت )) .

بە دەربڕینێکی تریش : (( هەتا ئێستا بەردەوام پێت بەخشیوم .. بەخشین سیفەتێکە لە سیفەتەکانی پایەبەرزییت ، لەبەر ئەمە بەدەر لەوەی کە هەتا ئێستا پێت داوم و بەخشیوتە هیچی ترت لێ داوا ناکەم ، بگرە تەنها داوای تەواو کردنی نیعمەتەکانت لێ ئەکەم )) .

لە دوعاکردنێکی ئاوەهادا لە بیرچوون یان پشتگوێخستنی دوعاکردن بۆ باوك و دایك نکوولیی کردنە و ، لەبەرچاو نەبوونی هەموو ئەو شتانەیە کە بە بۆنەی ئەوان هەردووکیانەوە خوا پێی بەخشیوە . بەڵێ ! داوود پێغەمبەر سەلامی لێ بێت باوکی سولەیمان پێغەمبەر بووە سەلامی لێ بێت و، پێغەمبەرێك بووە و لەسەر ڕەوییەی ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی لێ بێت گەیشتۆتە چڵە پۆپە و ، ئەو ستایشەشی دەرنەخست کە خوا لە قورئاندا دەربارەی هەندێ لە پێغەمبەران باسی کردووە کە بریتییە لە ﴿ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾.

گەیشتۆتە ئەو پلە بەرزە ، واتە بووە یەکێك لەو بەندە مەزنانەی خوا کە بە هەموو کیانێکیانەوە ڕوو ئەکەنە خوا . خۆ ئەگەر ـ لەم گۆشەیەوە ـ پێی وترا ئەو پێغەمبەری ( أوّاه ) ە ، واتە کەسێك کە هەناسە هەڵ بکێشێ و بناڵێنێ ، ئەوە لە جێی خۆیدایە . لەبەر ئەوەی هەرگیز لە سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت، کە لە پشتی پێغەمبەرێکی ئاوەها کەوتۆتەوە و ، لە کۆشیشیدا پەروەردە بووە، چاوەڕوان نەئەکرا لە بیری بچێت لەو پایە و پلەیەدا کە پێی گەیشتووە دایك و باوکیشی مافیان هەیە . خۆ ئەگەر بۆمان هەبێت بە داڕشتنێکی ڕوون تر ئەوە دەربڕین ئەوا ئەمان وت کە سولەیمان سەلامی لێ بێت ئەیزانیی کە ئەگەر ئەو لە سایەی خێزانێکی وەهادا گەورە نەبوایە و ، پەروەردەیەکی وەك پەروەردەی ئەو خێزانەی وەرنەگرتایە ، ئەوا سولەیمانێکی ئاسایی و تاکە کەسێك وەك کەسانی تر دەر ئەچوو . لەبەر ئەوە دوعاکردنی بۆ دایك و باوکی پشتگوێ نەنەخست.

هەروەها ئەشتوانرێت بەم شێوەیە لە باسەکە نزیك بکەوینەوە : دایك و باوك نزیکترین کەسن بۆ مرۆڤ و ، لە سیلەی رەحمیشدا یەکەم مافداریان هەیە و، قورئانی پیرۆزیش بەو دوعایانەی کە هەڵیان ئەبژێرێت ئەو ئەدەبەمان فێر ئەکات:
﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴾ ( إبراهيم : ٤١).

کەواتە یەکەم جار خودی مرۆڤ خۆی لە پێشە و ، پاشان دایك و باوك . لە راستییدا ئەمەش مەرجێکە لە مەرجەکانی مرۆڤایەتیی و ، مەرجێکیشە لە مەرجەکانی خۆڕازاندنەوە بە سیفەتە مرۆیییەکان . مرۆڤی راستەقینەش ئەوەیە کە بە لەزەت چەشتنی کەسانی تر ـ بە پێی پلەی نزیکییان لێیەوە ـ لەزەت بچەژێت و ، بە ئازاریان ئازاری پێ بگات .. ئا ئەمە مەرجێکە لە مەرجەکانی بەمرۆڤ بوونی . بۆ نموونە سەرنجی حاڵی ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بگرن کە چۆن ـ وەك لە فەرموودەکاندا هاتووە ـ لە دنیاش و قیامەتیشدا بۆ حاڵی باوکی ئازاری پێ ئەگات .[٥٨] لەبەر ئەوە ئەبینین سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت لەم کارەدا شوێن پێی باپیری شکۆداری هەڵ گرت و ، دایك و باوکی لە دوعاکانیدا بەشدار کردن ، وەك بفەرموێت : (( بەختیاریی ئەوان بەختیاریی منیشە )) .

خاڵێکی تریش ئەوەیە کە وەك داواکردنی کەسێك لە خوا بۆ لێخۆشبوون لە دایك و باوکی شتێکە هاتووە ـ وەك لە دوعادا لەسەرەوە تۆمارمان کرد ـ ، بە هەمان شێوە سوپاسکردنیشی بۆ ئەو بەختیارییەی کە دایك و باوکی پێی ئەگەن شتێکە هاتووە . واتە ئەگەر مرۆڤ نەیتوانیی بێت مافی دایك و باوکی لە ژیانیانا بە چاکیی بدات ، بۆ دواچارە شتێك هەیە ئەتوانێت ئەنجامی بدات، ئەوەش بەکارهێنانی زمانیەتی دەربارەیان بە چاکە ، وەك بڵێت :

(( خوایە ! لەو تەسبیحات و حەمد و سەنا و ئیستیغفارەی کە ئەنجامی ئەدەم بەشی دایك و باوکمی لێ بدە )) .

---

[٥٨] البخاري ، الأنبياء : ٨ .

پێغەمبەرێك وەك سولەیمان سەلامی لێ بێت کە زمانی باڵندەکانیشی ئەزانیی: ﴿ عُلِّمۡنَا مَنطِقَ ٱلطَّيۡرِ ﴾ ، ئەیتوانیی بە جوانترین شێوە مافی ئەو کارە بدات .

﴿ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ ﴾ : پێویستە لە گۆشەی رادەی متمانەکردنی پێغەمبەرە مەزنەکانەوە بە چارەنووس و سەرەنجامیان سەیری ئەم ئایەتە بکەین . ئەوان ئەوپەڕی پلە لە خوا ترساون ، بەلاّم لەلایەنی پاراستنیانەوە بە سۆز و بەزەیی خوایی ئاسوودە و دڵ ئارامن . یان سولەیمان پێغەمبەر بە ئیلهامی خوای بالآدەست ئەوەی فەرمووە . سولەیمان پێغەمبەریش سەلامی لێ بێت لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە ئەکاتەوە کە گەیشتن بە رەزامەندیی خوا بە کردەوەی چاك ئەبێت ، لەبەر ئەوە لە خوا ئەپاڕێتەوە لە ئەنجامدانی کردەوەی چاك کردەوەیەکی تری چاکی لێ ئەبێتەوە . بەلاّم هەندێ کردەوە هەن کە بە چاك دەرئەکەون، کەچیی خاوەنەکەیان بە پلەی رەزامەندیی خوایی ناگەیەنێت و ، هەرگیز توانای ئەوەیان نیە .

کورتەکەی کاتێك کە سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بە دۆڵی مێروولەکەدا تێپەڕیی و ، گوێی لە وتەی مێروولەکە بوو ، زەردەخەنەی بۆ کرد و، هەستی بە فراوانیی بازنەی نیعمەت بەخشینی خوایی کرد کە پێی بەخشرا بوو فەرمووی : ﴿ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَدۡخِلۡنِي بِرَحۡمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ ، بە وێنەی یووسف پێغەمبەر بوو سەلامی لێ بێت کە حەزی بە گەیشتنی بە حزووری پەروەردگاری بوو ، لە کاتێکدا کە لە چڵەپۆپەی پایە و پلە ماددیی و مەعنەویەکانی دنیا و قیامەتدا بوو . هەروەها سولەیمان پێغەمبەریش سەلامی لێ بێت کە گەیشتە پایە و پلەی پێغەمبەرایەتیی و هەموو شتێکی لە مرۆڤەوە هەتا مێروولە بۆ رام کرا ، تا لەو ساتەدا بە هەموو کیانێکیەوە رووی کردە خوا و

، هۆیشی بۆ ئەم رووتیٚکردنە ئەو شوکر و سوپاسەیە کە دەربڕینی گشتگیری بەندایەتی‌یە و ، ئەو کردەوە چاکەیە کە سەرداری حەقی بە هۆیەوە لێی رازیی نەبێت ، تا خوای بالآدەست بی‌خاتە ریزی پیاوچاکانیەوە . بەمە تاسەمەندیی خۆی بۆ گەیشتنەوە بە پەروەردگاری دەربڕیی ..

ئەگەر کردەوەی چاك ئەو کردەوەیە بێت کە خوای بالآدەست فەرمانی پیٚ داوە و ، تەنها لە پێناو و رەزامەندیی ئەودا ئەنجام ئەدرێت و ، ئەو کەسە جگە لە قیامەت هیچ مەبەستێکی تری نەبوو ، ئەوە ئەو کردەوەیەیە کە یووسف پێغەمبەر سەلامی لیٚ بێت داوای کردووە ، هەروەها ئەوەیە کە سولەیمانیش سەلامی لیٚ بێت داوای کردووە .

خوایە ! پشت‌گیرییم بکەیت هەتا سوپاسی ئەو نیعمەتانەت بکەم کە بە من و بەندە پیاوچاکەکانت بەخشیون و، بە سۆز و بەزەیی خۆت بمانخەرە ریزی بەندە پیاوچاکەکانتەوە و ، صەلات و سەلامیش بەسەر ئەو کەسەدا و هەموو ئال و بەیت و هاوەلآنی‌دا برێژە کە بە ( رحمة للعالمین ) رەوانەت کردووە .

* * *

 ( النمل : ١٩ ) .

وشەی پێکەنین کە لە ئایەتە پیرۆزەکەدا هاتووە بە مانای قاقای پێکەنین بە دەنگی بەرز نیە ، بگرە زەردەخەنە ئەگەیەنێت ، واتە دەرکەوتنی هێڵی زەردەخەنەیەك لەسەر لێوی بۆ ماوەیەکی کورت .

یەکەم : وت و وێژێکی ئیعجازیی لە نێوان سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لیٚ بێت و مێروولەکان‌دا رووی دا ، ئەمەش بە فەزڵی ئەو میهرەبانیی و پلە بەرزەوە کە خوای بالآدەست پێشکەشی کردبوو . لەبەر ئەوە ئەی‌بینین زەردەخەی سوپاس

گوزاریی ئەکات ، تا منەتباریی خۆی بۆ ئەم نیعمەتە دەر ببڕێت ، واتە نیعمەتەکانی خوای لەسەر خۆی راگەیاند .

دووهەم : بە هۆی چەند ئاماژە و ئاگادارکردنێکی سولەیمان پێغەمبەرەوە سەلامی لێ بێت مێرووڵەکە دەستی دایە روونکردنەوەی بیر و بۆچوونی خۆی دەربارەی دیاریی‌کردنی کۆتاسنووری عەدالەت و رەفتارکردن بە حەق ، ئەوەبوو وتی :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾ ( النمل : ١٨ ) .

واتە : مێرووڵەکە بە هاوڕێکانی وت : ئەم خەڵکە ، بەبێ مەبەست یان بیر کردنەوە ، بە پێی ئەو سروشتەی کە پێیان بەخشراوە ، زیانتان پێ ئەگەیەنن. سولەیمان پێغەمبەریش سەلامی لێ بێت بە هۆی ئەو میهرەبانی‌یە خوایی‌یەوە کە پێی بەخشرا بوو و ، کرانەوەی ئەو جۆرە دەروازەیە لە بەردەمیدا زەردەخەنەیەکی کرد ، چونکە ئەوە میهرەبانی‌یەکی تایبەتیی بوو بۆ پێغەمبەرایەتی‌یەکەی و، ئەوەش پێویستی بە سوپاسێکی حالیی و مەقالیی ئەوی ئەکرد . ئەوەبوو ئەویش بە زەردەخەنە و سوپاسەکەی ئەو کارەی ئەنجام دا..

وێنەی ئەم زەردەخەنەیەش ، کە رەزامەندیی دەرئەبڕێت لە ژیاننامەی شکۆداری پێغەمبەریشمان ﷺ ئەی بینین .

( موسەددەد بۆی باس کردین ، حەممادی کوڕی زەید لە عەبدلعەزیزی کوڕی صوهەیبەوە و ، ئەویش لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە بۆی باس کردین ، هەروەها یوونسی کوڕی عوبەید لە ثابیتەوە و ، ئەویش لە ئەنەسەوە بۆی باس کردین کە وتوویە : لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتوانی مەدینە تووشی گرانی‌یەك بوون . جا لە کاتێکدا کە وتاری جومعەی بۆ ئەدایین ، پیاوێك هەستا

و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! مەڕ و ماڵاتمان هەموو تیاچوو ، لە خوا بپاڕێرەوە بارانمان بۆ ببارێنیێ . ئەویش هەردوو دەستی درێژ کردن و دوعای کرد .

ئەنەس ئەڵێت : ئاسمانیش وەك شووشە وەها بوو ، بایەك هەڵی کرد ، پاشان پەڵە هەورێك پەیدا بوو ، پاشان خڕ بوویەوە ، پاشان باران هاتە خوارەوە . کە لە مزگەوت هاتینە دەرەوە نیشتینە مل ئاوەکە هەتا گەیشتینەوە ماڵەکانمان . باران هەروا هەتا جومعەی داهاتوو ئەباریی . هەر ئەو پیاوە ، یان غەیری ئەو هەستا و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ماڵەکان رووخان ، لە خوا بپاڕێرەوە بیوەستێنیێ. پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەی کرد و ، پاشان فەرمووی : (( حوالينا لا علينا )). فەرمووی : خوایە! بارانەکە با بە دەورماندا واتە لە دەرودەشتدا ببارێت ، نەك بە سەرماندا . منیش سەیری هەورەکەم کرد بە دەوری مەدینەدا دڕنی ئەدا و وەك تاجە گوڵینە وەهابوو .

عیسای کوڕی حەممادا بۆی باس کردین ، لەیث لە سەعیدی مەقبوریەوە ، لە شەریکی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبونەمرەوە ، لە ئەنەسەوە هەواڵی پێ داین کە گوێی لێ بووە ئەیوت : نزیك بە فەرمودەکەی عەبدولعەزیزی گێڕایەوە . ئەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بەرامبەر دەم و چاوی بەرز کردەوە و فەرمووی : (( أللهم اسقنا )) . فەرموودەکەی نزیك بەو شێوە هێنا ) .[٥٩] واتە پێغەمبەری خوا ﷺ وەك ناونیشانی سوپاسکردنی خوای بالآدەست و ، وەك تەصدیقێك بۆ پەیامەکەی و ، گێڕانی خۆیشی بە پێغەمبەرێکی دوعا گیرا بوو زەردەخەنەیەکی کرد .

بۆ هەردوو زەردەخەنەکە وشەی (( پێکەنین )) ی بە کار هێنا . ئەم پێکەنینەی سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت قاقا نەبووە ، بەڵکو سووکە زەردەخەنەیەك بوو کەوتە سەر هەردوو لێوی . ئەشگونجێ یەکێك لەوانەی کە لە دەوروبەریدا بوون هەستی بەو زەردەخەنەیە نەکردبێ .

---

[٥٩] سنن أبي داود ، الصلاة : ٩٩٣ ، صحيح البخاري ، الجمعة : ٨٨٠ .

ئەشگوبجێ لە گۆشەیەکی ترەوە سەیری ئایەتی : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾ بکەین ، کە بریتی‌یە لەوەی کە مێرووله‌کە ئەوە تۆمار ئەکات و ئەڵێت : کەسێك لە ئاستی سولەیمان پێغەمبەردا بێت سەلامی لێ بێت هەر تەنها ئەوەندەی لەسەر نیە عەدالەت لە نێوان خەڵکدا جێبەجێ بکات ، بەڵکو لەسەری پێویستە هەتا لەگەڵ مێروولەش‌دا بە عەدالەت بجوولێتەوە . لە کاتێکیش‌دا مێرووله‌کە روونی ئەکاتەوە کە جێبەجێکردنی عەدالەتی تەواو لەلایەن مرۆڤەوە شتێکی گرانە لە نێوان خۆیان‌دا ، مێروولەکانی تریش وریا ئەکاتەوە و پێیان رائەگەیەنێت کە هاتنیانە سەر رێی سەربازەکان شتێکی پڕ مەترسی‌یە و ، تیاچوونی لە دوایە.

هەروەها لە کاتێکیش‌دا کە پەپوسولەیمانەی بە ئاسمان‌دا فڕیو ، دەربارەی شاژنی سەبەء و میللەتەکەی و خۆر پەرستنیان هەواڵ بە سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت ئەدات و ، سەرسوڕمانی خۆی بۆ ئەو پەرستشەیان دەرئەبڕێ و ئەڵێت : ﴿ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴾ ( النمل : ٢٥ ) ، سەری لە پەرستنی ئەو خۆرە سوڕ ئەمێنێ کە یەکێکە لە بەدیهێنراوانی خوای بالادەست .

ئەو شتەیش کە سەرنج رائەکێشێت ئەوەیە مێرووله‌کەش و شاژن بەلقیسیش کە پەپوسولەیمانە هەواڵەکەی هێنا ، هەردووکیان مێینەن . مێینەش هێمای پیتاندنە . جا لەگەڵ ئەوەدا کە مێرووله‌کە ئاماژەیەکە بۆ شاژنی سەبەء، فرەیی ژنەکانی سولەیمان پێغەمبەریش سەلامی لێ بێت و ، بەرچاو گرتنی زۆریی کوڕەکانی بۆ ئەنجامدانی جیهاد و بەرزکردنەوەی فەرمایشتی خوا ، کارێکی سەرنج راکێشە ..

لێرەدا وای بۆ ئەچم کە ئاماژەیەك بۆ ئەوە هەبێت کە مرۆڤی کامڵ بایەخ بە جیهانی زیندەوەرانیش ئەدات و ، ئەشگوبجێ لە گۆشەیەکی ترەوە ئەمە گرنگ

بێت . خۆ ئەگەر ئێمە پەیوەندییمان بە جیهانی زیندەوەرانەوە ببوایە و ، بمان توانیایە هەندێ لەو راستی‌یانە دەرك بكەین كە وابەستەی ئەو جیهانەن ، ئەوا زۆرێك لە راستی‌یەكان ، كە بە دیی‌هێنراوان بە زمانی تایبەتیی خۆیان پێمان ئەگەیەنن بۆمان دەرئەكەوتن . من بڕوام وەهایە كە ناونانی هەندێك لە سوورەتەكانی قورئان بە ناوی زیندەوەران ، وەك مێروولە و هەنگ ، ئاماژەیە بۆ گرنگیی بوونی پەیوەندیی نێوان جیهانی مرۆڤ و جیهانی زیندەوەران . بێ‌گومان هەندێك زیندەوەر وەك مێروولە و هەنگ ـ كە لە رژێمێكی كۆماریی‌دا ئەژین ـ هەندێ راستی‌یان لایە كە ئەتوانن بە ئیلهام پێمان رابگەیەنن . بەلاَم ئەم پەیوەندی‌یە وردە جێ بەجێ كردن و شەرح كردنی مەگەر لە لایەن هەستێكی خاوەن دەركی مرۆڤێكی ئیمانداراەوە ئەنجام بدرێت .

خوای بالاَدەست لە قورئان‌دا روونی كردۆتەوە كە ئیمكان بوونی وت و وێژ كردنی راستەوخۆی مرۆڤ لەگەلَ گیاندارێك‌دا موعجیزەیەكی پێغەمبەرایەتی‌یە و، ئەم زمانی ئاخاوتنەش زمانێكی پاراو و پڕ بەلاغەتە ، ئەگەرچیی وشەیشی تیا بە كار نەهێنرا بێت و ، هەر ئەو زمانەش بەسە تا هۆیەك بێت بۆ وت و وێژێكی كراوە لە نێوان مرۆڤ و گیان‌لەبەران‌دا .

ئەشگونجێ یەكێك لە هۆكارەكانی زەردەخەنەكەی سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بریتیی بێت لەوەی كە ئەم رام كردنە بە ( هێز ) قابیلی گۆڕانە بۆ رام كردن بە ( كردار ) و ، كە كاتی گونجاویش هاتە بەرەوە جێ بەجێ ئەبێت ..

الله أعلم بحقيقة الحال والصواب ، وإليه المرجع والمآب ...

  

﴿ قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴾
(النمل : ٤١ )

له تەفسیری ئەم ئایەتەدا هەندێك له تەفسیرنووسان وتوویانە :
(( بۆمان دەرئەکەوێت ئایا شاژن ڕێی ئیمان ئەدۆزێتەوە ، یان بە گومڕایی و دوور له هیدایەتەوە ئەمێنێتەوە )) . بەڵام من وەهای ئەبینم کە ئەمە لەگەڵ سیاقی ئایەتەکەدا ناگونجێت و ، تەفسیری ئایەتەکە وەك من بۆی ئەچم ئەمەیە : (( ناونیشانی تەختی پادشایەتی‌یەکەی بۆ بگۆڕن ، با بزانین تەختەکەی خۆی ئەناسێتەوە یان نەء )) .
بەڵام وشەی ( هیدایەت ) لێرەدا بە تەنیا مانای ناسینێکی سادە نابەخشێت ، کە ئەو تەختەی لە بەردەمی‌دا پیشانی دراوە تەختەکەی خۆیەتی. سیاقی ئایەتەکە لەگەڵ ئەوەدا ناگونجێ. ئایا ئەم تەختە ـ کە ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە ـ تەختی پادشایی‌یەکەی خۆیەتی ، یان تەختێکی نوێیە ؟ ... سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بەم تاقیی‌کردنەوەیە ئەی‌توانیی پێوانەی زیرەکیی شاژن بکات .
بەڵام وا دەرئەکەوێت مەسەلەکە بە تەنیا لەمەدا بەند نەبووە . سەرنجی ئافرەتێکی بت‌پەرست یان خۆپەرست بدەن ، بە پێی بیروباوەڕەکەی تەختێکی پادشایی بۆ خۆی دروست کردووە . کەواتە ئەبێت ئافرەتێکی وەها تەختی پادشایی‌یەکەی بە وێنەی خۆر و ئەو شتانەی کە لە غەیری خوا ئەیان پەرستێت وەك ئەستێرە و مانگ .. تد ڕازاندبێتەوە و، سولەیمان پێغەمبەریش سەلامی لێ بێت ئاڵوگۆڕی بەسەردا هێنا بێت و ، بە شتانێکی وەها ڕازاندبێتیەوە کە بۆ هیدایەت وەرگرتن ئامادەی بکات و لێی نزیك بکاتەوە . قورئانی پیرۆزیش باسی ئەوە ناکات کە سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت تەختەکەی زیاد و کەم پێ کردبێ ، بەڵکو فەرمووی : ﴿ نَكِّرُواْ لَهَا عَرْشَهَا ﴾ . فەرمووی : تەختەکەی بۆ

بگۆڕن . دەی لەمە چیی تێ ئەگەین ؟ ئایا ئەوە تێ ئەگەین کە فەرمانی بەسەر خەڵکەکەدا داوە شێوەی تەختەکەی بگۆڕن ، یان بە هەندێ جوانکاریی ئیسلامیی بۆی برازێننەوە ؟ وای ئەبینین کە ئیحتمالی دووهەم بە هێزتر بێت ، کە بریتی‌یە لە لابردنی هەر شتێك لە وێنە و جوانکاریی کە ئاماژە بۆ بت‌پەرستیی بکات. پاشان چاوەڕوانیی و سەیرکردنی تا بزانن داخۆ ئەو پەیام و ئاماژەیەی کە ئاراستەی کراوە ، کاتێك کە تەختەکەی ئەبینێ ، تێ ئەگات و هیدایەت وەرئەگرێت ، یان نەء . لە ئەنجامدا ئەبینین کاتێك کە بەلقیس تەختەکەی ئەبینێ، هیدایەت وەرئەگرێت ، چونکە خاوەنی فیطرەیەکی ساغ و زیرەکیی و بلیمەتیی و بیرێکی فراوان و بەرین بوو . چونکە هەر کە تەختەکەی بینیی ئەوەندە سەرسام بوو خۆی پێ نەگیراو ، لەو نامە و ئاماژەیەش کە لە هەڵوێستەکەدا هەبوون تێ گەیشت و ، هیدایەت و تەسلیم‌بوونی خۆی بۆ پەروەردگاری جیهانیان بڕیار دا ..

بێ‌گومان شاژنە بەلقیس لەسەر فیطرەیەك بوو کە ئامادە بێت بۆ وەرگرتنی ئەو پەیامانەی تەوحید کە لەم بوونەوەرەدان ، بەڵام سەرەڕای فیطرەی ساغ و زیرەکیی و چاوساغیی لەوەو پێش هیدایەتی وەرنەگرتبوو ، چونکە لە نێو کۆمەڵێکی بت‌پەرستدا هەڵکەوتبوو و ، پەروەردەی وەرگرتبوو و ، بیروباوەڕی پڕ و پووچی قەومەکەی لەگەڵ خوێن و گۆشتیا تێکەڵ بوو بوو ، بە جۆرێك کە ئەو بیروباوەڕانە بوو بوونە کۆسپ لەبەردەم ئەو و هیدایەت و ، هەڵسەنگاندنی ئەو پەیامانەی تەوحید کە لە جیهاندا بڵاو بوونەتەوە .

بێ‌گومان ئامادەکردنی ئەو تەختە لەوێ بە موعجیزەیەکی سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت و ، بە کەرامەتێکی تاکێکی ئوممەتەکەی ، کە زانستێکی ( لدني ) پێ بەخشرا بوو ، لە قەڵەم ئەدرێت . ئیتر بۆ بەلقیس بەس بوو تا ئیمان بهێنێت و ، تەصدیقی سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بکات. بەڵام بناغەی ئیمان هێنان بریتی‌یە لە خستنە کار و بەکارهێنانی عەقڵ و، بیرکردنەوەی

ئافـاقيى و ئەنفوسـيـى و ، [٦٠] ويسـتى تايبـەتمەنـديى خـوايى . هـەتا ئـەو رۆژە ئەمانە هۆ و رێگای ئیمان هێنان بوون و ، نە لـە سـەردەمى سـولەيمان پێغەمبـەر سەلامى لىٚ بێت و ، نە لە دواى ئەويش‌دا ئـەو هۆيانـە بۆيـان نـەبوو ئاڵوگۆڕيـان بەسەردا بێت .

أللهم صل وسلم وبارك على من أرسلته رحمة للعالمين وعلى إخوانه من النبـيين والمرسلين وعلى أصحابه والتابعين أجمعين ..



﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ﴾ ( النمل : ٤٥ ) .

کـە قورئـان راسـتەوخۆ چـيرۆکى قـەومى ثـەمـوود دواى چـيرۆکى سـولەيمان پێغەمبـەر سـەلامى لىٚ بێـت ئەگێڕێتـەوە ، لەوانەيـە لەبـەر ئـەم هۆيانـەى لاى خوارەوە بوو بێت :

١ ـ عەرەبەکان قەومى ثەمووديان چاك ئەناسيى .

٢ ـ لەوانەيە رادەى هێزى قەومى ثەمووديان زانيى بێت . ئەمـەش لايـەنێکى ترى گرنگە دەربارەى کاريگەريى لەسەر قەومى سولەيمان سەلامى لىٚ بێت.

٣ ـ هەروەك قەومى ( ئۆرارتۆ ) بە دواى قەومى ( ئيرەم ) دا هاتن، لەوانەشە قەومى ثەموديش بە دواى قەومى سولەيمان‌دا هـاتبن ، بۆيـە قورئـانى پـيرۆز بـە باشترى دانا کە باسى يەکێکيان بە دواى باسى ئەوى تريان‌دا بهێنێت .

٤ ـ لەوانەيە لە يەك چوونى رەوشت و هـەڵس و کـەوت و سروشـتى دوو قـەوم هۆيەك بێت بۆ پێکەوە باس کردنيان .

---

[٦٠] واتە بيرکردنەوە لە ( ئافاق ) و لە ( ئەنفوس ) بە پێى ئەم ئايەتەى کە لە قەرئان‌دا هـاتووە : ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾( فصلت : ٥٣ ) . ( وەرگێڕى عەرەبيى ).

جا سەرەڕای ئەوەش کە ناکۆکیی لە نێوان ئەوانەدا کە بە دەم بانگەوازی پێغەمبەرانەوە دێن ، کاتێك کە ئوممەت بانگ ئەکەن و ، لە نێوان ئەوانەدا بەرهەڵستیان ئەوەستن ، ناکۆکی‌یەکی دووبارە بۆوەیە لە مێژوودا : ﴿ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴾ ( النمل : ٤٥ ) ، کەچیی لێرەدا هێڵێکی یەك گر لە نێوان ئەو تەوژمە گەورەی گومڕایی‌دا ، کە لە دوای سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت لە نێو مووسەوی‌یەکان‌دا دەرکەوت و ، لە نێوان لادان و گومڕایی قەومی ثەموددا بە دیی ئەکرێت . جا لە بەرامبەری بانگەوازی صالح پێغەمبەردا سەلامی لێ بێت بۆ قەومەکەی و فەرموودەکەی‌دا پێیان : ﴿ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ ﴾ ( النمل : ٤٦ ) ، وەڵامی قەومەکەی بریتیی بوو لە ﴿ قَالُوا اطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ﴾ ( النمل : ٤٧ ) . ئەمەیان پێ وت و ، لەسەر سەرگەردانیی و گومڕایی خۆیان بەردەوام بوون . جا ئەم وتەیە ، یان ئەو ڕاگەیاندنە لەوەو پێش لە مێژووی ئیسرائیلیی‌دا بە مووسا پێغەمبەریشیان سەلامی لێ بێت وتووە ، پاشان دژی چەندین پێغەمبەری تریش ، کە یەکێکیان عیسا پێغەمبەر بووە سەلامی لێ بێت دووبارەیان کردۆتەوە ، بەویشیان وت : ﴿قَالُوا إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ﴾ ( يس : ١٨ ) . جگە لەمەش چەندین دیوی لێك چوو و هاوبەش لە نێوان ئەم لادانانەدا هەیە کە پشتیان بە زۆرداریی و جەور و ستەم و پەرەسەندنی زوڵم و ناهەقیی بەستووە و ، لە نێوان داواکردنی کاری لە رادەبەدەر و موعجیزە ، بگرە داواکردنی بینینی خوای بالادەست بە ئاشکرا .

قورئانی پیرۆزیش باسی ئەو قەومانە ، کە لە پێغەمبەرەکانیان یاخیی بوون ، قەوم لە دوای قەوم ئەکات و ، زۆربەی جاریش بە شێوەی یەك لە دوای یەك .. ئەم بەشەی سوورەتەکەش نموونەیەکە لەوە ..



﴿ إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ﴾ ( القصص : ٧٦ ) .

لە هەندێ ریوایەتی تەفسیردا ـ بە پشت بەستن بەم ئایەتە ـ هاتووە کە قاروون یەکێك بووە لە خزمانی مووسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێت . هەندێکیان وتوویانە خالۆزای بووە و ، هەندێکی تریان وتوویانە : پوورزای بووە لە باوکیەوە. لەوانەیە ئەم جۆرە تەفسیرکردنانە و ، گەڕان بە دوای دەست خستنی خزمایەتیی لەگەڵ ئەم پێغەمبەرە بەرێزەدا بۆ ئەوەیە دەربخرێت کە قاروون لەگەڵ ئەوەدا ئەوەندە لە مووسا پێغەمبەرەوە سەلامی لێ بێت نزیك بووە نەیتوانیوە کەلکی لێ وەربگرێت . لە راستییدا بۆ ئەم جۆرە خزمایەتی‌یە نە لە قورئانی پیرۆزدا و نە لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ هیچ ئاماژەیەك نیە .

کەواتە پێویستە بە دوای تەفسیری تردا بگەڕێین :

هەڵ ئەگرێت قاروون لە بەنی ئیسرائیل بێت ، لەبەر ئەوە قورئان ئەفەرموێت: ﴿ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ ﴾ . یان هەڵ ئەگرێت لە نێو ئەو ئوممەتەدا هەڵ کەوتبێ کە حەزرەتی مووسا بانگی کردبن . واتە یەکێك بووە لەوانەی کە بانگەوازی مووسا سەلامی لێ بێت نەیگرتنەوە . لەوانەشە ـ بە وێنەی سامیریی ـ یەکێك بووبێت لەو کەسانەی کە مووسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێت گرنگیی پێ دابوون و ، وەهای ئەبینیی کە ئەمە یەکێکە لەوانەی کە پێویستە بایەخی تایبەتیی پێ بدرێت . بەڵام قاروون نەیتوانیی نرخی ئەو بایەخ پێدانە و ، نرخی ئەو سەروەت و سامانە بزانێت تا بەهەشتیان پێ دەست بخات .

ئایەتەکە بەردەوام ئەبێت و ئەفەرموێت : ﴿ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ ﴾ ( القصص : ٧٦ ) . جا با لە سەرەتاوە ئەوە

بلـێین کـه دارشـتنه‌کانی قورئـانی پـیرۆز لـه درۆ پـاك و خـاوێنن ، هـه‌روه‌ها لـه زیاده‌ڕه‌وییش که به درۆیه‌کی ( ضیمنیی ) ئه‌ژمێررێت . که‌واته کاتێـك کـه ئـه‌م حه‌قیقه‌ته‌ی قورئان ده‌ری ئه‌برێ دێنینه به‌رچـاومان ، واتـه هێنانـه به‌رچـاوی ئـه‌و گه‌نجینانـه‌ی کـه کۆمه‌ڵـه پیـاوێکی بـه‌هێز بـه هـه‌ڵگرتنی کلیلـه‌کانیان ناڕه‌حـه‌ت ئه‌بوون ، ده‌رك به‌وه ئه‌که‌ین که ئه‌م هه‌مووه سامانه چ مانایه‌ك ئه‌به‌خشێ .

ئه‌م گه‌نجینانه‌ی قاروون ئه‌وه‌نده زۆر بـوون به‌شـی ئـه‌وه‌یان ئـه‌کرد کـه چـه‌ندین مۆزه‌خانه‌ی ئه‌م سه‌رده‌مه پڕ بکه‌ن .

قاروون له به‌رامبه‌ر ئه‌م سامانه زۆر و زه‌به‌نـده‌دا کـه پێشکه‌شـی کـرا ده‌سـتی دایـه سـته‌م و ته‌کـه‌ببور و لـه سـنوور ده‌رچـوون و خـۆ به‌گـه‌وره گـرتن به‌سـه‌ر قه‌ومه‌که‌ی‌دا ، له‌به‌ر ئه‌وه هه‌ندێکیان بـه قاروونیـان وت : ﴿ لَا تَفْرَحْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴾ ( القصص : ٧٦ ) .

به‌لام ئه‌و گوێی به‌م ئاگادارکردنه نه‌دا ، به‌ڵکو له‌سـه‌ر لادانـی خـۆی به‌رده‌وام بوو . پاشان له‌وپـه‌ڕی بێشـه‌رمیی‌دا وه‌لامـی خه‌ڵکه‌کـه‌ی دایـه‌وه : ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ﴾ ( القصص : ٧٨ ) .

ئـه‌م بارودۆخـه تایبـه‌ت نیـه بـه قاروونـه‌وه . لـه مێـژووی کـۆن‌دا و ، لـه‌م سه‌رده‌مه‌ی ئێستای خۆشمان‌دا چه‌ند که‌س سـه‌روه‌ت و ده‌وڵه‌مه‌نـدیی لـه خشـته‌ی بردن و له ڕێی ڕاست لای پێ دان و ، ئه‌وه‌ی کـه قـاروون وتـی ئـه‌وانیش ئـه‌وه‌یان دووباره ئه‌کرده‌وه . له‌به‌ر ئه‌مه ڕاست نیه چوارچێوه‌ی ئـه‌م فه‌رمایشـته‌ی قورئـان ته‌سك بکرێته‌وه و ، ته‌نها قاروون بگرێته‌وه . ئه‌وانه‌ش که ئێره‌یی‌یـان بـه قـاروون ئـه‌برد له‌سـه‌ر سـه‌روه‌ته‌که‌ی وتیـان : ﴿ يَـٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾ ( القصص : ٧٩ ) .

بەڵام کاتێك خوا قاروون و ماڵ و حاڵی بە ناخی زەویی‌دا برد : ﴿ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴾ ( القصص : ٨٢ ) .

چارەنووسی قاروون ، کە بەرامبەر بەو نیعمەتانەی پێشکەشی کران کردار و رەفتاری خۆی نەگۆڕیی و رێك و پێکی نەکردن ، ئەوەبوو خوای گەورە قاروون و ماڵ و حاڵی بە ناخی زەویی‌دا برد . قورئانیش ئەم کارە بەم دیمەنەی کە دێت وێنە ئەکێشێت :

﴿ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴾ ( ٨١ ) .

لە راستیی‌دا قاروون لە دوولاوە هەڵەی کرد :

یەکەم : بە هۆی ئەو نیعمەتانەوە کە خوا بەسەری‌دا رژاندنی بەرەو غروور لای دا و ، خۆی لە خەڵکییش و لە خوایش بە گەورەتر ئەزانیی و ، کەوتە ناو چاڵی تەکەببور و غرووڕەوە ، کە ئەمەش یەکێکە لەو سیفەتانەی کە ئەبنە هۆی ئەوە کە مرۆڤ نەچێتە بەهەشت . جا لە بەرامبەر داواکاریی تەکەببور و غرووڕەوە خوای گەورە بە رۆچوونی زەویی لە ژێریی‌دا سزای دا . بە دەربڕینێکی تریش : لە کاتێك‌دا کە قاروون بیروڕای وەها بوو کە ئەو خاوەنی ئەو نیعمەتانەیە کە پێشکەشی کراون و ، بۆ هەتا هەتایی موڵکی ئەون ، خوای گەورە بە ناخی زەویی‌دا برد . ئەمەش لە کاتێك‌دا کە وا جوانتر بوو تەوازوع دەربڕێ : ( من تواضع لله رفعه الله ، ومن تكبر وضعه الله ) .[٦١] واتە : هەر کەس لەبەر خوا

---

[٦١] المسند للإمام أحمد : ٣ / ١٧٦ ، إبن ماجه ، الزهد : ١٦ .

خۆی بە کەم بگرێت خوا بەرزی نەکاتەوە و ، هەر کەسیش تەکەبور بنوێنێ نزمی ئەکاتەوە .

دووهەم : ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا نموونەی قاروون و هاووێنەی زۆر بوون و، بیروڕای خۆیان بەسەر کۆمەڵگادا سەپاند ، نیشانەی پارچە پارچە بوون و هەڵوەشاندن لەو کۆمەڵگایەدا سەر هەڵ ئەدات . واتە ئەگەر بۆچوونی ئەوانە زاڵ بوو کە پارە و سامانێکی یەکجار زۆر و قازانج ئەکەن و ، وایشی نابینن کە هیچ کەس مافی بەو پارە و پووڵەوە هەبێت و ، گەر کەسانێکیش لە برساندا بمرن ئەوان مێشێك میوانیان نابێت ، واتە ئەگەر فەلسەفەی مرۆڤە خۆپەرستەکان دەستی بەسەر کۆمەڵگادا ڕۆیشت و ، ئەو فەلسەفەیە نەخشەی بۆ ژیانی خەڵك ئەکێشا ، جیاوازیی یەکجار زۆر لە نێوان چینەکانی کۆمەڵگادا سەر هەڵ ئەدات. جا ئەتوانرێ سەرنجی سەرمایەداریی و شیوعیەت وەك نموونەی ئەم جیاوازییە فراوانەی نێوان چینەکان بدرێت . لەم جۆرە ڕژێمانەدا ، لە ڕابوردوودا و ئێستاش، جیاوازییەکی فراوان لە نێوان چینەکانی گەلدا هەیە ، ئەمەش بوو بووە هۆی پەیدابوونی چەندین پەژارە و موسیبەتی مرۆڤانەی گەورە . لەبەر ئەمە خوای گەورە ، بۆ ئەوەی نەهێڵێ ئەم دەرد و نەخۆشییە پەرەبسێنێ و ، لە ناو تاکەکانی گەلدا بلاّوە نەکات ، سزای قاروونی دا ، ئەویش بە چوونی خۆی و خانووەکەی بە ناخی زەوییدا ، تا ببێتە پەند و ئامۆژگاریی بۆ ئەوانەی کە دوای ئەو دێن .

هەروەها خوای بالاّدەست ویستی خەڵك وریا بکاتەوە کە ئەوانەی بایەخ بە زینەت و زرق و برقی ژیانی ئەم دنیایە ئەدەن کەوتوونەتە هەڵەیەکی گەورەوە ، چونکە ماڵ و سامانی دنیا لە ناو ئەچێت و ، خوای بالاّدەستیش کە ئەم سامان و زینەتەی بەخشیوە هەر کەی ویستی لەسەر بێت ئەتوانێت لەو کەسەیان بسەنێتەوە .

کورتەکەی : قاروون کەل و پەلێکی زۆری لە زێڕ و زیو هەبوو و، لێرەدا ئەوە گرنگ نیە کە چۆنی دەست خستووە ، گەنجینەکانیشی لە چەندین ژووری بە

ناویەك چوودا بوون و ، هەریەكەش كلیل و ئەلقەڕێزی خۆی هەبوو تا بە جوانیی پارێزراو بن . ئەم كلیل و ئەلقەڕێزە زۆرانەش ئاماژە بۆ سیفەتی حیرص و رەزیلیی قاروون ئەكەن . ئەگونجێ قاروون ئەم سەروەتە زۆرەی لە رێی هەڵكۆڵینی زەوییەوە ، بە دوای ئەو گەنجینانەدا كە لەوەو پێش بە ناخی زەویی‌دا چوو بوون و هی پادشاكانی سەردەمە پێشینەكان بوون ، دەست كەوتبێ ، یان لە رێی وەرگرتنی ( ریبا ) وە . ئەم سەروەتە زۆر و كوت و پڕییە كە بە دەسەڵات و دەست رۆیشتنێكی گەورەی گێڕان و ، بەندە و پاسەوانی كردنە خزمەت كاری خۆی ، وەهایان لێ كرد لە سنووری خۆی دەرچێت و دەست بداتە تەكەببور و جەور و ستەم ، بۆیە هەندێك لە خزمانی پێیان وت : ﴿ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴾ ( القصص : ٧٦ ) .

بە ئاسان دەست كەوتنی ئەو سەروەتە یان رەزیلیی و رشدی‌یەكەی چاویان كوێر كرد و ، وەهای نەبینیی كە هیچ كەسێك مافی بەو سەروەتەوە هەبێت . ئیتر هەموو ئەو هەڵس و كەوتە سەلبی‌یانەی كە لێیەوە دەركەوتن لە بناغەدا ئەگەڕێنەوە بۆ ئەو چاوكوێربوونەی و ، بۆ ئەو بۆچوونەشی كە وەهای ئەزانیی دنیا ئەو بەختەوەر و تێر ئەكات و بەشیشی ئەكات .. كەواتە كەسێك دڵ بە دنیا خۆش ئەكات و پشتی پێ ئەبەستێ كە هاوسەنگیی دڵی لە دەست دابێ و ، قاروونیش یەكێك بووە لەوانە ..

* * *

﴿ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ ﴾ ( القصص : ٧٧ ) .

لەلایەن کەسانێکی زۆرەوە لەم ئایەتە پیرۆزە ئەوە تێ گەیشتم کە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات بەردەوام هەوڵ بۆ دنیا بدەین . بەڵام هەر کەس شتێکی کەم لە زمانی عەرەبیی بزانێت ئەزانێت ئەم رایە هەڵەیە . جا هەرکەس لە سیاق و سەرەتای ئایەتەکە ورد ببێتەوە ئەم مانایەی دێتە پێش چاو :

ئایەتەکە ئەفەرموێ : ﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ ﴾ ، واتە : بەوەی کە خوا پێی بەخشیوی هەوڵ بۆ قیامەت بدە ، یانێ : هەرچیی خوا پێی داوی بیکە بە هۆیەك بۆ دەست خستنی قیامەت . کرداری (( وَٱبۡتَغِ )) لێرەدا واتای شتی زیاتر لە (( واطلب )) ئەبەخشێت ، چونکە مانای ئەوەیە : هەرچیی خوا پێی بەخشیوی لە دڵ و هەست و شعوور و پەی پێ بردن و تەندرستیی و ماڵ و منداڵ .... تد ، بگرە هەتا هەموو لێ هاتنێکی کارایی و شارراوەت ، بەکار بهێنە و بۆ دەست خستنی قیامەت ، پاشان ئایەتی : ﴿ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ ﴾ واتە : بەشی خۆیشت لە دنیات لە یاد نەچێت ، دێت بۆ هاوتا کردنی مەسەلەکە . بەڵێ ، لەسەرمان پێویستە بەردەوام سبەینێ و دووا سبەی بخەینە بەرچاومان و ، لە هەمان کاتیش‌دا ئەو کارانە و ئەو شتانەی کە بۆ دنیان لە یادمان نەچن . کەواتە وەرگرتنی بەشی دووهەمی ئایەتەکە بە تەنیا و ، دنیا بە تەنیا بخەینە بەرچاوان و ، ئەو بە تەنیا بکرێتە تەوەرەی چالاك هەڵەیەکی لە رادەبەدەرە . چونکە ئەم مانایە لەگەڵ ئایەتی پیرۆزی : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ ﴾ (التوبة : ١١١ ) دا ناگونجێ و ، هەر کەس شتی وەها بڵێت ئەوا ، پەنا بە خوا ، قورئان بە کتێبێك لە قەڵەم ئەدات کە هەندێکی پەرچی هەندێکی تری بداتەوە .

ئەشتوانرێ لە گۆشەیەکی ترەوە سەرنجی ئەم ئایەتە بگیرێت : هەوڵ بۆ دنیا بدەن بە پێی بەهای خۆی و ، هەوڵ بۆ قیامەتیش بدەن بە پێی بەهای خۆی.

ئەگونجێ ئەمەش یەکێك بێت لە یاساکان . کەواتە قورئان بەم ئایەتە پێوەرێك بە مرۆڤ ئەدات و ، داوای بەکارهێنانیشی لێ ئەکات .

بەڵێ ! ... پێویستە بەم مانایە لەم ئایەتە بگەین . چونکە دنیا بە پێی دڵە دامەزراوەکان وەك رۆژی ( عەرەفات ) وەهایە و ، رۆژە رابوردووەکانی دنیاش لە چاو جەژندا وەك رۆژی عەرەفات وەهان . بەڵام جەژنی راستەقینە وا لەودیوی ئاسۆوە ، بگرە لەودیوی ئەو دیوی ئاسۆوە . بۆیە پێویستە ئەم هاوکێشەیە بپارێزرێ و چاودێریی لێوە بکرێت و ، ژیانی رۆژی عەرەفەش مافی خۆی پێ بدرێت . هەر کەسیش لە حەجدا رۆژی عەرەفەی لە دەست بچێت ئەتوانێت دوای ساڵێك پێی بگاتەوە ، بەلاّم هەرکەسێك رۆژی عەرەفەی قیامەتی لە کیس بچێت ـ کاتێك کە ئەم رۆژە بە ژیانی دنیا ئەشوبهێنین ـ و ، لە دەستی دەربچێت ئەوا جارێکی تر پێی ناگاتەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکیدا ئەفەرموێت : ( ما لي وما للدنيا ، ما أنا إلا كَراكِب استَظَلَّ تَحتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ راحَ فَتَرَكَها ) .[٦٢]

ئەگەر سەرنجیش بدەین ئەبینین تەرکی دنیا و وازهێنان لێی داوا نەکراوە ، هەروەها داوای ئەوەش نەکراوە کە دنیا بە هەموو شتێك لە قەڵەم بدرێت . لە فەرموودەیەکی تریشدا هاتووە : ( لَو كانَتِ الدُّنيا تَعدِلُ عِندَ اللهِ جَناحَ بَعوضَةٍ ما سَقَى كافِراً مِنها شُربَةَ ماءٍ ).[٦٣] بەمە هیچ کافرێك ، کە ئینکاریی بوونی خوا و هاتنی قیامەت ئەکات ، بۆی نەبوو خۆشیی لە نیعمەتەکانی خوای بالاّدەست ببینێ . ئەمەش پێچەوانەی عەدالەتی خواییە ، بەلاّم لە پشتی ئەم جیهانەوە جیهانێکی هەمیشەیی هەیە و، بەرامبەر بەو سزایەی کە لەوێ

---

[٦٢] الترمذي ، الزهد ، ٤٤ ، ابن ماجه ، الزهد ، المسند للإمام أحمد : ١ / ٢٠١ . ئەفەرموێ : چیم داوە لە دنیا ، من وەك رێبوارێك وەهام کە ئەچێتە ژێر سێبەری درەختێك و پاشان بەجێی ئەهێڵێ و ئەڕوات .

[٦٣] الترمذي ، الزهد : ١٣ ، إبن ماجه ، الزهد : ٠٣ ئەفەرموێ : ئەگەر دنیا بە لای خواوە کێشی باڵە مێشوولەیەکی ببوایە قومێك ئاوی دەرخواردی کافرێك نەئەدا .

ئەیچێژن ، خوای گەورە نایەوێ لەم دنیایەدا ژیانیان لێ تێك بدات ، بەڵكو سۆزی خۆی بەسەریاندا ئەڕێژێت و ، لێرە لەم دنیادا هیچێ لە بەختیاری‌یان لێ تێك نادات .

مامۆستا سەعیدی نوورسییش بەم شێوەیە سەیری ئەم باسە ئەكات :

(( ژیانی هەزارەها ساڵی پڕ بەختەوەریی لە دنیادا ناگاتە ژیانی تاقە سەعاتێكی بەهەشت و هاوتای نابێت و ، ژیانی هەزارەها ساڵی پڕ خۆشیی و بەختەوەریی بەهەشتیش ناگاتە بەختەوەریی یەك دەقیقەی سەیركردنی خوای گەورە )) . [٦٤]

ئا ئەمە ئەو ژیانەیە كە ئێمە داوای ئەكەین و هەوڵی بۆ ئەدەین .. كەواتە بەهای ژیانی دنیا لە چاو قیامەتدا كامەیە ، تا لە نێوان دنیا و قیامەتدا هاوكێشەیی بكەین ؟ ژیانی مام ناوەندیی دنیا بریتی‌یە لە شەصت ساڵ ، كە سێ‌یەكی بە خەوتن بەسەر ئەچێت .. ئیتر ئەبێت ژیانی لەو جۆرە بەهای كام بێت؟ لەبەر ئەمە دەرچوون لەم چوارچێوەیە و ، بە دنیا دانی نرخێك كە زیاتر بێت لەوەی كە شایانیەتی و ، وتنی : (( ئەمە نرخی ژیانە لە دنیادا و ، ئەمەش نرخی ژیانە لە قیامەتدا )) ئەوە دەربڕینی تێ‌نەگەیشتنمانە لە دەقەكان .

بۆ ئەم باسە مامۆستا نوورسیی ئاوڕدانەوەیەكی هەیە كە لە لای كەسێكی تری غەیری ئەو نەم دیوە . ئەڵێت : *دنیا سێ دیوی هەیە : دیوی یەكەم رووی لە ناوە جوانەكانی خوای گەورەیە و ، دووهەمیش رووی لە هەوا و ئارەزووەكانی مرۆڤ ناوە و ، دیوی سێ‌هەمیش ئەو دیوەیە كە رووی لە دەست خستنی ژیانی قیامەتە . ئەمەش ئاوڕدانەوەیەكی قووڵە .*

لەو لایەنەوە كە دنیا ئاوێنەیەكی تیشك دەرەوە بێت بۆ تیشك دانەوەی ناوە پیرۆزەكانی خوا ، وەها لە دنیا ئەكات كە شتێكی یەكجار بە نرخ بێت ، بگرە وەهای لێ ئەكات كە نرخی مەزندە نەكرێت ، ئێمەش لەم لایەنەوە دنیامان

---

[٦٤] سعيد النورسي ، كليات رسائل النور ، الكلمات : ١ / ٢٩٨ .

خۆش نەوێت ، بگرە شەیدای نەبین . خۆ ئەگەر دنیا کێڵگەی قیامەت نەبووایە، ئێمە بۆ ژیانی قیامەت دەست نیشان نەئەکراین و ، نەئەبووینە خاوەنی و ، نەشمان نەتوانیی دەستی بخەین . ئا لەم دیوەیشەوە دنیا بەهەشت و باخچەیە . بەڵام ئەو دیوەی دنیا کە بەسەر هەوا و ئارەزووەکانی نەفسدا ئەڕوانێت ، لە هەموو ناشیرینێك ناشیرینتەرە . واتە ئەگەر مرۆڤ وابەستەی هەوا و ویستەنییەکانی نەفسی بێت و ، بۆ ئەم هۆیە قیامەتی لە بیر چوو ، ئا لەم حاڵەتەدا دنیا شتێکی زەم کراوە .

مامۆستا نوورسیی دەربارەی دنیا هەڵسەنگاندنێکی تری هەیە . ئەڵێت : *پێویستە لە دڵەوە دەست لە دنیا هەڵ بگرین ، نەك لە دەست خستنیەوە* . جا ئەمەی کە مامۆستا نوورسیی ئەیڵێت ، وەهامان لێ ئەکات ، کە زیاتر نزیك ببینەوە تا بۆمان دەربکەوێت کە ئێمە هیچ دژایەتییەکمان لەگەڵ دنیادا نیە و، ناشگونجێ شتی وەها ببێت .

بەڵێ ، کارکردنی مرۆڤ بە پێی ئەم چوارچێوەیە توانیویەتی وەك ئەهلی دنیا کاسپیی بکات و قازانج بکات ، ئەگەرچیی وەك قاروونیش دەوڵەمەند ببێ .. بەڵام هەر کاتێکیش پێویست بوو لەسەریەتی ئەوەی بە دەستی هێناوە هەر هەمووی لە پێناوی خوادا ، بە تەواوەتیی وەك عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ، کە ئەوەبوو حەوتصەد وشتری بە بارەکەیانەوە لە ڕێی خوادا بەخشیی و ، لەسەر ئەو دەوڵەمەندییەشی پێغەمبەر ﷺ هیچی پێ نەفەرموو و ، بۆڵە و سەرزەنشتیشی نەکرد ، بەڵام دەربارەی مافدانی ئەو دەوڵەمەندییەی ئاگاداری کردەوە و ، پاشانیش مژدەی دایە و دڵ خۆشیشی کرد .[٦٥]

دەربارەی ئیبراهیم پێغەمبەریش سەلامی لێ بێت چیرۆکێکی ڕەمزیی هەیە کە تیایا هاتووە : لە خوای پەروەردگار پرسیاریان کرد : پەروەردگارمان ! دەربارەی ئیبراهیم سەلامی لێ بێت ئەفەرمویت کە دۆستتە . ئێمەش ئەمانەوێ

---

[٦٥] أسد الغابة لإبن الأثير : ٣ / ٢٧٦ ـ ٣٨١ .

بـزانین ئایـا دۆسـتایەتیی تـۆ لەگـەڵ سـەروەت و دەوڵەمەنـدییدا ئـەگونجێت ؟ پەروەردگاریان پێی فەرموون : بڕۆن تاقیی بکەنـەوە . مەلائیکـەت ، لـە شێوەی کەسانێکا کە لە سەفەرێکی دووری هیلاككەرەوە هاتبن و لە جل و بەرگێکی شڕ و وڕدا چـوونە خزمـەتی ئیـبراهیم سـەلامی لێ بێـت و ، هـەواڵیان دایـە کـە برسییانە. ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی لێ بێت هەستا و مەڕێکی بۆ سەر بڕین. کە خستیە بەردەمیان ، مەلائیکەتەکان دەستیان بۆ درێژ کرد و لـە بریـی وشـەی ( بسم الله ) دوعایەکی تایبەت بە مەلائیکەتیان خوێند کـە بـریـتـیی بـوو لـە (( سبّوحٌ قدوسٌ ، ربُّ الملائكة والروح )) . ئەم تەسبیحە ئەو دڵەی کە وەحی پشت گیریی لێ ئەکرد هێنایە جۆش بە رادەیـەك کـە لێـیـان پـاڕایـەوە و فـەرمـووی: (( چواریەکی مەڕەکانم پێشکەشتان بێت ئەگەر ئەو تەسبیحە دووبارە بکەنـەوە )). مەلائیکـەت دوعاکـەیان دووبـارە کـردەوە و ئیـبراهیمیش سـەلامی لێ بێـت فەرمووی: (( نیـوەی مـەڕەکانم پێشکەشـتان بێـت ئەگـەر ئـەو تەسـبیحە دووبـارە بکەنـەوە )) . بـەم شـێوەیە هـەتا لـە چـوارەم جـاردا هـەموو مـەڕەکانی پێیـان ئەبەخشێت . کەواتە ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی لێ بێت ـ ئەگـەر ئـەم ریوایەتـە راست بێت ـ بۆ دەست خستن تەرکی دنیای نەکردبوو ، بەڵکو لە دڵەوە .

لـە راسـتییدا هـیچ روونکردنەوەیـەکی ئاشـکرای سـەرداری پێغەمبـەران ﷺ دەربارەی زەمکردنی دەوڵەمەنـدیی و مـاڵ و سـامان ، بـە مانـای رەهـا ، بەرچـاو ناکەوێت . راستە هەندێ هەڵاوێژن هەیە ، بـەڵام ئـەوە پەیوەنـدیی بـە بـارودۆخی تایبـەتیی هەنـدێ کەسـەوە هەیـە . خـۆ ئەگـەر دەربـارەی دەوڵەمەنـد نـەبوونی پێغەمبەر ﷺ پرسیار بکرێت ، ئەوا ئەڵێین : پێغەمبەری خوا ﷺ لـە خێزانێکـی هـەژاردا هـەڵ کـەوتووە ، جـا ئەگـەر دوای بـوونی بـە پێغەمبـەر و ، بـوونی بـە لێپرسـراوی بانگـەوازێکی گـەورەی پایـەدار دەوڵەمەنـد ببوایـە ، لەوانەیـە ئـەم دەوڵەمەندییەی گومانێکی بـۆ بانگەوازەکـەی دروسـت بکردایـە و ، پرسـیارێکی ئاراستە بکرایە : (( ئەوەت لـە کـوێ بـوو؟ )) . لەوانەشـە ئـەم گومانـە ببوایەتـە

مایەی شۆکە پێ خستنی متمانەی خاوەنانی نیەتە خاوێنەکان . لەبەر ئەمە پێغەمبەر ﷺ - لە گۆشەی بانگەکەیەوە ، بە شێوەی خواست ، یان بە فەرمانێکی ناسکی خوایی - بەردەوام هەژاریی پێ باش بووە ... ئەمە ئەو گۆشە نیگایەیە کە پێویستە ئێمە لە روانگەیەوە سەیری پێغەمبەر ﷺ و ، سەیری زانایان و ئەولیایان و ئەصفیایان ، کە لە دوای ئەو هاتوون ، بکەین .

کورتەکەی ، پێویستە لە دڵەوە نەك لە دەستخستندا دەست لە دنیا هەڵ بگرین . پێویستە دنیا نەچێتە دڵمانەوە و ، سەرخۆشمان نەکات ، یان بەرچاومان لێڵ نەکات ، یان قیامەتمان لە بیر نەباتەوە .. جا ئەگەر ئەمەمان جێ بەجێ کرد ئەو کاتە ئەبینە خاوەنی دنیا و فەرمانی خۆمانی بەسەردا ئەدەین ، ئەگەر نا دنیا فەرمانی خۆی بەسەرماندا ئەدات و ، ژیانێکی لە هەست و شعوور خاڵیی بەسەر ئەبەین و ، هەموو خولەکێکی بە فیڕۆ ئەڕوات .. شتی زۆر هەن کە ئیرادەمان بەهێز بکەن و پشتی بگرن بۆ ئەوەی لەم تاقییکردنەوەدا سەرکەوتن بە دەست بهێنین . بە تەواوەتیی پێویستیشە ئیرادەمان بجووڵێنین و بیخەینە کار، تا ببێتە ئیرادەیەکی چالاك . بۆ نموونە ناسینی خوا هۆکارێکی یەکجار گرنگە بۆ بەهێزبوونی ئیرادە و ئیمان . ئەگەر بۆمان هەبێت ئەمە بە نموونەیەك روون بکەینەوە ئەڵێین : وا دابنێین تۆ ئەتەوێ ژیانی موسریفان بدەیتە سەر و ، لەسەر ئەو بناغەیەش کاروباری خۆتت رێك خست ، پاشان کەوتیتە هەوڵ و تێکۆشانێکی گەرم تا ئاستی ژیانت بەرز بکەیتەوە . ئا لەم کاتەدا ناسینی خوا دێت بە فریاتەوە . لێرەدا پێم خۆشە باسی رووداوێك بکەم کە لە یەکێك رووی داوە . کێ ئەزانێت ، لەوانەیە لەوەی کە من باسی ئەکەم ئێوە شتێکی بابەتییتان بەرچاو نەکەوێت . لەگەڵ ئەوەش دا هەر باسی ئەکەم .

یەکێك کەوتە گەڵ کابرا و پێکەوە چوونەوە ماڵی ئەوان و ، لە باڵکۆنییەکەدا کە بەسەر دەریادا ئەیڕوانیی پێکەوە دانیشتن . ئا لەو ساتەدا حەزکردنێکی یەکجار زۆر بۆ ژیان لەو شوێنە قەشەنگەدا بە دڵیدا هات و ، دۆستەکانی

شـاهێدیی بـۆ ئـەدەن کـە خێـرا لـە شـوێنی خـۆی هەسـتا و ، بـۆ ئـەوەی لـەو بالکۆنی‌یەدا دانەنیشێت ، شوێنەکەی بە جێ هێشت ، چونکە ئـەو دیمەنـە جوانـە دلڕفێنە هەسـتی هیـوا درێـژیی لـە دلّیـا بزوانـد و ، بـەرەو بـە تـەمابوونی هـەتا هەتایی و نەمرییشی برد . بۆ ئەمە ناسینی خوا دێـت بـە هانایـەوە و ، ئەوەشـی ئەخاتە بیر کە یەك دەقیقەی سـەرنج‌دانـی جوانیی خـوایی بەرامبـەر بـە هـەزاران سالّی ژیانی پڕ بەختەوەریی بەهەشتە و ، لەو تەنگ و چەلّەمەیە رزگاری ئەکات.

لەبەر ئەمە تێ‌گەیشتنی ئایـەتی : ﴿ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ﴾ بەو شێوەی کە هەندێك ئەیانـەوێ لەگـەلّ تێ‌گەیشـتنی گشـتیی قورئـانی پـیرۆزدا ناگونجێت . من وەهای ئەبینم کە پێویستە مرۆڤ هەست بـە تاسـەمەندیی مانـەوە لە دنیا بکات ، بەلاّم بە مەرجی ئەوەی کە وەك ژیانی مامۆستا نوورسیی تیای‌دا بژیی و ، بە بیر و حەزی ئـەوەوە پەیوەسـت بێـت کـە ئوممـەتی موحەممـەد ﷺ بـە جوانەمەنی‌یە مرۆڤانەکان بگەیەنێت . پێویستە دنیا بە نـاوی حـەق و ، خزمـەتی ئوممەتەوە دەست بخرێـت ، بـەلاّم پێویسـتە ژیـانیش بـەردەوام بـە دەوری تـەوەرەی قیامەتدا بێت . جا وێنەی ئەو ژیانەی کە بـە دەوری تـەوەرەی قیامـەتدا بێـت مرۆڤ لە چوارچێـوەی کاسـپیی حـەلاڵ و ، لـەزەتی موبـاح‌دا ئەهێلّێتـەوە . دیـارە کاسپیی ناشەرعیی و ، لەزەتی ناشەرعیی بەردەوام هەزارەها ئێش و ئازار لەگـەلّ خۆیان دێنن .

جا با ئەم باسە بە فەرموودەی دوایـین پێغەمبـەر ﷺ : (( فَلْيَأْخُذِ العَبدُ مِـن نَفسِهِ لِنَفسه ، ومِن دُنياهُ لآخِرَتِهِ ، ومنَ الشَّـبِيبَةِ قَبـلَ الكِبَـر ، ومِـنَ الحيـاةِ قبـلَ المَوتِ . فَوَالَّذي نَفسُ محمدٍ بِيَدِهِ ما بعدَ الموتِ مِن مُستَعتِبٍ ، ولا بَعـد الـدنيا مِـن دارٍ إلا الجنة أو النار )) .[٦٦]

---

[٦٦] القرطبي ، الجامع لأحكام القرآن : ١٨ / ١١٦ .

ئەفەرموێ : با بەندە لە خۆی بگرێتەوە بۆ خۆی و ، لە دنیای بۆ قیامەتی و ، لە گەنجیی پێش پیریی و ، لە ژیانی پێش مردنی . دە بەو خوایەی کە گیانی موحەممەدی بە دەستە دوای مردن دڵدانەوە نیە و ، دوای دنیاش جگە لە بەهەشت یان ئاگر خانەیەك نیە .

صلى الله عليه وعلى إخوانه من النبيين والمرسلين ، وعلى الملائكة المقربين ، وعلى عباد الله الصالحين .



﴿ إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ﴾ ( القصص : ٨٥ ).

لێرەدا دوو ڕێنمایی ، یان دوو تەفسیر دێن .. یەکێکیان بریتی‌یە لە یادخستنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ڕۆژی گەڕانەوەی بۆ حزووری خوا ، کە ئەو ڕۆژەیە بە شەوق و تاسەمەندی‌یەوە چاوەڕوانیی ئەکرد ، بۆیە ئەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ﴾و ، ئەو ڕۆژەی یاد ئەخستەوە کە لە ماڵ و ، نیشتمان و ، لەو کەعبەیەی کە ئەوەندەی خۆش ئەویست وەسف نەکرێت ، جویێ ئەبوویەوە ، بەڵام لە دووتوێی ئەم یادخستنەوە تێکەڵە بەو خەفەتە ناسکەدا خوای گەورە مژدەیەکی گەورەی شیاو بەو فیترەتە مەزنەی پێ ئەدا .. مژدەی پێگەیشتن و ڕەزامەندی‌یەك کە عەقڵ نەتوانێ تەسەووری بکات و ، پەی بە ماهییەتی ببات . ئەوەبوو ئاماژەکە بە ئەنوینی نەناسراویی لە وشەی (( معادٍ )) دا هات .. (( معاد )) دوا نیشتگە و مەنزڵیەتی، تا بەوە هەموو خەم و خەفەتێکی لێ بڕەوێنێتەوە .

تەفسیرەکەی تر بریتی‌یە لەوەی کە خوای باڵادەست لە سەرەتای سوورەتی ( القصص ) ەوە هەتا ئەگاتە ئەم ئایەتە ، چەند دیمەنێکی گرنگی ژیانی مووسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێت و ، هەوڵ و کۆششی لەگەڵ فیرعەوندا و ، پەیوەندیی

لەگەڵ قەومەکەی و تیرە و تایەفەکەیدا نەهێنایەوە یـاد .. دوای یادخستنەوەش ئەوەی ئەگەیانـد کـە مێـژوو دووبـارە ئەبێتـەوە و، ئەمـەش سـوننەتی خوایـە لـە بوونەوەردا .. ئەمە ئاماژەی بۆ ئەوە ئـەکرد کـە پێغەمبـەریش ﷺ ـ بـە وێنـەی مووسا سەلامی لیّ بێت ـ ناچار ئەبێت شار و نیشتمان و ماڵەکەی بـەجیّ بهێڵـیّ و ، لە شارێکی تـر نیشـتەجیّ ببێـت . ئەمـەش یاسـایەك و سـوننەتێکە و ئـاڵ و گۆڕی بەسەردا نایـەت . خـۆ ئەگـەر بێینـە سـەر پەیوەنـدیی ئـەم مەسـەلەیە بـەم ئایەتەوە ، ئەوا ئەڵێین : ئەم سوورەتە مەککی‌یە ، بەڵام ئایەتەکەی سـەرەوە ، بـە پێی ریوایەتێك ، لە کاتی کۆچ کردن‌دا هاتۆتە خوارەوە . واتە قورئان بـەم ئایەتـە باری بەجیّ هێشتنی مەککە لەسەر شانی پێغەمبەری خـەمبار سـووك ئـەکات و، لەلایەکەوە کارەکەی بە لاوە ئاسان ئەکات و ، لەلایەکی تریشەوە مژدەی ئـەداتیّ کە دوای نۆ سـاڵ سـەر لـە نـویّ ئەگەڕێتـەوە مەککـە . جـا ئـەم تەفسـیرە و ئـەم ڕێنمایی‌یە بەهێزترە و، هەواڵێکی غەیبیی و بەڵگەیەکی پێغەمبەرایەتییشی تێدایە.

کە کاتی تەقدیرکراو هاتە بەرەوە مەککە فەتح کـرا و ، دوژمنـەکان لـە زەلیلیـی‌دا سەریان شۆڕ کرد ، بەڵام پێغەمبەری خوای سەرداری هەموو کائینات ﷺ ئەو بەڵێنـە ( معاد ) ەی لە پێشەوە مژدەی پیّ درا بۆی هاتە دیی . لەبەر ئەوە راسـتتـر وەهایـە کـە وشـەی ( معـاد ) لێـرەدا ئـەو کـارە و ئـەو مژدەیـە ئەگەیـەنێت کـە بریتی‌یـە لـە گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەککە .

والله أعلم بالصواب ، وإليه المرجع والمآب .



﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ﴾ ( العنكبوت : ٤٥ ) .

لەگەڵ ئەوەدا کە نوێژ ئەو کەسەی ئەنجامی ئەدات لە کردەوەی خراپ و بەدڕەوشتیی قەدەغەی ئەکات ، بەلاَم لە دەست دەرچوونی هەندێ هەڵە لە لایەن هاوڕێنەی ئەم کەسەوە شتێکی تەقدیر کراوە و ، ئەو فەرموودەیەش کە ئەفەرموێ : ( كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ وخَيرُ الخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ ) [٦٧] ئاماژە بۆ ئەم حەقیقەتە ئەکات .

ئەگەر مرۆڤ نوێژەکەی بە مانای تێر و تەسەلی خۆی ئەنجام دا ماوەی نوور و رووناکیی بە لایەوە فراوان ئەبێت و ، ماوەی تاریکیی و شەوەزەنگیش بە لایەوە کەم ئەبێتەوە و ، حاڵەتی سنگ فراوانیی لەلای گەشە ئەکات و ، خەریکە حاڵەتی دڵتەنگیی بە لایەوە مەحو بێتەوە . لە جیهانی ناوەوەیدا پەنجەرە والاّ بووەکانی نەفس و شەیتان تەسك ئەبنەوە و ، دەرگا رۆحانیی و مەلائیکییەکانیش ئەخرێنە سەر پشت .. بەلاَم هەموو ئەمە بەستراوە بەوەوە کە نوێژەکە بە ئاگابوونەوە ئەنجام بدرێت .. واتە بەستراوە بەو نوێژەوە کە دڵ ئەبزوێنێ و ، هەستەکان تێر ئەکات و ، هەست کردن تا رادەی لەرزین ئەجوولێنێ . واتە ئەو نوێژەی کە لە ئایەتی : ﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ﴾ باسی هاتووە ، بە مانا تێر و تەسەلەکەی نوێژە . بەلاَم ئەوانەی لە نوێژەکەیاندا ناگەنە ئەم ئاسۆیە ، چاریان نیە کەوتوونەتە هەڵەوە .

---

[٦٧] الترمذي ، القيامة : ٤٩ ، إبن ماجه ، الزهد : ٣٠ ، الدارمي ، الرقاق : ١٨ .

دووره‌په‌رێزیی‌کردنی نوێژ بۆ ئه‌و که‌سه له خراپ‌کاریی و ئاراسته‌کردنی به‌ره‌و به‌رزاییی‌یه‌کان مه‌سه‌له‌یه‌کی یه‌کجار گرنگه . بۆ نموونه : که له مانگه گه‌رمه‌کانی هاویندا رۆژووی ره‌مه‌زان ئه‌گرین و ، نزیکه‌ی ١٦ ـ ١٧ سه‌عات ده‌ست له خواردن و خواردنه‌وه ئه‌گرینه‌وه ، پاشانیش که رۆژوو ئه‌که‌ینه‌وه و، په‌رداخێك ئاو ئه‌خۆینه‌وه ، هه‌ست ئه‌که‌ین که ئه‌و ئاوه به‌سه‌ر به‌شه‌کانی لاشه‌ماندا دابه‌ش ئه‌بێت . به هاوشانی ئه‌مه پێویسته ویژدانیشمان هه‌ست بکات به هه‌موو وشه‌یه‌ك که له نوێژه‌که‌دا ئه‌ی‌ڵێین و ، به هه‌موو روکنێك له روکنه‌کانی نوێژیش که ئه‌نجامی ئه‌ده‌ین و ، ئه‌م نوێژه دڵه‌کانمان بهێنێته له‌رزه و، ئه‌وه‌مان بخاته یاد که ئێمه واین له‌به‌رده‌م خوای بالاده‌ستدا . وێنه‌ی ئه‌م نوێژه ئه‌و نوێژه‌یه که قه‌ده‌غه‌ی کرده‌وه‌ی خراپ و به‌دڕه‌وشتیی ئه‌کات . که‌واته لێره‌دا ئه‌توانین بڵێین : ئێمه به پله‌ی ئه‌و ئاسته‌ی که له نوێژدا ئه‌ی‌گه‌ینیٚ له خراپه‌کاریی به‌دوور ئه‌بین . به تێپه‌ڕبوونی کاتیش ئه‌و جۆره نوێژه به پله قووڵه‌کانی ئه‌بێته هۆیه‌کی گرنگ بۆ دامه‌زراندنی هه‌ڵس‌وکه‌وتمان .

لێره‌دا ئه‌ڵێین : له‌سه‌ر مرۆڤ پێویسته ـ به‌و مه‌رجه‌ی تووشی نائومێدیی نه‌بێت ـ به‌رده‌وام موحاسه‌به‌ی خۆی بکات . له‌سه‌ری پێویسته وریا بێت و، به‌رده‌وام به خۆی بڵێت : (( ئه‌گه‌ر ئه‌م خواپه‌رستی‌یه‌م بدرێته‌وه به‌سه‌رمدا چیی ئه‌بێت و، ئه‌گه‌ر نوێژه‌که‌شم وه‌ك په‌ڕۆ شڕه بدرێته‌وه به‌سه‌ر و چاومدا چیی ئه‌بێت؟ )) به‌لام ئه‌مه به خۆی ئه‌ڵێت ، نه‌ك به که‌سانی تر ، چونکه ئه‌وه حه‌رامێکی ئاشکرایه و به گومان خراپیی ئه‌ژمێرریٚ . به‌ڵیٚ ! ... لێره‌دا با وته‌یه‌کی پێشینان دووباره بکه‌ینه‌وه که زۆر جار دووباره‌ی ئه‌که‌ینه‌وه ، که ئه‌مه‌یه : (( پێویسته مرۆڤ له‌به‌رده‌م خۆیدا وه‌ك ( مدعي عام ) یان نوێنه‌ری تاوانبارکردن ره‌فتار بکات و، بۆ خه‌ڵکییش وه‌ك پارێزه‌ر )) . واته گوناهه بچکۆله‌کانی خۆی به گوناهی گه‌وره ببینێت و ، له‌گه‌ڵ گوناهه گه‌وره‌کانی خه‌ڵکییشدا به وێنه‌ی سۆز و شه‌فه‌قه‌تی دایك ره‌فتار بکات .. هه‌تا کاتێك گوناهکاریش ئاگادار

ئەکاتەوە دڵی پڕ لە سۆز بێت بۆی . لە ڕاستییدا ئەمە شێواز و ڕەفتاری قورئانە، بۆیە خوای باڵادەست فەرموویە: ﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾( العنكبوت : ٤٥). واتە فەرمانمان بەسەردا ئەدات تا لە هەموو کارێکماندا و ، لە هەموو هەڵس‌وکەوت و ڕەفتارێکماندا قورئان بکەینە ڕابەری خۆمان .

با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان : ئەو نوێژەی کە بۆ بەجێ هێنانی فەرمانی خوای باڵادەست و، دەستخستنی ڕەزامەندیی ئەو ئەنجام بدرێت و ، بە دەربڕینێکی تریش : ئەو نوێژەی بە ئیخلاصەوە ئەنجام بدرێت و ، مەبەست پێی ڕەزامەندیی خوا بێت ـ بە تێپەڕ بوونی کات ـ ئەتوانێت مرۆڤ لە کردەوەی خراپ و بەدڕەوشتیی دوور بخاتەوە ، ئەگەر ئەمڕۆ نەبوو ، سبەینێ . واتە نوێژ ئەبێتە خواپەرستی‌یەك ناهێڵێ مرۆڤ بکەوێتە ناو تاوان و خراپەوە ، کە یەکەمیان شەریك بۆ خوا بڕیاردان و ، ئەوەش کە ئەبێتە هۆی ، یان لێی نزیك ئەخاتەوە و، ئەو هۆیانەش کە ئەبنەی مایەی گومڕایی . چونکە نوێژ بریتی‌یە لە خواپەرستی‌یەك کە تان و پۆی ذیکری خوایە بە وتن و کردار و حاڵ . ئەم جۆرە ذیکرەش کارێکی گەورەیە و لەگەڵ مەزنیی خوادا گونجاوە و، قورئانی پیرۆزیش ئەمەمان وەبیر دێنێتەوە کاتێك کە ئەفەرموێت : ﴿ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ﴾ ( العنكبوت : ٤٥ ) .



﴿ يَـٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾ ( لقمان : ١٧ ) .

لەم ئایەتەدا قورئانی پیرۆز چوار کاری گرنگ یەك لە دوای یەك باس ئەکات: بەجێهێنانی نوێژ ، فەرمان‌دان بە چاکە ، دوورەپەرێزیی لە خراپە و ، ئارام گرتن لەسەر شتە نەویستراوەکان .

نوێژ سەری هەموو خواپەرستی‌یەکانە و ، لە ئیسلامدا کۆڵەکەی دینە و، فەرمان‌دان بە چاکەیش یەکێکە لەو کارانەی کە دین پشتیان ئەگرێت . کاتێك کە کەسێك هەولّی چاك‌کردنی هەڵەکانی کۆمەڵگە ئەدات و، لە توانای کەسیی خۆی و لێ پرسراویی تاکیی خۆی ئەترازێت ، ئەوا پێویستە لەگەڵ چەندین کۆسپ و تەگەرە بەرامبەر ببێتەوە . هەر کەس ئەوە بزانێت کە ناچار ئەبێت واز لەو شتە بهێنێ کە ساڵەهای ساڵ لەسەری راهاتووە و ، هەموو تاکێك یان دامەزراوەیەك ببینێ وا بەرژەوەندی‌یەکانی ئەکەونە مەترسی‌یەوە و ، ئەوانە هەر هەموو لە روویدا ئەوەستن و ، فشاری ئەخەنە سەر ... ئا لەم جۆرە بارودۆخانەدا لەسەر ئیمان‌دار پێویستە لەسەر بەرهەڵست کاریی سوور بێت و ، پارێزگاریی لەسەر رەوتی خۆی بکات .. خۆ ئەگەر لەم گۆشەوە سەیری مێژوو بکەین ، ئەوا چەندین نموونەی ئەم کارەمان بەرچاو ئەکەوێت . لە پێشەنگی ئەم نموونانەوە پێغەمبەری بەرێزمان ﷺ ئەبینین کە لە بەردەم ئەو تەنگ و چەڵەمانەدا کە روو بەرووی بوونەوە و ، ئەویش فەرماندەی خەباتە مەزنەکەی ئەکرد ، لەرزەی پێ نەکەوت ، هەتا کاتێکیش کە خۆی بە تەنیا بوو و ، بەوپەڕی دامەزراویی و ، بە هەموو ئارامێکەوە لەسەر رەوتی خۆی بەردەوام بوو .

کەواتــە هــەموو جارێــك کــاری جێبــەجێکردنی ئیســلام و ، ژیــان بەســەربردن لەگەڵیا لە واقیعی ژیاندا بە مانا راستەقینەکەی دێتــە کایــەوە و ، بــانگکردنــی کەسانی تریش بۆ سەری لەگەڵ باسی ئارامدا دێت . ئایەتێکی تریش هەیە کە ئەم کارە بە شێوەیەکی ئاشکراتر روون ئەکاتەوە ، کە ئەمەیــە : ﴿ وَٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴾ ( البقرة : ٤٥ ) . واتە کۆمەکیی لە هەموو جۆرە نوێژ و صــەڵەواتێك و، لە هەموو جۆرە ئــارامگرتنێــك وەربگــرن و ، هانایــان بــۆ ببــەن و، لەســەر رەوتــی خۆتــان بــەردەوام بــن . لــە راســتییدا بــەردەوام بــوون هــەموو رۆژێــك لەســەر بەجێهێنانی پێنج فەرزەی نوێژ و ، لەسەر بەجێهێنانی رۆژانە چل رەکعەت نوێــژ و ، دامــەزراویی لەســەر بــەجێهێنانیان جــۆرێکی چــاکی ئــارامگرتنــە. ئــەم خواپەرستییە گەورەیە کارێکی یەکجار قورسە لەسەر شانی ئەوانــەی کــە فێــری خشووع نەبوون : ﴿ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴾ ( البقرة : ٤٥ ) .

ئایەتەکە لێرەدا ئەوە تەئکید ئــەکات کــە نوێــژ بــەجێهێنان و فــەرماندان بــە چاکە و ، دوورەپــەرێزییکردن لــە خراپــە لــە نــاو ئوممەتــەکانی تــریشدا هــەبوون و لێیشیان داوا کراون . ئــەم حەقیقەتــە لێــرەدا بــە شێوەی ئاخــاوتنی ئیمــاندارێــك پێشکەش ئەکرێت . وەها دەرئەکەوێت کە لوقمان سەلامی لێ بێت کاتێك کە لــە سەرەتاوە فــەرمووی : ﴿ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾ ئــەی ویست کوڕەکەی لە کردەوە خراپە هەرە گەورەکان و تاوانــە گــەورەکان بپارێزێــت ، پاشان گرنگترین پایەی ئیسلام  و فەرماندان بە چاکە و ، دوورەپەرێزییکردن لــە خراپەی خستەوە یادی ، کە بریتییە لە لایەنێکی ئــەو جیهــادەی کــە لــە هــەموو زەمانێکدا لە هەموو تاکێك داوا ئەکرێت . مەبەستیش لــە بــاس کردنــی بابــەتی فــەرماندان بــە چــاکە و دوورەپــەرێزییکردن لــە خراپــە لــە پــاڵ گــرنگتــرین خواپەرســتییدا ـ کــە نوێــژە ـ بــۆ ئاگادارکردنــەوە و ، ســەرنج راکێشــان و، دامەزراندنی هاوکێشەی شەرعیی داوا کراوە .

بەلاّم ئەگەر بێینە سەر باسی وەسیەتی : ﴿ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴾ ئـەوە لەلایەکـەوە بـۆ روونکردنـەوەی لێپرسـراویی کەسـێکی سەربەخۆیە و بـۆ وریاکردنەوەیشـە کـە پێویسـتە وریـای ئـەو مەینـەت و سزا و ئازارانـە بـین کـە دوو فـەرمانبەرییەکـەی پێشـەوە ـ فـەرمان‌دان بـە چـاکە و دوورەپەرێزیی لە خراپە ـ بەسەرماندا ئەیهێنن .

* * *

﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِۦۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔي تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي ٱلسَّبِيلَ ﴾ ( الأحزاب : ٤ ) .

زەیدی کوڕی حاریثەی سەردارمان بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەر بوو ﷺ . لەگەڵ ئەوەشدا کە باوکی لە ژیاندا بوو ، زەید پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵ بژارد و لەگەڵیا مایەوە ، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ کردیە کوڕی خۆی . ئەوەبوو بۆ ماوەیەك خەڵکەکە بە (( زەیدی کوڕی موحەممەد )) یان بانگ ئەکرد . قورئانی پیرۆزیش بەم ئایەتە قەدەغەی کردن ئەو ناوەی لێ بنێن و ، لە هەمان کاتدا موسڵمانانی ئاگادار کرد کە هیچ کەس بە غەیری ناوی باوك و دایکییەوە بانگ نەکرێت و ، فەرمانی دا هەر کوڕێك باوکی ناسراو بێت بە کوڕی ئەو بانگ بکرێت ، بەمە بە کوڕکردنی قەدەغە کرد . ئیتر موسڵمانان دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە بە زەیدی کوڕی حاریثە بانگیان ئەکرد . هەروەها ناوی فلاَنی بەندەی ئازادکراوی فلاَنە کەسیان لەوانەش ئەنا کە بە دەستی موسڵمانان هیدایەتیان وەرگرتبوو ، بۆ نموونە : سالمی مەولای ( واتە بەندەی ئازادکراو ) حوذەیفە .

کارێکی تریش کە ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژەی بۆ ئەکات ئەوەیە کە عەرەبەکانی سەردەمی نەفامیی بیروباوەڕیان وەها بوو کە ئەو کەسەی کە زیرەکە لە ناو سنگیدا دوو دڵی هەیە و ، هاوسەرانی ئەو پیاوانەش کە بڕیاری ( ظیهار ) بۆ

ژنەکانیان ئەدەن ، بەو ظیهارە وەکو دایکیان لیّ دیّت ، ئیتر ئەوەبوو ئایەتەکە بە لیّدانیّك هەردوو بیروباوەڕەکەی لە ناو بردن .

ئیّستاش با بیّینە سەرباسی نەبوونی دوو دلّ لە ناوسنگی مرۆڤ دا . بیّگومان ئەو دلّەی کە لیّرەدا مەبەستە ئەو دلّە ماددییە نیە کە بریتییە لە پارچە گۆشتیّك بەو شیّوەیەی کە هەموان ئەیزانن . بەلکو ئەو دلّەیە کە هەلّگرانی تەصەووف وەصفیان کردووە و هەلّیان سەنگاندووە . ئەوەی کە لە سیاقی ئایەتەکەوە دەرئەکەویّت ئاوەهایە . بەلیّ ... ناگونجیّ مرۆڤ دوو دلّی کراوەی هەبن ، یەکیّکیان ـ بۆ نموونە ـ بۆ تەوحید و ، ئەوی تریشیان بۆ شیرك .. یەکیّکیان بۆ ئیخلاص و ، ئەوی تریشیان بۆ شیرك .. یەکیّکیان بۆ حەقیقەت و ئەوی تریشیان بۆ درۆکردن .. یەکیّکیان بۆ حەق و ئەوی تریشیان بۆ ناحەق .. سپیی سپییە و ، رەشیش رەشە . بەلیّ ... ئەو هاوسەرانەمان کە ( ظیهار ) یان بۆ بڕیار ئەدەین خوا نایانکاتە دایکمان و ، ئەو کوڕانەش کە ئەیانکەینە کوڕی خۆمان نابنە کوڕمان ، هەروەها کەسیّکی زیرەك دوو دلّی نیە . ئەمە قسەیە و بە دەمتاندا دیّت . خوای گەورە هەر خۆی راستیی ئەزانیّت و ، بۆ سەر ریّی راستیش هیدایەت ئەدات .

ئەگەر لە گۆشەیەکی ترەوە سەرنجی باسەکە بدەین ئەلّیّین : مرۆڤ لە چەند کاتیّکی جیاوازدا و لە ئەنجامی چەند بارودۆخیّکی جیاوازدا لە شیّوەی جووتیّك کەسایەتییدا دەرئەکەویّت . بەلاّم ئیسلام هەرگیز ریّ بە بارودۆخی وەها نادات کە بریتیی بیّت لە سەرەتای بازنەیەکی خالّیی . چونکە ئەمە مرۆڤ وەها لیّ ئەکات کە لە کافر مەترسییدارتر بیّت . بەلاّم سەرەنجامی ئەم جۆرە کەسە ـ بە پیّی دەربڕینی ئایەتەکە ـ لە نزم ترین شویّنی ئاگردایە . ئەگەر مرۆڤ بتوانیّ ئەوە رابگەیەنیّت کە لەسەر ئەو ریّگا راستە ئەڕوات کە خوای بالاّدەست نەخشەی کیّشاوە و ، دەریشی بڕیّ کە پەیوەندیی بە خواوە بەهیّزە ، لەگەلّ ئەوەشدا ـ لە لایەکی ترەوە ـ نوقمی ناڕەوایی بوو بوو ، کەواتە ئەو جۆرە کەسە ـ بە پیّی

دەربڕینی ئایەتەکە ـ لە ناو سنگیدا دوو دڵ هەیە . بەڵام ئایەتەکە ئەوە ئەداتە دواوە و ، ڕەفزی ئەکات و ، جەخت لەسەر نەگونجانیش ئەکاتەوە . کاتێکیش کە خوای باڵادەست لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت : ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَـٰمُ ﴾ ( آل عمران : ١٩ ) . ئایا ئەوە پەرچی دوانەیی و جووتایەتیی ناداتەوە ؟

بەڵێ ... کاتێك کە ڕێگا یەکێك بێت دڵیش یەك ئەبێت . هەرکەسیش شوێن چەندین ڕێی جیاواز بکەوێت ناتوانێ لە شڵەژاویی و شپرزەیی جیهانی بیر و تەسەوور و دڵ ڕزگاری ببێت . ئیتر لەوە بە دواوە ـ وەك قورئانی پیرۆز باسی ئەکات ـ بریتی‌یە لە وتە و هیچی تر . بۆ نموونە دەربارەی کەسێك کە ئەڵێت موسڵمانە چیی ئەڵێیت ، کەچیی لە هەمان کاتدا ئەیبینیی وەك مولحیدێك ڕەفتار ئەکات و ، سووکایەتیی بە دین و قورئان و پێغەمبەر ئەکات ؟ هاوێنەی ئەو کەسە دووڕووە و ، نموونەی دووڕوویی و دووبەرەکایەتی‌یە .

کورتەکەی هیچ کەس نە دوو دڵی هەیە و نە دوو ویژدان . دڵ لە قوڵایی جیهانی خۆیدا ، لە خاڵی پشت پێ بەستنیدا یەك دڵە و ، بەهێزترین شاهیدی ( أنفسي ) یە لەسەر تاك و تەنیایی خوای باڵادەست . هەریەکە لەوانەی ـ کە بە پێیەی زمان ـ دەربارەیان ئەڵێن دایکتانن ، دایکتان نین و ، ناشگونجێ ئەوانەی لە پشتی خۆتان لە دایك نەبوون ببنە کوڕتان . لەم سێ مەسەلەیەدا دژایەتی‌یەك لەگەڵ ڕاستی‌یەکاندا هەیە . خوای باڵادەستیش حەق ئەفەرموێت و ، هەر خۆیشی بۆ سەر ڕاستە شەقام هیدایەت ئەدات و ، بانگتان ئەکات هەتا لەگەڵ ویژدانتان ودەروونتاندا ڕێك بکەون .



﴿ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ ( سبا : ١٢ ) .

سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بە هەندێ دوعا و بە هەندێ لە ناوە جوانەکانی خوا کە ئێمە نایانزانین جیننییەکانی بۆ خزمەتی خۆی رام کردبوو. کاتێك کە ـ لەم جیهانی هۆیانەدا ـ ئەیخوێندن ئەهاتنە ژێر باری خزمەتی .. لە راستییشدا ناوە جوانەکان بریتیی نین بە تەنها لەو صەد ناوەی کە ئەبوهورەیرە خوا لێی رازیی بێت ریوایەتی کردوون ، ئەوەتا لە یەکێك لە دوعاکانی پێغەمبەردا ﷺ ئەم هاتووە : ( أسألُكَ بِكُلِّ إسمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيتَ بِهِ نَفسَكَ أو أنزَلتَهُ في كِتابِكَ أو عَلَّمتَهُ أحَداً مِن خَلقِكَ ، أوِ استَأثَرتَ بِهِ في عِلمِ الغَيبِ عِندَكَ... ).[68] لە خوا ئەپارێتەوە بە بەرەکەتی هەموو ناوێکی خوا کە لە خۆی نابێت ، یان لە قورئاندا هاتبێت ، یان بە کەسێکی فێر کردبێت ، یان لە عیلمی غەیبدا لای خۆی هێشتبێتیەوە .

لەمەوە ئەوە تێ ئەگەین کە لەوانەیە خوای بالادەست ناوی جۆراوجۆری فێری هەر پێغەمبەرێك کردبێت . لەوانەشە سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بە خوێندنی ئەو ناوانە جیننییەکانی رام کردبێ . لە مانای راستەقینەشدا خوای بالادەست خۆی جیننیی و شەیاتینی بۆ خزمەتی سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت رام کردوون . ئەم کارەش بە شێوەیەکی روون تر لە سوورەتی : (لأنبیاء:٧٩ـ٨٢)دا دەرئەکەوێت .

---

[68] المسند للإمام أحمد : ١ / ٣٩١ ، ٤٥٢ .

له هەندێ ریوایەتی ئیسرائیلیاتدا هاتووە ـ نەك لە سوننەتی صەحیحدا ـ کە سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت لەوە ترساوە ئەو ناوانە ( ی خوا ) لە دوای خۆی خراپ بەکار بهێنرێن ، بۆیە لە لایەك لە لایەکانی عەرشەکەیدا شاردوونیەوە و ، هەر لە سەردەمی خۆیدا هەندێك جوولەکە ئەو ناوانەیان لێ دزیوە و ، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بە کاریان هێناون و ، لە ( العهد القديم ) یشدا هەندێ ئایەت هەن کە لەگەڵ ئەو جۆرە تەفسیرەدا گونجاون .

ئێستاش هەندێ تەوژم هەن کە ئەیانەوێ ئەم کارە مانای تری پێ بکەن کە لە ماهیەتی خۆی زیاتر بیترازێنن . بۆ نموونە ئەڵێن : (( پێویستمان بە خوا نیە ـ حاشا لله ـ ، گرنگ ئەوەیە هێزی خراپە رازیی بکرێت ، هەتا کارەکان راست ببنەوە )) . یان ئەڵێن : (( توانای هێزە خراپکارەکان زیاترە لە توانای هێزە چاکەکارەکان ، لەبەر ئەمە پێویستە هێزەکانی خراپە رازیی بکرێن )) . ئەشگونجێ بناغەی ئەمە بگەڕێتەوە بۆ فیکری ( کابالا ) ، واتە سەرچاوەکە سەرچاوەیەکی ماسۆنیی رووتە . هەروەها ئەگونجێ زۆرێك لە شێوەی مەراسیم و دروشمی ماسۆنیەتیش بگێڕرێنەوە بۆ هەمان سەرچاوە . لە فلیمە کارتۆنەکانی منداڵانیشدا هەندێ دەستەواژە بە کار دێن ، وەك : (( بە ناوی هێزی تاریکییەوە، بە ناوی هێزی گومڕاییەوە .... )) ئەمەش ئەبێتە هۆی ژەهراویی‌کردنی مێشکی ناسکی منداڵەکان و ، سەراوژوور کردنەوەی و ، لە رۆحی گەنجەکاندا زامی وەها دروست ئەکات کە سارێژ نابن ، هەروەها لە جیهانی میتافیزیقیی ئەواندا ، کە سەفسەطەیەکە لە دەستەواژە و دەربڕینەکانی ئێمەدا نیە . وا دەرئەکەوێت هەتا ئێمە جیهانی ناوەوە و، جیهانی رۆحیی ئەندامانی ئومەتەکەمان راست نەکەینەوە و، رێك و پێکیان نەکەین ئەم سەرلێ شێواندنانە هەر بەردەوام ئەبن .

کارەکەی تریش کە پێویستە لێرەدا ئاوڕی لێ بدەینەوە ئەوەیەکە : داوود پێغەمبەر و سولەیمان پێغەمبەر سەلامیان لێ بێت چەندین شێوازی رام کردنی

دروست کراوانیـان پـیّ بەخشـراوە و پێشکەشـیان کـراوە . رام کردنـی چیاکان و، ئاسن بۆ داوود سەلامی لێ بێت کە تووشی گرفت و نارەحەتی‌یەکی زۆر بـوو ، بـە رادەیەك کە بووە نموونـەی حەقیقـەتی : ﴿ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾ ( ص : ٣٠ ) و، ڕێزنـان لـە سـولەیمانیش سـەلامی لێ بێـت بـە پێغەمبەرایـەتیی و ، بـە هێـز و دەسـەلاّت ـ کـە بەشـێکی لـە باوکیـەوە بـۆی مابوویـەوە ـ و بـە پادشـایی و، سەلطەنەت و ، رام کردنی جیننیی و شەیاتین و دێوەکان بۆی کـە ئـەمانـە دروسـت کراوێکی میتافیزیقیین ـ واتە لە دوای جیهانی بینراوەوەن ـ ، هەروەها رام کردنـی باکان بۆی ، وا دەرئەکەوێت نموونەیەکە بۆ ئەو هاوسەنگی‌یەی کـە لـە حەقیقـەتی ئەحمەدیی‌دا، لـە نێـوان جیهـانی مـاددیی و جیهـانی میتـافیزیقیی ( نامـاددیی ) دا، هەیە.

بەم پێیە ئەتوانین بڵێین کە داوود پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بە ناوکی لایـەنی ( باطینیی ) حەقیقەتی موحەممەدیی و ، سولەیمان پێغەمبەریش سەلامی لێ بێت بە ناوکی لایەنی ( ظاهیریی ) ئەو حەقیقە ئەژمێررێن . کە کاتیش هاتـە بـەرەوە هەردووکیان ـ ظاهیر و باطین ـ لە کەسایەتیی خـاوەنی یـەك‌گـرتن‌دا ﷺ یـەکیان گرت.

الله أعلم بالصواب .



﴿ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴾ ( سبا : ١٤ ) .

ئەم ئایەتە ئەیەوێ پێش هەموو شتێك بەیانی حەقیقەتێکی دیاریی‌کراو بکـات کە ئەویش ئەوەیە جیننیی غەیب نـازانن . جـا ئەگـەر جیننیـی غـەیب نـەزانن ، کەواتە ئەوانـەش کـە هـەواڵیان لێ وەرئـەگرن نـە غـەیب ئـەزانن و نـە ئەشـتوانن

بیزانن . لەبەر ئەمە بڕیار دراوە ئەو کەسەی کە بە ڕاستیی بەو هەواڵی غەیبەی کە کاهینەکان ئەیڵێن بڕوا بکات لە دین ئەچێتە دەرەوە ، پەنا بەخوا .

کاری دووهەمیش ئەمەیە : ئایا بە ڕاستیی جینییی لە ژێر فەرمانی سولەیمان پێغەمبەردا سەلامی لێ بێت کاریان کردووە ؟ هەندێ لە نووسەرە هاوچەرخەکان ئەوە ڕائەگەیەنن کە ئەم ئایەتانە و هاووێنەیان کە لە قورئاندا هاتوون ئایەتی هێمایین و مەبەستیان ( مجاز ) و ( إستعارة ) یە و ، مەبەست لە مانای ڕواڵەتیی نیە . منیش بڕوام وەهایە کە هەموو ئەو ڕووداوانەی کە قورئانی پیرۆز ڕوونی کردوونەتەوە بە ڕاستیی ڕوویان‌داوە .

ئەگەر بێینە سەر ئەو دەرسەی کە لە ئایەتەکە وەرئەگیرێ ئەوا ئاماژە بۆ بابەتێکی قووڵ ئەکات . بۆ نموونە ئەگونجێ بوترێ بەوەی کە وا بەستەیە بەم ئایەتەوە : بوونەوەر بە ویستی خوایی دامەزراوە و ، بە پێی خواستی خواییش بەڕێوە ئەچێت و ، بریتی‌یە لە چەند ڕژێمێکی بە ناو یەک‌دا چوو و ، لە چوارچێوەی ئەم ڕژێمانەش‌دا لە هیچ جووڵەیەکی بوونەوەردا جێی ڕێکەوت نابێتەوە و ، داخورانی ئەو داردەستەی کە سولەیمان پێغەمبەر سەلامی لێ بێت خۆی ئەدا بەسەری‌دا لە لایەکەوە حەقیقەتێکە و ، لەلایەکی تریشەوە ڕێکەوت نیە . لەوانەیشە ئایەتەکە بیەوێ پێمان بفەرموێ کە ڕۆژێك لە ڕۆژان مولکی سولەیمان سەلامی لێ بێت تەفر و توونا ئەبێت . ئەوەبوو دوای مردنی بە چەند ساڵێك ئەوە هاتە دیی .. پارچە پارچە بوونێکی گەورە لە کۆمەڵگادا هاتە دیی و، بارودۆخ گەڕایەوە سەر سەردەمی ئەو ئاژاوەیەی کە لە ڕۆژەکانی سەرەتای سەردەمی داوود پێغەمبەردا سەلامی لێ بێت هەبوو .. لە ناکاودا ئەو دەسەڵاتە گەورەیە ، کە بە وێنەی چیاکان گەورە بوو داڕووخایە سەر زەویی و پارچە پارچە بوو و ، ئەو خەڵکەی کە لە سایەی‌دا حەوابوونەوە ، خۆیان لە بارودۆخێکی تەواو جیاوازدا دیتەوە .



﴿ وَجَآءَ مِنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾

( یس : ٢٠ ) .

با یەکەم جار ئەوە روون بکەینەوە کە دەستەواژەی (( أصحاب القرية )) ، واتە دانیشتوانی شارەکە کە لە پێشی ئەم ئایەتەوە هاتووە ئاماژە بۆ ئەو شوێنە ئەکات کە پێغەمبەرەکان بۆ تەبلیغی دینی خوا روویان لێ نا ، لادێیەك نەبوو لە بیاباندا ، بەڵکو بە ترازووی ئەو رۆژە شارێکی خاوەن شارستانیەت بوو . ئەوەبوو دانیشتوانی شار بانگەوازی دوو پێغەمبەریان دابووە دواوە ، ئیتر خوای گەورەش بۆ پشتگیریی و بەهێزکردنی ئەو دوانە پێغەمبەری سێهەمی بۆ ناردن . بەڵام خەڵکی شارەکە کە لەسەر قیرسچمەیی و یاخییبوونی خۆیان سوور بوون ، هەر بە پشتهەڵکردن لەو پێغەمبەرانە رازیی نەبوون ، بەڵکو هەوڵیان دا یەکێکیان بکوژن کە خەڵکی شارەکەی خۆیان بوو .

ئەم ئایەتەی کە لێرەدا واین لە خزمەتیا باسی پیاوی چوارەم ئەکات کە پشت گیریی لە سێ پێغەمبەرە پێشووەکە ئەکات و، وەها باسی ئەکات کە لە ( أقصى ) ی شارەکەوە هاتووە بۆ لای ئەو خەڵکە .

جا تەفسیرنووسانی لەوەو پێش دەستیان داوەتە شییکردنەوە و تەفسیرکردنی دەستەواژەی (( أقصى المدينة )) و ، هەر یەکە بۆچوونێکی دەربڕیوە . وا ئێمەش سێ لەو تەفسیرانە وەرئەگرین :

(( أقصى المدينة )) واتە : ئەو سەری شار و ، ئەم پیاوە لەو شوێنەدا نیشتەجێ بووە .

(( أقصى المدينة )) واتە : چینی شکۆداری شار ، واتە لە چینی پیاو ماقوولانی شار . لە دوعای (( الصلاة المنجیە )) دا دەستەواژەی (( أقصى الغايات )) بە مانای بەرزترین و بڵندترینی مەبەستەکان هاتووە . واتە ئەو کەسە لە چینی بەرزی خەڵکەکە بووە و ، لە دەوروبەری شاردا نیشتەجێ بووە و ، لەو چینی بورجوازە بووە کە پەیوەندییەکی گەرم و گوڕی لەگەڵ دانیشتوانی شاردا نەبووە .

ئەم دەستەواژەیە ئاماژە بۆ کەسێك ئەکات کە لەلایەنی شێوازی بیرکردنەوە و تێگەیشتنەوە لە بیروبۆچوونی قەومەکەی دوور بوویێت و ، ئاستیشی لەوان بەرزتر بوویێت و ، فەرمایشتەکەشی : ﴿ يَـٰقَوْمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلْمُرْسَلِينَ ۝ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسْـَٔلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴾ ( يس : ٢٠ ـ ٢١ ) . بەڵگەیە لەسەر ئەو جیاوازییە لە ئاستی بیرکردنەوەدا .

بە پێی تەفسیری دووهەم و سێهەم لەبەردەم کەسێکدایـن کە خاوەنی بیرکردنەوەیەکی سەربەخۆ و ، فەلسەفەیەکی سەربەخۆیە لە بیرکردنەوەی دانیشتوانی شارەکە و ، کەسێکی وەها ئازایشە کە هەرکاتێك کارێك رێی پێ گرتن دانیشتوانی شار بە پەلە ئەچن و راوێژی پێ ئەکەن . تەفسیرنووسی ناودار حەمدیی ئالمالیی لە تەفسیرەکەیدا ئەڵێت کە ئەم کەسە کاتێك دانیشتوانی شارەکە ویستیان بیکوژن فەرمووی : ﴿ يَـٰلَيْتَ قَوْمِى يَعْلَمُونَ ۝ بِمَا غَفَرَ لِى رَبِّى وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴾ ( يس : ٢٦ ـ ٢٧ ) .

ئەگەر ئەم فەرمایشتە شیی بکەینەوە ئەڵێین ئەم کەسە بەردەوام خۆشویستنی قەومەکەی لە دڵیدا بووە و ، ئاواتی چاکەی بۆ خواستوون و ، هیچ رق و کینەیەکی بەرامبەریان نەبووە ، یان حەزی لە تۆڵەسەندن لێیان نەبووە . بەڵکو پێچەوانەی ئەمەوە هەتا بەرامبەر بە دوژمنەکانیشی سۆز و بەزەیی لە دڵدا بووە

و، ئاواتی ئەخواست ئەوانیش بەو بەختەوەرییە بگەن کە خۆی پێی گەیشتووە و، بە شێوازێکی پێغەمبەرانەش ویستی بۆ دواجار حاڵی خۆی بۆیان باس بکات .

لە راستیی‌دا ئەو شێوازە لە بیرکردنەوە و رەفتارکردن شێواز و بیرکردنەوەی موخلیصەکانە لە هەموو سەردەم و زەمانێك‌دا . ئەوەتا سەرداری پێغەمبەرانیش ﷺ ، لە کاتێك‌دا کە لە جەنگی ئوحوددا دانی تەختی شکا بوو و ، خوێنی لێ ئەڕۆیشت ، لە خوا ئەپاڕایەوە و ، ئەی‌فەرموو : ( أللهمَّ ! اهْدِ قَومِي فَإِنَّهُم لا يَعلَمُونَ ) .[٦٩] ئەی‌فەرموو : خوایە ! هیدایەتی قەومەکەم بدەی ، چونکە ئەوان نەزانن .

لێرەدا لە باسەکە لا ئەدەین و ئەڵێین : هەرچەندە دوعاکەی نووح پێغەمبەر سەلامی لێ بێت دژی قەومەکەی ﴿ رَّبِّ لَا تَذَرۡ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴾ ( نوح : ٢٦ ) وەها دەرئەکەوێت کە بە رواڵەت پێچەوانەی ئەوەیە کە لەوەو پێش وتوومانە ، بەڵام وەها نیە ، چونکە لەوانەیە نووح سەلامی لێ بێت ئەمەی بە ئیعتیباری ئەوە فەرموبێت کە روو ئەدات و ، سروشتی ئەو کۆمەڵگایەش کە چەندەها ساڵی دوور و درێژ وەك پێغەمبەرێك تەمەنی تیا بەسەر بردبوو و، لەوانەشە لە ویستی خوایی گەیشتبێ ، یان ئەو ویست و مەبەستە خواییەی بە وەحی بۆ هاتبێ و ئەو دۆعایەی فەرموبێت . چونکە بە زۆریی ئەوە رەوشتی گشتیی پێغەمبەرە گەورەکانە .

پاشان پێویستە لەسەر ئەوە بوەستین کە ئایا ئێمە ئەم چیرۆکانە بە راست دائەنێین یان نەء. چونکە ئێمە بڕوامان وەهایە کە ئەم چیرۆکانە چیرۆکی هێمایی نین ، بەڵکو بە راستیی روویان داوە و قورئانیش بۆمانیان گێڕاوەتەوە .

دووهەم خوای باڵادەست بە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکانە ئاماژە بە هەندێك حەقیقەتی بوونەوەریی ئەکات کە هەتا هاتنی قیامەت بەردەوام ئەبن . واتە لەو

---

[٦٩] البخاري ، الأنبياء : ٥٤ ، إستتابة : ٥ ، مسلم ، جهاد: ١٠٤ ، إبن ماجه ، الفتن : ٢٣ .

کاتەوە کە ئادەم سەلامی لیّ بیّت هاتۆتە بوون هەتا دواهەمین پیاوی ئەم دنیا ئەو حەقیقەتانە بەردەوامن . چونکە کاتێك کە ئێمە سەیری ئەو توخمانە ئەکەین کە قورئان بە کاریان ئەهێنێت ، ئەبینین تایبەت نین بە کات و شوێنێکی زانراوەوە . دیارە لە کتێبێکی بوونەوەریی وەهاش هەر ئەوە چاوەڕوان ئەکرێت. بەلاّم بۆ ئەوەی بتوانین بەو شێوازە سەیری قورئان بکەین ، پێویستە لە ناو چوارچێوەیەکی تایبەتیی‌دا بە دوای ئایەتەکانی‌دا بچین . بگرە ئەتوانین بڵێین ئەمە تاکە مەرجە بۆ وەرگرتنی کەڵکی راستەقینە لە قورئان ..

شتێکی تریش ، ئایەتەکان ئیتر سا دەرهەق بە کافر ، یان مونافیق ، یان جوولەکە ، یان گاور هاتبوون و ، هۆیەکانی دابەزینیش ئاماژە بۆ ئەم کارە یان ئەو کارە بکەن ، ئەوا هەموو تاکێك ـ لە کاتێك‌دا کە پەیوەندیی عەقلّیی و مەنتیقیی و شعووریی و ویژدانیی لە کات و شوێنێکی دیاریی‌کراودا لەگەڵ خۆی و دەوروبەری‌دا بەستبیّ ـ ئەتوانێت نامەی تەڕ و تازەی لە قورئانەوە پیّ بگات و، لە قووڵاییی دڵیشیەوە هەستیان پیّ بکات . بە دەربڕینێکی تریش تاك لەسەری پێویستە بە خۆی بڵێت : (( راستە من پێغەمبەر نیم ، بەلاّم وا هەست ئەکەم ئایەتەکانی قورئان کە شەش هەزار و کەمێك ئەبن بۆ سەر من دابەزیون )) . لە دوا هەنگاودا ئایا ئەمە گیان و بنچینەی کێشەکە نیە ؟ ئایا ئەگونجیّ خوای بالآدەست ـ حاشا لله ـ لە کات و شوێنێکی دیاریی‌کراودا گەمارۆ بدرێت ؟ کەواتە ئەو قورئانە پیرۆزەی کە تەجەللای سیفەتی فەرمایشت‌کردنی خوای بالآدەستە ، هەروەك فەرمایشتی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کرد ، هەروەها فەرمایشت لەگەڵ تۆدا ئەکات و ، لەگەڵ من‌دا ئەکات و ، فەرمایشت لەگەڵ هەموو کەسێك‌دا ئەکات کە دوای ئێمە دێت .. واتە فەرمایشت لەگەڵ تێکرای مرۆڤایەتیی‌دا ئەکات . ئەم کارەیش لە بارەی گشت‌گیریی قورئان و ، بوونی لە ژووروویی کات و شوێنەوە کارێکی گرنگە ، ئەگینا مرۆڤ وەها سەیری ئەو رووداوانە ئەکات کە لە قورئان‌دا باسیان هاتووە کە ئەوانە چیرۆکی رابوردوون .

جا ئەم جۆرە سەیرکردنە بۆ قورئان خوێندن رادەی کەڵك وەرگرتن لێی یەکجار کەم ئەبێتەوە .

ئێستاش با جارێکی تر بگەڕێینەوە سەر ئایەتە پیرۆزەکە .. ئەو رووداوەی کە لێرەدا خراوەتە روو بە هاوتاکانیەوە و هاوێنەیانەوە هەتا رۆژی قیامەت روو ئەدەن و ، ئێمەش ئەتوانین هاوێنەی پاڵەوانانی ئەم رووداوە ، کە لە هەموو چەرخێك‌دا هەن ، هەر لە ئیمان‌دارەکەی ئالی فیرعەونەوە هەتا سەردارمان ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێت و ، هەر لە حەبیبی نەججارەوە هەتا شاهێدانی هەموو چەرخێك و ، لەوانیشەوە هەتا شاهێدانی ئەم چەرخەمان ، کە یەکێك لەوانە شاهێدی ئەم چەرخەمان کە لەوپەڕی وڵاتەوە هات بۆ ئەستەنبووڵ و، لەگەڵ خۆی‌دا کۆمەڵێك چارەسەریی و پێشنیاری هێنا بوون کە وابەستەی ئایندەی ئیسلام بوون و ، ئەو لەم کارەدا کرێیەکی لە هیچ کەس نەئەویست و بە تەمای ناوبانگێك و دەستکەوتێکیش نەبوو ، بەڵکو ئەمان‌بینیی نموونەی ئیخلاص و قوربانیی‌دان و راستگۆیی بوو تا رادەیەك کە بڵێت : ( ئەگەر دیتم ئیمانی ئوممەتەکەم گەیشتۆتە لێواری سەلامەتیی ، ئەوا من رازییم بە ئاگری جەهەننەم بسووتێم ) . داخۆ چەند نموونەی تریش لە ناوخۆ و لە دەرەوەدا هەبن.. نموونەی تر لەسەر هەمان شێواز و ، لەسەر هەمان ئەندازە لە دەست‌گرتن بە بیروباوەڕ و بەهاکانەوە و ، قوربانیی‌دان لە پێناویان‌دا ..

هەروەها قورئانی پیرۆز باسی رووداوێکی تر ئەکات کە لە سەردەمی مووسا پێغەمبەردا سەلامی لێ بێت رووی داوە . جا ئەم رووداوە و ئەو رووداوە کۆمەڵێك هێڵی هاوبەشیان هەڵ گرتووە . لەم رووداوەدا یەکێك لە ئالی فیرعەون ئەبینین ، واتە یەکێك لە بنەماڵەی کۆشکی فیرعەونیی و ، لە چینی بورجوازیی، کاتێك کە نیەتی کاربەدەستان ئەزانێت کە بریتی‌یە لە کوشتنی مووسا سەلامی لێ بێت ، خۆی پێ ناگیرێ و هاوار ئەکات : ﴿ أَتَقْتُلُونَ رَجُلاً أَن يَقُولَ رَبِّيَ

ٱللَّهُ ﴾ ( غـافر : ٢٨ ) . ئـەڵێت : ئایـا پیاوێـك ئـەكوژن كـە ئەفـەرموێ : أللە پەروەردگارمە ؟

لەو ناوەنـدەدا نەئـەگونجا كەسێك لـە عامـەی گەلەكـە دژی پیلانـی كوشـتن و لەناوبردنی مووسا سەلامی لێ بێت بووەستێت .

لە مێژووی ژیانی پێغەمبەری خـوادا ﷺ هـەمان پاڵـەوانێتیی بـە ئەبوبـەكری صددیقەوە خوا لێی رازیی بێت ئەبینین . لە كاتێكدا كە موشریكەكان خـەریكی سزادانی موسڵمانەكان بـوون هـەتا مـردن ، ئەبوبـەكری صـدديق ـ كـە لـە چینی بورجوازیی مەككە بـوو ـ هـەمان دەسـتەواژەی ئەفـەرموو : ( أتقتلـون رجـلاً أن يقول ربي الله ) .[٧٠]

كەواتە ئەو رووداوانەی كە قورئـان باسـیان ئـەكات بـە درێـژایی زەمانـە و بـە وێنەی جۆراوجۆر ، بەڵام بە هەمان حەقیقەت ، دووبارە ئەبنەوە .

❋ ❋ ❋

[٧٠] البخاري ، فضائل الصحابة : ٥ ، مناقب الأنصار : ٢٩ ، تفسير القرآن ( ٤٠ ) ١ ، المسند للإمام أحمد:٢ / ٢٠٤ .

﴿ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴾ ( ص : ٢٠ )

ئەم ئایەتە دوا بە دوای کۆمەڵە ئایەتی :

﴿ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلْأَيْدِ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ۝ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ۝ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً ۖ كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾ ( ص : ١٧ ـ ١٩ )

هاتووە .. دوای باس‌کردنی ئەو فەضیلەت و موعجیزانەی کە خوای باڵادەست بە داوودی سەلامی لێ بێت بەخشیی‌بوون ، قورئانی پیرۆز سێ فەضیلەتی تری گرنگ باس ئەکات کە خوای باڵادەست بەم پێغەمبەرە بەڕێزەی بەخشیی‌بوون و، جەختیشی لەسەر ئەوە ئەکردەوە کە پێویستە بکرێتە پێشەنگ بۆ فێربوونی چۆنیەتیی گرتنە دەستی دەسەلات لەگەڵ نزیک‌بوون لەگەڵ خوادا . ئەو سێ فەضیلەتەی دواییش ئەمانە بوون :

١ ـ ( وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ ) : واتە : پشتیوانیی و کۆمەکیی دەسەلاتەکەیان کرد. ئەوەبوو داوود پێغەمبەر سەلامی لێ بێت تووشی چەندەها بەلا و تەنگ و چەڵەمە و موصیبەت بوو ، بەڵام ـ بە فەضلی خوا ـ لێیان دەرباز بوو و ، حوکم و دەسەلاتەکەشی زیاتر بتەو و بەهێز بوو . هەروەها ئایەتەکە ئاماژە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ ئەکات کە ئایندە یەکجار گەشاوە ئەبێت . [٧١]

---

[٧١] هەموو ئەو چیرۆکانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون دڵدانەوە و مژدەن بۆ پێغەمبەر ﷺ ، هەروەها دەرس و ئامۆژگارین . لەبەر ئەوە ئاوردنی ئەو نیعمەتانەی خوای گەورە کە بەسەر داوود پێغەمبەردا سەلامی لێ بێت رژاندوونی ، ئاماژەیەکە بۆ ئەوە کە خوای باڵادەست چەندین نیعمەت بەسەر پێغەمبەریشماندا ﷺ ئەرژێنێ . ( وەرگێڕی عەرەبیی ) .

٢ ـ ( وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحِكْمَةَ ) : دیاردەی تـەواوی حەقیقـەتی ئـەم حیکمەتـە کـە لایـەنێکی گـرنگ و تایبـەتیی لایەنـەکانی پێغەمبەرایەتی‌یـە ... ئـەم دیـاردە تـەواوەی حیکمـەت بـە درەوشـاوەترین وێنـە لای پێغەمبـەرمان ، کـە سـەرداری هەموو مرۆڤە ، درەوشـایەوە . ئـا لێـرەدا وەبیر هێنانـەوەی ئـەو نیعمەتەیـە کـە پێشکەشی پێغەمبەرمان کراوە .

٣ ـ ( وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ) : واتە لێ‌هاتنی وتاربێژیی کامڵ و تـەواو . جا لـەم نیعمەتەش چەندێك بە داوود پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بەخشراوە ، ئـەوا چـەند قاتی ئەوە بە پێغەمبەری ئینس و جینن و ، وتاربێژی بوونەوەر و هەموو شوێنێك و ، سوڵتانی عیلمی کەلام و بەلاغەش ﷺ بەخشراوە . جا ئەگەر چیاکان ئـاوازی شمشاڵەکەی داوود پێغەمبـەر سـەلامی لێ بێـت بگێڕنـەوە دوا، ئـەوا رۆژێـك لـە رۆژان ئاوازەکانی فەرمایشتی بولبولی پێغەمبەران و قورئـان ئەگەڕێنـەوە دوا و ، لە هەموو دڵەکان‌دا دەنگ ئەدەنـەوە . ئـەم مانایـە لـە هـەماگیریی مـەعناکان‌دا دەرنەکەوێت .

بەڵام لە هەندێ تەفسیری کلاسیکیی‌دا هاتووە کە مانـای (( فصـل الخطـاب )) وتنی : ( أما بعدُ ) ی عەرەبی‌یە . بەڵام ناگونجێ قورئان ئەم کارە لـە پێشـانگای منەت و نیعمەت بەخشین‌دا باس بکات و ، مەبەستی پێی ئەم جۆرە وشەیە بێت، کە خەریکە هەموو کەسێك بتوانێ بی‌ڵێت . بەڵێ ! ئەمە فـەضلـێکی خـوایی و نیعمەتێکـە بـە داوود پێغەمبـەری سـەلامی لێ بێـت بەخشـیوە . لەبـەر ئـەوە وا چاکترە بڵێین کە ( فصل الخطاب ) لێرەدا یانێ لێ‌هاتنی قسەکردن بە پێی عـەقڵی خەڵك و ، لێ‌هـاتنی وتـاردانی بێ‌وێنـە و ، بـەکارهێنانی شـێوازی قسـەکردن کـە قەناعەت بە هەموان بکات و ، ماوە بۆ رەخنە و وت و وێژ نەهێڵێتەوە. هەروەها ئەتوانین بڵێین ئەوە بریتی‌یە لە توانا و ، لێ‌هاتنی بۆ شەرحکردنی وردەکاریی و لق و پۆپی هەموو مەسەلەیەك بە شێوەیەکی روون .



﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴾ ( المؤمن : ٢٦ ) .

لەم ئایەتە پیرۆزەدا ناوی ئیمانداریێك دێت كە لە بنەماڵەی فیرعەون هەڵكەوتووە و ، ئەوەیە كە ناوی (( ئیمانداری ئالی فیرعەون )) ی لێ نراوە و ، لە سوورەتی (( المؤمن )) دا هەواڵی هاتووە . فیرعەون وتی : ﴿ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴾.
وتی : وازم لێ بێنن با من مووسا بكوژم و ، ئەویش لە پەروەردگاری داوای كۆمەكیی بكات . من ئەترسم دینەكەتان بگۆڕێت یان لە سەرزەوییدا فەساد و خراپكاریی بلاّو بكاتەوە . جا بۆ ئەوەی بتوانین بە چاكیی لە ئایەتەكە بگەین وا بە كەڵكە ئەو رووداوانە بهێنینەوە یاد ، كە یەك لە دوای یەك وەك زنجیرە هاتن هەتا گەیشتنە ئەم خاڵە .

وەك زانراوە فیرعەون لە هەموو هەوڵەكانیدا بۆ دژایەتیی مووسا سەلامی لێ بێت شكستی هێنا و ، بۆ دواجار بڕیاری كوشتنی دا و ، بۆ ئەم كوشتنەش ئیزنی لە قەومەكەی وەرگرت . ئەوەش كە لە رۆحی ئایەتەكەوە ئەیبیستین و لێوەی ئەڕوانین دەستەوسانیی و تێكشكان و ژێركەوتنی فیرعەونمان بۆ دەرئەكەوێت لەگەڵ هەستكردنی بەوە كە هەردوو دەستی بەستراون . كە ئەڵێت : ﴿ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ ﴾ ئەوە بەڵگەی ئەو دەستەوسانییەیە . چونكە ئەو فیرعەونەی كە لە لایەنی عەقلّیی و مەنتیقیی و بەڵگەدارییەوە لە بەردەم مووسا پێغەمبەردا

سەلامی لێ بێت تێك شکا ، بە دەنگێکی نزمی لاوازەوە دەستی دایە وەرگرتنی ئیزن لە قەومەکەی . ئەمە شێوازی کەسێك نیە کە متمانەی بە خۆی هەبێت، بەڵکو شێوازی کەسێکە بە شێنەیی هەموو کۆمەکێکی لە دەست دابێ . شێوازی زۆردارێکە کە لە کاتی دەسەڵاتیدا ستەمکار و ، لە کاتی لاوازییدا زەلیل بێت، یان لە رواڵەتدا بە دیمۆکراسیی دەربکەوێت . ئەم شێوازە لە حاکمێکی زۆردار و ستەمکارەوە کە بۆ بینای ئەهرەمەکان قەومەکەی رام کردبوو ، جگە لە ریایی و زەلیلیی و پەنابردن بۆ نیفاق لەبەردەم گەلدا هیچی تر نیە . ئەیویست هێزی جەماوەری ئەو گەلەی کە خۆی بە نەریتە کۆنە و دینەکەیەوە هەڵ واسیی بوو لەگەڵ خۆیدا بەرێت و ، ئەو گەلەی کە کاتێك بەهێز بوو تێکی شکاند و زەلیلی کرد وەبەر بهێنێ .. بەڵێ ! ... ئەویش وەك هەموو خاوەنفیز و دەمارەکان و دیکتاتۆرە پێشیینەکان وەها بوو کە جیهانیان بەگیر هێنا بوو .. ئەیویست لە هێزی گەل بپارێتەوە و رای گشتیی بۆ خۆی پێك بهێنێ . وەك موشریکانی سەردەمی نەفامیی وەها بوو کە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ ئەیان وت : ( ژن و مێرد لە یەك ئەکات و ، لەو خوایانەی کە باوباپیرمان ئەیانپەرستن دوورمان ئەخاتەوە ) . بەڵام فیرعەون بە خەڵکەکەی ئەوت : ئەترسم دەستکاریی دینەکەتان بکات ، یان خراپکاریی لە زەویی‌دا بڵاو بکاتەوە . ئەمەی ئەوت هەروەك تا ئەو کاتە هەموو شتێك بە چاکیی بەرێوە چووبێت و ، گەل لەوپەڕی خۆشگوزەرانیی و بەختیارییدا بووبێت و ، مووسا بیەوێ هەموو شتێك تێك بدات و ، میللەتیش بەرەو ئاژاوە و پشێویی ببات .

تا لەم کاتەدا ئیماندارەکەی ئالی فیرعەون دەستی خستە کارەکەوە .. بە پێی هەندێ ریوایەت ئەم ئیماندارە برای ئاسیا خاتوون و فەرماندەی گشتیی سوپاکانی فیرعەون بووە و ، ناشکونجێ مووسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێت ـ کە خاوەنی فەراسەت بووە ـ لێی ئاگادار نەبووبێت . مووسا سەلامی لێ بێت ئەو ئیماندارەی ئەناسیی و ، دەستی دایە بەرنامەڕێژیی بۆ هەڵسەنگاندنی هێز و

دەسەڵاتی و ، دوای ئەوەی ئەو کارەی بەرچاو گرت ، کاری خۆی رێك خست. کاتێکیش کە فیرعەون گەیشتە ئەم خاڵە لە دەستەوسانیی و بێهێزیی و لاوازیی، ناچار بوو هاوار بۆ گەلەکەی بەرێت کە لەوەو پێش بە هیچ و بێنرخی ئەژمارد. بە راستیی مووسا سەلامی لێ بێت لە دەرکەوتنی ئەو ئیمانداره کەڵکی چاکی وەرگرت .

قورئانی پیرۆزیش بایەخێکی زیاتری لە بایەخ پێدانی هەندێ لە پێغەمبەران دا بەو ئیماندارەی ئالی فیرعەون . کاتێکیش کە فیرعەون خۆی بە کەسێکی دیموکراتیی وەها دەرخست کە ئاوڕی بە لای گەلەکەیەوە دابێتەوە ، ئەویش بە شێوازێکی دیموکراتیانە بە فیرعەونی وت : ئایا پیاوێك ئەکوژن کە ئەڵێت : پەروەردگارم ( ألله ) یە ؟ واتە : ئایا هیچ رێزێك بۆ بیروباوەڕ و بۆچوونی خەڵك دانانێن ؟ ... کەم کەم ئیمانهێنانی خۆی ئاشکرا کرد و ئەیوت : ئەی قەومەکەم ! ئەمڕۆ ئێوە موڵك و دەسەڵاتتان هەیە و لەسەر زەوییدا زاڵ و سەرکەوتوون ، بەڵام ئەگەر خەشم وقینی خوا یەخەی پێ گرتین کێ بگاتە فریامان؟ لە بەردەم ئەم وتارە قەناعەت پێکەرەدا کە ئاراستەی گەل کرا فیرعەون پەنای بۆ دیماغۆغیەت برد :

فیرعەون ئەیوت : ئەوەی بە چاکی بزانم ئەوەتان ئەخەمە پێش چاو و ، تەنها رێی راستیشتان پیشان ئەدەم . وەهای دەر ئەخست کە زۆر بە تەنگ بەرژەوەندیی گەلەوەیە .

لە کاتێكدا کە فیرعەون بە پەلە لە تێك شکانی یەکجاریی نزیك ئەبوویەوە، مووسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێت لەوپەڕی دڵئارامییدا بوو و ، هەڕەشە و گوڕەشەی فیرعەون تاڵە موویەکی نەئەبزواند و ، خێرا وەڵامی دایەوە : خۆم داوەتە پەنای پەروەردگاری خۆیشم و ئێوەش لە ستەمی هەموو خۆ بە زل زانێکی ستەمکار کە ئیمانی بە رۆژی موحاسەبە نەبێت . بەمە متمانەی خۆی بە خوای

بالاَدەست دەرنەخست و ، لەلایەکی تریشەوە جەختی لەسەر ئەوە ئەکردەوە کە خوای بالاَدەست خۆی بە تەنیا پەروەردگاری جیهانەکانە .

کورتەکەی ، لە پاڵ دیمەنی فیرعەونда کە هەڕەشە و گوڕەشەی مردنی ئەکرد و، لە کاتی ئەو هەڕەشە و گوڕەشانەدا نەیئەتوانی دڵەڕاوکە و شڵەژاویی خۆی و، دژواریی عەقڵیی و مەنتیقیی و قەلبیی خۆی بشارێتەوە ، هەتا هەوڵیشی ئەدا پشتگیریی ئەو گەلەی بە دەست بهێنێ کە زۆرێك سووکایەتیی پێ کردبوو.. هێشتا لەم حاڵەتەشدا بۆ وەبەرهێنانی سۆزی دینیی گەلەکەی دوودڵ نەبوو.. بگرە هەوڵی ئەدا تاوانی گەندەڵیی بخاتە ئەستۆی دوژمنەکەی تا سومعەی لەکەدار بکات ، ئیتر لە یادی ئەچوو خۆی سەرچاوەی هەموو گەندەڵی یەکی سەرزەوییە . لە کاتێکیشدا کە لە هەموو بۆنەیەکدا دژایەتیی دینی ئەکرد، دیندارەکانی تاوانبار ئەکرد کەوا ڕۆحی دین ئەگۆڕن . لە لایەکی ترەوە مووسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێت ئەبینین لەوپەڕی دڵئارامیی و دامەزراوییدایە و ، لە بریی ئەوەی هانا بۆ گەل ببات ، هانا بۆ لای خوا ئەبات و ، بە ڕاشکاویی غروور و تەکەببوری فیرعەون ئەخاتە بەرچاوی . ئەمەش جیاکردنەوەیەکی ناکۆکیی نێوان (( حزب الله )) و (( حزب الشيطان )) ە لەو سەردەمەدا .



﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴾ ( فصلت : ٣٠ ) .

وشەی ( الإستقامة ) یانیٚ شویٚنکەوتنی ریٚی راست بە دریٚژایی ژیان و، شویٚن کەوتنی شتی راست و حەق و بە دریٚژایی تەمەن . قورئانی پیرۆز ئەفەرمویٚ : (( فاستقیموا )) بەمە فەرمان ئەدات و ئامۆژگاریمان ئەکات تا ریٚی راست بگرینە بەر . ئایەتەکەی سەرەوەش مژدەیە بۆ هاوویٚنەی ئەوانەی کە ریٚی راستیان گرتۆتە بەر . راستترین ریٚگاش لە نیٚوان ریٚگاکاندا ئەو ریٚگەیە کە پیٚغەمبەر ﷺ گرتیە بەر ، کە ئەوەبوو پەروەردگاری فەرمانی بەسەردا دا تا ئیستیقامەت وەربگریٚت : ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ﴾ ( هود : ١١٢ ، الشعراء : ١٥ ) ، تا ئەو ئیستیقامەتەی کە لە حاڵەتی هیٚزدا لە فیطرەتیدایە بە شیٚوەی کردار لە واقیعدا دەربکەویٚت .. ئەو ئیستیقامەتەش کە بەم فەرمانە خواییە لیٚی داوا کراوە ئەو ئیستیقامەتەیە کە لەلای خوا پەسەند بیٚت . لە راستییدا ئەو تیٚگەیشتن و جیٚبەجیٚکردنەی ئیستیقامەت کە لە لایەن خواوە داوا کراوە بە تیٚگەیشتنی تەواو و جیٚبەجیٚکردنی تەواو ، بەو مانایەی کە لە لای خوای بالادەست مەبەستە ، یەکجار گرانە . بۆیە فەرمانەکە بە شیٚوەیەکی رەها هاتووە و، ئاگاداریش کراوین تا بە پیٚی توانامان ، لە چاودیٚریی فەرمان و قەدەغەکانی خوادا راست و دروست بین . بەڵیٚ ! ... ئەوەمان لیٚ داوا کراوە . فەرموودەیەکی پیٚغەمبەریش ﷺ هەیە کە ئاماژە بۆ ئەمە ئەکات کە ئەفەرمویٚ : ( ما نَهَيتُكُم

عَنهُ فَاجتَنِبُوهُ ، ومَا أَمَرتُكُم بِهِ فَافعَلُوا مِنهُ مَا استَطَعتُم ) .[72] ئەوەی لێرەدا جێی سەرنجە ئەو ئاماژەیە بۆ توانین و توانابوون لەسەر دوورەپەرێزیی لە تاوانەکان و ، توانابوون و توانین لەسەر ئەنجامدانی کردەوەی چاك ..

ئیستیقامەت کەفالەتی بەختەوەریی دنیا و قیامەت ئەکات و ، بنچینەی چەندین مژدەی گرنگە کە لە قورئانی پیرۆزدا باسیان هاتووە . جا لەبەر ئەوەی کە لە پێشەوە ئەم بابەتەمان بە شێوەیەکی درێژتر باس کردووە ،[73] ئەوا لێرەدا بە باسکردنی هەندێ نوکتەی تری ئەم بابەتە واز دێنین :

١ ) ئیستیقامەت بۆ مرۆڤێك کە لە سەرەتای رێگادا بێت ـ یان بۆ کۆمەڵێك، یان بۆ ئوممەتێك ، یان بۆ دەوڵەتێك ئەگەر بتوانێ بابەتەکە بە پێوەرێکی گەورەتر وەربگرێت ـ توێشوویەکی گرنگە و ، ئەوانەش بەبێ توێشووی ئیستیقامەت رێگا ئەگرنە بەر لە نیوەی رێگادا ئەمێننەوە و ، هەرگیز بە ئامانجیان ناگەن . بەڵام بۆ ئیماندار گرنگ ئەوەیە بەو ئامانجە بگات کە خوای باڵادەست روونی کردۆتەوە . لەوانەیە ئەو ئامانجە کەسیی ، یان خێزانیی ، یان کۆمەڵایەتیی بێت .

بەڵێ ! ... ئیستیقامەت پایەیەکە نابێت بۆ سەرکەوتن دەستی لێ هەڵ بگیرێت ، ئیترسا سەرکەوتن لە ژیانی تاکە کەسیدا بێت یان لە ژیانی ئوممەتەکەماندا بێت . هەتا ئەگەر هەندێکمان توانییمان بە درۆ و ساختەکاریی هەندێ سەرکەوتن بە دەست بهێنین و ، جەماوەرمان بە دوای خۆماندا راکێشا ، هەر کە راستییەکان بە روونیی و راشکاویی دەرکەوتن ، ئەوانە هەموو ئەوەی کە لە رابوردوودا دەستیان خستبوو کەم کەم لە دەستیان دەرئەچێت ، هەروەها گونجان و هەلی دەستخستنەوەی لەدەستچوویان سەر لەنوێ لە دەست ئەچێت.
ئیستیقامەت دەستمایەیەکە ئەگەر لە دەستت دا ، ئەوا ئەوەی پێی زانیوە دەست ئەداتە راکێشانی هەموو ئەوەی کە ئەو دەستمایەیە هەتا ئەو رۆژە

---

[72] البخاري ، الإعتصام : ٤ ، مسلم ، الحج : ٤١٢ ، الفضائل : ١٣٠ ، النسائي ، الحج : ١.

[73] ئەمە لە کتێبێکی تری دانەردا ، لە ژێر ناونیشانی ( التلال الزمردية للقلب ) ج ١ / ٩٧ ، هاتووە .

دەستی خستبوو . جا لەبەر ئەوەی کە ئیستیقامەت بەو پلەیە ئەبێتە مایەی دەستکەوت ، ئەوا نەبوونیشی بە هەمان پلە زیان ئەگەیەنێت . پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ : ( شَيَّبَتنِي هُود وَأَخَواتُها ) .[٧٤] ئەفەرموێ : سوورەتی هوود و هاوەڵانی پیریان کردم . چۆن وا نەبێ کە ئەم سوورەتە ئایەتی ﴿ فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ ﴾ ( هود : ١١٢ ) ی تێدایە ؟ کەواتە هەتا پێغەمبەریش ﷺ دڵەڕاوکەی گەیشتن بە ئیستیقامەتی راستەقینەی لە کۆڵ نابێتەوە . کاتێکیش کە یەکێك لە هاوەڵان داوا لە پێغەمبەر ﷺ ئەکات تا ئامۆژگاریی بکات ، ئەفەرموێ : ( قل آمنتُ باللهِ ثم استقِم ) .[٧٥] ئەفەرموێ : بڵێ ئیمانم بە خوا هێنا و ، پاشان رێك و پێك دوای ئیسلام بکەوە .

ئەگەر لە چوارچێوەی ئیستیقامەتدا مایتەوە ، ئەوا ئەو تۆمەتانەی کە دوژمنان یان حەسوودان دەربارەت بڵاویان ئەکەنەوە زیانت لێ نادەن ، چونکە رۆژێك دێت بێتاوانییت دەربکەوێت ، ئەو کاتەش چەند قاتی ئەوەی کە لە رابوردوودا زیانت لێ کەوتووە قازانجت دەستگیر ئەبێت . گرنگ ئەوەیە لەگەڵ هەموو شتێکدا لەسەر هێڵی ئیستیقامەت بمێنیتەوە .

٢ ) ئەگەر کەسێك رێك و پێك نەبێت ژیان بە دڵەڕاوکە ئەداتە سەر ، چونکە هەموو ساتێك ترسی ئەوەی هەیە پاشێڵە پیسەکانی دەربکەون . جا ئەگەر لەو تاوان و هەڵانەیدا کەسێکی تر لەگەڵیا هاوبەش بوو ، ئەوا لە هەموو حاڵەتێکیدا و ، لە خەودا و لە خەبەردا ترس و دڵەڕاوکە لێی دوور ناکەونەوە ، نازانێت چ کاتێك لە دواوە رمی لێ ئەدرێت . بەو ترسەوە ئەتلێتەوە ، چونکە ئەم پەندە ئەیگرێتەوە : (( گەر دزەکان ناکۆك بن ، ماڵە دزراوەکە ئاشکرا ئەبێت )).

---

[٧٤] الترمذي ، تفسير السور ( ٥٦ ) : ٦ .

[٧٥] مسلم ، الإيمان : ٦٢ ، المسند للإمام أحمد : ٣ / ٤١٣ ، ٤ / ٣٨٥ .

ئیتر ناچار ئەبێت ماستاو بۆ ئەوانە بکات و ، بەردەوام لە ژێر فشاری ترس و دڵەڕاوکەدا ئەبێت .

٣ ) ئێستاش با رایەکی مامۆستا ( بدیع الزمان ) سەعیدی نوورسیی دەربارەی روویەکی تری ئیستیقامەت بخەینە روو :

کاتێك کە مامۆستا نوورسیی هۆیەکانی دواکەوتنمان ئەخاتە روو ئەفەرموێ : *(( جاری وا ئەبێت هەوڵ ئەدەن لە رێی بەکارهێنانی شێواز و هۆکاری هەڵەوە بە ئامانج و مەبەستی راست بگەن ، کەچیی گەیشتن بە ئامانجە راستەکان پێویستە لە رێی شێواز و هۆکارە راستەکانەوە بێت ))* . بە داڕشتنێکی تر : *(( لە رێی هۆکارە ناڕەواکانەوە ، گەیشتن بە ئامانجە راست و پاك و حەقەکان کارێکی نەگونجاوە ))* . بۆ نموونە : بە گاڵتەجاڕییەکانی سیاسەت مرۆڤ ناتوانێ بە رەزامەندیی خوای باڵادەست بگات ، یان قازانجێك بۆ موسڵمانان دەست بخات. هەروەها دەربارەی وەبەرهێنانی سۆزی جەماوەر بۆ ئەنجامدانی کارێك هەمان شت دووبارە ئەبێتەوە . ئا ئەمە هۆیەکی ناڕەوایە و ، مرۆڤ بەمە خۆی ئەخەڵەتێنێ ، هەروەها لە رێی چارەسەرییە دەست کردەکانەوە گەیشتن بە حەقیقەت سەر ناگرێت . چونکە ئێمە نە لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ و ، نە لە مێژووی ئیسلامدا و، نە لە سەردەمەکانیدا ، کاتێك کە ئیسلام زیندوو بوو ، ئەوە نابینین . کەواتە پێویستە شوێن رێگایەك بکەوین یان رێبازێك بە کار بهێنین بەردەوام راستگۆیی و ئیستیقامەت بناغەی بن ، ئەگینا هەرچیی کۆشش و لێهاتن ـ کە ئیستیقامەت پاڵپشتی نەبێت ـ بەخت کراوە هەمووی بە با ئەچێت و ، لەسەر ئەو دۆڕان و شکستە خواش موحاسەبەمان ئەکات . لەبەر ئەوەی کە هەر چەندە نیەتەکان چاکیش بن ، ئەوا جەماوەر بەرەو چەندین رێی هەڵە ئاراستە ئەکرێت کە لەوانەیە وێنە و شێوەی دینی ئیسلام بشێوێنێ و ، چەك و بەڵگە ئەداتە دەست دوژمنان تا دڕوندایەتییان زیاتر پەرە پێ بدەن .. کەچیی ئەم جۆرە مەسەلانە کە پەیوەندییان بە کۆمەڵگاوە هەیە ، لەسەر ئاستێکی فراوان ،

پێویستی‌یان به راوێژ و ، گۆڕینەوەی بیروڕا هەیە . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە تۆ بە هەوا و ئارەزووی خۆت جەماوەرت راکێشایە ناو مەترسیی گەلێکی چاوەڕوان نەکراوەوە و، خوای بالآدەستیش بە دڵنیایی‌یەوە لەسەر ئەوە موحاسەبەت ئەکات . بە داخەوە ئەم جۆرە هەڵانە ئێستا لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامیی‌دا ئەنجام ئەدرێن و ، نموونەی دیاریش لەسەر ئەمە لە هەندێ وڵاتی ئیسلامیی‌دا ئەبینین.

کورتەکەی بایەخ دان بە ئیستیقامەت لە هەست و ، لە فیکر و ، لە کاردا لایەنی کرداری ئیمان پێك دێنێت . ئەوەبوو پێشینە پیاوچاکەکان و ئەوانەش کە بۆ یەکەم جار بە قورئان دوێنران بایەخیان بە لایەنێك لە لایەنەکانی ئیستیقامەت دا .. هی وایان هەیە ئایەتی ﴿ ثُمَّ ٱسۡتَقَـٰمُواْ ﴾ ی وەها تەفسیر کردووە مەبەستی لەوانەیە خوای بالآدەستیان بە تاك و تەنیا ناسیوە و نەکەوتوونەتە ناو تاوانەوە . هەندێکی تریان وەهایان تەفسیر کردووە کە ئەوانەن گەیشتوونەتە بەندایەتیی پالفتەی خوای بالآدەست . هەندێکی تر وتوویانە ئایەتەکە ئاماژە بۆ ئەوانە ئەکات کە فەرزەکانیان بە کاملّیی بەجێ هێناوە و ، بە ظاهیریی و باطینییش کاملّ بوون . وێنەی ئەمانە مەلائیکەت دەوریان ئەدەن و ، دڵنیایی و ئاسودەییش دائەبەزنە سەر دڵ و دەروونیان . بەڵێ ! ... هەروەك رۆحە خراپ و پیسەکان و شەیاتین سەردانی ئەوانە ئەکەن کە رۆحیان بە ئاژاوە و هەستە شەیتانی‌یەکان پڕ بووە ، ئەوا رۆحە پاکەکانیش سەردانی هەڵگرانی ئیستیقامەت ئەکەن و مژدەیان پێشکەش ئەکەن ﴿ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴾ .

هەندێکیان وای ئەبینن کە ئەم دابەزین و مژدەدانەی مەلائیکەتەکان لە کاتی سەرەمەرگ و مردن‌دا ئەبێت . هەندێکی تر وای ئەبینن ئەوە دوای زیندوو بوونەوە لە مردن و هەرچیی رووداوێکی گران لە گەڵیا و بە دوای‌دا دێت ، روو

ئەدات . هەندێكی تر وتوویانە ئەوە لە كاتی مردن و ، لە كاتی زیندووبوونەی دوای مردندا جێ بەجێ ئەبێت . كێ ئەزانێت لەوانەیە ـ شان بە شانی كاتەكانی مردن و زیندووبوونەوە ـ مەلائیكەت لە هەموو لاپەڕەكانی ژیانی ئیماندارانیدا دائەبەزنە سەریان و ، ئەمەیشە هۆی ئەوەیە كە ئەو ئیماندارانە ژیانی پڕ لە ئاسوودەیی و دڵنیایی بەسەر ئەبەن . بەڵام وێنەی ئەم هەست كردن و فیكر و بیرانە كە دەرەنجامی ئەو تۆوی ئیمانەیە كە بە درێژایی تەمەنیان لە دڵیاندا بووە، بە كۆمەكیی قودرەت و سۆز و بەزەیی خوایی ، لە كاتی مردندا زیاتر روون ئەبنەوە و ، ئەبریسكێنەوە و ، قووڵ ئەبنەوە و ، لە كاتی مەحشەریشدا زیاتر دەرئەكەون و ، ئەگەنە لایەنە قیامەتی‌یە راستەقینەكانیان .

الله أعلم بالصواب ، وإليه المرجع و المآب .



﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ ( فصلت : ٥٣ ) .

یەكەم جار ئەم ئایەتە باسی ئەوە ئەكات كە ئەو نیشانانەی لەسەر راستگۆیی ئەم قورئانە بەڵگەن و ، حەقە و گومانی تێدا نیە ، لە ( آفاق ) و ( أنفس ) دا یەك لە دوای یەك ئەو نیشانانە دەرئەكەون و، ئەو ئاوازكاری‌یەی كە لە نێوان ( آفاق ) و (أنفس ) دایە ئاماژە بۆ تاك و تەنیایی خوای بالآدەست ئەكات و بانگەشە بۆ بوونی ئەكات و ، مژدەش بەو ئیماندارانە ئەدات كە ئەو كاتە یەكجار لە تەنگانەدا بوون ، ئەوا دڵی دانیشتوانی مەككە و دەوروبەری ئەكرێتەوە و ، نووری ئیسلام لە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا بڵاو ئەبێتەوە و ، رۆحی

موحەممەدییش باڵی بەسەر جیهاندا درێژ ئەکات و ، ئاماژەش بۆ ئەوە ئەکات کە بارودۆخ لە دەرەوەی مەککە باشترە و ، زیاتریش گونجاوە بۆیان ..

شێوازی ئەم ئایەتە ئاسۆی بیرکردنەوەیەکی یەکجار فراوان لەبەر دەمماندا ئەکاتەوە و ، گونجانی چاودێریی‌کردنی راستی‌یەکانمان بۆ ئامادە ئەکات . وەك زانراویشە ئەو بەڵگانەی کە بۆ چەسپاندنی حەقیقەت پێشکەش ئەکرێن ، ئەکرێن بە دوو کۆمەڵەوە : ئەو بەڵگە ( آفاق ) یانەی کە لە بوونەوەر و ، هەر رووداوێکەوە کە پەیوەندیی پێوە هەیە هەڵ گۆزراون ، واتە بەڵگەکانی دەرەوەی ( نەفس ) . پاشان ئەو بەڵگانەی کە پەیوەندی‌یان بە جیهانی ناوەوەی مرۆڤەوە هەیە ، لە فیکر و هەست و هەڵهێنان و ، هەڵسەنگاندنی کەسیی بۆیان ..

* * *

﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ ﴾ ( الشوری : ٢٩ ) .

ئەم ئایەتە لە رابوردوودا بە بەڵگە ئەهێنرایەوە لەسەر ئیحتیمالی بوونی چەند شێوەیەك لە ژیان ـ لە جیهانی تری غەیری ئەم جیهانەی خۆمان ـ ئیترسا لەم ژیانە بچن کە لەسەر ئەم زەوییەی خۆماندا هەیە ، یان جیاواز بن لێی ، ئەمە راستە . هەروەها ئایەتی ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ ﴾ لەوانەیە ئەو تێگەیشتنەی لێ وەربگرین کە ئەگونجێ ئێمە بچین بۆ لایان ، یان ئەوان هەستن و بێن بۆ لای ئێمە .

( دبیب ) واتە جم و جوڵ و ، ( دابّة ) ش واتە جووڵاوە . لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەگونجێ ئەم وشەیە بەرامبەر بە جینن و رۆح و مەلائیکەت بە کار بهێنرێت ، بەڵام لە عورفی شەرعدا هەتا ئێستا بۆ ئەو گیاندارە ماددییانە بەکار هاتووە کە لەسەر زەوییدا هەن . لەبەر ئەوە ئەتوانین بڵێین کە لەوانەیە خوای بالادەست لە ئاسمانەکاندا بەدیهێنراوانی تری بە وێنەی مرۆڤ و غەیری ئەویش ، لە زیندەوەرەکانی تر ، بەدیی هێنا بێت و ، هەر کەی بیەوێ ئەتوانێ هەموویان کۆ بکاتەوە و ، هەروەك هەموو خەڵکیی و هەموو شتێك کۆ ئەکاتەوە و لە جیهانەکەی تردا حەشریان ئەکات ، وەهاش ئەتوانێ هەموو ئەو بەدیهێنراوانە پێکەوە کۆ بکاتەوە کە لە گۆشەکانی بوونەوەردان ..

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك لە تەفسیرنووسان دەریان بڕیوە کە مەبەست لە وشەی ( دابة ) ئەو باڵندانەیە کە بە ئاسمانەوەن ، بەڵام ئەو تەفسیرە ساردە و،

ناتوانیٚ لیٚرەدا لایەنی ئیعجازیی بسەلمیٚنیٚ . چاك تـر و گونجـاوتر ئەوەیـە قبـووڵی هەبوونی بەدییهیٚنراوان بکەین لە کۆمەڵـەی دوور و نزیکـی بوونـەوەردا کـە لـەو بەدییهیٚنراوانە بچن کە لەسـەر زەویـیدا هـەن ، هـەروەك ئیمـام موجاهیـد بـۆی چووە .

ئیٚمە لەم باسە ئەگەڕیٚین بۆ زانایـان و لیٚکۆڵـەرانی ئیمـانداری ئاینـدە . ئیٚمـە بوونی جیهانی تر لە گۆشەکانی بوونەوەردا ، کە لەم جیهانـەی خۆمـان بکـەن و ، بوونی بەدییهیٚنراو و دروستکراوانیش تیایاندا بە دوور نازانین ..

والله أعلم بالصواب .

* * *

﴿ وَمَآ أَصَـٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴾

( الشوری : ٣٠ ) .

ئەگەر بڵیٚین : هەر موسیبەتیٚك کە تووشمان ئەبیٚت سزای تاوانیٚکە کە ئـەنجامان داوە ، پیٚچەوانەی مەنتیقی شەرعیی نیە . بەڵام ئەگەر لەسەر هەر گوناهیٚـك کـە لە دەستمان دەرچوایە سزا بدرایِنایە ، ئەوا بەلاّ و موسیبەت بەسەر سەرماندا بـە کۆمـەڵ ئـەبارین و ، حەسانەوەمان لیٚ هـەڵ ئـەگیرا .. واتـە ئەگـەر لەسـەر ئـەو کردەوانـەی کـە خـوا پیٚیـان رازیـی نیـە ، لـە قسـەکردن و کۆڕبەسـتن و هـەڵس و کەوتمان، سزا بدرایِنایە ، ساتیٚك سرەوتمان نەئەبوو . ئەمەش مانای وەهایە خـوای باڵادەست ، کە هەمیشە سـۆزی پـیٚش سـزا و ئـازاری کـەوتووە ، چاوپۆشـیی لـە زۆریٚك لە گوناهەکانمان ئەکات . کیٚ ئەزانیٚت لە رۆژیٚکدا چەند جار چاوپۆشییمان لیٚ ئەکات ؟ ئەمەش ئەم ئایەتە پیرۆزە : ﴿ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴾ تۆماری ئەکات..

لـە راسـتییدا زانینـی ئـادەمیزاد کـەوا ئـەو موسـیبەتانەی تووشـی ئـەبن لـە ئەنجامی کردەوەکانی و ئەو تاوانانەن کە لە دەستی دەرچوون ، فەرمانی قورئانە .

هەر بیرکردنەوەیەکیش پێچەوانەی ئەمە بێت مرۆڤ بەرەو پشکنین بە دوای تاوان بار و گوناهباری دەرەکییدا پاڵ پێوە ئەنێت . وێنەی ئەم مرۆڤە ئەو جۆرە تاوانبارەی دەست ناکەوێت و ، لە تاوانی بەدگومانییش رزگاری نابێت ..

بەڵێ ! ... بۆ دۆزینەوەی تاوانبار قورئان پێوەرێکمان ئەداتێ : تاوانبار کەسێکی تر نیە ، بەڵکو خۆمانین . بۆ نموونە با بڵێین ـ لە ئەنجامی هەڵە و بێئاگاییدا ـ پێمان هەڵ کەوت و ، پەرداخێکمان شکاند و ، چایەکەی ناوی رژا و، پێمانی سووتاند . لەم حاڵەتەدا تووڕەبوون و ، گەڕان بە دوای تاوانباردا و هاوارکردن : (( کێ ئەم پەرداخەی لێرە داناوە ؟ )) کەڵکی بۆمان نیە ، بەڵکو پێویستە بە خۆماندا بێینەوە و بڵێین : (( پەروەردگارم ! ... لە رووداوەکانی بوونەوەردا جێی رێکەوت نابێتەوە . ئەگونجێ ئەم رووداوە تۆڵەسەندن بێت لێم لەسەر گوناهێك کە لە دەستم دەرچووە ... دەی لە گوناهەکانم خۆش ببە )). ئیتر سەرزەنشتی کەسانی تر نەکەین . ئەگەر بە دوای تاوانباری تردا بگەڕێین ، ئەوە دژی ئایەتی پیرۆزی : ﴿ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡ ﴾ ( النجم : ٣٢ ) هەنگاومان هەڵ گرتووە .. هەروەها بەدگومانیی بە کەسانی تریشی تێدایە ، واتە پێچەوانەی ئایەتی پیرۆزە : ﴿ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ ﴾ ( الحجرات : ١٢ ) .

بەڵێ ! ... مرۆڤ کە لە کاتی رووداونی موسیبەتدا خۆی تاوانبار ئەکات ئەوە پاڵی پێوە ئەنێت تا چاودێریی خۆی بکات . ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچیی تەنگانەیەك ئەهاتە رێی هەڵمەتی ئەئەدا بۆ نوێژ و ، بۆ دوعا و ، رووکردنە خوا و ئیستیغفار ؟

وشەی (( أيديكم )) کە لە ئایەتەکەدا هاتووە مەبەستی تەنها ئەو گوناهانە نیە کە بە دەستی خۆتان ئەنجامی ئەدەن ، بەڵکو مەبەستی هەموو ئەو گوناهانەیە کە دەست و پێی و گوێ و چاوتان .... تد تیایا بەشداریی ئەکەن. واتە هەموو ئەو کردەوانەی کە هەموو ئەندامەکانتان تیایا بەشداریی ئەکەن. لەبەر ئەوە

ئەگونجێ بەم چاوە سەیری هەموو گوناهێك بكەین هەر لە غەیبەتەوە بیگرە هەتا ئەگاتە زینا .

هەندێ جار لە نێوان چۆنیەتیی هاتنی موسیبەتەكان و قورسایی‌یەكانی لە نێوان ئەو هەڵە و تاوانانەی كە ئەنجام دراون پەیوەندیی هەیە و ، هەندێ جاریش نیە . بەلاَم هەموو موسیبەتێك بۆ ئیماندار بە حەوزی پالاَوتن و پاككردنەوە ئەژمێررێ ، كە ئیماندار ئەچێتە ناوی و لە گوناهەكانی پاك ئەبێتەوە ، بەمەش پارێزگاریی لەو پاكژی‌یە ئەكات كە لە نیەتی‌دا هەیە و ئەی‌پارێزێت .

لە فەرموودەیەكی شەریفدا كە ئیبن ئەبوحاتەم ئەی‌گێڕێتەوە پێغەمبەری پاك و بێگەردمان ﷺ ئەفەرموێ : ( لا يُصِيبُ إبنَ آدَمَ خَدَشُ عُودٍ وَلا عَثـرَةُ قَـدَمٍ وَلا إختِلاجُ عِرقٍ إلاَّ بِذَنبٍ وَمَا يَعفُو عَنهُ أكثَرُ ) .[٧٦] ئەفەرموێ : هەر موسیبەتێكی رووشانی چیلكەیەك ، یان پێ هەڵكەوتنێك ، یان لێدانی دەمارێك كە تووشی ئادەمیزاد ئەبێت هۆیەكەی ئەگەڕێتەوە بۆ گوناه كردن و، بەشی زۆرتریش لەو گوناهانە چاوپۆشی‌یان لێ ئەكرێت . ئیترسا خوای بالاَدەست راستەوخۆ لەو گوناهانە خۆش ببێت ، یان بیانگۆڕێت بە بەلاَ و موسیبەت و مرۆڤەكەیان پێ پاك بكاتەوە ، ئەوا مرۆڤ پیسیی تاوانەكانی پێوە نامێنێت . هەروەك ئیمام عەلیی خوا لێی رازیی بێت فەرموویە : خوای بالاَدەست لەوە دادپەروەرترە لە قیامەتدا لەسەر گوناهێك ، كە پێشتر لە بەندەیەكی خۆش بوویێت، موحاسەبەی بكات و ، لەوەش دادپەروەرترە لە قیامەتدا ، لەسەر گوناهێك كە لە دنیادا سزای بەندەیەكی دابێت ، جارێكی تر سزای بداتەوە .

ربنا اغفر لنا ذنوبنا وإسرافنا في أمرنا وثبت أقدامنا وانصرنا على القوم الكافرين .



[٧٦] إبن كثير ، تفسير القرآن العظيم ، تفسير الآية أعلاه ، علي المتقي ، ( كنز العمال ) ٣ / ٣٤١ ، ٧٠٧ .

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴾ ( الفتح : ٢٩ ).

ئەگەر ویستمان بەراوردێکی پەیوەندییدار بەم ئایەتەوە لە نێوان یەهوودییەت و مەسیحییەت و ئیسلامدا بکەین ئەوا ئەڵێین :

عیسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێت بۆ کۆمەڵگایەکی تا رادەیەکی زۆر ماددیی رەوانە کرا . جا بۆ چاککردنی ئەم جۆرە کۆمەڵگا ماددیـیە عیسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێت دینێکی رۆحانیی بۆ هێنان و ، ئەوەبوو فیکر و ئارەزووە ماددیـیەکانیانی چاک کرد ..

بەڵام ئەو کۆمەڵگایانەی کە لەسەر بناغەیەکی بتپەرستیی دینیان بەرپا کردووە ، خۆڕزگارکردن لە ئامۆژگارییەکانی ئەو دینە بتپەرستییە و ، گەیشتن بە فیکرێکی دینیی نوێ ، کارێکی یەکجار گرانە . ئەوەبوو مەسیحی سەردارمان سەلامی لێ بێت زیادەڕەوییە ماددییەکەی ئەو کۆمەڵگایەی راست کردەوە کە بۆ ناوی رەوانە کرابوو و ، لەبەردەمیا دەروازەیەکی بۆ رۆحانییەت والا کرد . لە هەمان کاتیشدا بە هۆی وەحی ئاسمانەوە ، بەبێ زیادەڕەویی لە هیچ لایەك، هاوسەنگییەکی لە نێوان رۆح و ماددەدا دامەزراند . بەڵام ئەوانەی کە دوای ئەو هاتن و هەڵگری ئەم دینە بوون نەیانتوانی ئەو هاوسەنگییە بپارێزن .. چونکە

به تێپەڕبوونی رۆژگار بە رادەیەك روویان لە رۆحانییەت نا کەوتنە ئینکاریی ماددە . قورئانی پیرۆزیش باس ئەکات کە ئەوانە رەبەنی‌یەکیان داهێنا نەیان توانی بە چاکیی بەڕێوەی بەرن ( الحدید : ۲۷ ) ، واشیان ئەزانی بە کۆمەڵە بەهایەکی بڵند گەیشتوون کە لە ژووری هەموو بەهاکانی ترەوەن ، بە مەرجێك خوا ئەو رەبەنی‌یەی لەسەریان فەرز نەکردبوو . لە پێناوی رەزامەندیی خوادا شتێکیان داهێنا کە لە رۆحی دینەکەدا نەبوو ، پاشان لە ژێر قورسایی ئەوەدا کە دایان هێنا بوو بەزین و ، لە بناغەی دینەکە دوور کەوتنەوە ، لە کاتێکدا شتە پاك و بەلەزەتەکان لە چوارچێوەی شەرعیی‌دا لە لایەکەوە موباح بوون و، بەسیش بوون و ، لەلایەکی تریشەوە پێویست بوون . ژیان لەگەڵ خێزان و منداڵدا لە پێویستی‌یەکانی ژیانن بۆ مرۆڤ و ، کاتێك کە هەندێك لە شوێن‌کەوتوانی مەسیحییەت پشتیان لەو پێویستی‌یانەی ژیان هەڵ کرد ، بە شێوازی ناشەرعیی بۆ جێبەجێ‌کردنی ئەو پێویستی‌یانە ژیانی خۆیان پیس و چەپەڵ کرد .

لە نەصرانییەت‌دا شێوەی تری زۆر بە وێنەی ئەم ئاڵ و گۆڕە ئەبینین . لە ئینجیل یووحەننادا ئەبینین : (( هەرکەس زللەیەکی لە روومەتی راستت دا ، لای چەپیشی بۆ وەرگێڕە )) . ئەمڕۆ ئەگونجێ ئەو مانایە و ئەو رۆحە بە سەیرکردنی هەڵ بسەنگێنرێت هەر وەك شێوەیەکی تر بێت لەم دەربڕینە : (( بەرامبەر بە کەسێك کە لێی دایت بێ‌دەست بە و ، بەرامبەر بە کەسێکیش کە جنێوی پێ دایت بێ‌زمان )) . بەڵام هەڵەی ئاشکرا لێرەدا ئەوەیە ئەم بۆچوونە خەڵك بەرەو تەسلیم بوون بە زوڵم و قبووڵ‌کردنی ئەبات و ، ئەمەش شتێکی هەڵەیە . چونکە زاڵم هەرگیز لە زوڵم تێر ناخوات . ئەوەبوو مەسیحییەت لە سەرەتای سەرهەڵدانی‌دا تووشی جۆری جیاواز لە گوشار و سەرکوت کردن بوو ، بۆیە هەلی بۆ نەئەڕەخسا تا خۆی بنوێنێ . جا لەبەردەم ئەم زوڵمەدا ئەوە درا بە گوێیاندا کە بەرامبەر بە دەستدرێژیی دەست نەکەنەوە . پاشان ئەمە بووە ناونیشان و سروشتێکی تایبەت بە مەسیحی‌یەکان و ، بیرورای جەنگ نەکردن و ، بەرەنگار

نەبوونەوەی دەستدرێژیی ، یان کۆشش‌کردن دژی و ، ژیـان بـە رەبـەنی‌یان گرتـە خۆ. بەلاّم کاتێك لەو کارە ئەکۆڵینەوە بۆ ئەوەی بـزانین تـا چ رادەیـەك لـە ژیـانی واقیعیی و کرداریی‌دا رەنگ ئەداتـەوە ، دیـمەنێکی رەش ئـەبینین کـە لەگـەڵ ئـەو بیروڕایەدا ناگونجێ . چونکە ئەیان‌بینین لـە شـوێنە جۆربـەجۆرەکانی جیهـان‌دا بـە تەواوەتیی بە پێچەوانەی ئەم بیروڕایەوە رەفتار ئەکەن و ، بە داخەوە، پێویستی‌یە فیطری‌یەکانی هەڵگیرسانی ئـەو جەنگانـەی کـە تـا ئـەمڕۆمان ئاسـەواریان درێـژە ئەکێشێ ، هەروەها ئەبنە هۆی لە ناوبردنی چەندین کەسی بێ‌تاوان بە زولـم و بـە ناڕەوا .

ئـەو بزووتنـەوە چاکسـازی‌یەی کـە مەسـیحی سـەردارمان سـەلامی لێ بێـت هێنـای، ئـەو رێیانـەی کردنـەوە کـە ئەبوونـە مایـەی هـاتنی جێـی شـانازیی مرۆڤایەتیی و کۆتا پێغەمبەر ﷺ کـە مـژدەی هـاتنی ئـەویش درا بـوو .. بـەلاّم ئەوانەی کە لە دوای ئەو هاتن ، وەك کاردانەوەیەك لەسەر زیادەڕەویی یەهوود لـە ماددەدا ، کەوتنە کەمتەرخەمیی و ئینکاریی ماددەیان کرد . ئایەتـە درێژەکـەی کۆتایی سوورەتی ( الفتح ) ئاماژە بۆ ئـەو باسـە ئـەکات و رووناکییشـی ئەخاتـە سەر . ئێمەش پێمان خۆشە چەند کارێك کە پەیوەندی‌یان بەم ئایەتەوە هەیـە روون بکەینەوە :

ئایەتەکـە بـە ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ﴾ دەسـت پـێ ئـەکات . واتـە بـە جـەخت کردنەوە لەسەر پێغەمبەرایەتیی ( النبوة والرسالة ) پێغەمبەرمان ﷺ دەست پێ ئەکات . لەبەر ئەوەش کە ئەم حەقیقەتە لـە چـەندین شـوێنی جیـاوازی قورئـان‌دا روون کراوەتەوە ، لێرەدا بـە شـێوەیەکی کـورت بـاس کـراوە . بـەلاّم ئـەم ئایەتـە تیشك ئەخاتە سەر ئەو خەڵکانەی کە لە دەوروبەری‌دان لە هاوەڵانی ، بـە هـەموو جۆرە ناونیشان و سیفەتێکیان و ، بە لایەنە جیاوازەکانیشیان .

حەقیقەتی ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ﴾ حەقیقەتێکی گرنگ و یەکجار زیندووە و، شاعیریش سەعدیی شیرازیی و ، هەروەها مامۆستا نوورسییش لە کتێبی (مەکتووبات) ی‌دا فەرموویانە : مەحاڵە بەبێ وتنی (( محمد رسول الله )) سەلامەتیی و ڕێی ئاسوودەیی هەبێت . بیریار و ئەدیبی تووركیی ناسراویش (نجیب فاضل) لە ڕوون کردنەوەی ئەم حەقیقەتەدا دەری بڕیوە کە ( باسکاڵ ) ی فەیلەسووف دوای ئەو حەقیقەتە کەوتووە و خەریك بووە بی‌گاتێ، بەلاّم لەبەر ئەوەی کە نەی‌وتووە : ( محمد رسول الله ) فریای کەشتیی سەرفرازیی نەکەوتووە و لە دەستی دەرچووە ، هەرچەندە گەیشتبووە قەراغی بەندەرەکە . بەڵێ ! ... هەرکەس نەگاتە لای پێغەمبەرمان ﷺ ، ئەستەمە بگاتە کەناری سەلامەتیی و بێوەیی ..

ئێستاش با بگەڕێینەوە بۆ لایەنی پەیوەندیی ئایەتەکە لەگەڵ باسەکەمان : هەر کەس بگاتە پلەی ( معیه ) واتە لەگەڵبوونی پێغەمبەرایەتیی ئەوا ئەگاتە پلەی لەگەڵبوونی خوایەتییش . جا لەم لایەنەوە ئەگونجێ ( لەگەڵبوون ) لەگەڵ پێغەمبەرمان ﷺ لە جیهانی ماددیی و جیهانی بەدیی‌هێناندا ، وەك جێ‌کەوتێك بێت بۆ ( لەگەڵبوونی ) خوایی لە جیهانی فەرماندا . کاتێکیش ئەڵێین : ( لەگەڵبوونی پێغەمبەرایەتیی ) مەبەستمان ئەوەیە کە لە ئایەتی ﴿ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ ﴾ دا هاتووە . ئیتر پاشماوەی ئایەتەکە دەربارەی سیفەت و ناونیشانی ئەوانە باس ئەکات کە توانیویانە بگەنە ئەو ئاسۆیە .

یەکێك لە سیفەتەکانیان ئەوانە ﴿ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ ﴾ . واتە ئەوانە لە دژی ئەوانە توند و تۆڵن کە توانای ئیمان‌هێنانیان لە دڵ و دەروونیاندا کوژاندەوە و، ئەو هەمووە نیشانانەی تاك و تەنیایی خوایان بە درۆ خستنەوە کە لەبەر چاواندا و لە جیهاندا پەخش و بلاّوبوونەتەوە و ، بەرەو ئیلحاد و ئینکاریی لایان دا و ، هەوڵیان دا بە دەم و پلیان نووری خوا بکوژێننەوە .

سیفەتی دووهەمیان ئەوانە : ﴿ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ﴾ چونکە ﴿ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ﴾ لە نێوان خۆیاندا بەسۆزن ، چونکە خەریکی رکووع و سجوودن و هەوڵی ڕەزامەندیی خوا ئەدەن ، واتە لە نزیكترین حاڵەتدان لە خواوە . ئەوانە لە هەمان کاتدا ئەزانن کە هەموو شتێك لە بەخشایشی خوای باڵادەستە . لە کۆتا مەنزڵیشدا مەبەستیان دەست خستنی ڕەزامەندیی خوای باڵادەستە ، بۆیە ئەبینین ﴿ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ﴾ .

﴿ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ﴾ تەوراتیش ئەو کتێبەیە کە پێشکەش بە مووسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێت کرا و ، دوای خۆی دەستکاریی کرا . ئەوەبوو لە بریی بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوای باڵادەست هەوا و ئارەزوو تیایا بەرچاو گیرا و ، ماددییەت ڕۆحی دەرپەڕاند و چووە جێگەکەی . کاتێکیش کە تەورات وەسفی ئوممەتی موحەممەدیی ئەکات لە لایەنی مەعنەویی و ڕۆحییەوە وەسفی ئەکات . لە لایەکی تریشەوە : ﴿ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ ﴾ کشت وکاڵیش شتێکی ماددییە لە تۆوەکانەوە پەیدا ئەبێت و ، تۆویش تەنێکی ماددییە و بەرنامەی ژیانی تێدایە ، بە وێنەی هێلکە کە لووی ژیانی تێدایە ، یان بە وێنەی ئاوی مرۆڤ . ﴿ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ ﴾ ، ( شطء ) واتە گەڵای کشتوکاڵ یان بڕاڵەی دارخورما کە ئەویش شتێکی ماددییە . لە وشەی ( شطء ) یشدا مۆسیقایەکی شاراوە هەیە هەروەك وێنەی دەرهاتنی کشتوکاڵەکە بکێشێ ، هەموو وشەیەکیش لەم ئایەتەدا بە وردیی و تەواویی هەڵبژێرراوە و ، بە وێنەی چنینی دانتێللا ڕێکراوەتەوە ..

﴿ فَٱسْتَغْلَظَ ﴾ واتە گەشەی کرد و گەورە بوو ، لێرەشدا ئەبینین لێك چواندنەکە ماددییە ، چونکە ناگونجێ ڕۆح یان لایەنی مەعنەویی گەورە و ئەستوور بکرێت .

﴿ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ ﴾ واته خۆی بەسەر قەدەکەیەوە گرت و ڕێك بوو .
( سوق ) لە مرۆڤ دا قاچیەتی ، بەڵام لە ڕووەكدا قەدەکەیەتی .

﴿ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ ﴾ واتە ئەو کشتیارەی کە تۆوەکانی چاندووە دڵی بە کشتوکاڵەکە خۆش ئەبێت ..

﴿ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ﴾ تا بەوە کافران داخیان لێ بێت .. ئەم داخ لێهاتنەش دوای ئەوە ئەبێت کە چاوی کەسانی تر بەوەی سەرسامیان بکات و بیان ترسێنێ پڕ بکات . ئەم کارانەش هەر هەموویان وابەستەی ماددەن .

ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین ئەبینین ئەو بەراوردکردنانەی کە لە ئینجیلدا هاتوون تێگەیشتنێکی ماددیی رووت ئاوەژوو ئەکەنەوە و ، سەرنجی خەڵك بۆ لای لایەنە هەست پێکراوەکانی شتەکان ڕائەکێشن . بەڵام ئەو حەقیقەتانەی کە لە تەوراتدا باس کراون لە هیچ کامیاندا شتێك نیە کە بگونجێ دەستی لێ بدرێ یان ببینرێت ، یان هیچ شتێك نیە کە پەیوەندیی بە هەست پێ کراوەکانەوە ببێت، بەڵکو هەموویان حەقیقەتی رووتن هەروەك پەیوەندیيان بە جیهانی فەرمانەوە هەبێت و ، لە چەمکە مەعنەوییەکان بن . ئەم کارە وردەش لە لایەنی تێگەیشتن لە بارودۆخی مەسیحی سەردارمان سەلامی لێ بێت یەکجار گرنگە . مەسیحی سەردارمان سەلامی لێ بێت ئەرکی ڕاستکردنەوەی ماددییەتی جوولەکەی پێ سپێررا . هەر مرۆڤێکیش ئەم جۆرە ئەرك و فەرمان بەرێیانە ئەنجام بدات پێویستە بەو شتانەی کە بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە یارمەتیی ئەدەن ساز بکرێت . یەکەم جار کە هاتە دنیاوە لە خێزانێکی ڕێك و پێکدا پێ گەیشت . ئەوەبوو خاتوو مەریەم سەلامی لێ بێت ، کە ناتوانین ناوی ئافرەتێکی تر بەرین کە لە لایەنی پەروەردەوە پێی بگات ، سەروکاریی پەروەردە کردنی کرد . قورئانیش لە چەندین ئایەتی جیاوازدا ـ بە هەڵبژاردنێکی جوانی وشەکان ـ سیفەت و نیشانەکانی مەریەم باس ئەکات . جا ئەم ئافرەتە مەزنە

ئەوەندە بایەخی بە داوێن پاکیی خۆی ئەدا هەتا لەبەردەم ئەو مەلائیکەتەش‌دا کە لێی دەرکەوت ترسی لێ نیشت .

ئەوەبوو دایکی مەریەم ئەو منداڵەی کە لە سکیا بوو نەذری کردبوو بۆ خوا. واتە لە پەرستگادا خزمەت بکات ، بەلاّم کە منداڵەکەی بوو و کچ بوو خەمبار و مات و مەلوول بوو ﴿ قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ ﴾ جا لەبەر ئەوەی کە نەزرەکەی بۆ ئەوەبوو منداڵەکە بکرێتە خزمەتچیی لە پەرستگادا ، سەرەڕای هەموو شتێك مەریەمی لە پەرستگا هێشتەوە و، مەریەمیش لە باروودۆخی رۆحیی پەرستگادا پێ گەیشت ، پاشان بە شێوەیەکی لەعادەت بەدەر و نائاسایی مەریەم بە عیساوە سەلامیان لێ بێت حامیلە بوو ـ کە بە ئەرکێکی تایبەتیی رەوانە کرا بوو ـ .

کورتەکەی مەسیحی سەردارمان سەلامی لێ بێت لە دایکێك بووە کە ژیانی لە شتانی لەعادەت بەدەر و نائاسایی پڕ بووە و ، خۆیشی لە ژێر چاودێریی و پارێزگاریی خوادا وەك مرۆڤێك کە ئاستی لایەنی رۆحیی بەرز بێت پێ گەیشت ، چونکە بۆ ناو کۆمەڵگایەك و خەڵکانێك رەوانە کرا بوو کە ساڵەهای ساڵ بوو لایەنی ماددی‌یان لە سنوور دەرچوو بوو ، بە رادەیەك کە ماددەپەرستیی لە لایان وەك دینی لێ هاتبوو ، کە رووخاندن و لەناوبردنی ، یان ئاڵوگۆڕ و نوێ‌کردنەوەی یەکجار گران بوو ، ئەمەش ناچاری کرد تا بە درێژایی تەمەنی لەگەڵ ئاوەها کۆمەڵگایەك‌دا لە خەبات‌دا بێت .

کاتێك کە مەسیحی سەردارمان سەلامی لێ بێت وەك پێغەمبەرێك بەو ئەرکە رەوانە کرا ، پێویست بوو ئەو شتانەی پێ ببەخشرێت کە ئاتاجیی و داخوازی‌یەکانی ئەو خەڵکەیان پێ جێبەجێ ئەکرێن . ئەوەبوو دژی ئەو بۆچوونە خەباتی کرد کە ماددەی کردۆتە خوا .. جا لەبەر ئەوەی کە بەبێ باوك هاتە دنیاوە و ، بە ئیزنی خوا چەندین موعجیزەی وەك زیندووکردنەوەی مردووان و، چاك کرنەوەی نەخۆشی‌یە سەختەکان و ، هی تریش ئەنجام دا ، ئەمانە بوونە

یارمەتیی‌دەری . بەم شێوەیە توانیی فیکری ماددیی راست بکاتەوە و ، رێگاش لەبەردەم فیکری مەعنەویی و رۆحیی‌دا بکاتەوە و ، بەمەش رێی بۆ دوا پێغەمبەر و نێرراو و ، جێی شانازیی مرۆڤایەتیی ﷺ خۆش کرد .

بێ‌گومان پێغەمبەری مەزن و ، خاوەنی پلە و پایەی ( جەمع ) ﷺ کە دوای ئەو دوو پێغەمبەرە ـ مووسا و عیسا ـ هات ، چەند کارێکی بە پێی پێویستیی ئاڵوگۆڕی کات و زەمانە ، راستکردنەوە کە پەیوەندی‌یان بە هەردوو ئوممەتەکەیان و هەردوو زەمانەکەیانەوە هەبوو . هەروەها لە شەریعەتی هەردووکیان ـ کە وا دەرئەکەون لە یەك جیاواز بن ، بەڵام لە بناغەدا هەردووکیان پارچەی یەکێکی تەواون ـ مەشرەب و تام و چێژێکی نوێ و، رێگایەکی راست هەڵ ببژێرێت . بەڵام لە راستیی‌دا ئەم شتە هەڵبژێرراوانە بریتین لە چەند بریسکەیەکی خووڕەوشتی ئەم دوو پێغەمبەرە بەڕێزە و، خووڕەوشتی پێغەمبەرانی تریش سەلامیان لێ بێت ، کە لە کتێبەکانیان‌دا دەربڕراون .

الله أعلم بالصواب .

❊ ❊ ❊

﴿ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴾ ( النجم : ١٨ ) .

وەك زانراوە ئەم ئایەتە وەسفی ئەوە ئەكات كە لە میعراجی پێغەمبەرمان ﷺ رووی دا . سەرەڕای ئەم لایەنەش لە ئایەتەكەدا ، ئەوا دەرگا لەسەر چەندین حەقیقەتی تر والا ئەكات كە لە دەرەوەی باسە تایبەتی‌یەكەدان .

بینینی بەڵگە ( آفاقي ) و ( أنفسي ) یەكان دەربارەی بوونی خوای بالادەست لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بە چاوی خۆی و ، هەڵسەنگاندنی ئەم بینینەی چاوی، بە بینینێكی ناوەكیی قووڵ و ، بە سووسەكردنێك كە دووری‌یە راستەقینەكانی لە ئەنجامی میهرەبانی‌یەكی خوایی دەور و خول بدات ، بەڵێ ! ... بینینی ئەم مرۆڤە مەزنە پێویستە بینینێكی گشتیی بێت چونكە ئەو خاوەنی تێڕوانینێكی گشتی‌یە و ، بەم پێ‌یەش بێت ئەتوانێ ، بەبێ هیچ بەرهەڵست و بەرگر و پەردە و كۆسپێك ، ( تجليات ) ی خوایی ببینێت . جا ئەو فەرمایشتەی كە لە دەمی كەسێك وەك ئەم مرۆڤەی كە خاوەنی ئەم ئاسۆ فراوان و بەرینەیە دەرچێت ، ئەوا بۆ هیچ مرۆڤێكی ئاسایی ناگونجێ بەرهەڵستی بووەستێت ، یان رەخنەی لێ بگرێت . بێگومان تێڕوانینی كەسێك كە بەسەر زەوی‌یەوە وەستا بێت و سەرنجی ئاسمان بگرێت ، وەك تێڕوانینی كەسێك نیە كە لەماڵەكەی خۆی‌دا دانیشتبێت و، نەتوانێ شتێك لە لووتی دوورتر ببینێت .

ئەگەر لێرەدا سەرنجی (( الآیة )) و (( الكبری )) بگرین ، لەسەر ئەساسی ئەوەی كە هەردووكیان (( صفة )) و (( موصوف )) ن ، یان ئەگەر (( مِنْ )) لێرەدا بە زیادە لە قەڵەم بدەین ، ئەو كاتە ماناكە وەها ئەبێت كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتە گەورەكانی خوای دیون . كەواتە ئەم پێغەمبەرە خاوەن قەدرە لەم گەشتەی‌دا لە ژووری زەمان و مەكانەوە ئەوەندە موعجیزەی پەروەردگاری و، نیشانەی گەشاوەی و ، شتی سەیری پشتی پەردەكانی بینیی كە وەسف ناكرێن و، لەگەڵ نیشانە گەورەكانیش‌دا بەرامبەر یەك وەستاون و ، بینینی چەندەها ئاسۆی

بۆ لوا کە بۆ هیچ کەسێکی تر نەلواوە بیـان بینـێ و ، لـە توانـای هـیچ وتنێـك و هیچ روون کرنەوەیەکیش‌دا نەبوو وەسفی ئەو ( تجلیات ) ە خوایی‌یانـە بکـات کـە لە کاتی گەڕانی‌دا بە مەقام و پلە بەرزەکان‌دا چاوی پێ کـەوتن . بـە راسـتیی بـە تەنیا ئەو لەو ئاسۆیانەدا کە پیایانا گەڕا هەستی بە ( أنـوار ) و ( أسـرار ) ەکـان کرد و ، هەر خۆیشی بیستنی . ئیتر لە توانا و لێهـاتنی کەسـێکی تـری غـەیری ئەودا نەبوو بەرگەی ئەو بینینە گشتی‌یە فراوانە بگرێـت کـە بریتی‌یـە لـە ( الآیـة الکبری ) . ( الآیة الکبری ) ش خوای تاك و تەنیا و ( صمد ) نیە ، واتە ئـەوەی کە دیتی زاتی خوای بالأدەست نەبوو ، بەڵکو نیشانە گەورەکەی ( الآیة الکـبری ) بوو . بوونیش هەر هـەمووی لـە سـەرەتایەوە هـەتا کۆتـایی بریتی‌یـە لـە نیشـانە گەلێك کە بەڵگەن لەسەر بوونی ( حـق تعـالی ) و ، ئامـاژەن بـۆ لای و ، بـوونی دەرئـەبڕن . بـە پێـی ئایـەتی ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾ ( الأنعام : ١٠٣ ) دەور و خولی خوا نادرێت ، یان دەرکی پێ ناکرێت ، ئەوە کـارێکی نـەگونجاوە و ، بـاس کردنیشی لە توانادا نیە ، بەڵام بینینی مومکینە . بەڵام ئایەتەکە بە راشـکاویی دەری ئەبڕێت کە ئەوەی بینراوە خوا خۆی نەبووە ، بەڵکو ئـەو نیشـانە گەورەیـەی بوو ، کە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ ئاسان کرا بی‌بینێ .

جا بە گوێرەی ئەو حەقیقەتەی کە پێغەمبەر ﷺ کەڵە زانای کتێبی بوونـەوەر و ، ناوکی درەختی بەدیی‌هێنان و ، نووری جۆری مرۆڤ بێت ، ئەوا ئـەتوانین بڵـێین کـە ئـەو بیـنین و دیتنـە بریتی‌یـە لـە خوێندنـەوەی کتێبـی حەقیقەتەکـەی و ، سەیرکردنی درەخت و لق و گەڵا و بـەری ماهیەتـە دەرکەوتووەکـەی . ئـەم جـۆرە گەشتە لە شوێنێك‌دا کە لە ژوورووی زەمان و مەکانەوە بێـت ئـەنجام دراوە .. لـە شوێنێك‌دا کە کیڕەی ئەو قەڵەمەی قەدەر نەبیسترا کە لە سایەی عـەرش و ، لـە ئاسـۆی رەزامەنـدیی و مەردایـەتیی‌دا ، ئـەو قەڵەمـە نەخشـە و بەرنامەڕێـژیی بوونەوەری یەکەم جاری ئەنجام ئەدا .

أللهم أرنا الحق حقاً وارزقنا إتباعه ، وأرنا الباطل باطلاً وارزقنا اجتنابه .



﴿ رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴾ ( الرحمن : ١٧ ) .

ئەم ئایەتە یەکەم جار وەها دەرئەکەوێت کە ئاماژە بۆ سنووری هەردوو خۆرهەلآت و هەردوو خۆرئاوا ئەکات .

بۆ نموونە : خۆرهەلآت و خۆرئاوا لە وەرزی هاوین‌دا لە خۆرهەلآت و خۆرئاوای وەرزی زستان جیاوازە . خۆر لە هاوین‌دا لەوپەڕی خۆرئاوادا ئاوا ئەبێت و ، لەوپەڕی خۆرهەلآتیش‌دا هەڵ دێت . لە وەرزی زستانیش‌دا خۆر لە نزیک‌ترین شوێنی خۆرهەلآت‌دا هەڵ دێت و ، لە نزیك ترین شوێنی خۆرئاوایش‌دا ئاوا ئەبێت . کەواتە هەر رۆژە و خۆر لە خۆرهەلآتێکی جیاوازەوە هەڵ دێت و ، لە خۆرئاوایەکی جیاوازیشەوە ئاوا ئەبێت . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت لە نێوان دوورترین دوو خۆرهەلآت و لە نێوان دوورترین دوو خۆرئاوادا چەندین خۆرهەلآت و خۆرئاوای جیاواز هەن . بۆیە لێرەدا وتراوە : ﴿ رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴾.

لەبەر ئەوە و لە روانگەی ئەم تێبینی‌یەوە ئەڵێین : لەگەڵ ئەوەدا کە هەموو رۆژێك خۆرهەلآتێك و خۆرئاوایەکی جیاواز هەیە ، کەچیی دوو خۆرهەلآت و دوو خۆرئاوا وەرگیراون و سنووری ئەوپەڕی خۆرهەلآتن و خۆرئاوابوون ئەنوێنن ، ئیتر خۆرهەلآت و خۆرئاوا رێژەیی‌یەکانی نێوان ئەم دوو سنوورە هەر یەکەیان ئەگەڕێتەوە بۆ جەمسەری نزیکی خۆی . ئەوەش بزانرێت کاتێك کە قورئانی پیرۆز هەموو دووری‌یەکان بەرچاو ئەگرێت خۆرهەلآت و خۆرئاواکانی بە شێوەی کۆ ناو بردووە ، کە فەرموویە : ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَـٰرِقِ وَٱلْمَغَـٰرِبِ ﴾ ( المعارج : ٤٠ ) .

شان بە شانی دووریی خۆرهەلات ـ کە بنچینە و بناغەیە ـ ناوی دووریی خۆرئاوایشی بردووە ، کە بە پاشکۆ و بەردەوامیی بۆی ئەژمێرری .

سەرەرای خۆر و مانگ ، لەوانەیە هەموو تەنە ئاسمانی‌یەکانیش ، کە بە نیسبەت گۆی زەوی‌یەوە هەلٚ دێن و ئاوا ئەبن ، بەم ئایەتە بە مەبەست وەرگیرابن. لەوانەشە کە ئەم شێوازە بەکار هاتووە بۆ ئەوە بێت کە ئاماژە بۆ جیاوازیی روانگەکانی خۆرهەلاتن و بۆ جیاوازیی روانگەکانی خۆرئاوابوون بکات کە لە ئەنجامی خولانەوەی زەویی بە دەوری تەوەرەکەی‌دا پەیدا بوون .

لەوانەشە بە خولانەوەی زەویی بە دەوری خۆردا و ، خولانەوەی خۆریش بە دەوری تەوەرەیەکی دیاریی‌کراودا لە نێو کەشکەشانەی رێی کاکێشان ، کاتێك کە ئەویش رێی خۆی ئەبرێت ، دوو خۆرهەلات و دوو خۆرئاوا پەیدا بن ، ئەو کاتەش ئەم دوو تەنە ئاسمانی‌یە ـ واتە زەویی و خۆر ـ دوو ئاماژەی خوایی راستەوخۆ بن ـ بەلاّم غەیری ئەوان ئاماژەی ناراستەوخۆ بن ـ دەربارەی قودرەتی خوایی لە لایەکەوە و ، وەبیرهێنانەوەیش بن بۆ نیعمەتەکانی خوای بالاّدەست لەلایەکی ترەوە .

وتمان هەلّهاتن و ئاوابوون ئاماژە بۆ قودرەت و نیعمەتە خوایی‌یەکان ئەکەن... ئاماژە بۆ قودرەت ئەکەن لەبەر ئەوەی کە قودرەت زامنی بەهەشت و ئەمری‌یە و ، ئاماژەش بۆ نیعمەتەکان بە هۆی گیرابوونی داواکاری‌یە رۆحیی و جەستەیی‌کانمانەوەیە ، کە داخوازیی ئەوەیە سوپاس بکەین و نەکەوینە دان پیانەنان و چاکە لەبەرچاو نەبوون .. ئەمەمان لە یاد ئەبێت و بەردەوامیش ئەپرسین : ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ ... ئەوە ئەلٚێین و نوقمی ناو سوپاس و شوکرانەکردن ئەبین .

الله أعلم بالصواب و إليه المرجع و المآب .



﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ۝٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ۝٧٦ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٌ كَرِيمٌ ﴾ ( الواقعة : ٧٥ ـ ٧٧ ) .

ئاخ بە دەست مرۆڤی دڵڕەقەوە ! ... خوای باڵادەست بە زانستی ئەزەلیی خۆی ئەو بارودۆخە ئەزانێت ، بۆیە بە سوێندخواردن پشتگیریی ئەکات لەوەی کە ئەیەوێ روونی بکاتەوە .

لەسەر مرۆڤ پێویستە بۆ ئەمە شەرم بکات و تەریق ببێتەوە و ، چین چین عارەق هەڵ بڕێژێ و ، لێوی بلەرزن و ، کاتێک کە وێنەی ئەم ئایەتانە ئەخوێنێتەوە بهەژێت . پەروەردگاری ئەم مرۆڤە ، بۆ ئەوەی بۆ مرۆڤی روون بکاتەوە و بۆی راڤە بکات کە ئەم قورئانە کتێبێکی بەڕێزە و ، ئەوە بسەلمێنێ ، ئەوا بەڵگە لە دوای بەڵگە ئەهێنێتەوە ، پاشان سوێندێکی گەورەی بۆ ئەخوات .

لە قورئاندا نموونەی زۆر لەسەر ئەم سوێندە هاتووە . خوای باڵادەست هەندێ جار سوێند بە ئەستێرەکان و هەندێ جاریش بە خۆر یان مانگ یان بە ئاسمانەکان ئەخوات . هەندێ جاریش سوێند بە نیعمەتە زەمینییەکانی خۆی ئەخوات : بە زەیتوون و بە هەنجیر سوێند خواردنیشی بە ( طور ) هەر لەو جۆرەیە . هەندێ جاریش سوێند بە رۆژ و بە شەو ئەخوات . بێگومان لە پشتی ئەو جۆرە سوێندانەوە چەندین حیکمەت و نهێنیی هەیە .

لە ئایەتی : ﴿ وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ﴾ شدا خوای گەورە سوێندی بە ئەستێرە خواردووە و ، ئەشگونجێ لەم سوێندەدا ئەمەی خوارەوە تێ بگەین : (( سوێند بەو ئەستێرەیەی کە بەرەو ئاسمان بەرز ئەبێتەوە ، پاشان لێیەوە ئەگەڕێتەوە دوا )) .

لەبەر ئەمە لێرەدا لەو گۆشەیەوە کە ئەم سوورەتە مەسەلەی میعراجی پێغەمبەر ﷺ باس ئەکات ( توافق ) ئەبینین . جا ئەگەر ئەوە مەبەست بێت یەکێك لە ئیحتیمالەکان ئەوەیە کە ئەو ئەستێرەیە پێغەمبەر ﷺ خۆی بێت . بەڵێ ! ... ئەوەبوو لەلایەن بەدیی‌هێنراوانەوە رۆیشت بۆ لای بەدیی‌هێنەر ، پاشان لە لای بەدیی‌هێنەرەوە گەڕایەوە بۆ لای بەدیی‌هێنراوان .

بەڵێ ! ... ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە لە بەردەم دیمەنەکانی بەهەشت و، لەبەردەم هەموو شێوەکانی جوانیی و ، ئەو نیشانانەش‌دا کە پەروەردگاری بالآدەستی پیشانی دا چاوی کلا نەئەکرد ، گەڕایەوە دوا بۆ ئەم دنیای فەسادە ، تا ئەو نیعمەتانە باس بکات بۆ کەسانی تر کە خوا پێی بەخشیی و ، دەستیشمان بگرێت ری‌نماییمان بکات . جا ئەم کارە بەستراوە بە حەقیقەتی ﴿ وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ﴾ و، بە یەکێك لەو ئاراستەکردنانەی کە تێی‌دایە . سوێندخواردنیش لێرەدا بە شەرەف و بە پایەی بەرزی پێغەمبەرمان ﷺ چەندین نیشانە و مانا هەڵ ئەگرێت . بەڵێ ! ... ئەو ئەستێرەیە پێغەمبەرمانە ﷺ . ئەو سەرەڕای ئەو سیفەت و رەوشتە بەرزانەی کە لە بنەڕەت‌دا خاوەنیان بوو و ، دوای ئەوەش کە لە میعراج‌دا بووە دیاردەی چەندین نیعمەت ، لە شێوەی موحەممەدێکی تردا گەڕایەوە . ئەوەبوو گەڕانەوەی و هاتنە خوارەوەی شتێکی ناوازە و جیاکار بوو کە لە مێژوودا لە کەس رووی نەدابوو و ، رووداوێکی بێ‌وێنەش بوو . لەبەر ئەمە و، بە پشت بەستن بە رەوشتە بەرزە رەسەنەکانی ، پاشان ئەوەی کە لە میعراج‌دا دەستی کەوت ، خوای بالآدەست سوێندی پێ ئەخوا .. لە سوورەتی ( الإسراء ) یش‌دا هەندێ لە تەفسیرنووسان وەهای ئەبینن کە ئایەتی : ﴿ إنه هو السميع البصير ﴾ ئاماژە بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەکات . واتە خوای بالآدەست هەندێ لە سیفەتەکانی خۆی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەسپێرێ و ، لێرەدا کە خوای

بالآدەست ئەفەرموێ : ﴿ وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴾ ، ئەوە سوێند بە پێغەمبەر و، بە پایە و پلە بەرزەکەی ئەخوات لەلای .

هەروەها لە ئایەتی : ﴿ وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا ﴾ ( الشمس : ١ ) دا خوای بالآدەست سوێند بە خۆر و بە کاتی چێشتەنگاو ئەخوات و ، لە ئایەتی : ﴿ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴾ ( الضحى : ٢ ) شدا خوای بالآدەست سوێند بە شەو ئەخوات چونکە کاتی حەسانەوەیە و ، بە تاریکایش کە شەو دائەپۆشێت . پاشان سوێند بەو رۆژە ئەخوات کە شەو درن پێ ئەدات و لە ناوی ئەبات . واتە سوێند بەو دەورە هەمیشەیی‌یە دووبارە بووە ئەخوات کە لە بوونەوەردایە و ، بەو نیعمەتە خواییانە و بەو میهرەبانی‌یانەش کە پێشکەش بە خەڵك ئەکرێن ..

هەروەها لە شوێنێکی تریشدا ئەم سوێندە ئەبینین : ﴿ وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ ۝ وَطُورِ سِينِينَ ﴾ واتە سوێند بە هەنجیر و زەیتوون و کێوی طوور . طووریش شوێنێکی پیرۆزە و شوێنی فەرمایشت کردنی خوایە لەگەڵ مووسا پێغەمبەردا سەلامی لێ بێت .. جا ئەم فەزڵە خوایی‌یە لەگەڵ مووسادا سەلامی لێ بێت خاڵی سەرەتا بوو بۆ ژیاندنەوەی ئومەتێك . ئەوەبوو مووسا سەلامی لێ بێت لەوێوە فەرمانی وەرگرت و ، گەلێکی پێ بەئاگا ئەهێنا بۆ بەسەربردنی ژیانێکی راستەقینە . لەبەر ئەوە طوور ناوچەیەك بوو کە شیاو بوو سوێندی پێ بخورێت.

هەروەك لە سەرەتادا وتمان چەندین نموونەی ئەم سوێندە لە قورئانی پیرۆزدا هەیە و ، یەکێکیش لە نموونەکانی ئەم سوێندە سوێند خواردنە بە شوێنی ئەستێرەکان .

هەر لە دێرین زەمانەوە ئەمەی خوارەوە وتراوە :

١ ) لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا ئەستێرەکان بۆ مرۆڤ گرنگ بوون و ، بەردەوام پەیوەندیی لە نێوان ئەستێرەکان و مرۆڤ دا بووە . کەم ترینی ئەم

پەیوەندی‌یە بریتی‌یە لە ڕێی ڕاست دۆزینەوەی مرۆڤ پێیان و دیاریی‌کردنی ئاراستەی خۆی . ئایەتێکی تریش ئاماژە بۆ ئەم حەقیقەتە ئەکات و ئەفەرموێ :
﴿ وَعَلَٰمَٰتٍۚ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴾ ( النحل : ١٦ ) .

سەرەڕای دیاریی‌کردنی لاکان و شوێنەکان ، لە وشکایی و ئاودا ، بە ئەستێرەکان ، ئەوا هەموو ئەستێرەیەك و ، هەموو کۆمەڵە ئەستێرەیەك ئاماژە بۆ ئەو یاسا وردە ئەکەن کە لە بوونەوەردا هەیە و ، بە زمانی ئاواز و یاسا و ، بە زمانی ئەو حەقیقەتانەوە کە لە پشتی پەردەکانەوەن بە دڵماندا ئەچپێنن و ئەیان خەنە جووڵە و ، ئەبنە هۆیەك بۆ هیدایەت بە وێنەی ئەستێرەیەکی قورئانیی ، بۆیە ئەبینین خوای باڵادەست ئەفەرموێ : ﴿ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴾. کێ ئەزانێت ، لەوانەیە هۆی سوێندخواردنی خوای باڵادەست بە شوێن و مەنزڵی ئەستێرەکان بوونی ئەم پەیوەندی‌یە بێت لە نێوان ئەستێرەکان و لە نێوان مرۆڤ دا. چونکە ئەگەر ئەستێرەکان لە شوێن و مەنزڵێکی دیاریی‌کراو و زانراودا نەبن ئەوا لە توانای مرۆڤ دا نەبوو بەم شێوەیە کەڵکیان لێ وەربگرێت .

٢ ) بۆ ئەوەی خۆر و کۆمەڵەی خۆر بگەنە حاڵی ئێستایان و ، هەروەها دنیاش ئەم شێوەیەی ئیستای وەربگرێت ، پێویستە صەدەها مەرج هەبن . بۆ نموونە دوورکەوتنەوە و ڕۆیشتنی گازەکان لە بەرگە هەوادا ئەبێتە مایەی تێك چوونی هاوسەنگیی و ، کەم و کووڕیی لە قەوارەی بەرگە هەوادا ئیتر بۆ ژیان دەست نادات .

کاتێکیش کە لەوە ورد ئەبینەوە و دەرکی پێ ئەکەین جگە لە سەرسام بوون و سەرسوڕمان هیچمان بۆ نامێنێتەوە و ، لە هەمان کاتدا دەست ئەدەینە دەرهێنانی بەڵگە لێی لەسەر بوون و تەنیایی خوا . لەبەر ئەمە سوێندخواردنی خوای باڵادەست بەم ئەستێرانە و شوێن و مەنزڵیان کە ئەبنە بەڵگە لەسەر بوون و تەنیایی ئەو ، شتێکی پەسەندە و لە جێی خۆیدایە . خۆ ئەگەر چووینە دەرەوەی

کۆمەڵەی خۆر بۆ ناو کەشکەشانەی کاکێشان کۆمەڵەی تری زۆری تیا ئەبینین و، هەموو کۆمەڵەیەکیش لە شوێن و مەنزڵی ڕێك و پێك‌دا دانراوە . ئەگەر تەنها دوو ئەتۆم بکێشن بە یەکتریی‌دا قیامەت هەڵ ئەسێت ، چ جای پیا کێشانی ئەم تەنە کەتانە لە بۆشایی بوونەوەردا ، لە ئەنجامی کەم و کوڕی‌یەك لە هاوسەنگیی‌دا .. بە تەنها بیرکردنەوە لەمە مرۆڤ ترسی لێ ئەنیشێت . لەگەڵ ئەوەش‌دا کە ئەبوا لە ئەنجامی ئەو ئاڵۆزی‌یە زۆرەدا و ، لە ئەنجامی زۆریی ئەو تەنانە لە بوونەوەردا ، کەم و کوڕیی لە هاوسەنگیی‌دا دەربکەوتایە ، کەچیی بە قودرەتی خوای باڵادەست ئەستێرەکان وان لە سایەی یاسایەکی سەرسام‌کەردا. جا لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە هەوڵ ئەدەین تەفسیری ئەو هاوسەنگی‌یە بە هێزەکانی ڕاکێشان و پاڵنان بکەین ، بەڵام لە پشتی ئەم یاسا پڕ وردەکاری‌یەوە قودرەتی کۆتایی نەهاتووی خوای باڵادەست هەیە . خوای باڵادەستیش بە فەرمایشتی : ﴿ فَلا أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴾ بۆ ئەمە ئاگادارمان ئەکاتەوە و ، سەرنجیشمان بۆ لای ڕێك خستن و ڕاپەڕاندنی کارەکانی ڕائەکێشێت .

٣ ) ئەگونجێ لەم ئایەتەوە بگوازینەوە بۆ کارێکی تر ، کە ئەویش بریتی‌یە لەوەی ئەستێرەکان بە شێوەیەکی ڕێك و پێك وان لە شوێنی ڕێکی خۆیان‌دا ، بە جۆرێك کە ئەگەر دەربارەی کۆمەڵەیەکیان لێ‌کۆڵینەوە بکەیت کۆمەڵە زانیاری‌یەکی ڕاست و بەکەڵکت دەربارەی کۆمەڵەکانی تریان دەست ئەکەوێت. بگرە لەوانەیە بتوانیت شاریان تێ‌دا دروست بکەیت . بەڵێ ، هەر ئەوەندە لە یەکێکیان تێ بگەیت ئیتر دەربارەی کۆمەڵەی تر بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی زانستت دەستگیر ئەبێت ، چونکە بە شێوەیەکی ورد ڕێك خراوە و ، هیچ هەڕەمەکیی و شڵەژاویی و ئاژاوەیەکی تێدا نیە ، بەڵکو یاسا و ڕێك و پێکی‌یەکی یەکجار ورد لە ئارادایە . ئەگەر سەرنج بدەین ئەبینین لە سوورەتی ( الرحمن ) دا خوای باڵادەست بەم هاوسەنگیی و یاسا سەرسام‌کەرە ڕەحمانیەتیی خۆی دەرئەخات . ئەوەتا دوای ناوی ( ألله ) ی باڵادەست ئەبینین یەکێك لە ناوە

یەکەمینەکانی ناوە پیرۆزەکان ناوی ( الرحمن ) ە ، کە بە مانای ( رزّاق ) هاتووە. ئەوەتا لە (( بسم الله الرحمن )) دا ناوی ( الرحمن ) دوای لەفظی ( ألله ) دێت و ، لە قورئانیشدا و تەنها لە ( بسملة ) دا ( ١١٤ ) جار سیفەتی ( الرحمن ) دوای لەفظی ( الجلالة ) هاتووە . جا ئەم سیفەتە کە شان بە شانی لەفظی ( الجلالة ) هاتووە ، ئەبینین لە سەرەتای سوورەتی ( الرحمن ) یشدا هاتووە و ، ئاماژەش بۆ ئەوە ئەکات کە ئەم سیفەتە یەکێکە لە نیعمەتە هەرە گەورەکان کە بە ئادەمیزاد بەخشراون .

لە سەرەتای سوورەتی (( الرحمن )) دا ئەبینین کە (( الرحمن )) هاتووە ، پاشان ﴿ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾ وەك تیشك دانەوەیەك لە تیشك دانەوەکانی ئەم رەحمەتە دێت. جا ئایا رەحمەتێك هەیە لە فێرکردنی قورئان گەورەتر بێت ؟ بەڵێ ! ... ئەگەر ئێمە ئەنواری قورئان نەبینین و ، گەر پەیامەکانیشی جیهانەکەمان روونـاك نەکەنەوە ، ئەوا هەموو بوونەوەر بە پێی ئێمە جیهانێکی تەعزیەی گشتیی ئەبوو و ، هەموو دروست کراوانیش لە چاو ئێمەدا وەك کۆمەڵە تابووتێکی بێ‌گیان ئەبوون و ، جگە لە تەنیایی و ترس و لەرزیش هیچیان بە دڵدا نەئەهات . لەبەر ئەمە لە توانامـاندا نەبوو رووی راستەقینە و مانای راستەقینەی هیچ شتێك ببینین و بزانین . بە فەزڵی ئەنواری قورئانی پیرۆز توانییمان مانا و حیکمەتی هەموو شتێك بزانین و ، پەیشمان بەوە برد کە ئێمە گرنگ ترین نموونەین لە بوونەوەردا. ئەو کارانەش کە کەسانی تر بە ناوی زانستەوە پەییان پێ نەبرد ، ئێمە بە نووری قورئان پەیمان پێ برد ، ئیتر لە سەرسامیی و لە ترس رزگارمان بوو . کاتێکیش کە بە رۆحی قورئان لە بوونەوەر ورد بووینەوە ، پەیمان بە کۆمەڵە کارێك برد کە کەسانی تر بە مسقاڵی خەرتەلەیەکی نەگەیشتوون ، هەتا ناو و ناونیشانیان نەزانیوە . بە هۆی نووری قورئانەوە بە هەرلایەکدا سەیر بکەین هەموو شتێك بە روون و ئاشکرا ئەبینین .

﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ ۝ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ﴾ لێرەدا خوای باڵادەست رەحمەت و رەحمانیەتی خۆی دەرئەخات ، بەوەی کە ( بیان ) ی فێر کردووین . جا ئەگەر ئێمە لاڵ بووینایە و ، بە دەربڕینێکی تر ئەگەر توانامان نەبوایە ببینە تەرجومانی ئەم بوونەوەرە کە بە هەزار زمان ئەدوێ و ، ئەگەر توانامان نەبوایە لەو ( بیان ) ەی پەروەردگار تێ بگەین و ، هەندێکمان بە دەرس بە هەندێکمانی بڵێین ، واتە ئەگەر تێگەیشتن لەم بوونەوەرە قەشەنگە بەو ( بیان ) ەی کە لە سیفەتی فەرمایشت کردنی خوای باڵادەستەوە هاتووە ، نەبوایە ، ئەوا لە توانامان‌دا نەبوو لە نەخش و نیگارە ورد و ، لە مانا قووڵەکانی بوونەوەر تێبگەین .

﴿ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ﴾ واتە : خۆر و مانگ بە ئەژمارێکی ورد لە شوێنی خۆیان دانراون و ، هەر یەکەیان شوێنێکی گرنگی گرتووە و ، ئەو تیشك و رووناکی‌یەش کە لە هەردووکیانەوە دەرئەچن ، کاتێك کە بەناو بەرگە هەوادا تێ ئەپەڕن ، ئەگەنە لامان و ، لە شێوەیەکی خۆشەویستی دیمەنی مانگی چواردەدا بەرچاومان ئەکەون و ، لە روانگەی ئەو بوونەوە ویستێکی سەرسام دەرئەکەوێت ، کە هەموو شتێکی بە نەخشەیەکی پارێزراو داناوە . ئەمەش دەرخستنی رەحمەت و رەحمانیەتی خوایە لە ئاستێکی تردا . خۆ ئەگەر رەحمەتی خوایی ئەم جۆرە یاسایەی دانەنایە کە لەسەر ئەژمارێکی ورد وەستاوە ، ئەوا ئێمە ، لە نێوان ئەو تەنانەدا کە ئەدەن بە یەکتریی‌دا ، تۆزمان ئەچوو بە حەوادا. راستە جاربەجار هەندێ بەرد لە ئاسمانەوە بەر ئەبنەوە ، بەڵام هیچ مەترسی‌یەکی جیددیی و ، گرفتێکی راستەقینە دروست ناکەن . ئەو هەسارە و پرژە ئاگرانە نە سەری مرۆڤێکیان شکاندووە و نە چاویان کوێر کردووە . کەواتە ئەو تەنانە بەر قەڵغانی پاراستنی خوایی ئەکەون و ، تێك ئەشکێن . تۆیش ئەتوانیی لە هۆیەك بگەڕێی بۆ تەفسیری ئەو کارە و ، ئەڵێیت ئەو تەنانە بەر ئەو گازانە ئەکەون کە

بەرگە هەوایان پێك هێناوە و ، گڕ ئەگرن و ورد و خاش ئەبن .. بەلام هۆی ئەوە هەرچیی بێت ئەوا کۆمەڵی هەموو هۆیەکان بریتی‌یە لە بەرجەستەکردنی چاودێریی خوایی . خوای بالادەست هەموو شتێکی لە ناو یاسایەك و ، لە دووتوێی ئەژمارێکی ورددا داناوە . هەروەها ئەم مانایە لە بابەتی مەنزڵی ئەستێرەکاندا تێبینیی ئەکرێت ..

٤ ) ئەستێرەی قوطب و شوێنە ناوازەکەی و کەڵکی بۆمان لە دیاریی‌کردنی لاکاندا و ، کۆمەڵەی خۆر و شوێنەکەی لە ناو کەشکەشانەی رێی کاکێشاندا و، کەشکەشانەی رێی کاکێشان و شوێنە ناوازەکەی لە نێوان هێشووە کەشکەشانەکاندا و ، هێشووە کەشکەشانەکان کە کەشکەشانەکەی خۆمان لە ناویاندایە و ، شوێنی ئەو هێشووە لە نێوان کۆمەڵە هێشووە کەشکەشانەکانی تردا و ، گونجانی هەندێك لەگەڵ هەندێکی تردا ، هەروەها بوونی هەر هەسارەیەك لە کۆمەڵەی خۆردا لە دووری‌یەکی دیاریی‌کراو و گونجاوەوە لە خۆر.. هەموو ئەمانە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەن کە هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا بە شێوەیەکی قەشەنگ و سەرسامکەر رێك و پێکە و ، ئەڵێی هۆنراوەیەکی جوانە و، بەڵگەیشن لەسەر گرنگیی شوێنی ئەستێرەکان ..

٥ ) لە خۆرهەلات و خۆرئاوادا مەنزڵی ئەستێرەکان بە شێوەی جیاواز باس ئەکرێت . بۆ نموونە لە رووسیا دەستەواژەی (( ئەو شوێنانەی کە ئەستێرەکان تیایانا نیشتوونەتەوە )) . کەچیی ئەمە لە خۆرئاوادا بە کونە رەش و سپی‌یەکان ناو ئەبرێت . لە راستییش‌دا شان بە شانی ئەو مەسەلانەی کە زانست هەوڵ ئەدا حەلیان بکات ، زۆرێك نهێنیی هەن کە چاوەڕوانی حەلن . جا کاتێك کە زانست مەسەلەیەك حەل ئەکات، کتوپڕ دوو مەسەلە یان زیاتر لەبەردەمی‌دا دەرئەکەون.

هەندێك لە تەفسیرنووسە هاوچەرخەکان ئەڵێن کە (( مەنزڵی ئەستێرەکان )) ئاماژە بۆ ( کوازەر ) ەکان و ئەستێرە ترپنەکان ئەکات . کونە سپی‌یەکانیش سەرچاوەیەکی یەکجار زۆری وزەن و ، ئەمرۆش توانای بینینیان و دیاریی‌کردنی

شوێنەکانیان هەیە . زانایانی ئەمڕۆ ئەڵێن : کونە سپی‌یەکان وەك کێڵگەی ئەستێرە وەهان کە ئەستێرە و کۆمەڵە ئەستێرەی تیا دروست ئەبن و گەشە ئەکەن. بەڵێ ! ... ئەم کونە سپی‌یانە دارای وزەیەکی یەکجار زۆرن ، بە جۆرێك کە ئەگەر بۆ نموونە کەشکەشانەی ڕێی کاکێشان کتو پڕ بە قودرەتی خوای بالادەست مەحف بوویەوە ، ئەوا کونێکی سپیی توانای هەیە کەشکەشانەیەك وەك کەشکەشانەی ڕێی کاکێشان سەر لە نوێ پێك بهێنێتەوە. ئەم تەنە ئاسمانی‌یە کەتانە بەوپەڕی وردەکاری‌یەوە لە ناو جەستەی بووەنەوەردا دانراون ، تا فەرمان بەری‌یە سەرسامکەر و یەکجار گەورەکەی خۆیان بە شێوەی ئاوازێکی خۆش و بە گونجان و وردەکاری‌یەوە ئەنجام بدەن . کەواتە وەها دەرئەکەوێت کە مەنزڵی ئەستێرەکان لەو یاسا دیارەی بوونەوەردا دەورێکی گەورەیان هەیە . زانا رووسەکانیش دەربارەی مەنزڵی ئەستێرەکان ئەڵێن ئەو شوێنانەن کە ئەستێرە وردیلەکان تیایا دروست ئەبن و پاشانیش گەورە ئەبن . ئەم وتەیە لەلایەکەوە گرنگە ، کە بریتی‌یە لە تەصدیق‌کردنی ئەوە کە قورئان وەك ئێستە ئەزانێت رابوردوو و ئایندەش ئەزانێت و ، ئاماژەشی بۆ ( مەنزڵی ئەستێرەکان ) لەم جیهانە سەیرەدا کردووە .

٦ ) پاشان کونە رەشەکان .. ئەو ئەستێرانەی کە لە ئەلیکترۆنات و ناوکەکان پێك هاتوون . کاتێك کە ئەلیکترۆنەکان وزەکەیان لە دەست ئەدەن هەرەس دێنن و، کە ناوکەکانیش هەرەس دێنن لەسەر یەك کەڵەکە ئەکەن و ئەستێرە کەتەکان ئەگۆڕێن بۆ ئەستێرەی کورتە بنە و ، گەر ئەو ئەستێرانە ئەوەندەی خۆر بن یان بچووکتر بن ئەگۆڕێن بۆ ئەستێرەی ترپن . جا هەرچەندە ئەم ئەستێرانە هیچێك لە بارستایی و کێشیان کەم ناکەن ، بەلام قەبارەیان زۆر بچووك ئەبێتەوە ، پاشان ئەگۆڕێن بۆ کونە رەشی گەورە گەورە . ئەم کونە رەشانە نابینرێن بەلام هەر رووناکی‌یەك بە لایاندا تێ بپەڕێت ون ئەبێت ، واتە لە لایەن ئەم کونە رەشانەوە هەڵ ئەمژرێت و ، زەمەن کاری خۆی ئەکات . کاتێکیش کە شتان لە گێژاوی ئەو

کونانەدا ون ئەبن چەندین کار روو ئەدەن کە پڕن لە نهێنیی . بۆ نموونە ئەگەر کۆمەڵەیەك وەك کۆمەڵەی خۆر لەو کونە ڕەشانە نزیك کەوتەوە ئەوا ئەبێتە پارووپەکی چەور بۆیان و ، تێك ئەشکێت و تیایانا ون ئەبێت . هەندێ زانای فیزیای فەلەکیی دەربارەی ئەو کونە ڕەشانە ئەڵێت کە ئەوانە بریتین لە (( شوێنی ئەستێرەکان ـ مواقع النجوم )) .

٧ ) هەتا ئێستا مەبەست لە ئەستێرەکان بریتیی بووە لە پێغەمبەرە مەزنەکان . بۆ نموونە ئایەتی : ﴿ ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ ﴾ کە لە سوورەتی (( الطارق ))دا هاتووە ئاماژە بۆ ئەستێرەی کونکەر ، واتە ئەو ئەستێرەی کە ئەچێتە ناوەوە و ، هەتا دڵە ڕەقە داخراوەکانیش ڕووناك ئەکاتەوە . ئەو ئەستێرەیەش پێغەمبەرمانە ﷺ. هەموو پێغەمبەرێکیش بە نیسبەت چەرخەکەی خۆیەوە بە دیوێك لە دیوەکان و بە پێی ئەو ئەرکی پێغەمبەرایەتی‌یەی کە خراوەتە ئەستۆی ، بە ئەستێرەیەك ئەژمێررێت . ئەوانەش کە شوێن ئەو پێغەمبەرانە ئەکەون بەرز ئەبنەوە ، پاشان بەرزتریش ئەبنەوە ، هەتا وایان لێ دێت کە پەیوەندی‌یەکی بتەویان بە خوای باڵادەستەوە ئەبێت . کاتێکیش کە خوای باڵادەست سوێند بە (( مواقع النجوم )) ئەخوات ، سەرنجی ئادەمی‌یەکان بۆ لای مەنزڵە بەرزەکانی ئیبراهیم و نووح و مووسا سەلامیان لێ بێت و غەیری ئەوانیش لە پێغەمبەرە مەزنەکان و ، مەنزڵ و شوێنە بەرز و بڵندەکەی پێغەمبەرمان ﷺ ڕائەکێشێت . ئەم کارە ، بە تایبەت بە نیسبەت گۆشەی تەفسیری ئەشعەری‌یەوە بە گرنگ ئەژمێررێت .

٨ ) پێم خۆشە سەرنجتان بۆ لای خاڵێکی تری پڕ لە مانای قووڵ ڕابکێشم ، کە ئەویش ئەوەیە وشەی (( نجم )) بەسەر ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا ئەبرڕێت . تەفسیرنووسەکانیش ئەڵێن : (( إن القرآن نزل منجماً )) واتە : قورئان ئایەت ئایەت هاتۆتە خوارەوە . ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیش دارای (( شوێن ، موقع )) ن. ئایەتە قورئانی‌یەکانیش خاوەنی (( موقع )) ێکی گەورەن بەلای عیلمی

خوایی‌یەوە کە هەتا ناتوانین بی‌هێنینە پێش چاومان . ئێمە ناتوانین هێز و توانا و فراوانیی و دەوران‌گیریی سیفەتی فەرمایشت کردن ، بە شێوەیەکی تێر و تەسەل ببینین . لەبەر ئەمە لە کاتی سوێندخواردن بە مەنزڵی ئەستێرەکان خوای بالآدەست سوێند بە مەنزڵی قورئانی پیرۆز ئەخوات کە هەڵگری سیفەتی فەرمایشتیەتی ، لەبەر ئەوە لەگەڵ سوێندخواردن بە قورئانی مەجید لە ئایەتی: ﴿ قٓ ۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ﴾ دا هیچ جیاوازی‌یەکی نیە . هەروەها قورئان مەنزڵێکی تری لە ( لوح المحفوظ ) دا هەیە ، چونکە ـ هەتا دابەزینی لە شەوی قەدردا ـ لەوێ لە ( لوح المحفوظ ) دا پارێزراو بوو و ، جگە لە کەسێك کە توانای گەیشتنی بە ( لوح المحفوظ ) ی هەبێت هیچ کەس لێی ئاگادار نەبوو ، لەبەر ئەوە مەنزڵی ئەستێرەکان یانێ مەنزڵی ئەستێرەکانی ئەو قورئانەی کە بریتی‌یە لە شەرحی کتێبی بوونەوەر و ، بە ئیرادە و عیلم و قودرەتی خوا دەرکەوتووە . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە قورئانی پیرۆز بە کۆمەڵەیەکی تر لە هێشووە ئەستێرە لە قەڵەم ئەدرێت .. کۆمەڵە ئەستێرەیەك شەرح و تەفسیری ئەو ئەستێرانە ئەکەن کە لە بوونەوەردا هەن . بەڵێ ! ... ئەم جۆرە لێك چوونە لە نێوان بوونەوەر و لە نێوان قورئان‌دا هەیە . لەبەر ئەمە سوێندخواردن بە مەنزڵی ئەستێرەکان سوێندخواردنە بە مەنزڵ و پایەی بەرزی قورئان .

٩ ) مەنزڵێکی تری قورئان سنگی جیبریلە سەلامی لێ بێت ، کە بە فەزڵی قورئان پلەی ( ئەمین ) ی بە دەست هێنا . لەبەر ئەوە سوێندخواردن بە مەنزڵی ئەستێرەکان ، سوێندخواردنە بە سنگی ئەو جیبریلە و ، بە سنگی هاوچەشنانی کە هەڵگری قورئانن ..

١٠ ) هەروەها سنگی پێغەمبەرمان ﷺ و ، سنگە پاکەکانی ئومەتەکەشی لەم بارەوە بەبیرماندا دێن ..

١١ ) لەوانەیشە سنگی پاکی ئەو ئیمان‌دارانەی کە ئیمانیان بە خوا هەیە و، قورئان بە هەموو شتێك ئەزانن و ، ئەوانەش کە بە بیستنی قورئان رۆحەکانیان

هەست بەوە ئەکەن کە قورئان ئەوان ئەدوێنیێ ، لەوانەیە ئەو سنگانەش شوێنێك بێت لە شوێنەکانی سوێندخواردنی خوای بالآدەست . هیوادارین و لە خوای بالآدەست ئەپارێینەوە کە سنگی ئێمەش لەو سنگە پاکانە بگێڕێ کە شوێنی سوێندی خوای بالآدەست بێت .

بە هۆی ئەم مانایانەوە و ، هەروەها بە هۆی چەندین ماناوە کە ئێمە نایان زانین ، خوای بالآدەست سوێندی بە مەنزڵی ئەو ئەستێرانە خوارد ، کە خوای ( رب العالمین ) دەربارەی فەرمووی کە ئەمە سوێندێکی گەورەیە .

جا ئێمە هەروەك ئیمانمان بەو مانایە هەیە کە ئەیان زانین ، هەروەها ئیمانمان بەو مانایانەش هەیە کە بە تەواویی نایان زانین . لەبەر ئەوە لە هەموو دڵێکمانەوە ئیمانمان هەیە و تەصدیقیشی ئەکەین کە ﴿ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ﴾ .



﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَـٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ ( الحشر : ١٠) .

پێویستە یەکەم جار چاك بزانین کە یانەی ئاخیرەت و بەهەشت دوو شوێنی بنەڕەتین کە دڵپیسیی و خراپەکاریی تیایانا لە دڵدا دەرنەکرێن .. جا ئەگەر ئەم هەستانە ـ کە لە بنچینەکانی تاقیی‌کردەوەن ـ لە دنیادا لە دڵ دەرکران ، ئەوا هەر بە فیترەت مرۆڤ ئەگۆڕا بە یەکێك لە مەلائیکەتەکان . کەچیی خوای بالآدەست لەم دنیادا مرۆڤی بە ماهیەتێك ( بە ناخێك ) بەدیی هێناوە کە توانای چاکەیش و خراپەیشی هەبێت . خۆ ئەگەر بە فەرزی مەحاڵ ئەم هەستانە لە دڵی مرۆڤ دا لەم دنیادا دەرهێنران ، ئەم هەستانە ڕۆژێك لە ڕۆژان جارێکی تر لە ناو دڵدا ئەڕوێنەوە ، وەك چۆن سەر لە نوێ موو و نینۆك ئەڕوێنەوە ، چونکە ئەو هەستانە لکاون بە فیترەتی مرۆڤەوە . بۆ ئەم هۆیە ، لە بریی شێوەی دۆعاکرن و وتنی (( إنزع )) ڕوونان لە خوای بالآدەستی بکەری ڕاستەقینە ، ئەویش بە شێوەی ﴿ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ . کەواتە ئەو ئەرکەی کە لێرەدا خراوەتە ئەستۆی مرۆڤ بریتی‌یە لە ڕووکردنە خوای بالآدەست بە دۆعا و پاڕانەوەی وتن و کردار و ، هەوڵدان بۆ ڕزگاربوون لەو هەستانەی کە وەك دڕکی مەعنەویی لە دڵدا جێگیربوو لە قەڵەم ئەدرێن . بەم ڕێگایە مرۆڤ ئەتوانێ لە هەستە پیسەکان ڕزگاری بێت و ، شایانی چوونە بەهەشت بێت و ، خوای بالآدەستیش لێی ڕازیی ببێت .

پاشان هەر وەك لەم ئایەتە پیرۆزەدا نامەیەکمان ئاراستە کرابیّ و ، فەرمانمان بەسەردا بدات هەتا بە نیسبەت پێشینەی پیاوچاکەوە چاوێك بە خۆماندا بگێڕینەوە . واتە وەرگرتنی تابیعینی هاوەڵان و، وەرگرتنی تابیعی تابیعینی تابیعیان . واتە ئایەتەکە فەرمانمان بەسەردا ئەدات تا بەرامبەر بە خاوەن قەڵەم و خاوەن فەرمایشتەکان ، لە پیاوانی جم و جووڵ و فیکر ، کە لە ژیانی دینیی و ، لە هەست و فیکر و عەقیدەماندا ، بگرە هەتا لە تەفسیر و عیلمی کەلام و فیقهدا شوێنەوارێك و میراتێکی گەورەیان بۆمان بە جیّ هێشتووە کە ناسرێتەوە.. داوامان لیّ ئەکات بەرێزەوە لەگەڵیان هەڵس و کەوت بکەین .

کارەکەی تریش کە ویسترا لێرەدا بە پێی بۆچوونی من روون بکرێتەوە ئەوەیە کە هەموو مرۆڤێك بە رێژەی بەرز و بڵندیی هەستەکانی و بە رێژەی گەشەکردن و فراوان بوون و گەشەکردنی ئەو هەستانە ، لەزەت ئەبات و بەختیار ئەبێت ، هەروەها ئازاری پیّ ئەگات . بۆ نموونە ئەگەر قابلیەتی خەملاندن لە لای مرۆڤێکی هەستیار گەشەی سەند بوو ، ئەوا ئەو مرۆڤە ئەتوانێت چەندین مانا لە هەڵسوکەوتی کەسێك دەربهێنیّ کە لە بەردەمیا بێت . ئەمەش هەندیّ جار مایەی سزا ئەبێت بۆی و هەندیّ جاریش مایەی رەحمەت . لە روانگەی ئەمەوە توانا هەیە بوترێت : بڕی ئەو بەختەوەریی و لەزەتەی کە مرۆڤێك لە بەهەشتدا هەستی پیّ ئەکات گونجاوە لەگەڵ بڕی فراوانیی و گەشەسەندنی هەستەکانی لە دنیادا . کیّ ئەزانیّ ، لەوانەیە ئەو کەسەی کە ئەم هەستانەی لەلا فراوان نەبوون و گەشەیان نەکرد کاتێك کە ئەچێتە بەهەشتەوە بڵێت : (( خۆزگە پێش چوونە بەهەشتم گەشەی زیاترم بە هەستەکانم بسەندایە )) . یان ئەپاڕێتەوە و ئەڵێت: (( پەروەردگارم ! بم گێڕەرەوە بۆ دنیا تا ژیان نامەی رۆحییم تەواو بکەم و گەشەی پیّ بدەم )) . لەم گۆشەیەوە ئەگونجیّ بوترێت کە مرۆڤ بۆ ئەوەی بە تێر و تەواویی لەزەت لە نیعمەتەکانی بەهەشت ببات ، زۆر گرنگە لە هەستی رق و کین و دڵ

پیسیی و حەسادەت و غەیری ئەوانەش خۆی پاك بكاتەوە .. لەبەر ئەمە پێویستە لەم گۆشەیەشەوە سەیری ئەم ئایەتە بكرێت .

بە راستیی بە پێی ئایەتی ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٌ ﴾ ( الحجرات : ١٠ ) و ، ئایەتی ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ ﴾ ( التوبة : ٧١ ) ئەوانەی پەیوەندیی ئیمان و پەیوەندیی ئیسلامیان لە نێواندا هەیە لەسەریان پێویستە پێشینەكانیان خۆش بوێن و رێزیشان لێ بگرن ، بگرە چاوپۆشیی لە هەندێ هەڵەیان بكەن كە بگونجێ لە دەستیان دەرچن و ، دوعای خێریش بۆ ئەوانەی پێش خۆیان بكەن و ، بە هیچ جۆرێك بەرامبەریان هیچ كینە و رق و دژایەتی‌یەك لە دڵدا جێ نەكەنەوە . ئەوانەش كە خۆیان سەر بە پێغەمبەر ﷺ ئەزانن لەسەریان پێویستە تەنها بە چاكە بیر بكەنەوە و قسە بكەن و ، بە چاكەش هەڵس و كەوت بكەن ، ئەمەش بۆ بەجێهێنانی ئەم ئایەتە پیرۆزە : ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ ﴾ ( المائدة : ٢ ) .

ئێمە چەند پێویستییمان بە وێنەی ئەم كارە هەیە ، بە تایبەت لەم رۆژانەماندا .

﴿ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴾ ...... آمين .



﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ ( الحشر : ١٦ ) .

لەم ئایەتە پیرۆزەوە تێ ئەگەین کە (( ترسان لە خوای بالادەست )) . هەتا لە سروشتی شەیتانیش‌دا هەیە . ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە شەیتان خوای بالادەست ئەناسێت و لێیشی ئەترسێت . بەلام لەگەڵ ئەم زانینەیش‌دا لێی یاخیی بووە . جا کاتێك کە قورئانی پیرۆز باسی پاشگەزبوونەوە و ، گوێڕایەڵیی نەکردنی شەیتان لە فەرمانی خوا ئەکات وشەی (( عصیان )) واتە یاخیی‌بوون بەکار ئەهێنێت . دیارە (( عصیان )) یش دوای ئەوە دێت کە یەکەم جار گوێڕایەڵ و مل کەچ بووە .

قورئانی پیرۆزیش لە سوورەتی ( الکهف ) دا ئاماژە بۆ ئەمە ئەکات کە ئەفەرموێ :

﴿ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ﴾ . کەواتە شەیتان بە رەچاوکردنی ناخی وەك جینن لە ئاگر بەدیی هێنراوە و ، بەم ناخەیەوە خوای ئەناسیی و ، بەڵکو لە یەکێك لە چاخەکان‌دا ئەیشی پەرست ، بۆیە فەرمانی سەجدەبردنی بۆ دەرچوو . بەڵێ ! ... شەیتان بە پێی رواڵەتی دەرەوەی یەکێك بوو لەوانەی کە چاوەڕوانیی سەجدەبردنیان لێ ئەکرا . بەلام ـ بە پێی سروشتی ـ ئامادەیی و لێ‌هاتنیشی تیابوو بۆ یاخیی بوون و لادان . ئەوەبوو کە فەرمانی بەسەردا درا تا سەجدە ببات بۆ ئادەم سەلامی لێ بێت ، ئەم سروشتەی بە شێوەیەکی ئاشکرا بۆ هەموان دەرکەوت و ، ئەویش لەوانە دەرچوو کە خەسارۆمەندن .

پێشتر جار دوو جارێك شەرحی بۆچوونی خۆمم کرد دەربارەی ناخی شەیتان ، لەبەر ئەوە ئەگەر کورتە شەرحێکی ئەو رایە بکەین ، ئەوا ئەڵێین کە کاتێك

شەیتان یاخیی بوو و گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانی سەجدەبردن نەکرد لە ڕێ لای دا و، بەمەش ناخی ڕاستەقینەی خۆی دەرخست . ئەمە لە هەموو کاتێکدا بە نیسبەتی هەندێ کەسەوە ڕوو ئەداتەوە . لەوانەیە ساتی وا بەسەر مرۆڤ دا بێت کە بە هۆی هەستی تووڕەبوون و ، حەسادەت و ئارەزووبازییەوە ـ کە بۆ تاقییکردنەوە لە سروشتیدا چەقێنراوە ـ لا بدات و ، بچێتە ناو گێژاوێکی پێچەوانەی ویژدانیەوە و ، لە ڕێی ڕاست لا بدات . سەیری هەستی حەسادەتی هەندێ لە ئەهلی کیتاب بکەن کە دژی دوا پێغەمبەر و جێی شانازیی مرۆڤایەتی ئەنجامیان دا . ئەو هەستە پاڵی پێوە نان بۆ هەڵگەڕانەوە و ئینکاریی‌کردن ، ئیتر نەیانتوانیی ئەو نوورە ببینن کە ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ هێنای . چونکە بە تەما بوون دوا پێغەمبەر لە ناو خۆیاندا و لە ناو گەل و هۆزەکەی خۆیاندا هەڵ بکەوێت . هەمان شت بۆ ئێمەیش ، ئەگەرچیی بە پێوەری جیاواز بێت ، ڕوو ئەدات . هەندێ هەڵوێست هەن کە هەستەکان بەسەر مەنتیقدا زاڵ ئەبن و، مرۆڤیش بەبێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات ، خۆی لە ناو وڕێنە و ، لە ناو هەڵس و نیشتی نا مەنتیقیدا ئەبینێت . شەیتانیش بەرامبەر بە مرۆڤ بەردەوام لە حاڵەتی کینە و لێ دوورکەوتنەوە و حەسادەت و ڕق هەستاندا ئەژیت و ، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا هاتووە ئەڵێت : ( أمر ابنُ آدَمَ بالسجودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الجنة ، وأُمِرتُ بالسجود فَأَبَيتُ فَلِيَ النارُ ) .[77]

ئەشگونجێ شەیتان هەرچیی مرۆڤێك ببینێ سەجدە ئەبات هاواری ئێش و ئازاری لێ بەرز ببێتەوە و وڕێنە بکات . کاتێکیش کە بانگ وێژ لە مزگەوتدا بانگ ئەڵێت و ناوی خوای مەزن لەسەر زەوییدا دەنگ ئەداتەوە و،

[77] مسلم ، الإيمان : ١٣٣ ، ابن ماجه ، الإقامة : ٢٠١ ، مسند ابن حنبل : ٢ / ٤٤٣ . ئەڵێت : نادەمیزاد فەرمانی سەجدەبردنی بەسەردا درا سەجدەی برد و ئەچێتە بەهەشت . منیش فەرمانی سەجدەبردنم بەسەردا درا سەجدەم نەبرد و ئەچمە ئاگرەوە .

موسڵمانەکانیش بە خشووع و شەیدایی‌یەوە بە پەلە روو لە مزگەوت ئەکەن ، شەیتان نازانێت چی بکات و ، لە بیستنی ئەو بانگە چۆن ڕا بکات .

کورتەکەی بە هەر کردەوەیەك کە پەیوەندیی و وابەستەیی مرۆڤ بە پەروەردگاریەوە زیاد بکات ، شەیتان کینە و رق هەستان و حەسادەتی زیاتر ئەبێت . جا هەروەك بە مرۆڤێك بوترێت : (( فلانە کۆمەڵە جەردە کوڕەکەتیان کوشت )) ئەو کەسە لە تووڕەیی و گرژ بوون و هەڵچوونێکی هەمیشەیی‌دا ئەبێت دژی ئەو جەردانە . پاشان گەر پێی وترا : (( هەمان کۆمەڵە جەردە ژنەکەشتیان فڕاندووە )) ئەوا تووڕەیی و هەڵچوونەکەی زیاتر ئەبێت . ئەو مرۆڤەی کە لە نێو هەست و نەستی تۆڵەسەندن‌دا ئەتلێتەوە ، لە ئەنجام دانی هەموو خراپەیەکەوە نزیکە ، چونکە سیفەتی چاوپۆشیی و لێبووردن لە لای ئەو کەسە بە تەواوەتیی تواونەتەوە .. شەیتانیش لە ناو هەستی تۆڵەسەندن‌دا دژ بە مرۆڤ هەتا رۆژی قیامەت ئەتلێتەوە و، ناتوانێ خۆی لێ رزگار بکات .

ئەو ئەنجامەیش کە پێی ئەگەین ئەوەیە کە شەیتان تا رادەی ترسان لە خوای بالادەست ئەی‌ناسێت ، بەلام ئەو بەو سروشتەی کە توانای یاخیی‌بوونی هەیە لە رێ لای دا ، لەبەرئەوە زیانی هەمیشەیی بووە بەشی .

ئەوانەش کە شەپۆلی ئیلحاد رای‌ماڵێن و کوفر بووە سروشتێکی رەگ داکوتاو لە لایان ، هەروەها مونافیقەکانیش ، بە تەواویی لە شەیتان ئەچن . ئەوانە لە هەندێ بارودۆخ‌دا لە باس‌کردنی خوا و دین بە سەر زارەکیی دوودڵ نابن. ئەوانە ئەیانەوێ ( توقیە ) بکەن و کەسانی تر لە خشتە بەرن . لە شێوەی چاکەخواز و پیاوچاکان‌دا دەرئەکەون ، کەچیی بەردەوام کینەیەك لە دژی ئیمان داران وا لە ناو دڵیان‌دا بە هیچێ ناکوژێتەوە و ، بەردەوام بە دوای رێگادا ئەگەڕێن تا ئەو رق و کینەیە هەڵ بڕێن . لەو کاتانەش‌دا کە ناتوانن ئەوەی کە لە سنگیان‌دا پەنگی خواردۆتەوە جێ بەجێی بکەن ، بە زەردەخەنەیەکی هەڵبزرکاو ، یان بە بەیان و قسەی لووس ئەو کینەیەیان ئەشارنەوە و ، وەهاش دەری ئەخەن کە ئەوان

دیموكراتیین . بەلأم كە دەستیان گەیشتە هێزێك كە بتوانن ئەوەی ئەیانەوێ ئەنجامی بدەن ، ئەبینیی ئەڵێن : (( حەق بە لای هێزەوەیە )) . ئەو كاتە دیموكراتیەتیش ئەبێتە كارێكی خەیاڵیی یان فەنتازیی ، ئیتر ئەوەندە خراپە ئەكرێت كە بە بیری هیچ كەسدا ئەیەت ..

متمانەكردن بەو جۆرانە بە رێزنەگرتنی هەستی متمانە لە قەڵەم ئەدرێت ، بەلأم ترسان لەوانە بە متمانە نەكردن بە خوای بالأدەست ئەژمێررێت . ئیمان داریش ئەوەندەی لەسەرە هەمیشە سنگی بە خۆشویستنی هەمووان پڕ بێت، بەلأم لەوانە و وێنەیان بێئاگا نەبێت و پشتیان تێ نەكات و ، لە هەموو حاڵەتێكیشدا لەسەری پێویستە بۆ خۆ پاراستن لە شەڕی ئەوانە پەنا بۆ خوای بالأدەست ببات .

(( أللهم ! إني أعوذُ بكَ مِن الهَمِّ والحزن ، وأعوذ بك من العجز والكسل ، وأعوذ بك من الجبن والبخل ، وأعوذ بك من غلبة الدَّين وقهر الرجال )).

﴿ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ۖ وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ۖ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ۚ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ ۚ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ ۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾ ( المنافقون : ٤ ) .

ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە هەنـدێ سـیفەتی بنـەڕەتیی مونافیقـان شـەرح ئـەکات . ئێمەیش بەم شێوەی خوارەوە ئەیانخەینە روو :

رووکەشێکی دەرەوەیان هەیـە کـە سـەرنج رائەکێشـێت ، بـۆ نموونـە لەوانەیـە بالآبەرز بن و ، لەشیان کەتە بێت و ، شەنگ و شـۆخ بـن کـار لەوانـە بکـەن کـە ئەیان بینن .

خاوەنی قسەی نەستەق و زمان پاراویین ، کە بە بۆنەیانەوە بە قسـەکانیان یـان بە نووسینەکانیان ئەتوانن کار لە دەوروبـەریان بکـەن و ، بـە شـێوازی ئـەدەبی‌یان شەیدایان بکەن . کاتێك کە قسە ئەکـەن کەسـانی تـر کەمەنـدکێش ئەکـەن هـەتا گوێیان لێ بگرن .

جا سەرەڕای ئەم دوو سیفەتە ، ئەوانە مونافیقن :

أ ) ئەوانە ـ بە جل و بەرگـە قەشـەنگەکانیان ـ لـە تەختـە هەڵسـپێرراوەکانی دیوارەکان ئەچن .. بالآیان بەرزە و دیمەنی دەرەوەیان نایابە ، بەلاّم کارێکی گرانـە هەمان شت دەربارەی دڵیان بوترێت . ئەو دلاّنە رەق بوون و وەك تەختە وەهـان و، بە پێـی نهێنیـی ئایـەتی پـیرۆزی ﴿ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴾ مـۆر نـراوە بەسـەر ئـەو دلاّنەدا ، ئیتر ناتوانن بـە دەوری حـەق و حەقیقـەتدا بسـووڕێنەوە و ، ناشـتوانن لێی تێ بگەن و سەری لێ دەربکەن .

ب ) سەرەڕای ئەوەش وەهای لە قەڵەم ئەدەن کە هەموو هاوارێك و هەموو دەنگێکی بەرز دژی ئەوانە .. ژیانێکی ڕاڕایی لە نێوان ئەم و ئەودا بەسەر ئەبەن. بەڵام لەو شوێنانەدا کە ئیمان‌داران بە شوێنی گرنگیان ئەژمێرن ، ئەیان بینیی وەك لاشەی مردوو یان جەنازە بەڕێوە ئەچن و ، هیچ بایەخێکیان پێ نادەن. بەڵام هەوڵ ئەدەن لە بازاڕ و مزگەوت و مەیدانی جەنگ‌دا لە ناو موسڵمانان‌دا دەربکەون . جا بە بۆنەی ئەم دووبارەیی‌یەوە ئەوپەڕی ترسنۆکن ، چونکە ترسی ئەوەیان لە دڵدایە کە ڕووی ڕاستەقینەیان دەربکەوێت . لەبەر ئەوە هەموو هاوارێك لە دژی خۆیان ئەزانن ..

ج ) کەواتە ئەوانە بە دوژمنی ڕاستەقینەی ئیمان‌داران لە قەڵەم ئەدرێن.. ئەوانە لە دەستەی ئەو دووپشکە ئەچن کە نازانی کەی ئەت‌گەزێت .

د ) لەبەر ئەوە لەسەرتان پێویستە خۆتانیان لێ بپارێزن ، چونکە هەموو ئان و ساتێك ئەوان ئامادەن بتان‌گەزن . کاتێکیش ئەوە ئەنجام ئەدەن ، وەهای ڕائەگەیەنن کە ئەمە بۆ بەرژەوەندیی کۆمەڵ و قازانجی گشتی‌یە !

لە کۆتاییش‌دا خوای بالادەست حوکمی خۆی لە دژیان دەرئەکات و ئەفەرموێ : ﴿ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾ ، خوا بیان‌کوژێت بۆ درۆ و دەلەسەیان.

نوێنەرە پێشینەکانی نیفاق لە سەردەمی پێغەمبەردا ، وێنەی کوڕی ئوبەی و موغیثی کوڕی قەیس و جیددی کوڕی قەیس کە خاوەنی دیاردەی دەست کرد و شکۆدار و ، سەر و سەکوتی قەشەنگ بوون و ، جگە لەو دیمەنەی دەرەوەیان کە لە حەقیقەت خاڵیی بوو خاوەنی هیچی تر نەبوون .. ئەوانە بە دیوی دەرەوە و، بە قسەی نەستەق نوێنەری چاك بوون بۆ نیفاق و ، شەیدای قسەی ڕازاوە بوون . هەر یەکەیان بە زمان پاراویی خۆی دڵخۆش بوو ، زۆریش لە خۆی ڕازیی بوو .. کەچیی لە ڕاستیی‌دا ئەوانە کەسانێکی سادە بوون کە لە ناو چەندین جۆری لاوازیی‌دا چەقیی بوون .. کاتێك کە قسەیان بکردایە ـ ئەگەرچیی قسەیەکی هیچ

و پووچیش بوایە ـ هەوڵیان ئەدا ئەو باسانەیان هەندێ جار نادیار و ئاڵۆز بن ، تا بە شتێکی تازە و ڕەسەن دەربکەوێت . واتە وێنەی کەسایەتیی مرۆڤێکیان ئەکێشا کە تووشی دەردی ئازاردان و ، شێتیی خۆ بە گەورە زانین بوویێت . جا ئەگەر ڕێنمایی و ئاگادارکردنەوەی خوای باڵادەست نەبوایە ، ئەوا ئەیانتوانیی پایە و پلەیەکی چاك لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ و لە لای هاوەڵەکانی بپچڕن .
دیارە کاتێکیش کە گوێیان ئەگرت خۆیان وەها دەرئەخست کە هەموو گیانیان گوێیە .. هەموو هەڵس‌وکەوتێکیان بریتیی بوو لە دیوی دەرەوەی رووکەش و خەڵەتێنەر .. هەڵسانیان و دانیشتنیان .. قسە و باسیان .. هەر هەمووی درۆ لەسەر درۆ .. جا ئاگادار بوون لەو ساختەکارییە بەستراوە بە بەصیرەتەوە و، لەسەر بەهرە و خەڵاتی خوایی وەستاوە ..
جا ئەوانە لەبەر ئەوەی کە درۆزن بوون و ، دارای چەند رووییەکیش بوون و، ڕێی ( توقیە ) شیان ئەگرتە بەر ، لە هەموو شتێك گومانیان هەبوو ، هەتا لە پاکترین هەڵس‌وکەوت و ، لە هەموو جۆرە کارێکیش کە لەسەر پاکترین هەست و بیر وەستا بێت و ، هەموویان لە دژی خۆیان لە قەڵەم ئەدا و ، بە چاویلکەی هەست و شعووری دووپشکییەکانیان سەیری خەڵکیان ئەکرد .. سنگیان لە ناپاکیی پڕ بوو ، لەبەر ئەوە ، بە پێی دەستووری « الخائن خائف » ، واتە ناپاك ترساوە ، ئەوانە لە ترس و بیمێکی بەردەوامدان .
ئا ئەوانە دوژمنی راستەقینەی ئەهلی ئیمانن و، لەسەر ئیماندارانیش پێویستە ـ سەرەڕای پارێزگارییان لە شێوازی ئیمانییان ـ لە خۆپاراستن لەو دوژمنانە درێغیی نەکەن .

قاتلهم الله أنى يؤفكون ووقانا الله من شرهم ومن مكرهم ومن كيدهم ...

آمين يا معين .



﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجًا ﴾ ( الطلاق : ٢ ) .

تەقوا بە پێی بۆچوونی ئێمە بریتی‌یە لە شوێن‌کەوتنی یاساکانی شەریعەتی پاك و خاوێن ، شان بە شانی شوێن‌کەوتنی یاساکانی شەریعەتی فیطریی . یەکەم تەقوای نەفسیی یان (( أنفسي )) یە و ، دووهەم تەقوای (( آفاقي )) یە . هەرگیز راستیش نیە لێك جویّ بکرێنەوە ، بەلاّم گەیشتن بەو جۆرە تەقوایشە شتێکی هەروا ئاسان نیە .

با ئایەتەکەی سەرەوە وەربگرین : قورئان شەرحی یاسەکە بە ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ﴾ دەست پیّ ئەکات ، واتە کرداری ( الإتقاء ) بەکار ئەهێنێت .. ئەم کردارەش لە بابی (( إفتعال )) ەو ، گرنگترین سیفەتی ئەم بابەش ( مطاوعە ) یە ، واتە قبوولّ کردنی کردارەکە و ، سروشتی کارتیّکراو ، واتە ئەم کردارە ببێتە بەشێك لە سروشتی و ، قوولّی‌یەك لە قوولّی‌یەکانی بەدیی‌هێنانی .

بەلّیّ ! ... ئەوەی لێرەدا ئەویستریّت شەرح بکرێت ئەوەیە کە تەقوا دووری‌یەکە لە دووری‌یەکانی فیطرەت و ، قوولّی‌یەکە لە قوولّی‌یەکانی سروشتی مرۆڤایەتیی . واتە لە هەلّس و نیشتدا و ، لە هەموو حالّەتێکدا تەقوا بیر و رای بێت ، کە مرۆڤ لە قولاّیی دلّیەوە لەگەلّیا ئەژیت و ، هەناسەی پێوە ئەدات. قورئانیش دەربارەی هەر کەسێك کە توانی‌بێتی ئەم کارە گرانە جیّبەجیّ بکات و، بەو جۆرە ئاسۆیە بکات ، ئەفەرمویّ : ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجًا ﴾ .

وشەی ( مخرج ) لێرەدا وێنەی نەفسیی مرۆڤێکی ئابلّووقەدراو ئەکێشێت کە لە

شوێنێکی تەنگەبەرە و ، لە حاڵەتێکی ناهەمواردا بێت و ، لە هەوڵداندا بێت بۆ دەرچوون و رزگاربوون لێی و ، هەموو توانا و کۆششێکیشی خستبێتە کار..

جا ئەم مرۆڤە نابلوقە دراوە لەو شوێنە ناهەموارەدا لە جیهانی هۆکارەکاندا هەموو شتێك بە کار ئەهێنێ و ، تەقەش لە هەموو دەرگایەك ئەدا . لەگەڵ ئەوەشدا رێگای سەرفرازیی دەستگیر نابێت . ئا لەم کاتەدا هانا بۆ خوای بالآدەستی خاوەنی هۆکارەکان ئەبات و ئەویش خێرا دێت بە فریایەوە. کاتێکیش کە خوای بالآدەست ( خروج و مخرج ) دەرچوون و سەرفرازکردن لەم ئایەتەدا ئەداتە پاڵ خۆی ، ئەوە ئاماژە بۆ ئەم بەهاناوە هاتنە ناخلۆفییە ئەکات . چونکە وشەی ( مخرج ) لێرەدا چاوگێکی میمییە و واتە ( إخراج ) واتە سەرفرازکردن و، لە هەمان کاتیشدا ناوی شوێنە و یانێ شوێنی دەرچوون و سەرفرازبوون ، یان شوێنی دەرکردن و سەرفرازکردن . کەواتە ئەم سەرفرازکردنە کارێکی ئاسایی نیە، بەڵکو لە کارە لە عادەت بەدەرەکانە و، کارێکیشە بە تەنیا ئەدرێتە پاڵ خوای بالآدەست . لە راستییدا هەموو کارێك لە کارەکان لە بوونەوەردا بە کاری لە عادەت بەدەر ئەژمێررێت ، بەلآم چونکە هۆگریی و دووبارەبوونەوە چاومانی کوێر کردووە ، ناتوانین بە سەیرکردنێکی راست سەرنجی رووداوەکانی دەوروبەرمان بدەین ، کە لەسەر بەستنی هۆکارەکان بە دەرەنجامەکانەوە وەستا بێت و، ناشتوانین بە شێوەیەکی راست هەڵیان بسەنگێنین . بەردەوام پەیوەندییەکی ورد لە نێوان هۆکار و دەرەنجامدا هەیە ، بەلآم لە توانای ئەو هۆکارەدا نیە ئەو دەرەنجامە فەراهەم بێنێ .

بە پێی تێڕوانیین و هەڵسەنگاندنی مامۆستا نوورسییش رەحمەتی خوای لێ بێت جگە لە بەشێکی کەم لەو رووداوانەی کە لە دەوروبەری مرۆڤ دا بە ویستی خۆی ئەنجامیان ئەدا وەك خواردن و خواردنەوە، ناتوانین بیاندەینە پاڵ مرۆڤ . بۆ نموونە ئەو پارووە نانەی کە مرۆڤ ئەیخاتە دەمیەوە ، ئەگەر مرۆڤ بیر لە بەشی خۆی بکاتەوە لەو قۆناغانەدا کە نانیان تێدا دروست ئەکرێت ، حەقیقەتەکە

دەرنەکەوت . راستە مرۆڤ گەنمەکەی چاندووە و ، هەر ئەویش درەوی کردووە و ، هاڕیویەتی و، کردوویەتی بە نان ، بەڵام ئەگەر خوا زەویی و خۆڵی بەدیی نەهێنایە و ، ئەگەر خۆری بەدیی نەهێنایە و ، بارانیشی نەباراندایە ..... تد ، ئایا لە توانای مرۆڤ دا ئەبوو نان بخوات ؟ وا دابنێین نان دروست کرا، بەڵام ئەگەر خوا دەست و دەم و ددانی بە مرۆڤ نەبەخشییایە ، ئایا مرۆڤ ئەیتوانی نانەکە بخوات ؟ پێویستە بەم چاوە سەیری هەموو ڕووداوێکی بوونەوەر بکرێت ، تا هۆگریی و عادەت پەردە بەسەر چاوماندا نەکێشن و ، بتوانین دەست و مۆری خوا لە هەموو ڕووداوێکدا ببینین و ، لەم بینین و سەیرکردنەدا چێژی ئیمان بکەین .

کورتەکەی ، هەرکەس دەست لە حەرام هەڵ بگرێت و ، فەرزەکان جێبەجێ بکات و، لە شتە گومانی‌یەکان دوور کەوێتەوە و دوایان نەکەوێت و ، هەتا لە شتە موباحەکانیشدا پارێز بکات و، سوننەتەی خوا و ، شەریعەتی فیطریی بپارێزێت ، واتە دەستوورەکانی خاوەنی قودرەت و ئیرادە بپارێزێت ، خوای گەورە لە هەموو جۆرە تەنگ و چەڵەمەیەك کە تێی بکەوێت دەرووی لێ ئەکاتەوە و، بە سۆز و لوتفی خۆی کە لە ژمارە نایەن ئەیپارێزێت و پێیان پاداشتی ئەداتەوە و، لە بەسەربردنی ژیانی پیسیش رزگاری ئەکات و ، لە سەرەمەرگیشدا لە ئێش و ئازار و تەنیایی و تەنگانەی مردن ئەیپارێزێت ، هەروەها لە نارەحەتیی ڕۆژی قیامەتیش ئەیپارێزێت .

أللهم اجعل لنا خرجاً ومخرجاً من حيث لا نحتسب . آمين يا معين .

  

﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلاً لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ﴾( التحریم : ١٠).

لەوانەیە یەكێك بپرسێت : بۆچی قورئان باسی هاوسەرەكەی لووط و هاوسەرەكەی نووحی گێڕاوەتەوە ؟

وا دەرئەكەوێت كە هاوسەرەكەی لووط پێغەمبەر سەلامی لێ بێت ئیمانی پێ نەهابێت و ، وایش دەرئەكەوێت یارمەتیی قەومی لووطی لەسەر كردەوە پیسەكەیان دابێت ، یان بە لایەنی كەمەوە یەكێك بوویێت لە ئافرەتە مونافیقەكان و ، ناپاكیی لەگەڵ لووطدا سەلامی لێ بێت كردبێت . دیارە سەرەنجامی مونافیقیش لە سەرەنجامی كافر خراپترە .

هەروەك لووط پێغەمبەر سەلامی لێ بێت غەریب و بێگانە بوو بەو قەومەی كە بۆ سەریان رەوانە كرا بوو ، لە نێوانیشیاندا گەورە نەبوو بوو . جا ئایەتی ﴿ لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً ﴾ ( هود : ٨٠ ) . ئاماژە بۆ ئەوە ئەكات . لەم بارودۆخەشدا كە لووط پێغەمبەر سەلامی لێ بێت لە بارەی ماددییەوە و ، لە بارەی هێزیشەوە دەستەوسانە ، تا لە دەرەوە رووبەڕووی ئەو قەومە ببێتەوە ، كاری ترسناك ئەوەبوو كە لە ناوەوە ( لە ماڵەكەیدا ) ناپاكیی لەگەڵدا بكرێت . لێرەدا نهێنیی و هۆی باس‌كردنی ئەم كارە لە لایەن قورئانەوە بە جوانیی دەرئەكەوێت، بە تایبەت ئەگەر بزانین كە ئەو ناپاكی‌یە بە دەستی ئەو هاوسەرەی ئەنجام دراوە، كە هەموو شەوێك لە تەنیشتیا سەر ئەخاتە سەر پشتی‌یەكەی .

ئەشتوانین  بە نیسبەت نووح پێغەمبەرەوە سەلامی لێ بێت هەمان شت باس بكەین . بە پێی دەستووری : (( بحسب المغرم المغنم )) ، ئەبوایە كەڵك لە بارودۆخی ئەم ماڵە پێغەمبەرانەیە وەربگیرایە ، كە پڕیەتی لە نوور و ، هەموو بەیانیی و ئێوارەیەك بەستراوە بە جیهانەكانی ئەو دیوی ئاسمانەكانەوە . ئەو دوو ئافرەتە وەك شەمشەمە كوێرە وا بوون كە بە رووناكیی بێزار ئەبێت . بە پێی

ناوەرۆکی ئایەتی ﴿ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾ ( الإسراء : ٨٢ ) هەردووکیان ڕووناکییان بە تاریکیی و شیفاشیان بە نەخۆشیی ئەبینیی . بۆیە ژیانێکی خەسارۆمەندانەیان دایە سەر . لەبەر ئەوە پێویست وا بوو حاڵیان لە لایەکەوە وەك پزیسکەیەك وا بوایە کە هەستی ترس و لەرز لە دڵان و سنگاندا ئاگر تێ بەر بدات و ، لە لایەکی تریشەوە وەك شنەیەك وا بوایە کە دەرگاکانی هیوا بخاتە سەر پشت .

داخۆ چەند کەس - وەك ئەو دوو ئافرەتە بەدبەختە - هەلی ژیانیان لە دەوروبەرێکی پاك و خاوێندا دەست کەوتبێ ، بەڵام نەیان توانیبێ کەڵك لە خێر و بەرەکەت و بۆن و بەرامەی ئەو ناوەندانە وەربگرن ، بەڵکو - هەتا لەو ناوەندانەدا کە لە ناوەندی قەد پاڵەکانی بەهەشت ئەچن - بە هەستی ئەهلی جەهەننەمەوە ژیان و ، لە کوفرەوە گواستیانەوە بۆ ناپاکیی و ، لە نێوان ئینکاریی‌کردن و ناپاکییشدا ئەم بەر و ئەو بەریان کرد و ، لە ریزی کافراندا، نەك لە ریزی پێغەمبەراندا شوێنیان گرت ، ئەگەرچیی هاوسەریان بوون و، هەوڵیان دا بە دەم و پلیان نووری خوا بکوژێننەوە . بەم شێوەیە نرخی ئەو نیعمەتانەیان نەزانیی کە لە بارەی ئیمکان و هێزەوە لەبەردەستیاندا بوون ، بەمە ئیمکانیەتی بە دەست هێنانیان لە دەست دا و ، دەستکەوتە چاوەڕوان کراوەکانیان گۆڕیی بۆ زەرەر و زیانێکی روون و ئاشکرا ، بەمە هەتا هەلی بەزەیی هاتنەوە بە بارودۆخی پڕ ئێش و ژانیاندا لە دەست دا .

راستترین دارِشتنیش ئەمانە هەر چەندە لە ئاسۆی (( نزیکیی )) دا بوون، کەچیی ژیانی تاریکیی و شەوەزەنگی (( دووریی )) یان دایە سەر .. ئەمانە هەرچەندە لە هەرێمی خۆرەکاندا ئەژیان ، کەچیی چوونە ناو کونە رەشەکانیان هەڵ بژارد .

ربنا آتنا في الدنيا حسنة و في الآخرة حسنة وقنا عذاب النار ، آمين يا معين .

  

﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ﴾ ( الجن : ١ ـ ٢ ) .

بێگومان ئەو ڕووداوە نامۆ و سەیرەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزە لێی ئەدوێت، وەك ڕووداوە سەیرەکانی ئەفسانەکان نیە . بەڵکو پێویستە وەها لێی تێ بگەین، بە پێی عەقیدەی من ، کە شتێکی لە عادەت بەدەرە لە چوارچێوەی ئەو پەیوەندی‌یانەی کە لە نێوان مرۆڤ و شتەکانی دەوروبەری‌دا هەن و ، بە ناوی مەنطیقی مرۆڤایەتی‌یەوە کە قورئان لەبەردەم مرۆڤ دا دای‌ئەنێت .

بەڵێ ! ... قورئان ئەم ڕووداوە سەیرە ئەخاتە بەردەم مرۆڤ تا وریا بێتەوە و، لەبەر ڕووناکیی تیشکی قورئان و هەناسەکانی‌دا کە ژیان ئەبەخشن ، ئاوڕی لێ بداتەوە . لەبەر ئەمە ئەگونجێ بڵێین کە ئەگەر قورئان نەبوایە مرۆڤ وێنەی ئەم حەقیقەتەی نەئەبیست و ، لێیشی ئاگادار نەئەبوو . لە چوارچێوەی ئەم تێبینی‌یەدا کاتێك کە ئەو کۆمەڵە جیننی‌یە ـ کە بە پێوەرێکی دیاریی‌کراو ، لە هەندێ نهێنیی بوونەوەر ، لە جیهانی غەیب‌دا ئاگادار بوون ـ گوێیان گرت وتیان: ﴿ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴾ بە بیستنی قورئانیش وازیان نەهێنا ، بەڵکو خۆیان تەسلیمی ناوەندی پڕ کاریگەری قورئان کرد و ، بەوپەڕی سەربەرزی‌یەوە ئیمان هێنانی خۆیان ئاشکرا کرد . واتە بیستنی چەند ئایەتێکی قورئان بەس بوو بۆ ئەوانەی کە لە هەندێ نهێنیی بوون ( وجود ) ئاگادار بوون ، تا بە ئاشکرا ئیمان هێنانی خۆیان دەرببڕن ..

پێغەمبەرمان ﷺ چەند جارێك لەگەڵ جینییدا بە یەك گەیشتن . جا ئەو بەیەك گەیشتنە چۆن بوو ؟ ناتوانم بچمە ناو ئەو باسەوە ، چونکە پێغەمبەرمان ﷺ کەسێك بوو کە جیهانی ماددیی و جیهانیی میتافیزیقیی تیایا تێکەڵ بوو بوون و چووبوون بە ناو یەكدا . واتە جیهانی ئەو لەم جیهانە ماددییەی ئێمە بەرزتر بوو لێیشی تێ ئەپەڕیی . لەبەر ئەوە ئەم کارە لە لێ پرسراویی و سنووری ئێمە بەدەرە .

ئەوەی بە لامانەوە گرنگ بێت کاری ترن ، وەك ئەوەی کە پێغەمبەرمان ﷺ جێی شانازییە بۆ ئینس و جینن و، پێغەمبەرایەتیی و ، پەیامە جیهانییەکەشی ئینس و جیننی گرتەوە و، ئەو نازدارە ئەم کارەی تەبلیغ کرد بە هاوەڵانی ، واتە گوێگرتنی جینن بۆ قورئان ، بە پێی تێگەیشتن لە ئایەتی : ﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ ﴾ و ، بیستنی چەند ئایەتێکیش بەس بوو تا جینییەکان خێرا ئیمان هێنانیان دەرببڕن ، بە پێچەوانەی قورەیشەوە کە لە ئیمان هێنان یاخیی بوو بوون ، سەرەڕای ئەو هەمووە موعجیزە و نیشانە روون و ئاشکرایانە و، کۆمەڵی ئیمانداری جینییش کە بەم ئیمان هێنانەیان بەختەوەر بوون، بڕیاریان دا و ویستی خۆیان دەربڕیی کە خێرا بگەڕێنەوە بۆ ناو قەومەکەیان و ، بەبێ وەستان بانگیان بکەن بۆ سەر ئیسلام بێ‌ئەوەی دەقیقەیەك لە کیس خۆیان بدەن.

ربنا أرنا الحق حقاً وارزقنا إتباعه وأرنا الباطل باطلاً
وارزقنا اجتنابه.

* * *

﴿فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ﴾ ( الاعلی : ٩ )

هەر کەس هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم جۆرە ئایەتانە نەهێنێتە بەر چاوی لەوانەیە بە شێوەیەکی هەڵە لێیان تێ بگات و بڵێت : (( ئامۆژگاریەکانم کەڵکیان نەبوو و هیچ چاکەیەکیان بە دەست نەهێنا )) . یان (( پەنجا جار وەبیرم هێنانەوە کەچیی بیرخستنەوە کەڵکی بۆیان نەبوو )) . یان (( ئەوانە شایستەی ئیمان هێنان نین )) .... تد . بەم شێوەیە فەرمانبەریی بانگەواز و تەبلیغ تووشی ساردیی ئەبێت . کەچیی ئەو حەقیقەتەی کە ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ ئەکات بە تەواویی حەقیقەتێکی ترە و ، لەم تێگەیشتنە و لەم مانایە جیاوازە ، چونکە ئەم ئایەتە پیرۆزە هەڵگرانی بانگەواز فێری ئەرکی سەرشانیان لە ئیرشاد و لە بانگەواز ئەکات . ئایەتی ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾ ش ئامۆژگاریی ئەوانە ئەکات و پێیان ئەڵێت : ئەگەر ئامۆژگاریی و بیرخستنەوەکەتان کەڵکی هەیە لەسەری بەردەوام بن . ئەوەش بزانە کە پێغەمبەر ﷺ سەرەڕای ئایەتی ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ ( البقرة : ٦). لەسەر یادخستنەوەی دڵڕەقەکانی قورەیش ، وێنەی ئەبوجەهل و عوتبە و شەیبە و غەیری ئەوانیش ، بەردەوام بوو . مەگەر تەنها خوا خۆی بزانێت چەند جار تەشریفی بردبێتە لایان و یادی خستبنەوە و ، بۆ لای خوا بانگی کردبن . خۆ ئەگەر خوای باڵادەست هەل و بواری تری بدایە لە یادخستنەوە و بانگکردنیان درێغیی نەئەکرد .

بەلێ ! ... بنچینەی فەرمانبەریی تەبلیغ و ئیرشاد بریتی‌یە لە بەجێ هێنانی فەرمانی خوا ، ئەویش بە بەردەوام بوون و، کۆڵ نەدان لەسەر ئەو تەبلیغە. خۆ ئەگەر بە دەمەوە هاتن یان بە دەمەوە نەهاتنی خەلکیی بخەینە بەر چاومان ئەوا شتێکی پێچەوانە و ، دژ بە ئامانجەکانمان بە دیی دێت . سەیر بکەن خوای بالادەست چی ئەفەرموێت : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ﴾ ( المائدة : ٦٧ ) .

شان بە شانی یادخستنەوەی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن خوای بالادەستەوە بۆ فەرمانبەریی و ئەرکی سەرشانی ئاگادار کردنەوەیەکی نەرم و ناسکیشمان بەرچاو ئەکەوێت . هەروەك پێی بفەرموێ : دەربارەی وازهێنانت لە ئەرکی سەرشان و لێپرسراوییت لە تەبلیغ کردن هیچ رێیەکی تێ ناچێت ، ئەوە لە سروشتی تۆ ناچێت ، چونکە بە فیترەت تۆ لەسەر ئەنجامدانی تەبلیغ بەدیی هێنراویت ، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە یادت بخرێتەوە . تۆ خاوەنی رەوشتی بەرز و ، رەفتاری بلند و، فیترەتی نوورانییت ، کە بەرەو بێسنووریی و بێکۆتایی هەوڵ ئەدەیت ، لەبەر ئەوە هەست کردن بە لێپرسراویی ئەو ئەرکە مەزنەی کە خراوەتە ئەستۆت لەگەڵ فیترەتی بەرز و پیرۆزتدا گونجاوە .

بە پێی ئەو حەقیقەتەی کە ئایەتی ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾ ( القصص : ٥٦ ) . دەری ئەخات کە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر ﷺ و ئەرکی سەرشانی هەریەکەمان بریتی‌یە لە تەبیلغ و ، بە تەنیا تەبلیغ .

ئایەتی ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾ روویەکی تری هەیە کە ئەمەیە : هەندێ لەو خەلکە ئیرشاد و ئامۆژگاریی کەڵکیان پێ ناگەیەنێت ، لەبەر ئەوە پێویستە هەر لە سەرەتاوە ئەو حەقیقەتە بزانرێت ، تا هیچ کەسێك تووشی بێهیوایی و نائومێدیی نەبێت و ، تا دەست نەخەینە کارانێکەوە کە لە ئەرك و فەرمانبەریی

ئێمە بەدەرن . چونکە بە پێی ئایەتی ﴿ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴾ تەنها ئەوانە لە یادخستنەوە و تەبلیغ کەڵك وەرئەگرن کە ئەهلی شەرم و ترسان بن .

جا لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەرکی یادخستنەوە و تەبلیغ ، بەبێ هیچ مەرجێك ، پێ سپێرراوە ، ئەوا ئایەتی ﴿فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾ ڕێ لێگرتن نابەخشێت ، بەڵکو جەختکردنەوە لەسەر ئەو ئەرکە و ، ئەو پێسپاردنە ئەبەخشێت . چونکە ئەم فەرمایشتە کاریگەر و بەهێزە کە بە شێوەی وەحی هاتۆتە خوارەوە ، ئەبێت کەڵکێکی هەبێت ، ئەگەر بە زۆریش بووە (( واتە بە ڕێ تێچوون لە ئایندەدا )) . بەڵام کەڵك وەرگرتن و کەڵك وەرنەگرتنی گوێبیستان بە فیعلیی ئەوە باسێکی ترە . کە بە پشت بەستن بەم ئایەتە ئەتوانین بڵێین: ئامۆژگاریی بکە ، چونکە لە ئامۆژگاریی‌کردندا هەر ئەبێت کەڵکێك دەستگیر ببێ .

ألّلهم اجعلنا من عبادك الخالصين المخلصين .

وصل وسلم على سيد المخلصين .

❊ ❊ ❊

﴿ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ﴾ ( الضحى : ٤ ) .

سوورەتی ( الضحی ) سوورەتێکی مەککی‌یە و ، لە رۆژە یەکجار سەختەکانی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ هاتۆتە خوارەوە . لەو کاتەدا کە وەحی وەستابوو ئوم جەمیلی هاوسەری ئەبولەهەب هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و پێی وت : (( وای ئەبینم خاوەنەکەت دەستی لێ هەڵگرتووی )) . ئا لەم بارودۆخەدا سوورەتی ( الضحی ) هاتە خوارەوە ، کە پێغەمبەری خوای ﷺ دڵ خۆش ئەکرد و دڵی ئەدایەوە کە ئەی‌فەرموو : ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴾ .

کە لەبەر رۆشنایی ئەو بار و زرووفەی کە پێغەمبەری ﷺ تێ کەتبوو ئەم ئایەتە هەڵ ئەسەنگێنن ، بۆمان دەرئەکەوێت کە مانای ئەم ئایەتە ئەوە ئەگەیەنێت کە سبەینێت لەمرۆت چاکتر ئەبێت و ، ئایندەشت لەم کات و ساتەت چاکتر ئەبێت . مێژووش شاهێدە کە ئەمە بە فیعلیی رووی دا .. رۆژ بە رۆژ ئەستێرەی ئەدرەوشایەوە و ، بانگەوازەکەی لە پەرەسەندندا بوو . هەموو رۆژێک لە رۆژی پێشتری چاك تر و ، زیاتر بریسکاوە و گەشاوەتر بوو .. ئەو ئایەت و سوورەتانەی کە دوای ئەو رۆژە ئەهاتنە خوارەوە ، بەردەوام مژدەیان ئەدایە . بۆ نموونە : ﴿ أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ ﴾ و ﴿ وَٱلۡعَٰدِيَٰتِ ضَبۡحٗا ۝ فَٱلۡمُورِيَٰتِ قَدۡحٗا ﴾ ، وێنەی ئەم سوورەتانە سەرچاوەی هیوایەکی گەورە بوون بۆ پێغەمبەرمان ﷺ . ئەی چۆن نەبن ، هەتا ئێمە کە لەم رۆژانەدا ( والعادیات ) ئەخوێنین وێنەی ئەسپی هەناسە بڕبوومان دێنە بەرچاو کە تەپ و تۆز بەرز ئەکەنەوە و ، بریسکەی چەخماخەش لە ژێر پێیانەوە دەرئەچێت ، یان وێنەی

دەبابە و فڕۆکەی نوێمان دێنە بەرچاو ، هەروەك رۆحی موحەممەدیی لەبەر دەمماندا بە پێوە وەستا بێت .

لە سوورەتی ( الضحی ) دا هەست بە دیمەنی دڵەڕاوکە و تەنگانەی تاکە کەسیی ئەکەین ، هەروەها دیمەنی ئایندە و ، سەرکەوتن و زاڵ بوونی رۆحیی کە لە ئاستی کۆمەڵگادا لە ئایندەوە هاتبوو . هەروەها لەم سوورەتەدا مۆسیقایەکی خەمناك هەست پێ ئەکرێ . بەلاّم سوورەتی (( العادیات )) مۆسیقایەکی تێدایە کە لە مۆسیقای تەپڵی جەنگ ئەچێت . واتە پیتەکان و وشەکان لە قورئانی پیرۆزدا بە پێی ناوەرۆك و بابەتەکانیان بە شێوەیەکی وەها ورد هەڵ بژێرراون کە مرۆڤە ژیرەکان لە لێکۆڵەر و وردبینی ئەم کارە سەرسام ئەکات .

هەروەها شێوازی سوورەتی ( الضحی ) تایبەت مەندییەکی دەروونییش پێش چاو ئەخات . کاتێك سوورەتەکە دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەداتەوە ، ئەبینین سەرەتا سوێند بە کاتی چێشتەنگاو و ، پاشان بە شەو ئەخوات . واتە کاتێك کە ئەڵێیت : (( والضحی )) وەها هەست ئەکەیت کە تیشکی خۆری چێشتەنگاو روومەتت و هەردوو چاوت رووناك ئەکاتەوە و ، لە خۆشیی و شادمانییدا نوقمت ئەکات . جا ئەگەر ئێمە دوای تێپەڕبوونی چواردە صەدە و ، دوای ئەم هەموو ئولفەتە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا ، کە وشەی ( والضحی ) لە دەممان دەرئەچێت هەست بەم سۆزانە ئەکەین ، داخۆ ئەو هەست و سۆزانە چۆن بووبن کە سنگی سەرداری پێغەمبەرانیان ﷺ پڕ کرد بوو ، کاتێك کە بۆ یەکەم جار ئەم ئایەتەی ئەخوێند ! گیانم بە فیدای بێت .

هەروەها وەك (( وللآخرة )) مانای سبەی لە چاو ئەمڕۆدا و ، حاڵی ئایندە لە چاو حاڵی حازردا و ، مژدەی سۆز و رەحمەتی گشتگیر و لوتفی فراوانی داهاتوو لە چاو تەنگانەی ئێستا و لوتفی رێژەیی ئێستا ئەبەخشێت ، ئەم ئایەتە بۆی باس ئەکات و بەڵێنی ئەداتێ کە رۆژانی یەکەمی پێغەمبەرایەتیی لە مەککەدا کە بە تەنگانە ناسرابوون ، تا رادەیەك لە مەدینەدا دەروو ئەکرێتەوە و ، چێوەی فراوان

ئەبێت و ، ئەو گرفت و ناڕەحەتی‌یە ڕواڵەتیی و لابەلایانە ئەبنە ناز و نیعمەت .
بەم شێوەیە یەکەم جار مژدە بە خۆی ئەدرێت ، بەو پێیە کە پێغەمبەری تاقانە و بێ‌هاوتایە لە ئاستی بوونەوەر و زەمانەدا ، پاشان دووەم جار مژدە بە هاوەڵانی و بە شوێن‌کەوتوانی بانگەکەی ئەدرێت .

بەڵێ ! مژدە بۆ خۆی و ، هاوەڵانی و ، شوێن‌کەوتووە بەوەفاکانی بانگەکەی.
کاتی باس‌کردنی ﴿ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَىٰ ﴾ ش مژدەیەکیشە بە نومەتەکەی کە بارودۆخی ئەگۆڕێت بۆ چاکتر و ، لە خێری نیسبی‌یەوە بۆ خێری حەقیقیی و ، لە ئیمانەوە بۆ عەمەل و ، لە عەمەلیشەوە بۆ ئیحسان و ، لە تەنگانەوە بۆ سەرفرازیی و ، دواجاریش هاتنی مژدە بۆ ئەوە کە قیامەتی ڕاستەقینە بریتی‌یە لە بەهەشت و ، بە دیدار شادبوونی خوای بالآدەستیش لە کۆتایی‌دا لە هەموو شتێکی‌تر چاکترە .

أللهم إن نسألك الرضا بعد القضا ، وبرد العيش بعد الموت ، ولذة النظر إلى وجهك ، وشوقاً إلى لقائك ، يا أرحم الراحمين ، وصلى الله على سيدنا محمد وآله أجمعين.

* * *

 ( الضحى : ٥ )

ئەگونجێ وشەی ( فترضى ) لە ئایەتە پیرۆزەکەدا وەها تێ بگەین کە ئاماژەیە بۆ پلەی ( الرضا ) بەم شێوەیە : پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتادا وەك ڕوخسارێك بۆ پلەی ( الرضا ) لە شێوە و ناخی ناوکێکدا هاتە دنیاوە . بەڵێ ، ئەم ڕوخسارە لە سەرەتادا وەك ناوکێك و وەك تۆوێك وەها بوو . جا هەروەك تۆو ، دوای

ناشتنی له ناو خۆڵدا ، گەشە ئەكات و ، ئەبێتە ئەمامێكی بچووك ، پاشان گەشە ئەكات و گەورە ئەبێت هەتا ئاسمان دائەپۆشێت ، بە هەمان شێوە پێغەمبەریش ﷺ بەو ئیرادە و كۆشش و عەزمەی كە پەروەردگاری پێی بەخشیی، گەیشتە پلەی ( الرضا ) كە لە حاڵەتی هێز و شاراوەیی‌دا بوو ، بۆ پلەیەكی رەزامەندیی بە كردەوە و دیار ، ئەویش بە لێ‌هاتنێكەوە كە بە بیری هیچ عەقڵێكدا نایەت. كەواتە گەر ئێمە ( رضا ) ی رەها لە ئایەتی ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴾ بەر چاو بگرین ئەتوانین بڵێین كە ئەو بە حەتمیی بە پلەی ( الرضا ) ئەگات . هۆی ئەوەیش كە ئەڵێین لە دوارۆژدا ئەو ئەگات، بوونی وشەی (( ولسوف )) ەیە .

لە راستیی‌دا وێنەی ئەم ئەنجامە جوانە بەشی هەر كەسێكە كە ژیانی لە چوارچێوەی فەرمان و قەدەغەكانی پەروەردگاری‌دا بەسەر بردبێت . لێرەدا ئەوە گرنگە كە ئەو كەسە ئەو لێ‌هاتنانەی كە پێشكەشی كراون بۆ خراپە و ، رووە و هەڵە بەكار نەهێنێت .

هەرچەندە ئەو لامەی كە لە (( وللآخرة )) و هەروەها لە (( ولسوف )) ەدا هەن هەردوكیان لامی سەرەتان ، بەڵام هەڵ ئەگرێت لامی سوێندیش بن . جا دوای سوێندخواردن لە رستەی یەكەم‌دا كە ئاخیرەت بۆی چاكتر ئەبێت لە دنیا ، رستەی دووهەمیش دێت و، لەسەر ئەوە جەخت ئەكاتەوە كە خوای باڵادەست ئەوەندە ناز و نیعمەتی ئەداتێ هەتا رازیی ببێ . واتە بەرهەمی ئاڵ و گۆڕی رۆژەكانی تەمەنت لە نێوان لەزەت و ئازاردا و ، شیرین و تاڵدا و ، یارمەتیی‌دان و تەنگ پێ‌هەڵچنین‌دا پێ ئەگات و ، ئەشگاتە پۆپەی پلەكانی كەماڵ ، بە جۆرێك كە خۆت لە نێوان تاقگەكانی بەختەوەرییە ماددیی و مەعنەویی و فیكرییەكان‌دا ئەبینێتەوە . كاتێكی كورت و ماوەیەكی سروشتیی و فیطریی لەم رۆژانەدا هەیە كە پابەندی وشەی (( سوف )) ەیە . جا مادەم ساڵەكانی دنیا هەتا

بە چرکەکانی ئاخیرەت پێوانە ناکرێن ، کەواتە کەمێك ئارام بگرە شنەی ڕەزامەندیی خوایی ئەبینیی چۆن بە سەرتدا هەڵ ئەکات و چوار لات ئەگرێت .

ئەو کاتە هیچ خەم و خەفەت و دڵگیرییەك و ، هیچ زەرەر و شڵەژاوییەك، چ لە لای پەیڕەویی‌کەر و چ لەلای پەیڕەویی‌کراو نامێنێت . بەڵکو پەیڕەویی‌کراو ـ بە ناوی خۆی و ئوممەتەکەیەوە ـ هەموو ڕەنگ و جۆرێکی ڕەزامەندیی و بەختەوەریی دەستگیر ئەبێت و ، لە ناو هەموو دیاردەکانی « دەروونی ڕەزامەند » دا ژیان بەسەر ئەبات . بەڵام وەڵامی خاوەنی ئەزەل و ئەبەد بریتییە لە گەیاندنیان بە لووتکەی پلەکانی « دەروونی ڕازیی‌کراو » ، کە لێرەدا دڵۆپێك ئەگۆڕێت بۆ دەریایەك و ، فەنایش بۆ بەقا و نەمریی ، دیارە لەگەڵ پاراستنی بارودۆخی ڕێژەکان لە نێوان ئەصڵ و سێبەردا ، چونکە لێرەدا حەقیقەتی ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾ ( الإسراء : ٧٩ ) ئەدرەوشێتەوە .

أللهم اجعلنا من عبادك الحمّادين واحشرنا تحت لواء محمد ﷺ .



﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴾ ( الإنشراح : ٧ ) .

ئەم ئایەتە پیرۆزە فەلسەفەیەکی جم و جووڵی گرنگ و دەستوورێك بۆ ژیان پێشکەش بە موسڵمان ئەکات . بەڵێ ، پێویستە ئیماندار هەمیشە لە جم و جووڵێکی بەردەوامدا بێت .. کاتێك کار ئەکات لە جم و جووڵدا بێت و، کاتێکیش کە پشوو ئەدات هەر لە جم و جووڵدا بێت . بە دەستەواژەیەکی تر لەسەری پێویستە بە پێی نەخشەیەك ، کە هیچ بۆشایی‌یەك لە ژیانی‌دا نەبێت، خۆی رێك و پێك بکات . راستە ئەویش وەك مرۆڤێك پێویستیی بە حەسانەوە هەیە ، بۆیە شتێکی سروشتی‌یە کە پشوو بدات . بەلاَم پێویستە ئەم پشوودانەی پشوودانێکی چالاکانە و ئیجابی‌یانە بێت . بۆ نموونە ئەو کەسەی بە خوێندنەوە و نووسین ماندوو ئەبێت . ئەتوانێ بە خەوتن ، یان بە ئاڵ و گۆڕی شوێن و دەوروبەر، وەك ئەوەی قورئان بخوێنێ ، یان نوێژ بکات ، یان وەرزش کردن ، یان کۆڕگرتنی شەو ، یان گاڵتە و گەپێك کە شەرعیی بێت لەگەڵ کەسانی تردا.. تد، ماندووبوونی خۆی دەر بکات . جا کە لەوانە ماندوو بوو جارێکی تر ئەگەڕێتەوە سەر خوێندنەوە . واتە لە جم و جووڵێکی بەردەوام و سەرەمڕدا ئەبێت ، کە سەرقاڵبوونێك واز لێ دێنێ و بە شتێکی ترەوە سەرقاڵ ئەبێت .. واتە کاتێك کار ئەکات ئەحەسێتەوە و ، کاتێکیش ئەحەسێتەوە هەر کار ئەکات .

جا ئەگەر لە چوارچێوەی خزمەتی ئیمانیی‌دا ئەم مەسەلەیە هەڵ بسەنگێنین، ئەوا ئەتوانین بڵێین ئێمە وەك ئیماندار ـ وەك بەردەوام وتراوە ـ لە ژێر فشاری چەندین ئەلطافی ناچاریی و زۆرە ملیی‌دا ئەبین و ، بە پێی شێوازی ئەو خزمەتە ئیمانی‌یەی کە لەمەوبەر پەسەند کرا بوو و، بەردەوامیش جێبەجێ کرا ، ئەبینین

ئەم دەستووره قورئانی‌یە لە ژیانماندا ، وەك ئیماندار بەبێ ئەوەی هەست بکەین تیشك ئەداتەوە . لەمەو بەریش هەندێ لەو دەوڵەمەندانەمان کە بە دوای رەزامەندیی خوادا ئەگەڕان ، لە پێناوی خزمەت کردنی ئومەتدا ، کەوتنە یارمەتیی‌دانی قوتابیە زیرەکە هەژارەکان و نیشتەجێ‌کردنیان لە بەشەکانی ناوخۆدا .. دوای ماوەیەك هەستیان کرد کە ئەرکی سەرشانیان بەجێ هێناوە ، بۆیە پاڵیان لێ دایەوە و ، سەریان کردەوە ئیش و کاری ژیانی ئاسایی ، کەچیی لە پڕێکدا دەرگای چەندین خزمەتی نوێ و فراوان لە بەردەمیاندا خرانە سەر پشت و ، بانگیان ئەکردن تا لەزەتی بەجێ‌هێنانی ئەم خزمەتە بەر فراوانانە بچێژن .. دڵە پڕ لە ئیخلاصەکان بە شڵەژاوی‌یەوە پرسیاریان ئەکرد (( ئایا ئەگونجێ ئەم خزمەتە ئیمانی‌یە جۆراوجۆرانە کۆتایی‌یان پێ بێت ؟ ئایا مەیدانی تری فراوانتر لەمانە نیە ؟ )) لە پڕێکدا چەندین مەیدانی خزمەتی تر و ، لە ناوچەی جوگرافیی فراوانتردا دەرگایان لە بەردەمیاندا ئەخرێتە سەر پشت و ، لەزەتی بەجێ هێنانی ئەم خزمەتانە لە پێناوی خوادا ئەچێژن و ، نووشیان ئەکەن.. پاشان خوای گەورە لەبەر دەمیاندا مەیدانی چەندین خزمەتی بەرفراوان تر و چالاکتری لێ خستنە سەر پشت .. کورتەکەی ، لە هەر سەردەمێکدا وەها ظەن برابێت کە خزمەتەکان کۆتایی‌یان هاتووە و، دەرگایان لەسەر داخراوە ، ئەوا خوای گەورە لە بریی ئەوان چەندین شێوەی جیا جیای لە خزمەت کردن لە پێناویدا و ، لە چەندین مەیدانی جیا جیادا هێنایە بوون .. لەبەر ئەمە بۆ دەربڕینی ئەم جۆرە مانایە ئاماژەم بۆ ئەوە ئەکرد کە ئێمە کۆمەڵگایەکین بۆ ئەلطافە زۆر ملی‌یەکان . کەواتە ئێمە وەك ئیماندار ئەگەرچیی لە ماناکان و ناوەرۆکی ئایەتی ﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴾ ئاگادار نەبین و نەگەین ، ئەوا ئەو مانا و ناوەرۆکانە بە شێوەیەکی رێك و پێك و بەردەوام لە ژیانماندا دەرئەکەوێت و دیار ئەبێت ..

خۆ ئەگەر لە ئەسڵی مەسەلەکە ورد ببینەوە ئەبینین کە لە راستییدا دەرهەق بە ئیماندار هیچ ( بدیل ) یك نیە . یەکەم هەر نیعمەتێك لەو نیعمەتانەی کە خوای باڵادەست بە ئیمانداری بەخشیوە یەکجار گەورەیە . ئێمە کە مرۆڤین ئەوە نیعمەتێکە و ، کە تەمان دروستە نیعمەتێکی ترە و ، کە ـ لە ئەنجامی ئیمان بوومان ـ هەست بەو نیعمەتانە ئەکەین ئەوەش نیعمەتێکی هەڵبژاردەیە . واتە هەموو شتێك نیعمەتە : خواردنمان و خواردنەوەمان .. چاوەڕوانییمان بۆ ژیانی هەتا هەتایی .. چاوەڕوانییمان بۆ نیعمەتە هەتا هەتاییەکان نیعمەتە ... هەموو شتێك ... هەموو شتێك لە راستییدا نیعمەتە . بەڵام خوو پێوە گرتن و عادەت ئەم هەمووە نیعمەتە و نرخەکەیمان لە یاد ئەبەنەوە .. لەبەر ئەوە وەك پێویست شوکرانەیان بۆ ناکەین .. ئەم هەموو نیعمەتانە لە تایەکی ترازوودا و، نیعمەتێکی تر هەیە کە ئاوڕی بە لادا نادەینەوە ، کە ئەویش ئەمەیە : کە سەیری دەوروبەرمان ئەکەین چەندین جەنگی گەرم لە چەندین شوێندا ئەبینین و، هەزارەها کەس شیوەن ئەکەن و ، بە دەست ئەم کارەساتە دڵتەزێنانەوە ئەناڵێنین و ، لە چەندین ناوچەشدا موسڵمانەکان ئەبینین کە زوڵمیان لێ ئەکرێت و ، بە دەست زوخاو و دەست درێژیی ئەو کاربەدەستانەوە ئەناڵێنن کە لە ستەم کردن لە ئیمانداران دەست کۆتا نابن .. جا لە کاتێکدا کە ئەم رووداوە ترسناکانە لە دەوروبەرماندا روو ئەدەن و ، ئێمەش ئەتوانین ئەرکی سەرشانمان و ، فەرزەکان بە سەربەستیی و ، بێئەوەی زوڵم و سووکایەتییمان دەرهەق بکرێن ، بەجێ بهێنین . دیارە ئەمە بە نیسبەت حاڵی رابوردوومان و ، بە نیسبەت زۆرێك لە وڵاتە ئیسلامییەکانەوە . ئایا ئەمە نیعمەتێکی گەورە نیە ؟ ئایا ئەمە پێویستیی بە شوکرانە نیە ؟ کەواتە پێویستە لە کارێکەوە بۆ کارێکی تر پەلە بکەین و، ئەرکەکانمان ـ لە چوارچێوەی رێکخراوەی خزمەتی بەکۆمەڵدا ـ بەبێ سارد و سڕیی و بێزاریی ئەنجام بدەین و ، لە کاتی ئەنجامدانی ئەو خزمەتانەدا چێژ و لەزەتی مەعنەویی و رۆحییش وەربگرین .

بەڵێ ، ئیماندار مافی ئەوەی نیە بڵێت : (( ئەوەی لە ئەستۆمدا بوو ئەنجامم داوە و ، هیچی ترم لەسەر نیە ئەنجامی بدەم )) . بۆی نیە شتی وەها بڵێت و ، بۆ حەسانەوە و پاڵدانەوە لە مەیدان بکشێتە دواوە . دوای تەواوکردنی کارێکی چاکە فەرمانبەریی ئیماندار بریتی‌یە لە هەڵمەت بردن بۆ ئەنجامدانی کارێکی تری چاکە . لەسەری پێویستە بە کارکردن بحەسێتەوە و ، حەسانەوەکەشی پێشەکی‌یەك بێت بۆ کارێکی تر و ، لە تەنگانەدا وای لە قەڵەم بدات کە لە خۆشیی‌دایە و ، خۆشیی و ناخۆشیی لەبەر رۆشنایی هەستە غەیبیی و رۆحی‌یەکان بەرپا بکات و ، لە بەر رۆشنایی ئەوەش هەڵس و کەوت بکات کە جیهانی ماددیی جیهانی ناماددیی تەواو ئەکات و ، جیهانی ناماددییش جیهانی ماددیی تەواو ئەکات ، ئەو کاتە وەك مرۆڤێك ئەژیی کە هیچ بۆشایی‌یەك لە ژیانی‌دا نەبێت .

ألّلهم وفقنا لما تحب وترضى ، وصلى الله على سيدنا محمد المرتضى .

* * *

# ناوەرۆك

وەرگێڕانی ئەم کتێبە نازدارە لە ٢٧ / رجب / ١٤٣٠ ك بەرامبەر بە ٢٠ / ٧ / ٢٠٠٩ ز تەواو بوو . سوپاس بۆ خوای هیدایەت دەر .

# چەند تیشکێکی قورئانیی

## لە ئاسمانی ویژداندا



مامۆستا
محمد فتح‌الله گولەن

ئەو قورئانە پیرۆزەی‌کە بریتی‌یە لە کۆمەڵە یاسا و دەستوورێکی خوایی و ، لە لایەن خوای مەزنەوە دابەزیوە و ، جیهانی ئادەمیزادی رووناک کردۆتەوە .. لەو رۆژەوە هاتۆتە خوارەوە چەندین ملیار مرۆڤی بەوەفا و بەسەلیقە و بەئەمەك و بەغیرەت شوێنی کەوتوون و خزمەتی بانگەوازە مەزنەکەیان کردووە و ، خۆیان و خەڵکیشیان پێی پەروەردە و بەهرەمەند کردووە .

وا لەم کتێبەش‌دا مامۆستای پایەدار تیشکی هەندێك لە ئایەتەکانی قورئانی تۆمار کردوون ، بە تایبەت ئەوانەی کە بۆ ئەم چەرخە پێویست بێت دڵە هۆشیارەکان بە جوانیی لێیان تێ بگەن .

هیوادارین خوێنەری بەڕێز کەڵکیان لێ وەربگرێت .

ژمارە سپاردنی (١٧٤٩)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی زاینیی پێدراوە.

سۆز
کتێبخانەی